# فەرمانڕەوایانی قۆچی زێڕین

## لە سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە تا ئەتاتورک

نووسینی: نۆیل باربەر

وەرگێڕانی: ڕێبوار کەریم وەلی

■ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
ت (٢٩٩٩٢)

■ کتێبی ژمارە: (٢١)

■ کتێب: فەرمانڕەوایانی قۆچ زێڕین
لە سوڵتان سلێمانی قانوونییەوە تا ئەتاتورک

■ نووسینی: ئۆیل باربەر

■ بەرگ: سەربەست عومەر

■ چاپی یەکەم: هەولێر - ٢٠٠١

■ ژمارەی سپاردن (٣)ی ساڵی ٢٠٠١دراوەتێ.

■ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە / هەولێر

ئەم کتێبە بەو ناونیشانەی خوارەوە. لە لایەن «عەبدولڕەزا هۆشەنگی مەعدەوی»یەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی

Lorfs of the Golden Horn
by: Noel Barber
First Published 1973 by
Macmillan London, Limited.

# پێرست

پێشکەشە بە:
دەستەکانی... چاوەکانی ...

### وتەیەکی کورت

تاکو ئێستا لە کوردستان، تاکی کورد مێژووی وڵاتانی دەوروبەر؛ تورک، فارس و عەرەب لە روانگەی هەڵوێستی نەتەوەیی کورد [کە بەدرێژایی مێژوو لەلایەن ئەو نەتەوانەوە چەوسێندراوەتەوە] دەخوێننەوە و، زۆرجاریش دەبینین بەچاوی گومان و بەدبینییەوە لە مێژوویان دەڕوانێ. ئەگەر مێژوو بەوە وەربگرین کە بریتیە لەو گۆڕانکارییانەی کە مرۆڤی گەیاندۆتە ئەمڕۆ و، مرۆڤ لە هەر قۆناغێکی دیاریکراو و لە هەر ناوچەیەکدا بەپێی پێکهاتەی نەتەوەیی و نیشتیمانیی ئەو ناوچەیە بەشداریی لە دروستبوونی مێژوو کردووە ، ئەوا ئێمەی کوردیش بەو زوڵم و زۆردارییەی کە بەدرێژای مێژوو لێمان کراوە، بەشداریمان لە مێژووی ناوچەکە و جیهاندا کردووە و، بۆمان هەیە لە دەریچەی بەرژەوەندییەکانی خۆمانەوە سەیری مێژوو بکەین. ئەمە بەشێکە لە روانگەی ئێمە بۆ تێڕوانینی مێژوو، بەشەکەی تری بەو پێشکەوتنەی کە مرۆڤ بەخۆیەوە بینیوە، گەیشتۆتە قۆناغێک کە پێویستە مرۆڤ لە شوێنی خۆیەوە هەنگاوێکیش ئەولاتر بڕوات و بەچاوی دنیاوە سەیری مێژوو بکات. بۆیە زۆر گرنگە ئێمەی کورد جیا لە روانگەی نەتەوەییمان بۆ مێژووی نەتەوەکانی دەوروبەرمان، بە چاوی دنیا لەو مێژووە بڕوانین و دیوەکەی تری هەقیقەتیش ببینین. میخائیل گۆرباچۆف لە کاتی دەست پێکردنی پرۆستریکا قسەیەکی بەنێوبانگی هەیە و دەڵێ:لەوانەیە هەقیقەت رووییەکی لە تۆوە دیاربێت و، تۆ تەنها ئەو رووە دەبینی کە لە تۆوە دیارە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەنگاوێک ئەولاتریش بڕۆین و رووەکەی تریش ببینین. ئینجا بۆیە ئەگەر ئێمەی کورد بمانەوێ مێژوو بخوێنینەوە دەبێ واقیع بینانە بە مێژووی ناوچەکەدا بچینەوە تاکو باشتر خۆشمان بناسین و باشتر ئەو گۆڕانکارییانە هەڵبسەنگێنین کە بەسەر کورددا هاتوون. زۆر گرنگە مرۆڤ بتوانێ دوژمنەکەی خۆی وەکو ئەوەی کە هەیە ببینێ، نەک وەکو وەک ئەو کەسەی کەخۆمان دەمانەوێ بیبینین؛ چونکە سرووشتی مرۆڤ بە شێوەیەکە کە لە هەڵسەنگاندنی زاڵم دا، ئەو زوڵمەی کە لە مرۆڤ دەکرێ بە سەر هەموو شتێکدا زاڵ دەبێ و ئەمەش رێ لە هەڵسەنگاندنی واقیعیانە دەگرێ. جاری واهەیە دەوڵەت یان لایەنێکی زاڵم لەو پەڕی زۆرداریشدا هەندێ لایەنی ئیجابی هەیە کە ئێمە نەمانتوانیوە بیبینین، یانیش ئەو ئیجابیاتانە ئێمەیان نەگرتۆتەوە.بۆیە ئەگەر ئێمەی کورد بمانەوێ لە مێژووی خۆمان و ناوچەکە بگەین ، پێویستە زۆر بێلایەنانە مل لەبەر وەرگێڕانی مێژووی گەلانی دەوروبەر و تەنانەت جیهانیش بنێین، خۆ ئەگەر بکرێ خەڵکانی خۆشمان دەست بەنوسینەوەی مێژووبکەن، ئەوا کارێکی زۆر باشە. بەڵام بەوەی کە ئەمڕۆ لەبەردەستدایە دەکرێ جارێ تەنها بەوەرگێڕانی لایەنی جیاجیا، هەوڵ بۆ هێنانەکایەی خوێندنەوەی جیاجیا بدەین.

ئەم کتێبەی بەردەستتان کە لە نووسینی نوسەرێکی رۆژئاواییە،باس لە بەسەر هاتی سوڵتانەکانی عوسمانی دەکات لە ماوەی پێنج سەدەدا، کە تێیدا ئەم خەلیفە بەنێو موسڵمانانە وەک نمونەی دڵرەقی، درۆ، دیکتاتۆرییەت، چەوساندنەوە و زەوتکردنی مافی هاوولاتیان و ...هتد، خۆیان بەدیار دەخەن. کتێبەکە لە کۆی گشتیدا ، باس لە مێژوویێک دەکات کە بە هۆی کاریگەریی لایەنە جیاجیایە دەرەکی و ناوەکییەکان بەباری نیگەتیڤدا ، پڕە لە کارەسات و مەینەتی؛ ئەو کاریگەرییانەی کە هەموو مێژوونووسێک بە سانایی هەستیان پێناکات و نایانبینێت و هەر ئەم کاریگەرییەتیانەشن کە لە کۆتاییدا فاتیحا بۆ مەرگی گەورەترین ئیمپراتۆرییەتی بە نێو ئیسلامیی جیهان دەخوێنن.

ژیان و بەسەرهاتی(٣٦) سوڵتانی سیلسیلەی عوسمانی کە لە سلێمانی قانوونیی سەرسیلسیلەی

فرمانڕەوایانی ( قۆچی زێڕین- قرن الذهب)ەوە دەست پێدەکات و لەسولتان عەبدولمەجید دا کۆتاییان پێدێت، لەم کتێبەدا کۆکراوەتەوە. دواتر باسێک لە هاتنی ئەتاتورک و ئەو گۆڕانکارییانە دەکات کە تورکیا لەو ماوەیەدا بەخۆیەوە بینیون.

ئەڵبەتە پێویستە ئەوەش لەیاد نەکرێت کە نووسەر لە هەندێک شوێندا زۆر بە قوڵی بەناخی ڕووداوەکاندا شۆڕ نەبۆتەوە و لە باسکردنی هەندێ شتی لەبابەت کوشتاری ئەرمەنییەکاندا، تەنها پشتی بەو ڕاپۆرت وبەڵگەنامانە بەستووە کە ئەوروپایی و ئەمەریکاییەکان لەو بارەیەوە خستوویانەتە ڕوو.هەروەها باس لە هەندێ دابونەریتی وەها دەکات کە ڕەنگبێ بۆ ئێمەی ڕۆژهەلاتی زۆر جێی سەرنج نەبن، بەلام پێویستە ئەوەمان لەیاد بێت کە ئەم کتێبە بۆ خوێنەرێکی ڕۆژئاوایی نوسراوە و، بۆ ئەوان هەموو شتێ تازەیی خۆی هەیەو ئێمەش بۆ کەم نەکردنەوە لە بایەخی کتێبەکە وەکو خۆی وەرمانگێڕاوە و دەستکاریمان نەکردووە. ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کە لەسەرەتادا مایەی ترس و دڵەڕاوکێیی ولاتانی ئەوروپایی بوو لە ماوەیەکی کورتدا کەوتە سەر سەراولێژی لەنێوچوون و فەوتانەوە و هەموو هەوڵێکیش بۆ ڕزگارکردنی لە لەنێوچوون لە گەڵ شکستدا بەرەوڕوو بۆوە و بەم پێیە دوای دەیان ساڵ لە بالادەستیی تورکەکان بەسەر بەشێکی گەورەی دنیا، ئەمجارەیان نۆرەی ئەوەبووکە ئیمپراتۆرییەت لە ترسی هێرش و پەلاماری نێچیرەکانی دوێنێ و ڕاوچییەکانی ئەمڕۆ، پەنا بەرێتە بەر ولاتانەوە.

خوێندنەوەی مێژووی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بۆ ئێمەی کورد زۆر گرنگەو گرنگییەکەش لەوە دایە کە بەر لە هەموو شتێک بەشێک لە میللەتی ئێمە لەگەڵ ئەو ئیمپراتۆرییەتەدا ژیاوە و، بۆیە دەبێ بزانین هەیکەل، ئایدۆلۆژیا، ئاین و بەکارهێنانی ئاین لە نێو ئیمپراتۆرییەتە چۆن بووە و، ئێمەی کورد وەکو هاوئایینی ئەمانە، چۆن مامەڵەمان لەگەڵدا کراوە، چۆن مامەڵە لەگەڵ گەلان و نەتەوەکانی دیکەی نێو ئیمپراتۆرییەتدا کراوە کە لەژێر سایەی ئەم دەسەلاتەدا بوونە. لەلایەکی دیکەوە ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین بزووتنەوەیەکی سیاسیی توندڕۆی ئیسلامی لەکوردستان و تێکڕای ناوچەکە هەیە کە زۆر بە سۆزەوە باس لە قۆناغی پڕشنگداری حوکمی ئیسلامییەکان لە ناوچەکە دەکات و مەبەستیشیان لەو حوکمە، قۆناغی دەسەلاتدارییەتی عوسمانییەکانە.

ئیسلامییەکان ئیدعای ئەوە دەکەن کە لەو قۆناغەدا[سەردەمی دەسەلاتی عوسمانییەکان]، هیچ زوڵمێک لە نەتەوەکانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەت نەکراوە و بۆیە کورد لەو سەردەمەدا هیچ هەست و سۆزێکی نەتەوەیی نەبووەو، هەستی بە جیاوازیی نەتەوەیی لەگەڵ تورکدا نەکردووە. هەربۆیە زۆرجار هەندێ لەو کەسانەی کەدەیانەوێ بە بیروڕای ئیسلامی باس لە مێژوو بکەن، ئەمین زەکی بەگ بەنمونە دێننەوە و دەڵێن کە لە سەرەتای کتێبەکەی خۆی کە لەسەر مێژووی کورد نووسیویەتی، باس لەوە دەکات کە تا سەردەمی کۆماری لە تورکیا، هەستی بەوە نەکردووە کە کوردە یان تورکە.

دیارە ئەوەی هەندێ خاوەنفکری ئیسلامی دەیکەن، هەڵگێڕانەوەی مێژووە؛ چونکە ئەگەر مێژوو بخوێنینەوە زۆر بەڕوونی دەبینین کە لەدوا قۆناغی بەر لە هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ، چەندین ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی نەتەوەیی کە بەشێکی زۆریان هی کورد بوونە، لەدژی ئەم دەسەلاتدارانەدا ئەنجامدراوەو، ئەمەش بەڵگەی بوونی فکری قەومییە لە نێو نەتەوەکانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەت.

بۆیە ئەگەر خاوەنفکری ئیسلامیی ئەمڕۆ، سوڵتانەکانی عوسمانی، تێڕوانیین و بۆچونەکانیان، شێوەی گرتنەدەستی دەسەلات [کە لەم کتێبەدا دەبینین چۆن براکانی خۆیان قەتڵوعام کردوون و بەدەیان ساڵ لە قەفەسدا ڕایانگرتوون]، تێڕوانینیان بۆئافرەت[کە هەیانبووە پتر لە ۹۰۰ژنیان هەبووە]، سیاسەت و.....هتدیان بە نمونەی دەسەلاتی ئیسلامیی نمونەیی بێننەوە، غەدرێکی یەکجار گەورەیان لە ئایینی ئیسلام کردووە.

بەشێکی دیکە لەم کتێبە باس لە قۆناغی کۆماری و سەرهەڵدانی تورکەلاوەکان و ڕووداوەکانی

دوای تێشکانی تورکیا لە جەنگی جیهانیی یەکەم و بەدەرکەوتنی مستەفا کەمال ئەتاتورک دەکات.

قوناغی کۆماری بۆ جارێکی دیکە غەدری لە کورد کرد و لە هەقیقەتدا چ تورکە لاوەکان و چ مستەفا کەمالیش، لە رووی سیاسەتی شۆڤینییانەیان لە هەمبەر کورد و ئەرمەنی [کە دوا نەتەوە بوون کە لە دوای دابەشبوونی میراتی پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا لەگەڵ تورکیادا مابوونەوە]درێژەپێدەری سیاسەتی عوسمانییەکان بوون، بەلام بە شێوەیەکی مۆدێرنتر.

ئەوان بەبیانووی جیاجیا هەوڵی سرینەوە و لەنێوبردنی ئەو نەتەوانەیان دا. ئەرمەنییەکان کە ژمارەیان کەم بوو بەئاسانی قەتڵوعام کران، بەلام کوردەکان کە رەنگبێ لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ژمارەیان نزیکەی (٥) ملیۆن کەس بووبێت، لەنێو بردنی یەکجارەکییان ئاستەم بووە بۆیە نکۆڵی لەبوونیان کراوە و بە تورکی شاخاوی لە قەڵەم دراون.

ئەم قۆناغە لە روویەکی دیکەشەوە بۆ ئێمە گرنگە کە ببینین هەرکاتێ ناسیۆنالیزمی دەوروبەرمان ویستبێ‌یان توانیبێتی خۆی کۆی کاتەوە ، لەسەر حیسابی ئێمە بووە.

لایەنی دیکەی ئەم قۆناغە بریتیە لەوەی کە کەمالیزم کۆتایی بە دەسەڵاتدارێتی پاشکەوتوو و نەگونجاو لە گەڵ سەردەمی عوسمانییەکان، هێنا.راستە کە حوکمی کۆماری لەسەرەتادا دیکتاتۆرانە جوڵایەوە، بەلام نابێ باس لەو راستییەش نەکەین کە هەر ئەو حوکم و ئەو قۆناغە بوو کە سەرەتاکانی بە مەدەنی بوونی هێنایە نێو کۆمەڵگای تورکی. ئەم تورکیایەی کە ئەمرۆ دەیبینین راستە لە رووی هەڵوێست لە گەڵ کورددا حکومەتێکە کە دان بەبوونی نەتەوەی کورد دانانێت، بەلام هەر ئەم تورکیایە لە بەشە تورکەکەیدا کۆمەڵگایەکی شارستانی و پێشکەوتووە کە بە هیچ شێوەیەک نکۆڵی لێ ناکرێ.

ئەمەی ئەمرۆ لە تورکیا هەیە تەجرەبەیەکی نوێیە بۆ بەمەدەنی کردنی کۆمەڵگای رۆژهەلاتی و، کردنەوەی دەرگا داخراوەکانی کۆمەڵگای رۆژهەلاتی بەسەر تەکنۆلۆژیا، پێشکەوتن، دیموکراسی سیاسی و تەنانەت پێرەوکردنی بەشێکی زۆر لە مافەکانی مرۆڤ بە تایبەت بە بەشداری پێکردنی ئافرەت لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و...هتد.

تورکەکان بە فرێدانی بەشێکی زۆر لەو دابونەریتانەی کە رێگر بوون لە بەردەم پێشکەوتنیان، توانیان لەچاو ولاتانی دەوروبەریاندا بگەنە ئاستێکی وەها کە بەهیچ شێوەیەک لە گەڵ ئاستی دواکەوتوو و لەپاشی ولاتانی دەوروبەردا بەراورد ناکرێ. تورکیا لە رووی سیستەمی کۆمەلایەتی و سیاسی[بۆ تورکەکان] ، بازاڕی ئازاد، نزیکبوونەوە لە ئەوروپا، گەلێ هەنگاوی مەزنی هاویشتووە و گەلێ قۆناغی لە رووی مەدەنییەتەوە بڕیووە کە لە ولاتانی دەوروبەر و تەنانەت لە نێو ئێمەی کوردیشدا، ئەو قۆناغانە بەشێکن لە بەرنامەی سیاسیی بزووتنەوەی سیاسی بۆ گۆرانکارییەکان. ئەمە ئەوە دەردەخات کە تورکەکان لە پێشەوەن، بۆیە دەبێ ئەم لەپێشەوە بوونە بەدوور لە بەرچاوتەنگیی نەتەوەیی دیراسەت بکرێ و، لایەنە ئیجابییەکانی لێی بکۆڵدرێتەوە. بۆیە بۆ تەواوکردنی زانیارییەکان، پێویستە خوێنەر قۆناغەکانی پێش وپاش ئەو سەردەمەی کە ئەم کتێبە باسیان لێوە دەکات بخوێنێتەوە.

ئەو کەموکورتییەی کە ئەمرۆ بەرۆشنفکری کوردەوە دیارە ئەوەیە کە راستە رەنگبێ مێژووی جیهان بزانێت، بەلام بەوردی مێژووی رۆژهەلات و ئەو ناوچەیەی نەخوێندۆتەوە کە خۆی تێیدا دەژییەت. بۆیە دیسان پێویستە لە رووی وەرگێرانی مێژووەوە بایەخێکی یەکجار زۆر بە مێژووی گەلانی دەوروبەر بدرێت.

لە کۆتایشدا ئەوەندە دەڵێین: راستە هیند و پاکستانییەکان لە دژی دەسەلاتی کۆلۆنیالیستییانەی بەریتانیاییەکان دەجەنگان و بە سەربەخۆیی ولاتەکانیان خوێنیان دەبەخشی، بەلام ئەوە قەت بە مانای ئەوە نەبوو کە ئەوان نکۆڵی لە فەرهەنگ، مێژوو، کلتور و مەزنیی بەریتانیاییەکان بکەن.

داڕمانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی

١٦٨٣-١٩١٢

# فەسڵی یەکەم

## کۆشکی سوڵتان

لەساڵەکانی نێوەڕاستی سەدەی شانزدەهەم، کە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی لەو پەڕی شان و شکۆی خۆی دابوو و، سنورەکانی لەدەروازەکانی ڤیەنناوە تا یەمەن و عەدەن و لە سنورەکانی ئێرانەوە تا شاری ئۆران لە رۆژئاوای ئەلجەزایر درێژەیان هەبوو و، سوڵتان سلێمان فرمانڕەوایی بەسەر شەش لەسەیرو سەمەرەکانی دنیادا دەکرد، هیچ شارێ لەڕووی شان وشکۆوە خۆی لەقەرەی قوستەنتەنییە نەدەدا و لەنێو ئەو شارەیشدا هیچ جێگەیەک لەدنیادا وەک ئەو دنیا داخراوەی کە لەودیوی (بابی هومایون) بوو و، پێیدەگوترا کۆشکی سوڵتان، نەبوو.
دیوارەکانی ئەم قەڵا مەزنە، بەسەر دەریای مەرمەڕەو کەنداوی داردانێڵ دا دەیانڕوانی و بەو پێنج هەزار کەسە دانیشتووەی نێویەوە، بەشارێک لەنێو پایتەختدا لەقەڵەم دەدرا کە (بابی سەعادەت) ناو جەرگەکەی و، لە هەمانکاتدا حەرەمسەرای سوڵتانیش بوو. واتا ئەو شوێنەی کە سەدان کەنیزەک و کۆیلەی جوانکیلەی تێدا دەژیان و لەلایەن خواجەسەرایانی ورگ ئەستوور و ڕوومەت لۆچاوییەوە، شەو و رۆژ ئێشکەیان لێدەگیرا.
لەو سەردەمەدا، قوستەنتەنییەش بەجوانترین شاری جیهان لەقەڵەم دەدرا. لەو شارەدا کە لەسەر حەوت گردی نێوان گەرووی بسفۆڕ و دەریای مەرمەڕە و کەنداوی داردانێڵ بنیادنراوە، دیمەنی دەریای شین و دارستانە لێژەکانی داری کاج و خانووە یەک نهۆمەکانی گەڕەکی قەرەباڵغی «پرا» هارمۆنیەکی سەیریان خوڵقاندبوو و، دیمەنێکی یەکجار جوانی هەبوو. ئەم شارە شارێکی نێودەوڵەتی بوو و، تێیدا ئۆسقۆفی کەلیسای ئۆرتۆدۆکس لەنزیک تەویلەی سوڵتان کە (٤٠٠) سەر ئەسپی تێدا ڕاگیرابوو، مەراسیمی ئایینیی بەڕێوەدەکرد. لەبازاڕە سەرداپۆشراوەکەیدا(قەیسەری)، یەهودی و عەرەبە مەغربییەکان کە لەدەست ئیسپانیای فەردیناند و ئیزابێل رایانکردبوو و، پەنایان هێنابۆبەر ئەوێ، لەتەک یەکتریدا کاریان دەکرد. لەولای بازاڕ، سربەکان لە گەڕەکێکدا دەژیان کە بەحەسرەتی شارەکەیان نێویان نابوو(بەلگراد).
بەربەر و رەش پێستەکانی ئەفریقاو خەڵکانی کەنارەکانی دەریای سوور،

بەپاسەوانی لەو عەمبارانەوە خەریکبوون ،کە لە رۆخ دەریا بینادنرابوون و دەرمان و عاج و قوماشی ئاوریشمیی هاوردەی ولاتانی دوردەستیان تێدا کۆکرابۆوە.

لەو شـارەدا نـەتەوە و رەگـەزەو نەژادی جـۆراجـۆر لەژێر یاسـا توونـدەکـانـی ئیـمپراتۆرییەتی عـوسـمـانیدا، بەیەکـەوەو، لە ئاشتی و ئارامیدا دەژیان. رەنگبێ یادگارەکانی ئیمپراتۆرییەتی لەدەستچووی بیزانس، کە هێشتا لە شێوەی گۆرەپانی ئەسپ تاودان و کەلیساکانی ئەیاسۆفیا و ئیرنی پیرۆز و عەمباراوی هەزار ستوندا مابوونەوە، لەوبەینەدا رۆڵیان هەبوو. لە کۆڵانە تەنگ وباریک وپڕ لە قوڕو چڵپاوەکانی شـارو، خـانووە بنـاغەسـست و دارینەکانی، کـە بەبڵێسە ئاگرێک ئامادەی رمان و لەناوچوون بوون، دەنگی ژیانی ئەو هاوولاتیانە دەبیسترا کە رەنگی پێستیـان وەک جلەکانیان لێکدی جیاواز بوون، بەڵام دانیشتوانی کۆشکی سوڵتـان کە لەنێو پارکە پانو بەرین و، ئەو ڤێللا شکۆدارانەی کە دەیانڕوانیە سەر دەریاو جەنگەڵە لێژەکانی کاج دا دەژیان، هیچیان نەدەبیست.

کۆشکی سـوڵتـان دنیایەکی داخراو بوو کە لەسـەرانسـەریدا، گومـەزی زێڕین و منارەی نـوک تیـژی بڵـیند هـەبوون و بێـبشـەی دارسنەوبەرەکـان، کـەپر، کـۆشک و ڤـێللاکـانـی بەدیواری مـەڕمـەڕو کـاشـیکراوی رەنگاورەنگ وبریسکەدار، رەونەق و شکۆیەکی تایبەتییان هەبوو.

بێدەنگییـەکی تەواو بەسـەر گـۆلە دەسـتکرد و گـولزارە پڕ لە گـۆلی تێکەڵ بەبۆنی چیمـەنە سـەوزەکان و درەختـەبەردارەکـان و کـۆلە گـولـە رۆزەکـاندا زاڵ بوو و، تەنـها دەنگی سەدان نافورەی نێو حەوزەکان سنوری ئەو بێدەنگییەیان دەبەزاند.

لەنیوەی یەکەمی سەدەی شانزدەهەمدا، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەوپەڕی شان و شکۆو مـەزنی دابوو و، بەر لـەوەی بکەوێتـە سـەرسـەراولیـژی لەنێـوچوون و پارچە پارچەبوون، هیچ پاشـایەتیـیـەک لەدنیـادا خـۆی لەقـەرەنەدەداو، بۆ مـاوەیەکی درێژ حوکـمی بەسـەر بـەشێک لەم دنیـایەی ئەمڕۆدا دەکـرد. هەرچەندە لەو سـەردەمـەدا، ئەوروپاش لـەچەرخی زێڕینی رێنیسـانسـدا دەژیاو لەشـان و شکۆ بێ بەش نەبوو؛ لەوکاتەدا، (ڤایسیلـی ئیڤـانۆڤیچ)ی شازادەی مـەزنی مۆسکو، خـەریکی بنیادنانی بنـاغەی ئیمپراتۆرییەتێکی مەزن بوو، پاپ لیۆنـی دەیەم، شاری رۆمای کردبوو بە (باخـی رۆشنـبیـران)، هانری هەشـتـەم لەبەریتـانیـاو شـارلی پێنجەم کە بەشـارلکن بەنێوبانگ بوو، بەسـەر ئیسـپانیـا و فڕانسوای یەکەم بەسـەر فەرەنسادا حـوکمیـان دەگێڕا.

لەبـاشـوری ئەوروپاش و لە کـۆمـاری ڤـینیـز، کـە بەدەروازەی ئەوروپا بەسـەر رۆژهەلات لەقـەڵـەم دەدرا (گـریتی) کە نازنـاوی دۆچەی هەبوو، فـرمـانـڕەوایی دەکـرد. هێشتا پتر لە سی ساڵ بەسـەر دۆزینەوەی ئەمەریکا لەلایەن کریستۆف کۆڵۆمبسەوە تێنەپەڕی بوو.

ئەوروپا لە خـەوی هـەزار ساڵەی سەدەکانی ناوەڕاست بەخـەبەر هاتبوو و، دەستی کـردبوو بە پێکهـێنانی یەکـەم کـەشـتی گـەلی جـەنگی و بازرگـانی و، یەکـەم سـوپای رێکخـراو و جـێگیـری دروست کـردبوو، کـە دەیانتـوانی لـە گـۆڕەپانەکـانی شـەڕدا

تۆپخانە بەکار بێنن. بەڵام سەرەڕای ئەمە، سوڵتان سلێمان لەگۆڕەپانی شەڕدا بەسەر هەموو ئەو وڵاتانەدا زاڵ بوو و، لەنێوخۆی وڵاتەکەشی دا، بەیارمەتی میعمارە بەناوبانگەکەی کە نێوی (سینان)بوو، بەدرووستکردنی مزگەوت، قوتابخانەو نەخۆشخانەی ئەوتۆوە خەریکبوو کە لەڕووی هونەری بیناسازییەوە خۆیان لە قەرەی کاری وەستا بەنێوبانگەکانی ئەورووپا دەدا.

لەو سەردەمەدا، (مایکل ئانجیلۆ) لەهەوڵی درووستکردنی گومەزی کەلیسای سەنپیێری رۆما بوو و، فرانسوای یەکەمیش دەستی بە نۆژنکردنەوەی کۆنە کۆشکی لۆڤەر کردبوو.

سەرەڕای ئەوەی کە سلێمان سەرکردایەتیی سێزدە جەنگی کردبوو، بواری ئەوەی پەیداکردبوو کە کۆمەڵە یاسایەکی پێشکەوتوو پیادە بکات و راسپێردراوانی گەندەڵی دەوڵەت و، لەوانە یەکێ لە زاواکانی خۆی لەسەر بنەمای ئەو یاسایانە لە سێدارە بدات. سلێمان، وردبینانە ودەست پێگرتووانە، خەزێنەی وڵاتە پان و بەرینەکەی خۆی بەڕێوەدەبردو بەبەردەوامی خەرجییەکانی سوپا پەنجا هەزار کەسییەکەی خۆی دابین دەکرد. حەزێکی بەهێزی بەلای ئەدەبیاتدا هەبوو و، خۆی بە قوتابی ئەرستۆ دەزانی. ئەسکەندەری مەقدۆنی قارەمانی پەسندکراوی ئەوبوو و، لەسەردەمی جەنگدا بیرەوەرییەکانی رۆژانەی خۆی دەنووسییەوە و، لە کاتی ئاشتیشدا شیعری دەگوت.

باڵیۆزی ڤینیز لە قوستەنتەنییە، سوڵتان سلێمان بەپیاوێکی باڵا بەرزی بەژن باریک، کەسایەتییەکی بەسام، نێوچاوانی درێژ، چاوی رەشی کاریگەر، لووتی چەماوەو سمێلی ئەستوور و ریشی دولک ئاسا کە تا رادەیەک دەمی دادەپۆشی، وەسف کردووە. باڵیۆزی نێوبراو دەڵێ رووخساری خۆڵەمێشی بوو و، دەمی بێ بەزەییایەتییەکی پشتاوپشتی پێوە دیاربوو، کابرایەکی زۆر دلڕەق و پابەند بەپیادەکردنی رۆتین و نەریتەکان بوو بەتایبەت لە مەراسیمی نوێژی هەینی کە شەقامەکانی شار پڕ دەبوو لە حەشامەت؛ لەو رۆژەدا سلێمان خۆی بۆ بەشداریکردن لەو مەراسیمەدا ئامادە دەکرد، کە لە مزگەوتی جامیعی ئەیاسۆفیادا بەرپادەکرا. (چۆخەدار) واتا جل راگری سوڵتان، پێشتر جلەکانی ئامادەکردو بەبۆنی عود دەیرازاندنەوەو بۆنخۆشی دەکردن.

سلێمان عەبای ئاوریشمی دەپۆشی، کە یەخەو سەردەستەکانی لە کەوڵی قووزی سپی بوو و، مەندیلە هێلکەییەکەی لەسەردەنا کە تەنیشتەکەی بەدەرزییەکی ئەڵماس پەڕێکی تاووسی لێنداربوو.

ئەسپە سپییەکەشی بەزین و بەرگ کراوی ئامادەبوو.

لەیەکەم حەوشی کۆشکی سوڵتان دا کە درێژی دیوارەکانی دەوروبەری دەگەیشتە (٥) کیلۆمەتر، ژمارەیەک لەپیاوانی دەوڵەت کە دەتگوت لەناو کتێبی هەزارو یەک شەو هاتوونەتەدەر، چاوەڕوانی ئەوەبوون کە خاوەندگاریان سواری ئەسپ بێ و، بەو جادە شۆستەیەی کە بەناو ساختومانە تێکەڵ و پێکەڵە دەوڵەتیەکاندا تێپەڕدەبوو، تێپەڕبێت. لەڕۆژی هەینیدا، لەناو ئەو ساختومانانەدا

هیچ جوڵەیەک نەدەبیندرا، بەڵام لەڕۆژانی دیکەی هەفتەدا حەشامەتێکی نزیک بە پێنج هەزار کەسیان لەخۆوە دەگرت. دوای ئەمە، بەرلەوەی بگەیتە دەروازەی (بابی هومایون)، لەلای راستی نانەواخانەو لەلای چەپی عەمبارێکی ئازاڵە (داری قەڵاشکەری)ی لێبوو، کە دەیتوانی باری( ٥٠٠) کەشتی لەخۆدا جێ بکاتەوە. پاسەوانانی بیور لەسەرشان، کەقژی دەستکردیان لەسەر بوو و، زوڵفەکانیان لاچاویانی دادەپۆشی بۆ ئەوەی چاویان بەو کەنیزەکانەی حەرەمسەرا نەکەوێ کە بۆ داربردن دەهاتن، لەوێ بەرێز وەستابوون.

باڵیۆزی ڤینیز سەبارەت بە کۆشکی سوڵتان نووسیویەتی:« *وابێ دەچوو کە لەساختومانەکەیدا هیچ جۆرە جوانی و هاوئاهەنگیەک بەکار نەبردرابیت*»، بەڵام ئەم باڵیۆزە بەهەڵەدا چووە، چونکە وەک چۆن حەرەمسەرا بەجەرگەی کۆشکی سوڵتان لەقەڵەم دەدرا، ئاوهاش کۆشکی سوڵتان نێو جەرگەی ئیمپراتۆرییەت و شوێنی دانیشتنی سوڵتان و بارەگای دەسەڵات بوو و، تێکەڵەیەک لەساختومانە دەوڵەتی و دەربارییەکانیان پێک دەهێنا. وەک ئەوەی کۆشکی پاشایەتیی باکینگهام لەگەڵ ساختومانە دەوڵەتییەکانی وایت هاڵ تێکەڵ بە یەکدی بکرێن و بیانخەنە نێو پارکێکی دەورەدراوەوە. لەتەنیشت دەروازەی بابی هومایون، نێردراوانی وڵاتانی سەربە ئیمپراتۆرییەت لەچاوەڕوانی بەجێهێنانی رێزو کڕنۆش بردن و پێشکەشکردنی دیارییەکانیان بە (خەلیفە اللە فی الارض) بوون. لەو رۆژە تایبەتییەدا چەند سەرە ئەسپێکی رەسەنی عەرەبی، دووزنجیر فیل، بارێک کەوڵە قووز و سمۆرەی نایاب و گران بەها، زومردێکی بەقەدەر هێلکەی مریشک و گروهێک کیژی سپی پێستی جوانکیلەی چەرکەس پێشکەشی سوڵتان دەکران. لەدوولای رێڕەوی سوڵتان، سەربازانی یەنیچەری کە بەکەسانی هەڵبژاردەی سوپا لەقەڵەم دەدران، بە مەندیلی سپی، ئێلەگی زێردووراو، شەڵواری بەرین و چەکمەی چەرمیی زەردەوە، بەرێز وەستابوون. سوپای یەنیچەری، لەو کوڕە مەسیحییە کەمتەمەنانە پێکدەهات کە ساڵانە لەهەر چوار لای ئیمپرتۆراییەتی عوسمانیەوە کۆ دەکرانەوەو، لە قوتابخانەی تایبەتدا پەروەردەدەکران و رادەهێندران. باڵیۆزە بیانییەکان، بەجلی ئەرخوانیی سیم دوراو، هاوڕێ لەگەڵ ئەندامانی باڵیۆزخانەکانیان لە تەنیشت دەروازەی دیوان کە بەسەر حەوشی دووەمدا دەیڕوانی، لە چاوەڕوانی بەجێ هێنانی رێز و ئیحترام بوون.(١)

دەروازەی نێوبراو چەند بورجێک و گومەزی کەڵلەشەکری شێوەی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوروپاو زیندانێکی لەخۆوە گرتبوو. لەسەر ئەو دەروازەیە هەندێ نێزەیان چەقاندبوون کە سەری براوی کەسایەتییە پایەبەرزەکانیان پێوەدەکردن تا پێش رووناکی خۆر بگرن و لە قوڵتاییەکانی ئەملاوئەولای دەروازەکەش سەری ئەو کەسانە بەسەر نێزەوە دەکرا کە پلەیان لەپاشا کەمتربوو.

وەزیری گەورە، یان سەرۆک وەزیران لەکاتێکدا کە دوو کەسایەتی پایەبەرز بەجبەی کوڵکی لێوار لە کەوڵی قووز دووراو، بەپێنج هەنگاو لەپێشەوە دەڕۆیشتن و گوپاڵە سەر زیوینەکانی خۆیان لەزەوی دەکوتا، گەیشتە جێ. ئەگەر چی هەر ناو

ناوه سـەرۆک وەزیران بەتوندو تیـژی و دڵرەقـیـیـەوە لادەدراو یەکـێکی دیکەی لەجێ دادەنرا، بەڵام ئامـادەبوان بە مـەندیله کـەڵلەشـەکری شـێوەکـەی کە زنجـیـری زێڕ بەولاوئەولایدا شۆڕ ببۆوە، دەیانناسییەوە

نزیکەی هەزار کـەس لە کەسایەتییە کەم پایەخترەکانی دیکە، کە پتر بەدەست و پێگرو زیادە لەقـەڵەم دەدران و لەوانە تاڵ گرەوە، ئەسـتێرەناس و دەروێش، رووبەری حەوشی یەکەمیان پڕکردبوو.

تەباخ باشی، لەکاتێکدا کە کڵاوێکی تیژی بوتڵ شێوەی لە سەربوو و، کەوچکێکی گەورەشـی لەسـەر شـان دانابوو، چەک راگرباشی کە شـمشـێری سـوڵتانـی لەنێو کالانێکی قـەدیفـەی سـووردا راگرتبـوو، راوچی باشی بەکڵاوە قـۆچ شـێوەکـەی کە لەزێری بێگەرد درووسـتکرابوو، بەرپرسـانی بۆن و بەرامـەکـانی سـوڵتـان، راسـپـێردراوانی پارێزگـاریکردن لەبولبـول و کـەنارییـەکان و پاسـەوانی بـازو باڵندە شکارییەکان، لەناو ئەم کۆمەڵە حەشامەتە دادەبیندران.

ئەوکـاتە باوی ئەوەبوو دور وگـەوهەری بریسکەدار بە مـەندیل و کـالانی شمشێرەکانەوە بکەن و پەڕی وشترمر لە کڵاوەکانیان وەبدەن و جلی زێڕدووراو و شـەڵواری فش و جبـەی ئەتڵـەس بەسـەردەسـتە و یەخـەی لە کـەوڵە سـمـۆرەو قـووز بپۆشن. هەمـوو کـەس، بەبێ سێ ودوو دەیتـوانی دراوسـێیـەکەی خۆی لەرێگەی ئەو جلانەوە بناسێ کە بەپێی یاسا لەسەری بوو بیکاتەبەری. بەپێی ئەم یاسایانە شێوەو رەنگی مـەندیل و سـەردەسـتـەو یەخـەی پیـاوان دیاریدەکرا. بۆ نمونە وەزیرەکـان مەندیلی سـەوزو موفتییـەکان (پیاوانی ئاینیی) مەندیلی سپی و راسپێردراوانی نێو دەربار مەندیلی سوور و شێخەکان (دادوەران) مەندیلی سپییان لەسەر دەنا.

لەسـەرووی هەمـوو ئەو کـەسـایەتیـیـە پایەبەرزانە، پیـاوێک هـەبوو کـە جگە لەشـەخسی سوڵتان، ئەوانـی دیکە هەمـوو لێـیـدەترسـان و ئەو کـابرایەش سـەرۆکی خواجە سـەرایانی حەرەمسـەرا،یان قـزڵەر ئاغا (ئاغای کـچان- وەرگـێر) بوو. ئەم کابرایە دەسـەڵات و سـامـانێکی زۆری هەبوو و، تەنـانەت رێگەی پێدرابوو کە هەندێ خـوڵام و نۆکـەری هـەبێت؛ چـونکە ئەو کـابرایە، بەرێوەبەرو چـاودێری خـەرجـییـەکانی حەرەمسەراو تاکە رێگەی پەیوەندیی حەرەمسەرا بەدنیای دەرەوەوە بوو.

پیـاوێکی نـاحـەز و خـەسـێندراو بوو. هـەیکـەل و قـیـافـەیەکی ترسـناکـی هـەبوو و، بەجلە رەسـمـییـەکانی خۆی، کەبریتی بوون لە کراسـی ئاوریشـمـی گوڵدار، پشـتێنی پان و جبـەیەکی یەخـەوسـەردەسـتـە لە کـەوڵی قـووز دووراو کە شـاقـەلەکانی لەزەوی دەخشـان و، کڵاوێکی بـەقەدەر کـاسـەیەکی نەباتی گـەورەکە درێژییـەکەی دەگەیشـتـە (٦٠) سـانتی مـەتر، لەتەنیشت دەروازەی (بـابی سـەعـادەت) وەسـتـابوو. وێڕای ئەو هەموو کەش و فشـە، قزڵەرئاغا لەهەرەتی لاویەتیدا، لەلایەن کۆمەڵێک کۆیلەفرۆشەوە لەیەکـێک لە لادێیـەکـانی ئەفـریقـا رفـێندرابوو و، دواتر خـەسـاندبوویان و بـەچەند پیاسترێک وەک خوڵام و نۆکەر فرۆشـتبوویان و سـەرەڕای ئەو هێزو دەسەڵاتەیش کە لەنێـو حـەرەمسـەرو دەرباری پاشـادا هەیبـوو، پیـاوێکی گـەندەڵ و نەخـوێندەوارو تووندوتیژبوو. بەهۆی ئەو نوقسانیەی کە لەخۆیدا شک دەبرد، بەشێوەیەکی مەترسی

دار هەوەسبازبوو.
لەکاتێکدا کە ئەفسەرانی پایەبەرزی کۆشکی سەڵتەنەت ؛ کلیلدار باشی، مەتیەرباشی، مەندیل دارباشی و چەک راگرباشی وجل راگرباشی، سلێمانیان لەنێوخۆیان گرتبوو، سوڵتان لەکۆشک هاتەدەر. لەدەوروبەری سوڵتان گروپێک سەرباز بە بەکاربردنی شێوازێکی ساکار، واتا بە لەسەرنانی کڵاوی پەڕ درێژ، سوڵتانیان لە نیگای خەڵکی دەپاراست و بەقەولی باڵیۆزی ڤینیز: *« ئەوان حاڵەتی پەردەیەکی تەنکیان هەبو، کە لە پشتییەوە تەنها بۆ ساتێک مەیسەر بوو روخساری جیدی و عەبووسی سوڵتان ببیندرێت.»*
ورده ورده کەژاوەی سوڵتان بەدەنگی شەیپور و هاواری جارچیان، لە دەروازەی بابی هومایون تێدەپەڕی و دەچووە نێو شەقامە قەرەباڵغەکانی شارەوە. دوو خولامی منداڵکاری ئەسپ سوار لەپێش کەژاوەی سوڵتانەوە دەڕۆیشتن و دوو مەندیلی سوڵتانیان بەدەستەوە گرتبوو و، نیشانی ئەو خەڵکەیان دەدا کە لەو لاو ئەم لای شەقام بەڕێز وەستابوون . مەبەستیان لەم کارە ئەوەبوو کە سوڵتان لەکاتی گەیشتنی بۆ مزگەوت یەکێک لەم دووانە سەردەنێ، بەڵام زۆرینەی خەڵک ئەم کارەیان بەجۆرێک لەدەربڕینی دڵنەوایی لەلایەن سوڵتانەوە لێکدەدایەوە.
کاتێک کە سوڵتان بەسەربازانی یەنیچەرییەوە گەیشتە مزگەوت، چەکمەکانی داکەندو لەجیاتیان جوتێ پێڵاوی قەدیفەی کردەپێ؛ چونکە هیچکەس بۆی نەبوو بەپێڵاوەوە بەسەر ئەو فەرشانە بکەوێ کە موسڵمانەکان نوێژیان لەسەر دەکرد. لەوکاتەدا سلێمان لەو پەیژەیە بەسەرکەوت کە دەگەیشتە ئەو ژوورە تایبەتییەی کە بۆ نوێژی سوڵتان دیاریکرابوو و، سەرتاسەریشی بەگوڵ و میوە رازێندرابۆوە.
کاتێ کە مەراسیم کۆتایی پێهات، سوڵتان وەک چۆن هاتبوو ئاوهاش گەڕایەوە کۆشکەکەی تا بەشداری لەمیوانداریی پرشکۆی نانی نیوەڕۆی رۆژی هەینیدا بکات. پتر رۆژانی هەینی میوانان رێگەیان پێدەدرا تا لەگەڵ سوڵتاندا لەسەر یەک مێز نان بخۆن. تەنانەت مێزەکانی خواردنی هانری هەشتەمی پاشای بەریتانیا، کە بەسێ ساڵ لە سلێمان گەورەتربوو، خۆیان لە قەرەی خۆراکە رەنگاورەنگ و جۆراوجۆرەکانی سەر مێزی سوڵتان نەدەدا، کە خۆی لەنزیک بە پەنجا جۆری جیاوازدەدا و بەهۆی دووسەد خزمەتکاری جلی ئاوریشمی سوری یەکدەست لەبەر و کڵاوی سیم دووراو لەسەرەوە دەگەیەندرایە سەر سفرە. ئەم دووسەد کەسە، لە مەتبەخەوە تا هۆڵی نانخواردن بەڕێز وەستابوون و ئامادەی خزمەتکردن بوون.
کاتێ کە میوانان دەگەیشتنە ئەو هۆڵی نانخواردنەی کە فەرشی گرانبەهای لێراخرابوو و، دیوارەکانیشی بە پەردەی زێر دووراو رازێندرابۆوە، خزمەتکارە لاوەکان، دەست لەسەر ئەژنۆ، تا بۆیان کرابا دادەهاتنەوەو کڕنۆشیان بۆ دەبردن و بەخێریان دەهێنان. دواتر میوانەکان لەسەر سفرەیەکی گەورە، کە رووپۆشێکی زیوینی لەسەربوو، دادەنیشتن. دەفرەکانی خواردن کە سەرپۆشێکی لبادی رەشی لێوار سپییان لەسەردانرابوو، دەست بەدەست دەگەڕان تا دەگەیشتنە بەردەم سوڵتان و میوانە پایەبەرزەکانی، کە لەلای سەرەوەی سفرەکە دانیشتبوون. تەنها

گۆشتی ئەو ئاژەڵانە دەخورا کە بەنێوی خواو بەشێوەی ئیسلامی سەربڕابوون. بەو مانایەی کە قورگی ئاژەڵەکە بەشێوەیەک ببڕدرێت کە قورگ و دەماری ملی بەتەواوەتی ببڕدرێت. هەرکە نان خواردن کۆتایی پێدەهات، دەفری بەتاڵیان لەکاتێکدا لەسەر پۆشەکەی هەڵگەڕێندرابۆوەوە، دەگەڕاندەوە.

خواردەمەنی و خۆراک لەچوار لای ئیمپراتۆرییەتەوە دەگەیشتە قوستەنتەنییە؛ خورما و هەڵوژەو تەماتە لەمیسرەوە، هەنگوین (کە لەجیاتی شەکر بەکاردەهێندرا) لەدوورگەی کێرت، رۆن لەیۆنان و رۆنەکەرەش کە لە پێستە دابوو، لەرۆمانیاوەو لەرێگەی دەریای رەشەوە دەگەیشتە قوستەنتەنییە. سەدوپەنجا چێشت لێنەر لە (١٠) مەتبەخی گەورەی گومەزداردا، ئارەقە رێژان خەریکی لێنانی گۆشتی دوو سەد سەر مەڕبوون، کە خواردنی سەرەکیی ئەم میوانداریيە بوو. نانخواردن زۆربەی کات بەخواردنی هەڵقوم کە بەشیرنەمەنیی بەتام و دڵخوازی تورکەکان لەقەڵەم دەدرا، کۆتایی پێدەهات.

لەگەڵ نان خواردن مەشروباتی روحی نەدەخورایەوە، بەڵام جۆرەها شەربەتی رەنگاورەنگ کە لە پێکی پڕ لە بەفرو سەهۆڵ کرابوون، هەناوی میوانەکانیان فێنک و دەمیان شیرین دەکردن. بەفرو سەهۆڵی نێوبراو لە کێوەکانی ئۆڵۆمپی یۆنانەوە دابین دەکراو، بەسەر پشتی کەرەوە تا مودانیا کە کەوتبۆ سەر لێواری دەریای رەش دەهێندراو، لەوێشەوە بەکەشتی دەهێندرایە قوستەنتەنییە و لەچاڵە بەفرە سرووشتیەکاندا دەپارێزرا.

نیرۆنی ئیمپراتۆری رۆمیش خواردنەوەکانی خۆی بەم شێوەیە فێنک دەکردەوە.

هەزاران کەس لە خزمەتکارانی بچوک ئامادەی بەجێهێنانی بچوکترین خواستی سوڵتان بوون. باخەوان باشی کە کاری میرغەزەبیشی لەئەستۆبوو،سەرکردایەتیی گروهێکی هەزار کەسیی باخەوانانی دەکرد، کە لە کڵاوە لولەک شێوەکانیانەوە بەئاسانی دەناسرانەوە. سەد خۆشنووسی دەربار لە بورجی خۆش نووساندا بەدرێژایی رۆژ خەریکی نووسینەوەی بڕیار و فرمانەکانی سوڵتان بوون کە لەسەر کاغەزی رەنگاورەنگ دەنوسران. هەریەک لە گروهە خزمەتگوزارییەکان ژووری تایبەتیی خۆیان هەبوو؛ لە (٦٠) بەرپرسی راخستنی فەرشەکانەوە بگرە تا (٢٠٠) راسپێردراوی پاراستن و پاسەوانیکردن لە بازەشکارییەکان و (٥٠) شیرینی دروستکەر و ٢٠٠ نانەوا، کە بەکردنی نانی تایبەت بۆ سوڵتان لەئاردی سپی بۆرسەو شیرەوە خەریکبوون، هەر هەموو ژووری تایبەتیی خۆیان هەبوو. هەرکەس بەپێی کارەکەی خۆی رۆژانە بەشە نانی خۆی دەدرایە. بۆ نمونە بەشی هەر پاشایەک دە نان بوو، بەڵام جۆری نانی چینە ناوەندەکان هێندە باش نەبوو؛ چونکە ئاردی سپی بۆرسەیان لەگەڵ ئاردی ناوەندیی یۆنان تێکەڵ بەیەکدی دەکرد و دەیان دانێ، لەکاتێکدا کە فەراش و خزمەتکارەکان تەنها نانی بۆری یۆنانیان دەدرایە.

نانی باش بەرادەیەک لەناو عوسمانیەکاندا بایەخ و بەهای هەبوو کە نانەواکانی قوستەنتەنییە مزگەوتی تایبەتی خۆیان هەبوو و،ساڵی جارێکیش وەک پاداشت دەستێک جلوبەرگیان دەدرایە.

* * *

بێگومـان کـاتێ مـەراسـیـمی نوێژی هـەینی تەواودەبوو، سلێـمـان دەحـەسـایەوە. هـەرچەندە کـە ئێمـە نازانین پاشماوەی کاتەکەی چۆن بەسـەر دەبرد، بەڵام پێدەچوو لەبەرئەوەی رۆژانی هـەینی دیوانی هومایونی(٢) پێک نەدەهێندراو کۆ نەدەبۆوە، لای دەرەوەی بەجێ بێـڵـێ کـە هیـچ ئافـرەتێک مـافـی ئەوەی نەبوو پێی تێ بنێ و رووی دەکردە حـەرمسـەراوە کە تەنهـا سولْتان و خواجـەسـەرایان رێگەیان پێدرابوو بچنە ئەوێوە.

لەپێنج دەرگـای گـەورەوە رێ بۆ حـەرەمـسـەرا هـەبوو، بەڵام دەرگـای سـەرەکی کـەوتبۆ حـەوشـی دووەمی پشت سـاختـومـانـی دیوانەوە. هـەروەهـا دەکـرا لە حـەوشـی سێیەمیشەوە بچیتە نێو حەرەمسەراوە.

دیمەنی ئەم حـەوشەیە جیاوازییەکی تەواوی لەگەڵ فەزای نیمـچە رەسـمیی حـەوشـی یەکـەم و دووەمـدا هـەبوو؛ چونکە لەوێ، واتا لـەودیوی دەروازەی (بابی سـەعـادەت)، لەپڕێکا هـەموو شـتـێ دەگۆڕاو حـەوشـە بەبەرد فـەرش کراوەکـان کـە لە کـارمـەند و خزمـەتکارەکـان جـمـەیان دەهـات، جێی خـۆیان دەدا بەباخـێکی بەرین کە کـۆشکی سـولْتـان بەدیوارە مـەرمـەڕو پەردە زێڕدووراوەکـانییـەوە، کـەوتبـۆ ناوەڕاسـتـیـەوە. لە کۆشـەیەکی حەوشـی سێیـەمـەوە دەرگایەک رووەو جادەی زێڕین دەکرایەوە کە تاکە رێگەی پەیوەندیی نێوان دنیای پیاوان و دنیای ئافـرەتان بوو و، ئەویش بریتی بوو لە دالانێکی سـەر داپۆشـراو کـە لێـوەی دەچوونە ژوورەکـانـی شـازنی دایک و ئەو کـەنیـزەکـانەی کـە گـەیشـتـبوونە پلەی هاوسـەری سـولْتـان. هـەروەهـا مـزگـەوتی حەرەمسەراش هەر لەسەر ئەو دالانەوە بوو.

حـەرمسـەرای سولْتـان ساختومانێکی هێندە گەورە نەبوو و، بگرە لەچەند ڤیللا و کۆشکێکی بچوک بچوک پێکدەهات کە هـەندێکیان تارمـەی پڕ لەگـوڵ و باخـچە و کۆچک و هەیوانیان هـەبوو و بەبێ ئەوەی لەپێشـترەوە نەخشـەی بۆ داڕێژرابێ، تا داوێنی گردەکان و لەوێشـەوە تا لێواری دەریا درێژەی هـەبوو. لەدەوروبەری کۆشکی گرنگترین ئافرەتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، واتا شـازنی دایک، یان *(سـولْتـان والیدە)* بنیادنرابوو.

شـازنی دایک، فرمـانڕەوایی بەسـەر حـەرەمسـەراو چارەنووسی ئیمپراتۆرییەتی عوسـمـانیدا دەکرد؛ چونکە سـولْتـان دەیتوانی سـەدان ژنی مـارەکراوی هـەبێ، بەڵام نەیدەتوانی پتر لە دایکێکی هەبێ و پێغەمبەری ئیسلامیش گوتبووی (بەهەشت لەژێر پێی دایکان دایە).

کـاتێ کـە سلێـمـان لەسـەر تەخـتی پاشـایەتی دانیـشت، شـازنی دایک بەڵێنی وەفادارای و هـاوکاری لەتەواوی ئەندامانی حـەرەمسەرا وەرگرت و پێگەو دەسـەڵاتی خـۆیشی پتـەوکـرد. تەنانەت هـاوسـەرەکـانی سـولْتـانیش مـافی ئەوەیان نەبوو بەبێ مۆڵەت وەرگرتن، یـان وەرگرتنی کاتی چاوپێکەوتنی لەپێشـڕا دیاریکراو،شازنی دایک ببینن و گەورەترین خاتون یان خۆشەویستیرین ژنی سولْتـان نەیدەتوانی لە بەرامبەر ئەودا بەبێ جلی شیـاو وبەجێـهێنـانی نەریتی دیاریکراو بوەستێ و، لەسەری بوو کە

دەستەکانی لەسەرسینگ دانێ ویێی بڵێ *«تاجی سەری ئافرەتانی حیجاب دار»*.
لەسەردەمی کۆنەوە، کە حەرەمسەرا وەک حەساوگەیەک بۆ ئەو جەنگاوەرانەی کە هێندە بە کاروباری جەنگ وسیاسەتەوە خەریک بوون و بواری ئەوەیان نەبوو بەژنەکانیان رابگەنی لێهاتبوو، زنجیرە یاساو نەریتێکی ورد و رێکوپێکی تێدا پیادە دەکرا. جەنگاوەرانی نێوبراو کە ناچار بوون بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لەماڵەکانیان دووربن، ساناترین رێگەی زیندانیکردنی ئافرەتەکانیان لەوەدا دۆزیبۆوە کە بیان سپێرنە دەست خواجەسەرایان و لەحەرەمسەرادا نیشتەجێیان بکەن. دواتر ئەم رێگە ساناو بە سوودە بەشێوەیەکی پلە بەندکراوی پڕ لەرۆتین، لەکۆشکی پاشایانیش پیادەکرا. ئەم پلەبەندکردنە لە نزمترینی ئەو کەنیزەکانەوە کە دەیان لەژورێک دەنووستن و بەهیوای ئەوەبوون کە بەڵکو رۆژێک بتوانن سەرنجی سوڵتان بۆلای خۆیان راکێشن، دەستی پێدەکرد و تا ژنە قەمپاتمەکان، کە بۆ ماوەیەکی کورت سەرنجی سوڵتانیان بولای خۆیان راکێشابوو، بەلام کە منداڵیان نەبیوو وەلاوەنرابوون درێژەی هەبوو و، لە هاوسەرانی رەسمیی سوڵتان، کە ژمارەیان سنورداربوو و بەخێرایی دەکەوتنە بن دەستی (سوڵتان والیدە)وە، کۆتاییان پێدەهات. هاوسەرانی رەسمی سوڵتان پێیان دەگوترا *«سوڵتانە»*(٣)و لەبەر ئەوەی کە منداڵیان ببوو، خانووی تایبەتی و خزمەتکاری خۆیان هەبوو. ژمارەی ئەم ئافرەتانە پتر چوار دانەبوو کە (کوڕ)یان ببوو و، داوتر مامانی کۆشک منداڵەکانی دیکەی لەبەردەبردن.
لەنێوان ئەم چوار سوڵتانەیەشدا رکابەری و مافی لەپێش بوونێکی تووند بەرقەراربوو کە هیچ کامێکیان تەنانەت ئەو ئافرەتەیان کە خاتوونی عەزیزو خۆشەویستی سوڵتانیش بوو، نەیدەتوانی لەسەرووی ئەو ئافرەتانەوە بێت کە بەر لە ئەو منداڵیان ببوو.
هەموو ئەو ئافرەتانە لەسەرەتادا وەک کەنیزەک هاتبوونە نێو کۆشکی سوڵتانی عوسمانییەوەو، دواتر بەبڕینی پلەکان گەیشتبوونە پلەی هاوسەریەتی سوڵتان و بەم پێیە دەتوانین بڵێین سەرجەم سوڵتانەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی کوڕی ئەم کەنیزەکانە بوون.
وردە وردە رۆتینی نێو حەرەمسەرا پەرەی سەند و تەنانەت گەیشتە خەوگەی سوڵتانیش؛ ئەو کارانەی کە بۆ هەڵبژاردنی ئافرەتێک دەکران کە تەنها یەک شەو لەگەڵ سوڵتاندا دەنووست، بۆ خەڵکی خوێنگەرم و کەم تەحەمول زۆر ناخۆش بوون. لەبەر ئەوەی کە لەقۆناغی یەکەمدا دەبوایە سوڵتان فرمانەکانی دایکی جێبەجێ بکات تا رێگەی پێ بدات کە کەنیزەکە جوانکیلەکان بەبەردەمی دا تێپەڕن.هەرکاتێ یەکێک لەو کەنیزەکانە سەرنجی سوڵتانی رابکێشابایە، ئەوا بەئیشارەتێک لەڕیز دەریاندێناو دوای ئەمەش چەندین کاتژمێری پێدەچوو تا ئەو کیژەیان بۆ نووستنێکی یەکشەوە لەگەڵ سوڵتاندا ئامادە دەکرد؛ سەرەتا دەیانبردە حەمام و کوڵێکی باشیان بۆ دەکرد و جوان دەیان شێلاو، ئەم کارەیش پتر بەدەستی تاقمە کچێکی جوانکیلەی نێو حەرەمسەرا بەئەنجام دەگەیشت. دواتر تەواوی تووک و مووە

زیادەکانی لەشی کچەیان هەڵدەکەند، بۆدرەو رۆنی بۆن خۆشیان لەلەشی دەسوو، نینۆکەکانیان رەنگ دەکردو سەرتاپای لەشی کچیان بەبۆن وبەرامی وا دەرازاندەوە کە مرۆڤیان پێ مەست دەبوو. بۆ ئەو جێگەیانەش کە عارەقەی دەکرد، خەنەیان بەکاردێناو چاویشیان پڕ لە کل دەکرد.

بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە سوڵتان خاوەنی جوانترین کەنیزەکەکانی ئیمپراتۆرییەت بوو، دەبوایە ئەم کارە زۆر نەخایەنێ و زوو لە رازاندنەوەو جوان کردنی کچە ببنەوە؛ کەچی وانەبوو و، ئەم کارە زۆری دەخایاند. کاتێ کچێکی دەست لێنەدراویان دەنارده ژووری نووستنی سوڵتان، ئافرەتانی حەرەمسەرا بەگەرم و گوڕییەوە تابەیانی لە پشت دەرگەی ژووری نووستنی سوڵتان کۆدەبوونەوەو دوو مۆمی گەورەی بەژن ئاسا تا بەری بەیانی لە ژووری نووستنی سوڵتاندا دادەگیرسێندران. زۆربەی کات، سوڵتان زووتر دەچۆ سەر جێگەو لەگەڵ گزنگی بەیانیشدا لەجێ دەردەچوو و دەچووە گەرماوەوە؛ چونکە بەپێی یەکێ لەفەرموودەکانی پێغەمبەری موسڵمانان پاکوخاوێنی لەباوەڕەوەیە.

گەرماوی تایبەتی سوڵتان لەسێ ژوور پێکدەهات کە دیوارەکانی هەرسێکیان لەبەردی مەڕمەڕ بوو. ژووری یەکەم ئەو شوێنە بوو کە جلیان لێدادەکەندو، دیوارەکانی قولابەو قولفەی زێڕی بەمرواری رازێندراویان لێداکوترا بوو بۆ ئەوەی جلیان پێدابکرێ.

ژووری دووەم واتا سەرشۆر، تەنانەت لەسەردەمی سوڵتان سلێمانیشدا زۆر مۆدێرن بوو و زۆر بە بانیۆکانی ئەمڕۆ دەچوو؛ بەو جیاوازییەی کە لە دوولای ژورەکە، کۆسپ وسەکۆ بۆ دانیشتن وپاڵپشت دروستکرابوو. ئاو لە لەگەنێکی مسی دا کە لەژێر حەمامدا دانرابوو گەرم دەکرا و تەنها ئاوی زوولاڵی کانیاوی تێدەکرا.

کاتێ کە سوڵتان خەریکی خۆ شوردن بوو، کچە لاوەکە جلو بەرگی سوڵتانی دەپشکنی و چی لە گیرفانەکانیدا دۆزیبایەوە، بۆ خۆی هەڵدەگرت و ئەمەش لەلایەن سوڵتانەوە رێگەی پێدرابوو تا هاوسەرانی یەک شەوەی چییان مەبەست با لەگەڵ خۆیاندا بیانبردبایە.

ئەوجا مێژوو و کاتی خەوتنی کیژەکە لەگەڵ سوڵتاندا بەوردی لە دەفتەرێکدا تۆمار دەکرا؛ بۆ ئەوەی ئەگەر دوای نۆ مانگ منداڵێکی بووبایە جێی هیچ گومان و شوبهەیەک نەبێ. دواتر کچە دەگەڕێندرایەوە ژوورەکەی خۆی و ئەگەر نەیتوانیبا کوڕێکی ببێت ، ئەوا رەنگبوو هەرگیز نەتوانێ جارێکی دیکە بە دیداری سوڵتان شاد بێتەوە.

ئەم مەراسیمە بەلای خاتوو ( *فرانسیس ئەلیۆت* )ەوە هێندە جوان و شاعیرانە بووە، کە لە کتێبی «*بیرەورییەکانی ئافرەتێکی بێکار لە قوستەنتەنییەدا*» نووسیویەتی: «*دەبوایە قزلەر ئاغا؛ ئەو خولامەڕەش و قەڵەوەی کە سەرتاپای لەشی لەژێرو ئاڵتوونی جۆراوجۆرگیرابوو و لەکاتی رۆیشتندا وەک زەنگوڵە دەنگیان دەهات، ببینی کە چۆن سەرپەرشتی کاری خواجەسەرایانی دەکرد. یەکێ لە خواجە سەرایان تاقمە شازادە خانمێکی بەرەو کلاسەکانی وانە گوتنەوە رێبەری دەکرد،*

*یەکێکی دیکەیان (شاژنی دایک)ی، کە حیجابی ئیسلامی پۆشیبوو و رووخساری نەدەدیتراو کۆمەڵە کەنیزەکێکی بەدواوە بوو، دەبرد لای کوڕەکەی (سوڵتان). نەفەری سێیەمیان سوڵتانەی ئەوڕۆژی رووەو حەمام دەبرد و چوارەمینیان چاوەڕێی هاتنی کیژۆڵەی جوانی دیکە بوو تا رێو شوێنی ژیانی نێو حەرەمسەرایان فێر بکات. ئەم کیژە تازەبابەتانەش بۆ ئەوە بوون تا هەر کاتێ سوڵتان لە ئەوانەی نێو حەرەمسەرا بێزار بوو، ئەوا هی تازەی بنێرنە باوەشەوە.*

*ئەم کچانە پتر ئەلبانی،یۆنانی، چەرکەسی و گورجی بوون کە جاری واهەبوو وەک دیاری پێشکەشی سوڵتان دەکران و سەردەمێک لەلایەن چەتەو رێگرانەوە دزرابوون، یان لەبازاڕەکانی کۆیلە فرۆشیی ئاسیا کڕدرابوون. هەموویان سوور و سپیاویان کردبوو و، جلی سەرنجڕاکێشیان پۆشیبوو. لەم دنیا ئەفسووناوییەدا خواجە سەرایان دەسەڵاتیان بەدەستەوەبوو و، بەڕادەی پەرستن سوڵتانیان کە چەند ساڵ جارێ دەگۆڕدرا، خۆش دەویست.»*

بەڵام لەڕاستیدا، دیمەنی شاعیرانەی ئەو کەنیزەکە جوانکیلەو بۆنخۆشانەی کە پاڵیان دابووە بالیفە ئەتڵەسەکان، پڕبوو لە خەم و دەرد، جگە لەوانەی کە شانسیان هەبوو و، توانیبوویان سەرنجی سوڵتان بۆلای خۆی راکێشن، ژیانی ئەوانی دیکە لەسەریەک شێوەو پڕبوو لە دووبارەبوونەوە. هەندێکیان بەشدارییان لەپیلان و نەخشەکاندا دەکرد و تەنها ژمارەیەکی کەمیان کەبەپەنجەی دەست دەژمێردران و لەوانی دیکە بەرزەفڕتربوون، دەرفەتی ئەوەیان پەیدا دەکرد کە لاقیان بگاتە ژووری نووستن و باوەشی سوڵتان. ژیانی بێ پیاوی و بێبەش بوونیان لەزۆرشتی پێویست دەبووە هۆی پەیوەندی جنسی تایبەت لەنێوانیاندا و تەنانەت جاری واهەبوو عەشقبازییان لەگەڵ خواجەسەرایاندا دەکرد؛ بۆیە هەر ناو ناوە حەکیمی کۆشک ناچاربوو بەوردی خواجەسەرایەکان بپشکنێ تا دڵنیابێ لەوەی کە خەساون و پیاوەتییان تێدانەماوە. وێڕای خواجەسەرایان، خوڵامە منداڵکارەکانی حەرەمسەراش جێی سەرنجی ئافرەتانی حەرەمسەرابوون؛ ئەو هەرزەکارو مێرد منداڵانە بەوردی پەروەردە کرابوون و هەمیشە جلی ئەتڵەسی بریسکەداریان دەپۆشی و ناوی لەبابەت گوڵەسوورە، مێخەک،سونبول و نێرگزیان لێنابوون.

رەنگبوو خواجەسەرایان و مێرد منداڵان توانیبێتیان تاڕادەیەک ئارەزووەکانی ئافرەتانی حەرمسەرا دابمرکێنن، بەڵام ئەوان پتر ئاسانترین وباوترین رێگەیان هەڵدەبژارد کە بریتی بوو لە هاوجنسبازی و دوو ئافرەت یەکترییان دادەمرکاند.

( *ئۆتاویانوبۆن*)ی باڵوێزی ڤینیز لە قوستەنتەنییە، باس لە «کچە لاوە دڵڕفێن و هەوەسبازەکانی حەرەمسەرا» دەکات و نووسیویەتی: « *هیچکەس مافی ئەوەی نیە کەرەستەی خۆ راحەت کردنیان بخاتە بەردەست. بۆ نموونە کاتێ حەزیان لەخواردنی خەیار بێت، ئەوا خەیارەکەیان بەوردکراوی دەدەنێ نەبادا بەخەیاری ساغ خۆیان راحەت بکەن.*»

ئافرەتانی حەرەمسەرا،کە هەرلەبنەڕەتدا لەژیانی ئاسایی بێبەش بوون، ئەودەمە ژیان تەنگی پێ هەڵدەچنین و نارەحەتییان دەگەیشتە لووتکە، کە ئاغاو خاوەنەکەیان

دەمرد، یان لەسەڵتەنەت لادەدرا. لەو کاتەدا سوڵتانی نوێ دەستبەجێ تەواوی ئەو کەنیزەکانەی کە هی سوڵتانی بەر لە خۆی بوون، دەنارده کۆشکێکی دوور کە پتر بەشوێنی حەسانەوەی ئافرەتە خانەنشینکراوەکان دەچوو تا کۆشک؛ تورکەکان پێیان دەگوت :(کۆشکی فرمێسک). جاری واش هەبوو سوڵتانی نوێ یەکێک لە خاتوونەکانی پێشووی بەپاشایەکی خۆشبەختی جێی سەرنجی خۆی دەبەخشی، بەڵام ئەوانی دیکە مەجبوربوون رۆژانی دیکەی تەمەنیان لەوپەڕی نائومێدی و بێ هیواییدا بەسەربەرن.

* * *

حەرەمسەرای سوڵتان سلێمانی خاوەنشکۆ، (٣٠٠) کەنیزەکی تێدابوو کە لە کۆمەڵە ساختومانێکی تێکەڵو پێکەڵدا دەژیان. هەریەک لەم کچە لاوانە فێری ئەوەکرابوون کە چیبکەن بۆ ئەوەی بتوانن ببنە جێی سەرنجی سوڵتان و هەمووشیان شانازییان بەوەوە دەکرد کە توانیبوویان لەگەڵ سوڵتاندا بخەون.
لەگەڵ ئەوەشدا حەرەمسەرا گرفتێکی تایبەتی بۆ سوڵتان خوڵقاند، کە ئەگەر بابو باپیرانی سوڵتان زیندوو بانایە، رەنگبوو سەریان سوڕبمێنێ و، تەنانەت لێشی بەقین دابچن. مەسەلەکە ئەوەبوو کە هەرکە کەنیزەکی یەکەم سەرنجی سوڵتانی راکێشاو کوڕو جێنشینێکی بۆ سوڵتان هێنایە دنیاوە و بەسوڵتانەی یەکەم بەناویانگ بوو، کەنیزەکێکی روسی کە تازە دەستگیرابوو، پێشکەشی سوڵتان کرا.
دوای نۆمانگ کچە روسییەکە کوڕێکی بوو و، بەم پێیە بوو بەسوڵتانەی دووەم. لەو مێژووە بەولاوە سوڵتان سلێمان سەیری رووی کەسی نەکردو تا ئەو دەمەی کە ئەم ئافرەتە زیندوو بوو، پێی وەفادارما. ئەم جۆرە عەشق و وەفادارییە، کە لەوسەردەمەدا تەنانەت بە خەیاڵیشدا نەدەهات، یەکەم درزی خستە نێو بەرەبابی عوسمانییەوە و، وردە وردە ئەم درزە هێندە پەرەی سەند کە بناغەی مەزنترین ئیمپڕاتۆرییەتی سەر رووی زەویی هەڵتەکاندو بنەماکانیی سست و لاوازکرد.

* * *

## فەسڵی دووەم

## درزە مەترسیدارەکان

سلێمان لەساڵی ١٥٢٠ (٩٢٦ـی کۆچی)، لەتەمەنی (٢٦) ساڵیدا لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت و سێ هۆکاری گرنگ لە دەستپێکی موبارەکی گرتنە دەستی دەسەڵاتدا یارمەتیان دا. یەکێکیان ئەوەبوو کە ئەو تاقە کوڕی سەلیم بوو و، لەم رووەوە لە یاسای براکوژی بەدووربوو، کە ببووە هۆی ئەوەی یەکێ لەباپیرەکانی دووبراو هەشت برازای خۆ بکوژێ تا بتوانێ بەبێ رکابەر دەسەڵات بگێڕێ. دووەمیان ئەوەبوو کە وێڕای ئەوەی کە باوکی بەکابرایەکی (دڵڕەق) بەنێوبانگ بوو، بەڵام لەهەمانکاتدا بابایەکی روناکبیر بوو کە بۆ ماوەی (١٦) ساڵ سلێمانی لەکاری سیاسەت و بەڕێوەبردنی وڵات بەردابوو. سێیەمیان لەو سەردەمە پڕ لە فێڵ و پیلان گێڕییەدا، خاوەنی برادەرێک بوو کە هەموان ئارەزووی ئەوەیان دەکرد برادەرێکی ئاوهایان هەبێ.

ئەم کابرایە پێیدەگوترا ئیبراهیم و یۆنانیەکی مەسیحی بوو، کە لەشاری پارگای سەرلێواری دەریای ئیونی لەدایک ببوو، لەلایەن کۆمەڵێک چەتەی دەریاییەوە دزرابوو و، وەک خوڵام بەبێوەژنێکی تورک فرۆشرابوو. ئەم ئافرەتە وا شێت و شەیدای ببوو کە مۆسیقاو فەلسەفە و زمانەبیانیەکانی فێرکردبوو؛ بەشێوەیەک کە ئیبراهیم زۆر بەئاسانی دەیتوانی بەتورکی و فارسی و یۆنانی وئیتالیایی قسە بکات.

سلێمان لە تەمەنی نەوجەوانیدا بۆ یەکەمجار ئیبراهیمی بینی بوو و، لەنووسینگەی خۆیدا کاری پێڕاسپاردبوو. ئیبراهیم، بە تەمەن ساڵێک لە سلێمان گەورەتربوو. باڵای لە ئاستی ئاسایی کورتتر و رووخسارێکی کەرەن زەر وکراوەی هەبوو و، بەردەوام خەندەی لەسەر لێوان بوو. ئاشکرایە کە کاتێ سلێمان چووە سەر تەخت و بوو بە سوڵتان، ئیبراهیمیش قاچی گەیشتە کۆشکی سوڵتان و ئەم دووانە وەک دوو دۆستی هەمیشەیی مانەوە؛ بەیەکەوەنانیان دەخوارد، سواری قایەغ دەبوون و لەکاتی جەنگیشدا لەیەک چادرو تەنانەت لەسەر یەک جێ دەنووستن. لەبەرئەوەشە کە هەندێ لەمێژوونووسان پێیانوایە پەیوەندیی جنسی یان لەنێوانیاندا هەبووە. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە کارێکی وا لەو سەردەمەدا شتێکی ئاسایی بووەو بەقەدەر ئێستا بە ناماقوڵ و دوور لەڕەوشت لەقەڵەم نەدەدرا.

ئیبراهیم برادەرێکی وەفادارو راوێژکارێکی بەنرخ بوو کە لە هەندێ بواردا

لەئاغاکەی خۆی شارەزاتر و تەنانەت لێهاتووتریش بوو. ئەو بەکاری بێ بایەخی لەبابەت قوشچی (باڵندەڕاگر) و سەرۆکی منداڵەکەم تەمەنەکانی نێو کۆشک دەستی پێکرد، بەڵام لەماوەی سێ ساڵ دا سەرەتا بوو بەسەرۆکی پاسەوانانی خەوگەی سەڵتەنەتی، والی، وەزیرو دواتریش بوو بە سەرۆک وەزیران. تەنانەت لەڕوانگەی ئەو یاسایانەی کە لەنێو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی کاربەدەستی ولێپرسراویەتی دیاریکرابوون و بەپێی هەوەس و مەیلی سوڵتان بوون، پێشڤەچوونی خێرای ئیبراهیم مایەی سەرسوڕمانی هەموان بوو.

برادەرایەتی نێوان ئەم دووانە،کە لە تەمەنی لاویەتی دا دەستی پێکردبوو، بەتێپەڕبوونی کات وا قوڵ و پتەو ببوو کەهەماهەنگیەکی تەواوی لەگەڵ ئەوکارەدا هەبوو کە سلێمان بە ئیبراهیمی راسپاردبوو.

هەموو ساڵێ هاوینان، کە سلێمان ئەندامانی کۆشک و حەرەمسەراکەی دەگواستەوە کوێستانی ئەدیرنە، رۆژەکانی خۆی لەگەڵ ئیبراهیم و ژمارەیەک بازی راوچی، لە ناوچەیەکی بەرینی نیمچە زۆنگاویدا بەسەردەبردو، بەڕاوی قازو باڵندەی دیکەوە خەریک دەبوو. سلێمان فرمانی دا بەشێک لەو زۆنگاوانە وشک بکرێن، لە سەرلێواری رووباری ماریتساش باخێکی چەندین کیلۆمەترییی گەورەیان بنیادنا و گوڵە سوورەو گوڵی جۆراوجۆرو داری میوەیان تێدا چاند. هەموو عەسران ئیبراهیم لەخێوەتە مەزنەکەی سوڵتان دا بەدیداری سلێمان شاددەبوو و، جاری واش هەبوو کە سلێمان سەردانی ئیبراهیمی دەکردو چێژیان لە ئاوازی مۆسیقاو شیعر گوتن دەبرد. تاشل و کوت دەبوون لە ئەدیرنە دەمانەوە و، کاتێ دەگەڕانەوە قوستەنتەنییە کە «*دەنگی بۆقەکان بێزاریان دەکردن.*»

هەرگیز ئەو دوو برادەرە گیانی بەگیانیە ئەوەیان بەخەیاڵدا نەهاتبوو کە رۆژێک برادەرایەتییەکەیان لەئاکامی ئیرەیی ئافرەتانی حەرەمسەرادا کۆتایی پێ بێت و کۆتاییەکی وا خەمناکی هەبێ.

«هاوسەری یەکەمی» سلێمان ناوی گوڵبەهارو خەڵکی مۆنتینیگرۆ بوو. کاتێ سکی لە سلێمان پڕبوو و، مستەفای کوڕی بوو، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی پلەی سوڵتانەی پێ بەخشرا. گوڵبەهار وەک هەموو ئافرەتانی دیکە کە مێردێکی عاقڵیان هەیەو چاو لەدەرنییە، لەبارودۆخی خۆی رازی بوو و، هیچ گلەیی و گازندەیەکی ئەوتۆی نەبوو تا ئەو دەمەی کە لەپڕێکا ژیانی هێمنی حەرەمسەرا لەبەر یەک هەڵوەشا.

هێشتا چەند رۆژێک بەسەر دانانی ئیبراهیم لەپۆستی سەرۆک وەزیران لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٥٢٣ دا، تێنەپەڕی بوو کە کۆماندۆزە تورکەکان لە گالیسی تاقمە ئافرەتێکیان بەدیل گرت. لەناویاندا کچێکی روسی هەبوو کە لەبەر قۆشمەیی و جوانی ناویان نا (خورەم)کە واتاکەی دەیکردە دەم بەبەخەندە و دایاننا کە بینێرنە حەرەمسەرای سوڵتان. لە حەرەمسەرا لەبەر ئەوەی کە روسی نەژادبوو پێیان دەگوت: روکسلانە کە تەحریفی وشەی «روسی هێلانە» بوو.

روکسلانە هێندە جوان نەبوو، بەڵام بەژن و باڵایەکی باریک و سەرنجراکێشی

هەبوو؛ بەتایبەت لە قسەخۆشی و قۆشمەییدا کە بەخێرایی توانی سۆز و سەرنجی سوڵتان بۆ لای خۆی راکێشێت. لەو پۆرتریتەی (جینتیلە بلینی) شێوەکاری ڤنیژی لەروکسلانەی کێشاوەتەوە، روکسلانە بەکوڵمی بەرجەستەو قژی سووری بەم لاو ئەولادا شۆڕبۆوە وە دیارە. چەند ریزە مروارییەکی لە ملەو بالاکەی بەئاشکرا ئەوەدەردەخات کە لەنەژادی (سلاڤ)ەو هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە سوڵتان وا شێت و شەیدای بێت. روکسلانە دوای چەند مانگ کوڕێکی بوو کە نۆبەرەی پێنج منداڵەکانی دیکەی بوو و، سلێمان بەڕادەیەک لەو هەواڵە خۆشحاڵ بوو کەخێرا منداڵەکەی بەنێوی باوکییەوە کرد و ناوی نا (سەلیم).

ئێستا، روکسلانە ببوو بە سوڵتانەی دووەم و بەپێی پلەبەندیی نێو حەرەمسەرا، لەدوای لەدوای شازنی دایک و گوڵبەهار بەسێیەم ئافرەت لەقەڵەم دەدرا. وا بڵاو ببۆوە کەوا سوڵتان نەک هەر چێژ لە نوستن لەگەڵیدا دەبینێ، بگرە کەیفی بەوە دەهات کە لەگەڵیشی دا بدوێ و سوڵتان چەندین کاتژمێر سەبارەت بەکاروباری دەوڵەتی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردو لەباخەرەنگین و تەنیشت حەوزە نافورەدارەکان و ئەو مێرگانەی کە وشترمریماڵییان تێدا بەخێودەکرا، پیاسەیان دەکرد.

روکسلانە هەستی دوربینی و زیرەکی تایبەت بەکچانی لادێی تێدابوو و، گومان لەوەدانیە کە سوڵتان لەبەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت دا سودی لەرێنوێنییەکانی وەردەگرت و ئەمەش لە دەرباری عوسمانیدا شتێکی تازەبوو.

بێگومان روکسلانە مێردەکەی خۆی لەکانگای دڵەوە خۆش دەویست، بەڵام هەوڵی بێ پسانەوەی بۆ بەدەستهێنانی هێزو دەسەڵات، لەنێو حەرەمسەرادا بابەتێکی تازەبوو. ئەو ئافرەتێکی زیرەک و لێهاتوو بوو و، بەسەبرو لەخۆبووردووییەوە رووەو گەیشتن بەئامانجەکانی هەنگاوی دەنا. بەڵام زۆری پێنەچووکە هەندێ گیروگرفت هاتنە ئاراوە؛ چونکە دیارە سلێمان چێژی لەهەڵسان و دانیشتن لەگەڵ نزیکەکانیدا دەبردو بەشێک لەکاتی خۆی لەگەڵ گوڵبەهارو کوڕەکەیدا بەسەردەبرد. کوڕەکەی ئەودەم پارچەلانە بوو و دەکرا بکرێتە جێگری سوڵتان. دیار نیە ئاخۆ ئایا ئەو هێشتا حەزی لەگوڵبەهاربووە یان نا، بەڵام لەو جێگەیەی ڕا کە حەزێکی بەهێزی لە هاودەمی روکسلانەبووە، پێناچێ مەیلی بەلای کەسی دیکەدا هەبووبێ و دیدارەکانی سلێمان لەگەڵ هاوسەری یەکەمیدا تەنها لایەنی دیدارێکی دۆستانەی هەبووە کە وەک باوکێک ویستوویەتی ئاگاداری بارودۆخی پێشکەوتنی کوڕەکەی بێت.

سەرەڕای ئەمە هەریەک لە سوڵتانە ـ کان خاوەنی مافی ژن و مێردایەتی بوون و سوڵتان لەسەری بوو کە هەرکات نۆرەیان هات لەگەڵیاندا بخەوێت، بەڵام هەر جارەی کە سوڵتان دەچووە لای گوڵبەهار، ئەوا روکسلانە بەسەختی نارەحەت دەبوو. وایلێهات رۆژێکیان ئەم دوو ئافرەتە تێرتێر یەکتریان کوتا. ئەو رۆژە روکسلانە چیدیکە خۆی پێرانەگیرا بەنێو خواجە سەراکاندا تێپەڕی و خۆی گەیاندە ژووری گوڵبەهار و دەستی لە تێتکی نا. بەر لەوەی خواجە سەرایان و کەنیزەکەکان بتوانن لێکیان بکەنەوە، روکسلانە هەقی خۆی درایەوە گوڵبەهار پڕ بەدەستی قژە زەرد و زێڕینەکانی روکسلانەی رنی و دەموچاوشی خەوشدارکرد.

ئەم کارەی گوڵبەهار کە دیارە بۆ پاراستنی مافی ژن و مێردایەتیی خۆی بوو، کاردانەوەیەکی خەراپی هەبوو و خەراپ بەسەریدا شکایەوە؛ چونکە روکسلانە بەبیانووی ئەوەی کە دەموچاوی بریندار‌بووە، رۆژێک خۆی نیشانی سوڵتان نەدا و جگە لەمەش زۆر ژیرانە مامەڵەی کردو هیچ جۆرە شکایەتێکی لای سوڵتان نەکرد. تا وایلێهات سلێمان تەسلیم بوو و، لەو هەرایەدا لای روکسلانەی گرت.

هەواڵی لێکدان و پێکدادانی نێو حەرەمسەرا بە خێرایی لە دیوارەکانی حەرەمسەرا تێپەڕی و گەیشتە دەرباری عوسمانی. بەپێی راپۆرتی (پیترۆ براگادنیۆ)ی باڵیۆزی ڤینیز لە قوستەنتەنییە: *« هەچەندە کە گوڵبەهار لە پلەی سوڵتانەی یەکەمدا مایەوە، بەڵام سوڵتان بەتەواوەتی لەبەرچاوی کەوت و لەوکاتە بەولاوە ئیدی سلێمان کەمترین بایەخێکی پێ نەدا.»*

روکسلانە بەسەبرو لەخۆبووردووییەوە چاوەڕێی کاتێک ما، کە بتوانێ بەیەکجاری گوڵبەهار لەکۆڵ خۆی بکاتەوەو لەدەستی رزگاری بێت؛ ئەو دەرفەتەش کاتێ رەخسا کە مستەفای کوڕی گوڵبەهار گەورەبوو. سوڵتان مستەفای کردەو والیی مغنیسا، کە کەوتبۆ نزیک ئەزمیرو دایکیشی لەگەڵی چوو. بەم شێوەیە بۆ چەندین مانگ لە دەربار دوورکەوتنەوە.

دوای ماوەیەک لەم کارە شاژنی دایک کۆچی دوایی کردو روکسلانە خۆی لەپلەی ئافرەتی یەکەمی حەرەمسەرا دا دیتەوەو بۆ ئەوەی کە پتر پێگەی بەهێز بێت، سوڵتانی ناچارکرد مستەفاودایکی بنێرێتە ویلایەتێکی زۆر دوورتر لەو جێگەیەی کە پێشتر لێی بوون.

ئێستا کە، هێزو دەسەڵاتی روکسلانە بەسەر سلێماندا بەرادەیەک بوو کە ڤینیزییەکی دیکە نووسیویەتی:*« ئەو (واتا سوڵتان) وا شێت و شەیدای ئەو ئافرەتە بووە و، بروایەکی وای پێ پەیداکردووە کە بووەتە هۆی سەرسوڕمانی ژێردەستە و رەعیەتەکانی سوڵتان. ئەوان دەڵێن: روکسلانە، سوڵتانی جادوو کردووە و لەم رووەوە خەڵکی پێیدەڵێن (جادی) یان ساحیرە. سەرکردەکانی سوپا و دەرباریەکان، رقیان لەخۆی و منداڵەکانی دەبێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی سوڵتان خۆشی دەوێ کەس خیرەتی ئەوەی نیە دەم بکاتەوە. من لەهەموو جێگەیەک گوێم لێبووە کە خەڵک بەخەراپە باسی خۆی و منداڵەکانی دەکەن و زۆر مەدحی کوڕی یەکەم و دایکی (واتا گوڵبەهار) دەکەن.»*

سلێمان وایەخسیری دەستی ئەم ئافرەتەبوو کە لەمێژووی عوسمانیدا شتی وا نەبیندراوەو، روکسلانەش سودی لەم پێگە بەهێزەی خۆی وەرگرت و دوا داواکاریی خۆی خستەروو کە ئەویش هاوسەرییەتی رەسمی لەگەڵ سوڵتان بوو.

ئەم داواکارییە تەنانەت سلێمانیشی تووشی سەرسوڕمان کرد؛ چونکە ئەومافانەی کە ئەو وەک سوڵتانە هەیبوو، روکسلانەیان دەهێنایە ریزی گوڵبەهار کە دایکی جێنشینی سوڵتان بوو و، ئەو عەشقەیش کە سوڵتان لەهەمبەر ئەودا هەیبوو، وایکردبوو کە بکەوێتە سەرووی هەموو ئافرەتانی حەرەمسەراوە. لەسێ سەدە پێشترەوە، هیچ کام لە سوڵتانەکانی عوسمانی لەگەڵ هیچ ئافرەتێک هاوسەرییەتی

رەسمییان نەبوو.
هۆی ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە جارێکیان هاوسەرێکی مارەکراوی یەکێ لەسوڵتانەکانی عوسمانی بە یەخسیری کەوتبۆ دەست دوژمن و ناچاریان کردبوو بەڕووت و قووتی خواردن و خواردنەوەیان بۆبێنێ. لەبەرئەمە سوڵتانەکانی عوسمانی بڕیاریان دابوو بۆ خۆ بەدوورگرتن لە ڕووداوی سەرشۆڕکاری وەها، هەرگیز ئافرەتانی حەرەمسەرا لەخۆیان مارە نەکەن. بەڵام ڕوکسلانە ئافرەتێکی ئاسایی نەبوو، بیانوویەکی وای خستەڕوو کە سوڵتان نەیتوانی ڕەتی بکاتەوە. ئەو بۆ سەلماندنی وەفاداری و ئەوینی سلێمان بەخۆی، وای لە سوڵتان کردبوو کە ژمارەیەک لەکەنیزەک و ئافرەتانی جوانی حەرەمسەرا بەمێرد بدات و ئێستاکە بیانووی ئەوەی گرت کە مادامەکی ئەو کەنیزەکانە بتوانن مێرد بکەن و ماف و ئیمتیازاتی تایبەت بەخۆیان هەبێ، بۆچی ئەو کە خاتوونی یەکەمی حەرەمسەراو جێی سەرنجی گەورەترین سوڵتانی سەر رووی زەمینە هێشتا دەبوایە کەنیزەک و کوێلەبێت؟ ڕوکسلانە بیانووی ئەوەی دێنایەوە کە مادام بۆتە موسڵمان و ڕێوشوێنە ئایینییەکان بەوردی ئەنجام دەدات و پارەیەکی باش (لەپارەکانی سلێمان) بۆ بینادنانی مزگەوت و کاری خێر تەرخان دەکات و زانایانی ئاینیی و پیاوانی ئاینیش لێی ڕازین، بۆچی هاوسەری ڕەسمی و مارەکراوی سوڵتان نەبێ؟ لەڕاستیدا ئەو دەیزانی کە سوڵتان وا شێت و شەیدایەتی کە بەئاسانی دەتوانێ نەریتەکان لەژێر پێی بنێت.
لەکاتێکدا کە تەواوی دانیشتوانی قوستەنتەنییە تووشی سەرسوڕمان بوون، خوتبەی هاوسەریەتی سلێمان و ڕوکسلانە لەلایەن پیاوێکی ئایینییەوە خوێندراو، ڕوکسلانە لە سلێمان مارەکرا . سلێمان لەبەردەم مەلاکەدا بەڵێنی دا کەوا:« *من ئەم ئافرەتە لە کۆتی کۆیلەتی ئازاد دەکەم و دەیکەم بەهاوسەری خۆم. ئەوەی کەمی خۆیەتی لای خۆی دەمێنێتەوە*.»
یەکێ لەکارمەندانی بانکی (سان جۆرجۆ)ی سەربە کۆماری جێنێوا لەمبارەیەوە نووسیویەتی: « *لەم هەفتەیەدا، لەم شارە یەکێ لەسەیرترین و سەرسوڕهێنەرترین ڕووداوەکان ڕوویدا، کە لەمێژووی سوڵتانەکانی عوسمانیدا پێشینەی نەبووە. سوڵتان سلێمان کەنیزەکێکی ڕوسی کەنێوی ڕوکسلانەیە مارەکردو پلەی (ئیمپراتریس)ی پێبەخشی. بەم بۆنەیەوە میوانداری و ئاهەنگی پڕشکۆ سازدران کەهەر هەموویان لەناو کۆشکەکانی ئیمپراتۆرییەتدا بەرپا کران*.» ئینجا بەنارەحەتییەکی ئاشکراوە درێژەی پێدەدا: «*خەڵکی لەسەرانسەری وڵات باسی ئەم کارەی سوڵتان دەکەن و هیچکەس ناتوانێ لەوە بگات کە بۆچی سوڵتان وایکرد*.»(٥)
ئەگەرچی مەراسیمی مارەکردنی ڕوکسلانە بەساکاری بەڕێوەچوو، بەڵام ئەو ئاهەنگانەی کە دوای مارەکردنەکە سازدران، زۆر پڕشکۆ بوون. بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو دەرباری سوڵتان سلێمان شکۆو مەزنییەکی وای پەیداکردبوو کەببوە هۆی سەرسوڕمانی ئەوروپاییەکان. بەڵام هیچ کام لەو ئاهەنگانە، تەنانەت ئاهەنگی مەراسیمی سونەت کردن کە لەسەردەمی سلێمان دا داهێندرا، لەگەڵ ئاهەنگی

بوکێنیی روکسلانەدا بەراورد نەدەکران.
کاتژمێرێک بەر لە دابەشکردنی قاوەڵتی، کە بریتی بوو لەنان و زەیتوون بۆ هەژاران و نان و پەنیرو میوەو مرەبای پەڕەی گوڵ بۆ دەوڵەمەندان، شەقامەکانی قوستەنتەنییە لەحەشامەت جمەی دەهات. شەقامە سەرەکییەکان بەئاڵقەی گوڵ و ئالای ئەرخەوانی رەنگی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ئالای سەوزی ئیسلام رازێندرابوونەوە. لەسەر هەموو چوارڕیانەکان، میوە فرۆشەکان بەفرۆشتنی تەماتەی درشتی ماردین و هەرمێی بەتامی ئازەربایجان و ترێی ئاڵتونی رەنگی ئەزمیر و هەڵوژەی شیرینی تەمسویرەوە خەریکبوون. لە گۆشەیەکی دیکە دڵ و گورچیلەو جەرگ، لەسەر مەقلیی گەڕۆک لەشیش دەدراو دەبرژێندرا و، بەمەش ئیشتیهای رێبوارانیان دەورووژاند.
شەربەتفرۆشانیش کە بازاڕیان گەرم بوو، شەربەتە رەنگاورەنگەکانی خۆیان بە قاڵبە بەفرو سەهۆڵ سارد دەکرد و دیمەنی شوێنەکەی خۆیان بەنافورەیەکی بچوک کە ئاوی فێنکی بەولاوئەملادا دەپرژاند، ڕازاندبۆوە. شەربەتەکانیان بریتی بوون لە؛ شەربەتی لیمۆی تێکەڵ بە هەنگوین کە بۆن و بەرامی خۆشیان ئاوێتە کردبوون، شەربەتی وەنەوشەو هەنگوین کە پتر سەرنجی خەڵکی رادەکێشاو گرانتریش بوو.
دەستفرۆشەکانی دیکە بەدەست گولاویان بەشیربرنجی نێو قاپە مسییەکان دا دەکرد و، بەکەوچکی گەورە لە دەفری بچوکتریان دەکردن و بەخەڵکیان دەفرۆشت. ئاومیوەی فێنکیش مشتەرییەکی زۆری هەبوو، باش دەفرۆشرا. قاوەفرۆشەکانیش بازاڕیان گەرم بوو؛ چونکە لەو سەردەمەدا سلێمان ڕێگەی بە بازرگانێکی عەرەب دابوو قاوەخانەیەک بکاتەوەو، ئەوشتەی کە یەکێ لە تورکە بوغراکانی ئەوسەردەمە بە (دوژمنی رەشی خەو و جیماع) ناوی هێنابوو، بەخەڵک بفرۆشێ.
لەسەرانسەری وڵاتەوە دیاری جۆراوجۆریان بۆ سوڵتان ناردبوو. ئەم دیارییانە کە بریتی بوون لە فەرشی گرانبەها، کەرەستە نێومال و دەفری زێرو زیو، بەسەرپشتی دووسەد گوێدرێژەوە بە نێو شەقامە سەرەکییەکانی شاریاندا تێپەڕاندن. دوو خولامی منداڵکاری جلی زەردووری لەبەر، رێشمەی ئەو کەرانەیان گرتبوو و، بەدوای خۆیاندا رایان دەکێشان. بەدوای ئەوانەدا دووسەد وشتر، کە دیاریی گرانبەهای جۆراوجۆریان لێ بارکرابوو و لە ویلایەتە دوورە دەستەکانی وڵاتەوە نێردرابوون، ڕێگەیان دەبڕی. سەدو شەست خواجە کە نیوەیان سپی ونیوەکەی دیکەیان رەش پێست بوون و دیاری دەوڵەمەندو بازرگانانیان دەبردە خزمەت روکسلانەی تازە ئیمپراتریس، پاشقەڕۆی ئەم کاروانە پرشکۆیەیان پێک دەهێنا.
کاتێ ئەم کاروانە لەدەروازەی بابی هومایون تێپەڕی و لەپشت دیوارە بڵیندەکانی کۆشک وسەرای سوڵتان لەبەرچاوی خەڵک ونبوو، کاروانێکی دیکە بەڕێکەوت کە ئەویش نانەواکانی شاربوون و باری دوازدە عارەبانەی گەورە نانی سەر بەکونجییان فرێ دەدایە نێو خەڵک. دوا بەدوای ئەوان عارەبانەیەکی دیکە بەڕێوەبوو کە شەش گامێش رایان دەکێشاو نانێکی گەورەی چەند سەد کیلۆیی

لەسەر بوو کە نانەواکانی شار لە تەندووریّکی تایبەتیدا کە بە خۆڵەمێش دایان پۆشی بوو و برژاندبوویان، پیشکەشی سوڵتان و هاوسەرە تازەکەیان دەکرد.
ئەم ئاهەنگانە هەفتەیەک درێژەیان هەبوو. هەموو شەوێ کە دنیا تاریک دادەهات و هەزاران فانۆس کوچەو کۆڵانەکانی شاریان رووناک دەکردەوە، لەگۆڕەپانی ئەسپ تاودان، واتا ئەو جێگەیەی کە کۆن بیزانسیەکان بەداشقەو ئەسپەکانیان غار غارێنیان تێدادەکرد، شوێنێکیان بۆ سوڵتان و هاورێیانی دابین دەکرد.
بەشێکی ئەم شوێنەیان بەپەردە داپۆشیبوو بۆ ئەوەی روکسلانەو ئافرەتانی حەرەمسەرا بتوانن لەپشتیەوە سەیری ناو گۆڕەپانەکە بکەن و ئاگایان لەوە هەبێ کە چ باسە. بەرنامە بریتی بوو لە پێشبڕکێی جۆراوجۆری زۆرانباری، تیرهاویشتن بە کەوان، سیحر بازی و نمایش کردنی گیانلەبەرە سەیرو سەمەرەکانی ئاسیاو ئەفەریقا. کارمەندی بانکی جێنێوا دەنووسێ: *«دوو سەر زەرافە بەملی درێژیانەوە کە دەت گوت سەر لەئاسمان دەدەن، لەو گیانلەبەرانەبوون کە نمایش دەکران.»*
هەزاران کەس لە دەوروبەری گۆڕەپانەکە دەوەستان و تەنانەت بەدارودرەختی ئەو ناوە هەڵدەگەڕان تا بەڵکو بتوانن لەدوورەوە چاوێکیان بەسوڵتان سلێمان بکەوێت، یان پشکێکیان لەو دیاری و دراوانە بەرکەوێ کە خولامەکانی سوڵتانە لەگەڵ پارچە نانێک ومیوەدا بەسەر خەڵکیاندا دابەش دەکردن.
سلێمان و جەماعەتەکەی سەرەڕای ئەحکامی قورئان کە خواردنەوەی حەرام کردبوو، دژایەتیان لەگەڵ خواردنەوەی پێکێک شەڕابدا نەبوو، بەڵام کاتێ یەکێ تووشی مەستی بووباو کردەوەی ناشایستی ئەنجام دابایە، ئەوا سزایان دەدا و ئەم سزادانەش بەقەمچی لێدان دەستی پێدەکردو بە بەگەرووداکردنی قومە قوڕ قوشمێک کۆتایی پێدەهات.
مارەکردنی روکسلانە یەکەم ئاڵقەی ئەو زنجیرە رووداوانە بوو کە بوونە هۆی دارمانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی؛ چونکە لەوێ بەولاوە تا سەدە ونیوێک کاریگەریی ئافرەتانی حەرەمسەرا بەسەر کاروباری دەوڵەتدا، چەسپا. لەکاتێکدا کە روکسلانە بەوردی خەریکی چاودێری ئەو رکابەرانەبوو کە رەنگبوو ببنە کۆسپی سەر رێگای، بەرەورووی گرفتێکی بچوک و ئازاردەربۆوەو، ئەویش مەودای نێوان حەرەمسەرا و دەرباری سوڵتان، یان بابی عالی بوو. تا نێوەڕاستی سەدەی شانزدەهەم، حەرەمسەرا لەکۆشکێکی کۆندا بوو کە محەمەد فاتیح دوای دەست بەسەراگرتنی قوستەنتەنییە لەساڵی ١٤٥٣ (٨٥٧ی کۆچی) بنیادی نابوو. بەڵام دوای ئەوە سوڵتانەکانی دیکە چۆڵیان کردو کردیان بەبارەگای حکومەت. روکسلانە هەستی بەوەکرد کە ئەگەر ئەو ومێردەکەی لەژێر میچێکدا بژین، ئەوا ژیانی ئاسانتر دەبێ و لەمەیشدا بەختی هەبوو؛ قوستەنتەنییە کە زۆربەی خانووەکانی لەدارو تەختە دروستکرابوون، وەک بەرمیلێکی بارووت وابوو کە مەترسی ئاگرتێبەربوون بەبەردەوامی هەڕەشەی لێدەکرد و یەکی لەسامناکترین ئاگرکەوتنەوەکانی مێژوو لەساڵی ١٥٤١ (٩٤٨ی کۆچی) لەو شارەدا رویداو ئەم شارەی لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد. ئاگر کەوتنەوەکە لە لەنگەرگای دەریاوە دەستی پێکردو بەخێرایی گەیشتە ناو

شارو ساختومانه کۆن و رزیوەکانی کۆشکی سوڵتانیشی گرتەوەو کەنیزەک و ئافرەتانی حەرەمسەرا بەهاوار هاوارەوە ئەویان جێهێشت و لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا ئەم بینایە کۆنە بوو بەخۆڵەمێش.

ئاشکرایە کە دەبوایە ژنی سوڵتان لە شوێنێکی نوێی ئەوتۆ دانیشتەجێ بوایە کە شایستەی دانیشتنی شاژنێک بوایە. لەمڕووەوە روکسلانە گواستیەوە کۆشکی گەورە.ئەم شوێنە لەسەردەمی سوڵتان محەمەدی فاتیحەوە بەبارەگای بەڕێوەبەرایەتییە دەوڵەتییەکان لەقەڵەم دەدراو تەنها یەک بینایەی نوستنی تێدابوو. وادانرابوو لەو شەوانەیدا کە سوڵتان نیازی چوونی حەرەمسەرای نەبێت لەوێ بخەوێت. کاتێ روکسلانە و ئەوانەی لەگەڵیدابوون هاتنە نێو کۆشکی تازەوە، تەنانەت سلێمانیش تووشی سەرسوڕمان بوو؛ چونکە روکسلانە سەد خولام و سەدان خواجەسەراو خولامی منداڵکارو بەرگدروو و سێورساتچی(٦) بەجلی رازاوەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابۆ بابی عالی. هەروەها هەر کاتێ حەزی لێبوایە بەئاسانی بەوێدا هاتووچۆی دەکردو لەکاتێکدا کە گروهێکی سی کەسی لە خولام و کەنیزەک بەدواوەی بوون، دەهاتە نێو بابی عالیەوە.

هیچ مێردێک لە بارودۆخێکی وەهادا ناتوانێ جگە لە نارەزایەتییەکی بچوک بەو لاوە هیچ کارێکی دیکە بکات.

کۆشکی کۆن کە لەئاکامی ئاگر کەوتنەوەدا وێران ببوو و لەگەڵ خۆیدا خەزێنەکانی سوڵتانیشی لەنێو بردبوو، ماوەیەکی زۆری دەویست تا سەر لەنوێ بنیادبنرێتەوە.کەواتا دەرگایەکی تایبەتییان لەنێوان شوێنی نوێی روکسلانەو ئاپارتمانە بچوک و دوو ژوورییەکەی سوڵتاندا کردەوە و، روکسلانە لە تەنیشت مێردەکەی نیشتەجێ بوو.

بۆ سوڵتانە کارێکی ئاسان بوو کە لە جادەی زێڕین تێپەربێت و بەو قالدرمەیەدا سەرکەوێت کە دەچووە بورجی تایبەتیی سوڵتان و، لەپشت ئەو پەنجەرە کون کونەی کە بەسەردیواندا دەیڕوانی دانیشێ و بەبێ ئەوەی کەس بیبینێ، گوێ لەقسەی وەزیرو کاربەدەستانی وڵات بگرێ. لەم رێگەیەوە روکسلانە شارەزاییی سەبارەت بەهونەری بەڕێوەبردنی وڵات پەیداکرد.

ئێستا واپێدەچوو کە روکسلانە گەیشتبێتە هەموو ئاواتەکانی، بەڵام هێشتا دوو پەڵە هەور ئاسمانی بێگەردی ژیانییان داگرتبوو؛ یەکیان ئەوەی کە خەڵک مستەفای جێگری رەسمی سوڵتانیان بەڕادەی پەرستن خۆش دەویست و ئەویش مستەفای بەلەمپەری سەر رێگای سەلیمی کوڕی دەزانی، ئەوەی دیکەیان ئەوەبوو کە ئیرەیی بەو دەسەڵات وتوانایەوە دەبرد کە سوڵتان خستوویە بەردەستی ئیبراهیم.

* * *

بەدرێژایی ئەو سالانە سوڵتان هەموو کاتی خۆی بەڕابواردن لەگەڵ ئافرەتانی حەرەمسەراو پاڵدانەوەوە بەسەر نەبردبوو. سەبارەت بە ژیانی تایبەتی و هەروەها ئازایەتی سوڵتانەکانی عوسمانی لێکدانەوەی هەڵە هەیە. ئەگەرچی گەندەڵی و بەدڕەوشتی زۆربەی جێنشینەکانی سلێمان بووە هۆی لەنێوچوون و دارمانی

ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، بەڵام لەنێو ئەوانەشدا کەسانێک هەبوون کە مەیلێکی یەکجار زۆریان بەلای جەنگدا هەبوو کە بەقەدەر ئافرەت و رابواردن کە قەت لێی تێر نەدەبوون ئارەزووی جەنگیان هەبوو و هەوڵیان دەدا لەیەک کاتدا ئەم دوو ویستەیان بهێننەدی. لەبنەڕەتدا تورکەکان عاشقی جەنگن. هەروەک تراکتاتوس(٧) دەنووسێ: *«ئەوان (تورکەکان) وەک ئەوەی بۆ شایی لێیان گێڕابنەوە، ئاوا لەدەورەی یەکدی کۆدەبوونەوە»*.

سلێمان پتر لە هەموو شتێک سەرکردەیەکی شەڕکەرو بەجەرگ بوو. ئاگای لەهەموو لایەنەکانی خۆشبەختی ولاتەکەی بوو، بەڵام مەیدانی جەنگی پێ لە کوڕی راوێژکاری باشتربوو. راستە کە هاونیشتمانییەکانی نازناوی (قانونی) یان پێ بەخشیبوو، بەڵام لەڕاستیدا یاساکانی ئەو لەهەندێ داهێنانی سەمەرە لە نەریتە باوەکان پتر چیدی نەبوون، کە تێیاندا هەوڵدرابوو کەمایەسییەکانی ژیانی رۆژانە پڕبکرێنەوە. ئەو، ئەم ناوبانگەی لەو رووەوە بەدەست هێنابوو کە سوڵتانەکانی بەر لەئەو، هیچ مەیلێکی ئەوتۆیان لەم بوارەدا لەخۆیشیان نەدابوو و، پتریش لەو رووەوەبوو کە بەهۆی ئارەزووی ئەم کابرایە بەجەنگ، فێرگەیەکی تایبەت و باوەڕپێکراوی فێرکردنی هونەری جەنگی بۆ لاوەکان دامەزراندبوو. لەدوای هەر جەنگێک هەزاران یەخسیر و کۆیلەی نوێ دەهێندرانە نێو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و یەک لەسەرپێنجیان دەدرانە سوڵتان. سەرەڕای ئەمانە ژمارەیەکی زۆر ( *کوڕی پێشکەش کراو*)یان کوڕانی بەدیاری هێندراو هەبوون کە بەپێی مەراسیمێکی کۆن، هەر چوار ساڵ جارێک راسپێردراوانی سوڵتان بۆ دۆزینەوەی باشترین ولێهاتووترین، هەزرەکارو نەوجەوانانی ئەو ناوە هێرشیان دەکردە سەر خێزانە غەیرە موسڵمان وگوندە مەسیحی نشینەکان. لەو گوندانەدا شاندێکیان پێکدەهێناو وەک چۆن ئەسپ و جوانوویان هەڵدەبژارد، ئاوهاش کوڕانی جوانکیلەو بەتوانایان بەمەبەستی پەروەردەکردن بۆ خزمەتی سوڵتان، هەڵدەبژارد.

ئەگەرچی ئەم نەریتە وەک کارێکی بێ بەزەییانە دەهاتە پێش چاو، بەڵام کوڕانی بەڕەوشت و زیرەکی مەسیحی، لەخزمەت سوڵتان و بابی عالی دا، داهاتوویەکی باشتر لەژیانی نێو کێڵگە هەژارانەو شاخاوییەکانیان چاوەڕێی دەکردن. کاتێ ئەم کوڕانە دەهاتنە نێو فێرگەی بابی عالی، وەک ئەندامی ئەو خێزانەیان لێدەهات کە بەرزترین کاربەدەستانی دەوڵەتی وسوپاییان لێهەڵدەبژێردرا.

پڕۆگرامی وانەکانی ئەم فێرگەیە لەهی زانکۆی تازە بنیادنراوی بۆڵۆنیای ئیتالیایی پێشکەوتر بوو و، وانەی تیۆری و پەروەردەکردنی لەشی لەخۆوە دەگرت؛ چونکە سلێمانیش وەک ئەفلاتون لەو باوەڕەدابوو کەوا (عەقلی باش لە لەشێکی ساغ دایە).

پڕۆگرامی فێرگەکە گەلێک سەخت بوو؛ کوڕەلاوەکان دەبوایە هەموو رۆژێ خۆیان بشۆن و هەموو هەفتەی جارێک نینۆکیان بکەن و هەفتەی دووجار ریشیان بتاشن و هەموو رۆژێ دەستەسڕێکی خاوێن هەڵگرن و مانگی جارێکیش قژیان کورت کەنەوە. هەموو رۆژێ دەیانپشکنین بۆ ئەوەی نەوەکا شیرنەمەنی ودەرمانیان حەشاردابێ.

بەتایبەتیش دەرمان، کە هێزی جنسی یانی دەورووژاند. هەروەها بۆ ئەوەی ئەوەکا نامەی دڵدارییان لەکورانی دیکەوە پێ گەیشتبێ، لەبەر ئەوەی ئەولاوانە بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی جنسییان لەگەڵ ئافرەتاندا نەبوو، بێگومان هاوجنس بازی لەناو ئەولاوانە لەبرەو دابووەو، بۆ سوڵتانەکانیش کە خوشیان چێژیان لەم کارەدەبرد، ئەوا فێرگەی ناوبراو دەبێ شوێنێکی باش بووبێ بۆ راوکردنی کوڕی جوانکیلە.

ئاشکرایەکە خواردنەوەی مەشروب بۆ ئەو کوڕە بەدیاری هێندراوانە بە تەواوەتی یاساغ بوو؛ مەگەر ئەوەی کە لەکاتی نەخۆشی دا و دکتۆر بۆی نووسیبان و ئەودەمیش باخەوانانی کۆشک، گۆزە شەرابێکیان لە پەتێک دەبەست و لەسەر دیوارەوە شۆڕیان دەکردەوەو، لاوە نەخۆشەکەش قومێکی لێدەخواردەوە.

هیچ کام لەو لاوانە مافی ئەوەیان نەبوو بەبێ ئیزنی تایبەتیی سوڵتان پێ بنێنە دەرمانگەوەو، تەنانەت بەبێ ئیزنی سوڵتان مافی ئەوەیان نەبوو ددانیان بکێشن. ئەگەر بهاتایە دوکتۆری ددان هەڵەی بکردایەو ددانی ساغی لاوێکی بەهەڵە هەڵکێشابایە، ئەوا سوڵتان فرمانی دەدا ددانێکی دوکتۆریان وەک سزای هەڵەکەی دەکێشا.

سەرەڕای ئەم پرۆگرامە سەختە، هەریەک لەم کوڕەلاوانە بواری گەیشتن بە بەرزترین پلەوپایە دەوڵەتی و لەشکرییەکانیان لەبەردەم دابوو؛ چونکە ئەوە تەنها تورکەکان نەبوون کەبەردەوامی فرمانڕەواییان بەسەر ئیمپراپۆرییەی عوسمانیدا دەکرد و، بگرە ژمارەیەکی زۆر لەو کۆیلانە دوای تێپەڕاندنی ئەم پرۆگرامە سەختە باشتر لە تورکە ئاساییەکان ئامادەی بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆرییەتی پان وبەرینی عوسمانی دەبوون.

ژان فرانچێسکۆ مۆروزینی، باڵیۆزی ڤینیز ئەم بارودۆخە لەرستەیەکدا کورت دەکاتەوە کە کۆیلەکان بەبەردەوامی دووپاتیان دەکردەوەو ئەویش ئەوەبوو کە دەیانگوت: *«من شانازی بەوەوە دەکەم کە خولامی فرمانڕەوای مەزن بم.»* ئەمە دەیسەلمێنێ کەوا کۆیلەکان، ئەم ئیمپراتۆرییە مەزنەیان بەڕێوە دەبردو ئەوان بازووە راستەقینەکانی هێزو دەسەلات بوون. هەرکاتێ سوڵتان چووبایە جەنگ، ئەوا کاروباری وڵاتی دەسپاردە دەست یەکێک لەو کەسانەی کە خۆی بەخولام یان کۆیلە دەزانی و مافی ژیان و مردنی خۆی لەدەستی سوڵتاندا دەدیت. هەر لەم رووەشەوە بوو کە هەر کاتێ سوڵتان حەزی لێبوایە دەیتوانی یەکێک لەو کۆیلانە بکاتە سەرۆک وەزیرو دواییش بیداتە دەست میرغەزەب ولەملی بدات.

سوڵتان ئەو هێزو دەسەلاتەی لەهەمبەر سەربازانیشی دا هەبوو؛ چونکە هەروەک چۆن زیرەکترین و وریاترین کوڕانی دەرچووی فێرگە کاروباری ئیداری وڵاتیان پێ دەسپێردرا، ئاوهاش بەهێزترین ولێهاتووترینیان لەنیو هێزی هەڵبژاردەی سەربازیی (یەنیچەری)دا، کاریان پێ دەسپێردرا و دەبوون بە کاربەدەستی سەربازی و سەرکردەی سوپایی.

یەنیچەری، هێزێکی تایبەتی بوو کە لەساڵی ١٣٣٠ (٧٣٠ـی کۆچی) تەنها لەو کوڕە بەدیاریهێندراوانە پێکهێندرابوو و، هیچ هێزێک خۆی لەبەر ڕانەدەگرت.یەکەم برگەی

دەستوری نێوخۆیی یەنیچەرییەکان ئەوەبوو کە بەشێوەیەکی کوێرانە ملکەچی بڕیارەکان بن. جلی یەکڕەنگ لەڕەنگی شینی تۆخیان لەبەربوو و، کڵاوێکی لبادی سپییان لەسەر دەنا. کڵاوی ئەفسەرەکانیان بەپەڕی وشترمر و مەلی بەهەشت رازێندرابۆوە. سوێندیان خواردبوو کە هەرگیز ژن نەهێنن و موچەیەکی باشیشیان وەردەگرت. بەڕادەیەک تێرخواردن بوون کە قۆناغی فێرکردنی سەربازییان پتر بە چێژبردن لە خواردنی جۆراوجۆرەوە بەسەردەبرد. یەکێ لەپلەکانی ئەفسەران شۆرباچی باشی بوو و، عەریف و خاوەن پلەی وەک چێشت لێنەر باشی و سەقاباشی یشیان هەبوون. مەنجەڵی گەورەی پڵاو کە بەبەردەوامی بۆیان لێدەنرا، بەپێی ئەو هێزانە رەنگ کرابوون و لەرەنگی مەنجەڵەکانیانەوە هێزەکانیان دەناسرایەوە. هەر کاتێکیش یەنیچەرییەکان گلەییەکیان هەبوایە، مەنجەڵەکانی خۆیان وەک هێمای نارەزایی سەرەونخون دەکرد و ئەوەش بەمانای ئەوەبوو کە ئامادەنین خواردنی سوڵتان بخۆن.

سلێمان کە دیتی سوپاو سەربازێکی وەها باش و ملکەچ و ئازای هەن، یەکساڵ دوای دانیشتنی لەسەر کورسیی دەسەڵات، بڕیاری دا بچێتە جەنگی ئەوروپا مەسیحیەکان و یەکەم ئامانجیشی دەستبەسەراگرتنی قەڵای پتەوی بەلگراد، واتا «شاری سپی» بووکە کەوتبۆ سەرکەنارەکانی باشوری رووباری دانۆبەوە.

لەو سەردەمەدا جەنگکردن پێویستی بەکۆمەڵێ رێوڕەسمی تایبەت هەبوو و، لەسەرەتادا دەبوایە لەلایەن بەرزترین پلەی ئاینییەوە پەسند بکرێت ولایەنی شەرعی بەخۆوە بگرێت. ئینجا وەک هەنگاوی دووەم دەبوایە باڵیۆزی وڵاتی دوژمن بخەنە بەندیخانەوە. دوایی لەڕێوەڕەسمێکدا، سەرۆک وەزیر ئەسپێکی زین و بەرگ کراوی جەنگی و شمشێرێکی بەخشڵ نەخشێندراوی پێدەبەخشراو، مونەجیم باشی یان ئەستێرەناس باشیی دەرباری عوسمانی، کات وڕۆژی هێرشەکەی دیاری دەکرد. بەڵام هەمیشە بواری خۆ بەدەستەوەدان بەدوژمن دەدرا.

لە ١٦ی شوباتی ساڵی ١٥٢١ (٧ی ربیع الاول ـی٩٢٧ی کۆچی)، سلێمان بە شان و شکۆیەکی بێوێنەوە قوستەنتەنییەی رووەو بەلگراد بەجێهێشت.

سێهەزار وشتر کە کەرەستەی جەنگ و تەقەمەنی و ئازووقەیان لێبارکرابوو، بەرلەوەی سوڵتان لە حەوشی یەکەمی بابی عالی چاوی بەهێزە هەڵبژاردەکانی خۆی بکەوێت، بەڕێکەوتبوون و قوستەنتەنییەیان جێهێشتبوو.

ئەسپی فەوجە سوارە نیزامەکان بەقوماشی زێڕ وسیم دووراو رازێندرابوونەوەو، هەریەک لەسوارەکانیش پەڕی رەشی درێژەیان لەکڵاوەکانیان وەدابوو و، بەپێی ئەو پلەو پایانەی کە لەسوپادا هەیانبوو، جلی ئەتڵەسی زەردو زەرکفتی جۆراوجۆریان پۆشیبوو.

هەرسوارەو تێرێکی بەسەر زینەکەی دا دابوو، کەلایەکی بۆ کەوان و لەلایەکەی دیکەی بۆ تیرەکانی بوو. قەڵغانێکیان بەدەستی راست و شمشێرێکیشیان بەدەستی چەپەوە بوو و، گورزێکی ئاسنینی گەورەشیان بەزینەکەیانەوە کردبوو.

پیادە نیزامەکانیش پەڕی درێژیان لە کڵاوەکانیان وەدابوو و، لەچاوی بینەراندا

حاڵەتی جەنگەڵێکیان هەبوو کە ڕێگەی دەبڕی. دوابەدوای ئەوان هێزی سامناکی یەنیچەری بەتفەنگەوە دەهاتن. سوڵتان بەجلی زێڕینی خۆی لەکۆتایی لەشکر، سواری ئەسپە جەنگییە پرشکۆکەی ببوو و، لەکاتێکدا کە سێ منداڵ گۆزەی ئاو و قاپوت و کەوانەکەیان هەڵگرتبوو، ڕێگەی دەبڕی. ڕێکوپێکی سەربازی لەسوپای سوڵتان سلێماندا لەهەموو سوپاکانی دیکە پترو توندتربوو. پائۆلۆ جوڤیۆ لەو بارەیەوە نووسیویەتی: *«ئەم ڕێوپێکیە لە ڕاهێنانە سەختەکانیانەوە سەرچاوە دەگرێ کە تەنانەت لە ڕاهێنانەکانی لژیۆنەکانی ڕۆمی باستانیش توندترن. ئەوان لەهەموو ڕوویەکەوە لە سەربازەکانی ئێمە باشترن؛ چونکە یەکەمیان: بەبێ قەیدو شەرت ملکەچی بڕیاری سەرکردەکانیانن، دووەمیان: لەگۆڕەپانی جەنگدا بچوکترین بەهایەک بەگیانی خۆیان نادەن و سێیەمیان: دەتوانن ماوەیەکی زۆر بەبێ نان و ئاو بەسەر ببەن و بەخواردنی چەند دنکە جۆ و گەنمە شامییەک خۆیان تێرکەن».*

سەربازانی عوسمانی دەیانتوانی لەکاتی پێویستدا بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ لەو ناوچانەدا بژیەن کە دوژمن کاولی کردبوون. بەشە خواردنی ئەوان بریتی بوو لە نەختێ ئارد و دەرمان و خوێ، کە لە ئاویان دەکردو تێکیان دەدا. ئینجا دەیان خستە سەر ئاگر تا هەڵدەچوو و، وەک حەلیم (چێشتی کەشک)ی لێدەهات و دوایی لەقاپی بچوکدا دەیانخوارد.

هەندێکیان کیسەی بچوکی پڕ لە گۆشتی وشککراوەی (گا) یان پێبوو کە هەر ئاوا دەیان خوارد. جاری واش هەبوو گۆشتی ئەو ئەسپانەیان دەخوارد کە دەکوژران. دیارە هەرکاتێکیش بۆیان لوا با، دزییان لە گوندەکانی سەر ڕێگەش دەکرد.

باب وباپیرانی سلێمان دووجار هەوڵی دەستبەسەراگرتنی بەلگرادیان دابوو، بەڵام لەهەردوو جارەکەدا شکستیان خواردبوو. ئەمجارەیان سلێمان بەیارمەتی سێهەزار وشتری دیکە کە لە ئاسیاوە خواردن و ئازووقەیان بۆ هێنابوو، شاری بەلگرادی گەمارۆدا و یارمەتی کاریگەری سەربازە پیادەکانی کە ئەرکیان ئەوەبوو بە لاشەکانی خۆیان خەندەکی دەوروبەری شار پڕکەنەوە، توانی دەست بەسەر بەلگراد دابگرێ. ئەگەر سەربازە نێوبراوەکان زیندوو بمابان ئەوا خەڵاتدەکران و ئەگەریش بمردبان ئەوا بەڵێنی ئەوەیان پێدابوون کەوا وەک شەهید بەبێ سێ و دوو دەچنە بەهەشت.

هێشتا شەش مانگ بەسەر ڕۆیشتنی سلێماندا تێنەپەری بوو، کە وەک قارەمانێکی سەرکەوتوو گەڕایەوە قوستەنتەنییە. بەدەستبەسەراگرتنی بەلگراد، دوایین لەمپەری سەر ڕێگای ئەورووپای باکور لەنێو بردرابوو.هەر لەم ڕووەوە دۆچەی ڤینیز، لەنامەیەکدا بۆ دەوڵەتی بەریتانیا ئەم سەرکەوتنەی سلێمانی «بۆ جیهانی مەسیحیەت زۆر *دڵتەزێن و گرنگ*» لەقەڵەم دابوو.

سلێمان کاتی بەفیرۆ نەداو، ساڵێک دوای ئەوە هێرشی کردە سەر دوورگەی ڕۆدس، کە لە قەڵاکۆنەکەیدا شاسوارانی سەنت جان (یوحەننای قێدیس) لەسەردەمی جەنگە سەلیبییەکانەوە نیشتەجێبوون و سلێمان دوای (١٤٥)ڕۆژ

گەمارۆدان، توانی دەستی بەسەردا بگرێ. ئەم سەرکەوتنە لەسەر تورکەکان گران وەستا؛ چونکە دەقاتی بەرگری کاران لەهێرشبەران کوژران و، لەم رووەوە سلێمان تا سێ ساڵ دواتر هیچ شەڕێکی دیکەی ئەنجام نەدا.

ئەم رووداوانە هاوکاتبوو لەگەڵ پتەوبوونی دۆستایەتی نێوان ئیبراهیم و سلێمان و بەنێوبانگ بوونی خێرای ئیبراهیم . پێ دەچوو رۆژ بەڕۆژیش هەم نێوبانگی ئیبراهیم پتربێت و هەمیش دۆستایەتییەکەی لەگەڵ سوڵتاندا، پتەوتربێت. هەندێ جار ئەم دوو کەسە جلی یەکدییان دەپۆشی و کاتێ لێکدیش دووربانایە، نامەی دۆستانەیان بۆ یەکدی دەنارد. زۆربەی کات لەیەک ژوور دەنوستن و، جێی سەرسوڕمان نیە ئەگەر دەرباری عوسمانی لەو پەیوەندییە بەقین داچێ و تەنانەت مقومقۆی ریسوایی دەبیسترا؛ چونکە بەلای پیاوانی دەرباری عوسمانییەوە بەهیچ شێوەیەک شایستە نەبوو کە گەورەترین فرمانڕەوای سەرزەوی میهرو موحیبەتێکی وەهای لەهەمبەر کۆیلەیەکدا هەبێ.

وردە وردە ئیبراهیم نوقمی ژیانێکی دەست بڵاوانەوە و گەندەڵی هاوشێوەی سەردەمی بیزانس بوو و، ئەمەیش خەڵکی تورەی قوستەنتەنییەی نارەحەت و قین لەدڵ دەکرد. دەتگوت ئیبراهیم هەوڵی ئەوە دەدا تا لەشان و شکۆدا بەپێش ئاغاکەی بکەوێتەوە. لەکۆشکێکی وەک کۆشکی سوڵتاندا دەژیا و دیاری و بەرتیلێکی زۆری لەو کەسانە وەردەگرت کە خوازیاری ئەوەبوون لەژێر فرمانیدا کاربکەن. قایەغە تایبەتیەکەی (١٢) سەوڵ لێدەری هەبوو. هەرکاتێ کە سواردەبوو، هەشت کەسی گاردی رێزگرتن و (١٢)ئەسپی رازاوەی بەدواوەبوون. سوڵتان موچەیەکی وای بۆ دیاری کردبوو کە دووقاتی موچەی سەرۆک وەزیرانی پێشوو بوو، بەڵام ئەمە بەلای ئەوەوە بایەخی نەبوو؛ چونکە عادەت وابوو هەرکاتێ سەرۆک وەزیران لادرابایە، دەستبەجێ دارونەداری لە لایەن سوڵتانەوە دەستی بەسەردا دەگیرا. لە ئاکامدا لەمانگی ئایاری ساڵی ١٥٢٤ (رجب–ی٩٣٠ی کۆچی)، سوڵتان خوشکەکەی خۆی پێشکەشی ئیبراهیم کردو بەدرێژایی نۆشەو نۆ رۆژ زەماوەندو ئاهەنگ لە گۆڕەپانی ئەسپ تاوداندا بەرقەرار بوو و، سەرانسەری شەقامەکانی شار نوقمی شادی و رابواردن بوون.

متمانەو باوەڕیی سوڵتان بەئیبراهیم وەک فەرماندەیەکی جەنگ و سەرۆک وەزیرێکی نایاب لە جێی خۆی بوو. سەرەڕای ئەوەی کە ئیبراهیم بوغراو لەخۆڕازی بوو و، بەرتیل و دیاری لە خەڵک وەردەگرت، بەڵام لەهەمانکاتدا ئەرکەکانی خۆی وەک سەربازو سیاسەتمەدارێک بەباشترین شێوە بە ئەنجام دەگەیاند. لەگەڵ ئەوەشدا خۆ دەرخستنەکانی و، بەتایبەت کاتێ ئەو ئەنگوستیلە یاقوتەی فرانسوای یەکەمی فەرەنسای دەکردە پەنجەوە، دەربارییەکانی نارەحەت دەکرد.

کاتێک کە دوای چەندین ساڵ شەڕوپێکدادانی سنوری، شەڕی هەنگاریا دەستی پێکرد، ئیبراهیم لەشەڕی کۆتایی کە لە دەشتی *موهاچ* روویدا، قارەمانیەتییەکی بێوێنەی لە خۆی نیشاندا. ئەمە جەنگێکی بێبەزەییانە بوو کە تێیدا تورکەکان خۆیان لە بەیەخسیرگرتنی دوژمن دەپاراست و ئەوەی بکەوتبایە دەستیانەوە لەملیان دەدا.

دوابەدوای ئەو رووداوە سولتان سلێمان لە ٣١ی ئابی١٥٢٦ (٢٢ی ذیقعدەی ٩٣٢ی کۆچی)، لەدەفتەری بیرەوەری رۆژانەیدا بەشێوازی تایبەتی خۆی کە هەمیشە لەگێرانەوەدا کەسی سێیەمی بەکاردەبرد نووسیویەتی:
*«ئیمپراتۆر لەسەر تەختی زێڕینی خۆی دانیشتووە و، وەزیر و بەگەکان رێزو ستایشی خۆیان بەبۆنەی کوشتنی ٢٠٠٠ یەخسیری جەنگ، بۆ ئەو دەردەبڕن.»*
دواتر بەکورتی ئەوەی پێوە زیادکردووە نووسیویەتی: *«بارانێکی بەخوڕ دەبارێ.»*
لەم جەنگەدا، بەسەریەکەوە ٢٠٠ هەزار کەس کوژران و ١٠٠ هەزار کەس وەک کۆیلە نێردرانە قوستەنتەنییە.

* * *

لەوکاتەدا سلێمان تەمەنی ٣٢ سالان بوو، براگادنیۆی بالیۆزی ڤینیز ئاوا وەسفی دەکات و دەڵێ: «*رووخسارێکی هەڵبزرکاوی وەک مردووان، بەژنێکی باریک، لوتێکی چەماوەو ملێکی درێژی هەبوو. سیماکەی بەهیچ جۆرێ سەرنجی مرۆڤی رانەدەکێشا.*» هەروەها لەدرێژەیدا دەڵێ: «*بەڵام کاتێ دەستیم ماچکرد، هەستم کرد زۆر بەهێزو بەتوانایەو دەڵێن دەتوانێ کەوانێکی قایم پتر لە هەموو کەس بچەمێنێتەوە. میزاجێکی سەودایی هەیەو لەڕادەبەدەر حەزی لەمامەڵەکردن لەگەڵ ئافرەتە و لەهەمانکاتیشدا پیاوێکی پیاوانە، بوغراو بزۆز، بەڵام جارجارە نەرم و میهرەبانە.*»
ئەم کابرایە بەفرمانڕەوای گەورەترین ئیمپراتۆرییەتی سەررووی زەوی لەقەڵەم دەدرا، کە بۆ ماوەی سێ سەدە دوای ئەوەی هۆزی بچوکی عوسمانی، لە ئاسیای نێوەڕاستەوە بەرەو رۆژئاوا رۆیشتبوو و توانیبووی پەرە بەسوپا بچوکەکەی خۆی — کە خاوەنی هێزی جوڵانەوەو تووندوتیژییەکی بێ هاوتابوو— بدات و سەرەتا توانیبووی جێ پێی خۆی لەناوچەکانی باشوری رۆژئاوای ئاسیای نێوەڕاست قایم بکات و دواتر سنوری خۆی فراوان بکات و بەیارمەتی تۆپخانە بێهاوتاکەی وڵاتێکی نوێ داگیر بکات. ئێستا ئەم ئیمپراتۆرییەتە خەوی لە دەسەڵاتدارە ئاسیایی و ئەوروپاییەکان حەرام کردبوو.
لە سنوری ئیمپراتۆرییەتە پان و بەرینەکەی سولتان سلێماندا، شارەکان، وڵاتەکان، رووبارەکان و کێوەکان وەک فەرهەنگی جوگرافیایی تەنها وەک هێماونیشانەی بچوک لەقەڵەم دەدران. ئێستانلی لین پۆل لەمبارەیەوە نووسیویەتی: *«بەناوبانگترین شارەکانی مێژوو و ئایین لەو سەردەمەدا لەناو سنوری تورکیادا بوون و جگە لە رۆماو سیراکۆزو تەختی جەمشید، تەواوی شوێنە گرنگە باستانییەکان لەنێو سنوری تورکیادا بوون. لەو شوێنە باستانیانەی کە کەوتبوونە نێو سنوری ئەو وڵاتەوە دەتوانین ناوی کارتاژ، ممفیس، سور، نەینەوا، بابل و پالمیر (تەدمر) بهێنین. هەروەها شاری وەک، ئەسکەندەرییە، قودس، ئەزمیر، دیمەشق، نیقیە (ئەزنیق)، بۆرسا، ئەسینا، فیلیپس و ئەدیرنەو شاری وەک ئەلجەزیرە، قاهیرە، مەککە، مەدینە، بەسرا، بەغدا و بەلگراد، گوێرایەڵی فرمانەکانی سولتانی قوستەنتەنییە بوون.»* رووباری وەک نیل، ئوردون،رووباری عاصی، دیجلە، فورات،

دانۆب، هیبرۆس (ماریتسا)و ئیلیسۆس، بەنێو سنووری ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا دەهاتن و سەرانسەری لێواری رۆژهەلاتی دەریای نێوەڕاست لە کەنارەکانی یۆگسلاڤیاوە تا کەنارەکانی ئەلجەزایر بە موڵکی ئەو وڵاتە لەقەڵەم دەدران.

دەریای نێوەڕاست، دەریای رەش، دەریای سوور، دەریای مەرمەرەو دەریای ئازۆف بەئاوەکانی تورکیا لەقەڵەم دەدران و هیلالی عوسمانی لە زنجیرە کێوەکانی ئەتڵەس ـــ لەرۆژئاوای ئەفریقاوە ـــ، تاکێوەکانی قەوقاز، بەسەر لوتکەکانی ئاتۆس، سینا، ئارارات، کرمل، تۆرۆس، ئیدا (پسیلۆریتی)، ئۆلۆمپ، پیلیۆن، هاکمۆس و کارپات و تەنانەت بەسەر بەرزاییەکانی ئاکرۆکۆریتۆسەوە دەشەکایەوە.

سەرنجی سلێمان هەمیشە بۆلای ئەورووپا بوو و، زانیارییەکی زۆری سەبارەت بەو کیشوەرە کۆکردبۆوە. لە باوکیەوە نەخشەیەکی بۆ بەمیرات مابوو کە کریستۆف کۆلۆمبس لە کاتی دۆزینەوەی دەریای نوێ دا کێشابوویەوەو دواتر ونی کردبوو. سەیر لەوەدایە عوسمانییەکان کە مەسیحییەکان وەک سوک تەماشاکردنێک پێیاندەگوتن (بەربەر)، پلانە جەنگییەکانی خۆیان لەسەر بنەمای نەخشەیەک دادەڕشت، کە کەنارەکانی رۆژئاوای ئیسپانیا و فەرەنساو ئەفریقاو ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و کەنارەکانی رۆژهەلاتی ئەمەریکای باکورو ناوەندی بەباشی نیشان دەدا.

دوای ئەوە کە سلێمان دەستی بەسەر هەنگاریادا گرت، رووی خۆی رووەو دوایین دەروازەی ئەورووپا، واتا ڤیەننا وەرگێڕا کە لەو سەردەمەدا شارێکی بچوک بوو و، بریتیبوو لەچەند کەلیساو شوێنێکی پیرۆز کە لەدەورەی کەلیسای کۆمەڵگەی سەن ئیستیفان بنیادنرابوون. لە ٨٠٠ ساڵ بەرلەوەکاتەوە، واتا لەسەردەمی شەڕی تورک کە سوپای عەرەب لەسەردەستی شارڵ مارتل تێکشکێندراو لەناوەندی فەرەنسا پاشەکشێی کردبوو، جیهانی مەسیحیەت هەرگیز لەگەڵ مەترسییەکی لەو چەشنەدا بەروڕووبەبۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتە ئەورووپاییەکان واتووشی ناکۆکی و هەڕەشەی جۆراوجۆری سەربازی بوون کە نەیانتوانی یارمەتییەکی ئەوتۆ پێشکەش بەبنکەی ڤیەننا بکەن و لەئاکامدا سلێمان وئیبراهیم توانییان لە دوایین رۆژەکانی مانگی ئەیلولی ١٥٢٩ (محرم-ی ٩٣٦ی کۆچی) دەورەی بدەن وبیخەنە ئابلۆقەوە. دوای خۆبەدەستەوەدانی (بودا)، ئیدی بیانوو بۆخۆ بەدەستەوەنەدانی ڤیەننا نەمابوو و، چاوەڕێ دەکرا لەماوەیەکی کورتدا بکەوێتە ژێر دەستی عوسمانیەکانەوە. سلێمان سوپایەکی پتر لە چارەکە ملیۆنێک سەرباز و سێسەد تۆپی لەگەڵ دابوو و، ڤیەننا تەنها بە ١٦٠٠٠ سەربازو ٧٢ تۆپ دەپارێزرا کە لەنێو حەساری شاردا ـــ کە مەترو نیوێک پان بوو و هیچ جۆرە مەرجێکی سەربازی و جەنگی تێدانەبوو ـــ، سەنگەریان گرتبوو.

لەدەوروبەری شار، تاچاو حوکمی دەکرد خێوەتە رەشەکانی سوپای سلێمان لە ناو دەشتە سەوزەکاندا هەڵدرابوون و سوارە نیزام بەدڵڕەقی و توندوتیژییەکی بێوێنە گوندەکانی دەوروبەریان تاڵان دەکرد. هەروەها سوپای تورک چوارسەد زەورەق و بەلەمی بچوکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو و، هاویشتبوونیە نێو رووباری دانۆبەوە، بەڵام تۆپخانە دوور هاوێژەکەی سلێمان بەهۆی زریان و باوباران لەنیوەی

ڕێگا بەجێ مابوو.
لەگەڵ ئەوەشدا سلێمان سێ هەفتەی تەواو، بەبەردەوامی هێرشی کردە سەر ڤیەننا. بەڵام هیچی بەهیچ نەکرد. لەئاکامی ئەو هێرشانەدا دەشتەکانی دەوروبەری ڤیەننا وا رووتانەوە کە تەنانەت سلێمان لەتێرکردنی سوپاکەیدا تووشی گیروگرفت بوو.
سلێمان چاری نەما جگە لەوەی واز لە گەمارۆدانی ڤیەننا بێنێ. لەدوایین شەودا بڕیاریدا بڕێکی زۆر لەغەنیمەت و کەلوپەلە بەتاڵان هێندراوەکان، لەژێر دیوارەکانی شاری ڤیەننا دا بسوتێنن. دوایی ئافرەت و کچە جوانەکانیان بەمەبەستی فرۆشتن لەبازاڕی کۆیلەکاندا جیاکردەوە باقی یەخسیرەکانی دیکەیان، کە زۆربەیان لادێ نیشنەکانی ناوچەکە بوون و بەهیچ شێوەیەک بەشدارییان لەجەنگدا نەکردبوو، بەزیندوویی و بە بەرچاوی دانیشتوانی شاری ڤیەنناوە کە لەسەر حەسارەکەوە سەیری ئەو کارەساتەیان دەکرد، خستە نێو ئاگرەو سووتاندیانن.
سلێمان و ئیبراهیم بەبێ ئەوەی مەترسی تاقیب کردن و سەرلەدوونان لەلایەن دوژمنیان لەسەر بێ، گەڕانەوە قوستەنتەنییەو، لەوێ نووشوستی و شکست خواردنی خۆیان لەگرتنی شاری ڤیەننادا بەدرۆدەلەسە وەک سەرکەوتنێکی مەزن نیشاندا. بەڵام هیچ هۆکارێک نەیدەتوانی ئەو راستیە تاڵە بشارێتەوە کەوا بۆ یەکەم جار ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی لەبەرامبەر دوژمنێکی لاوازدا شکستی خواردبوو.
خاڵێکی گرنگی دیکە کە ئەودەم پەسند نەدەکرا ئەوەبوو کە ئەگەر باوباران ڕێیان لەگەیشتنی تۆپخانە قورسەکەی سلێمان نەگرتبایەو ئەو تۆپانەگەیشتبانە پای دیوارەکانی ڤیەننا، ئەوا بەدڵنیاییەوە سلێمان ئەو شارەی دەگرت و بێگومان ئەودەمیش ڕێڕەوی مێژوو دەگۆڕا.

* * *

ئێستاکە چاخی زێرینی سلێمان گەیشتبۆ لوتکەی خۆی؛ ئەو نەتەنها لە جەنگەکانی سەر زەویدا سەرکەوتووبوو، بگرە هێزی دەریاییشی کە لەژێر فرمانی سامناکترین ئەمیرولبەحەری سەردەم، واتا خەیرەدینی ریش سوور( باربارۆسا)بوو، سەرکەوتنی مەزنی بەدەست هێنابوون. خەیرەدین چەتەیەکی دەریاییی تاوانکاری موسووری لوت چەماوەبوو، کە سلێمان خستبوویە ژێر رکێفی خۆی و خزمەتی دەوڵەتی عوسمانیی پێدەکرد. سلێمان بە شمشێرێکی بەئاڵتون نەخشێندراو خەڵاتی کردبوو و، نازناوی کاپودان پاشای پێبەخشیبوو. هەروەها سلێمان گەلە کەشتییەکی تازەی خستبۆ بەردەست کە کەشتی سەوڵیی خێرای تێدابوون و، هەرکام لەو کەشتییانە بەهێزی بازووی پەنجا سەوڵ لێدەری شەڕانی و ناحەز بەڕێوەدەبران. ئەو کەشتییانە کە رووی سەرەوەیان چەندین تۆپی جەنگییان لەسەربوو، وەک ئەو قایەغانەی کە ئەمڕۆکە لە پێشبڕکێکاندا بەکار دەهێندرێن، درێژییان هەشت بەقەدەر پانییان بوو و سەوڵ لێدەرانیان پتر یەخسیری شەڕ و جاری واش هەبوو کۆیلەکان بوون کە قاچیان بەزنجیر لێکدی بەستبوون و سەوڵە درێژەکانی دەستیان بەخێرایی بەرەوپێش و پاش دەبرد.
خەیرەدینی ریش سوور، کەنارەکانی ئەفەریقاو ئەورووپای بەهێرشە ئازایانەکانی

خۆی وێران کرد. هەروەها دەستدرێژیی کردە سەر زۆر شوێنی وەک ئیتاڵیا ، ئیسپانیا و دورگەکانی سیسل و تەنانەت کەنارەکانی دەریای ئەدریاتیک. لە ئەفەریقا شاری تونسی بەبیانووی ئەوەی کە سولْتان بەنی حەفەس کابرایەکی گەندەڵ و بەدڕەوشتە، داگیرکرد. بێگومان سوڵتانی تونس خاوەنی ئەو جۆرە ئاکارانە بوو ، چونکە هەموو هێز و توانای خۆی بۆ دروستکردنی حەرەمسەرایەک خستبۆگەر، کە چوار سەد کوڕوکچی جوانکیلەی تێدابوو، بەڵام نەدەبووایە خەیرەدین کە خۆی چەتەیەکی دەریایی بوو، وانەی رەوشت فێری سوڵتان بەنی حەفەس بکات.

خەیرەدینیش وەکو ئیبراهیم ئاگاداری ئەوە بوو کە هەرکاتێ تاڵان و بڕۆی دەست بکەوێ، دوای پڕکردنی خەزێنەکانی خۆی، هەندێ دیاری شیاویش بۆ سوڵتان بنێرێ و هەرکاتێ لە سەفەرێکی دەریاییی پڕ لە کوشت و کوشتار و تاڵان وبڕۆ دەگەڕایەوە قوستەنتەنییە، جلی ئەرخەوانیی دەکردە بەر دووسەد منداڵ و، کوپەو گۆزەی پڕ لە زێڕوزیوی دەخستنە سەرشان. لەپشت سەری ئەوانەوە کۆمەڵە منداڵێکی دیکە کیسەی پڕ لە دراوی زێڕیان لەسەرشان بوو و، دوابەدوای ئەوانیش دووسەد پیاوکە هەر یەکەو کیسە پارەیەکیان پێبوو، بەڕێوەبوون. لە کۆتایشدا دووسەد یەخسیری کافر کە پەڕۆی سپی لەشێوەی تەوقیان لەمل بەسترابوو، تێدەپەڕین. خەیرەدین ئەوانەی وەک دیاری دەبردە لای سوڵتان و دوای ئەوەی کە دەستی سوڵتانی ماچ دەکرد، دیاری و جلوبەرگی گرانبەهای پێدەبەخشرا .(٨) کاتێ خەیرەددین مرد، سلێمان فرمانی دا ئارامگەیەکیان لەبەردی گرانیتی رەساسی لەتەنیشت ئاوەکانی بسفۆر بۆ دروستکردو، هەروەها فرمانی دا بەپیتی عەرەبی لەسەر کێلەکەیان نووسی:« *لێرە گەمیەوان (ناخودا)ی دەریاکان ئۆقرەی گرتووە.*» کاتێ لەلایەن هێزی دەریایی و زەمینییەوە ئەو سامانە زۆرە بەسەر قوستەنتەنییەدا دەڕژا، دەرباری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی شانو شکۆ و رەونەقێکی پتری بە خۆیەوە دیت؛ کۆشکی تایبەت بە سوڵتان لەو دیوی دەروازەی (بابی سەعادەت)، دیوارەکانی لەمەرمەڕەی سپی و ناوکەشی دیوارەکانیشی لە بەردی بەخشڵ نەخشێندراو بوو. پەردەی پەنجەرەکانی لە تۆڕی زێڕ بوون و، سوڵتان زۆربەی کات دوای نیوەڕۆیان، لەم کۆشکە قەشەنگەدا پاڵی دەدایە بالیفی زێڕین و زیوین وپێخەفی قەدیفەی سووریان پێدادەدا.

سوڵتان هەرگیز جلەکانی خۆی و تەنانەت پەستەکە بەیاقوت نەخشێندراوەکانی خۆی دووجار نەدەپۆشی. خواردنی لەسەر مێزێکی زیوی نەخشێندراو و، لە دەفری زیوەدا دەخوارد. پتر حەزی لەخواردنی گۆشت ماسی بسفۆرو خواردنی قەروقاوڵ بوو و شەرابی لە جامی فیرۆزەی یەکپارچەدا دەنۆشی.

تەنانەت قایەغ چوارینەکانی بەشێوەیەکی شکۆدار، بەپەردەی رەنگاوڕەنگی مرواری لێدووراوەوە رازێندرابوونەوە. میچە پاقلاوەیی شێوەکەشیان، هێندەیان یاقوت و فیرۆزە لێدووریبوون کەلە دوورەوە دەبریسکانەوە.

گومان لەوەدانەبوو کە سوڵتان رووی خۆی رووەو ژیانی پرشکۆ و پڕ لە رابواردنی

چاخی بیزانس وەرگێڕابوو. سامانی زۆر، ساختومانی ئەستون دار، کلێساو تەنانەت ئەو مزگەوتانەی کە تازە درووست دەکران، کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەتی بیناسازی بیزانسییەوە و ئەوانە شایەدی ئەومیان دەدا کە تورکەکان دوای دەست بەسەراگرتنی قوستەنتەنییەو دامەزراندنی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی، ئێستا وا خەریکە رووەو گەندەڵی و لادان دەچن.

دانیلۆ دۆلودویسی ڤینیزی کە لەساڵی ١٥٣٤(٩٤١ی کۆچی)، سلێمانی لەتەمەنی چل ساڵیدا دیتووە، ئاوا وەسفی کردووە: *«پیاوێکی بالابەرز، بە لوتی چەماوەوە،کە کاروباری دەوڵەتی پتر لە جاران داوەتە دەست ئیبراهیم و حەزی لەرابواردن و پاڵ دانەوەیە.لە مەسایلی ئاینییدا دەمار گرژەو ژیانێکی ئاسایی و پڕ لە تەندرووستیی هەیە. وا بلاوە کەوا هۆش و ژیری بەئەندازەی پێویست نییەو تەنانەت هێزو وریایی پێویستی سوڵتانێکی گەورەی نییە. لەم رووەوە بەڕێوەبردنی کاروباری ئیمپڕاتۆرییەتەکەی خۆی سپاردۆتە دەست سەرۆک وەزیرانەکەی ئیبراهیم و بەبێ رەزامەندی و رای ئەو خۆی و دەربارییەکانی هیچ بڕیارێکی گرنگ دەرناکەن . ئەوەش لە کاتێکدایە کە ئیبراهیم بەبێ راوێژکردن لەگەڵ سوڵتان و گەورەکانی وڵاتدا، چی حەز لێ بێت دەیکا .»*

ئیبراهیمیش وەک هەموو ئەو کەسانەی کە بەخێرایی قۆناغەکانی پێشکەوتن دەبڕن و دەگەنە دەسەلات، وردە وردە رادەی بوغرایی و لەخۆبایی بوونی پتر و مەترسیدارتر دەبوو. لەمیواندارییەک کە لەساڵی ١٥٣٣ (٩٣٩ی کۆچی) رێکخرابوو، فرمانیان بە باڵیۆزە بیانیەکان دا بەر لەوەی دیارییەکانی خۆیان پێشکەش بکەن، داوێنی جلە زێردووراوەکانی ئیبراهیم ماچ بکەن. دواتر قسەیەکی سەرسوڕهێنەری بەم شێوەیە بۆ باڵیۆزە نێوبراوەکان کرد: *« ئەوە منم کە ئەو ئیمپڕاتۆرییەتە مەزنە بەڕێوە دەبەم. هەر بڕیارێکی کە من دەری بکەم دەبێ جێبەجێ بکرێت و دەسەلاتی تەواوم بۆ دانانی یاساو لادان و دانانی کاربەدەستان هەیە. هەرشتێ کە من بیبەخشم کەس مافی ئەوەی نیە بیستێنێتەوەو ئەو شتەیش کە نەیدەم، کەس ناتوانێ رەخنەی لێبگرێ. هەرکاتێ سوڵتانی گەورە بیەوێت شتێک بەیەکێک ببەخشێ ئەگەر من رام لەسەر نەبێ ئەوا سەرناگرێ. هەمووشتێ ،بە شەڕو ئاشتی و خەزێنەوە لەبەردەستی مندایە. من ئەو قسانە لەخۆڕاناکەم و بۆ ئەوەمە کە غیرەتتان پێ ببەخشم تا ئازادانە قسە بکەن.»*

* * *

ئەوە یەکەمجار نەبوو کە ئیبراهیم وا بەئاشکرایی قسەی دەکرد. ئەم کارەشی دەبووە هۆی خۆشحاڵیی دوژمنە بێ شومارەکانی و لە هەموویانیش گرنگتر روکسلانە. گومان لەوەدانیە کە روکسلانە یەکێک بوو لەوانەی کە لەدژی ئیبراهیم دەستی دایە پڕووپاگەندەکردنی ناڕەوا.

ئەو ئافرەتە، بەدرێژایی ئەو ساڵانە تەنها بەدوای ئامانجێکەوە بوو کە ئەویش دەستە بەرکردنی تاج و تەخت بوو بۆ سەلیمی کوڕی، بەلام مستەفای کوڕی گوڵبەهار لەمپەری سەر رێگەی کوڕەکەی بوو و، تاڕادەیەکیش ئیبراهیم، کە

کاریگەرییەتییەکی باشی بەسەر مێردەکەیدا هەبوو. روکسلانە لەو باوەڕە دابوو کە ئیبراهیم دەسەڵات و تواناکانی سوڵتانی داگیرکردووە و هەندێ لە دەربارییەکانی سوڵتانیش لەگەڵ روکسلانەدا هاوڕابوون. دیار نیە ئاخۆ ئەو کاتەی سلێمان ناچاربوو لەنێوان ژنەکەی و برادەرە گیانی بەگیانیەکەی یەکێکیان هەڵبژێرێت چ ئەفکارێکی پڕ لەنهێنی لە کەللە دابووە، بەڵام بەدڵنیاییەوە دەیزانی کە لەئاکامدا ململانێی ئەو دوو کەسە بەتراژیدیایەک کۆتایی پێدێت؛ ئەو دەبوو لەوە گەیشتبێت کە هەرگز ئیبراهیم خیانەتی پێ نەکردووە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە هەق بەلای روکسلانەدابوو، بەتایبەتی کاتێ قسەکردنەکانی ئیبراهیم یان کە لەولاو ئەولا ئەنجامی دەدان بۆ سوڵتان دەگێڕایەوە. بەراستی واپێدەچوو کە ئیبراهیم شێت بووبێت.

بەدەیان کەس لە دەربارییەکانی سوڵتان بەسەرسوڕمانەوە گوێبیستی ئەو قسەیەی ئیبراهیم ببوون کە گوتبووی: *« ئەگەر ئەو (واتا سوڵتان) فرمانێک بداو من دژی بوەستم ئەوا ئەو فرمانە جێبەجێ ناکرێت، بەڵام ئەگەر من فرمانێک بدەم و ئەو دژایەتی بکات ئەوا بەدڵنیاییەوە جێبەجێ دەکرێ.»*

چەند مانگێک پەیوەندیی نێوان سوڵتان و ئیبراهیم رووی لەگرژی ناو، سوڵتان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئیبراهیم بووەتە مایەی مەترسیی، بەڵام لەهەمانکاتدا تووشی عەزابی ویژدان ببوو لەبەر ئەوەی کە سوێندی خواردبوو تا زیندووبێ خۆی لە ئیبراهیم تووڕە نەکات و لێی بەقین دانەچێت . ئێستاکە پێویستی بەوە هەبوو کە رێگەیەک بۆ شکاندنی سوێندەکەی خۆی بدۆزێتەوەو ئەم رێگەیەش لەلایەن یەکێ لەراوێژکارە یاساییەکانی دیوانەوە خرایە بەردەم سوڵتان بەوەی کە بەسوڵتانی گوت: *« ئێوە سوێندتان خواردووە کە تازیندوو بن نەیکوژن. وابکەن کاتێ ئێوە لەخەودان و نووستوون، بیخنکێنن؛ چونکە ئەو کەسەی نوستبێ، بەکردەوە زیندوو نییە. بەم شێوەیە دەتوانن بەسزای خیانەتی خۆیی بگەیەنن و ئێوەش سوێندەکەتان لێنەکەوێ.»*

چ راست چ درۆ، پێدەچوو رێگەیەکی باش بێت و لەگەڵ دابونەریتی تورکەکاندا دەگونجا. لەم رووەوە سوڵتان پەسندی کرد و بێئەوەی بهێڵێ کەس ئاگادار بێ، بەخێرایی پیادەی کرد.

لە ١٥ی ئازاری ١٥٣٦ (٢ی شوال ـی ٩٤٢ی کۆچی)، ئیبراهیم وەک جاران بەمەبەستی خواردنی نانی ئێوارە لەگەڵ سوڵتاندا، روویکردە بابی عالی. ئیبراهیم نەیدەتوانی هیچ جۆرە شوبهەو گومانێکی هەبێ؛ چونکە سوڵتان زۆر بەگەرم و گوڕی پێشوازی لێکرد و بچوکترین ئاماژەیەکیشی بەرووداوەکانی ئەو دواییە نەداو بەهیچ جۆرێ نکۆڵی لەوەفاداری ئەو لەهەمبەر سوڵتاندا نەکردو، بگرە بەپێچەوانەوە بەپێی نووسینی مێژوونووسان هێمنانە بەخواردنی نانی ئێوارەوە خەریک بوون و سەبارەت بە کاروباری وڵات و کاری رۆژی دوایی دوان. ئەوجا سوڵتان وای نیشاندا کە خەوی دێت و پێشنیازی ئەوەشی بە ئیبراهیم کرد کە شەو لەوێ لە ژوورەکەی تەنیشت ئەودا بخەوێ.

ئیدی کەس ئیبراهیمی بەزیندوویی نەدیتەوە؛ بۆ بەیانی لاشە خنکێندراوەکەیان لەبەردەم دەروازەی (بابی سەعادەت دا) دۆزییەوە، بەلام وادیار بوو کە ململانێیەکی سەخت لەنێوان سەرۆک وەزیران و ئەو خولامە کەڕولانەدا رویداوە کە بۆ کوشتنی راسپێردرابوون. هەندێ پەڵەخوێن بەسەر دیوارەکانی ژوورەکەوە بوون کە تا یەک سەدە دواتر هەر بەوێوەبوون وشوێنیان مابوو.

دەیانگوت ئەو شەوە لەهەژمەتان سوڵتان خەوی لێنەکەوتبوو، بەلام روکسلانە بە ماچە تەڕەکانی خۆی نەهێشتبوو سوڵتان گوێی لەدەنگی زرم و هۆڕی ژوورەکەی تەنیشتی بێت. چیرۆکێکی سەرسوڕهێنەرە کە رەنگبێ هەندێ لق و پۆپیشیان پێوەنابێ.

* * *

دوای ئیبراهیم، سێ کەسایەتی بێ بایەخ یەک بەدوای یەک جێی ئەویان گرتەوە. یەکەمیان گیرۆدەی دەستی کاروباری حەرەمسەراکەی بوو؛ چونکە ئەو کاتەی کە کرا بە سەرۆک وەزیر، لەکۆشکەکەیدا لانکی چل منداڵ رادەژێندرا و ئەوکاتەیش کە بەنەخۆشی تاعون مرد، ١٢٠ منداڵی لەپاش بەجێما. دووەمیان تەنها ساڵێک سەرۆک وەزیر بوو و لادرا. سێیەمیان خواجەسەرایەک بوو کە پۆستی مەزنی سەرۆک وەزیرایەتیی پێبەخشرا و، لە ساڵی ١٥٤٤ (٩٥١ی کۆچی) لەسەرکار وەلانرا. بەلام کەسی چوارەم لەوان زۆر گرنگتربوو؛ نێوی رۆستەم پاشاو زاوای سوڵتان و مێردی کچەکەی روکسلانە بوو. هەرکە رۆستەم بوو بە سەرۆک وەزیر، لەگەڵ رۆکسلانەدا بوونە هاوپەیمانی یەکدی؛ چونکە بەرژەوەندی هەردوولا وایدەخواست کە لە جیاتی مستەفای کوڕی گوڵبەهار، سەلیم ببێتە جێگری سوڵتان. بەلام ئەوان ناچاربوون ماوەی (٩) ساڵ واتا تاساڵی ١٥٥٣ (٩٦٠ی کۆچی) راوەستن بۆ ئەوەی روکسلانە بتوانێ ئەو تاوانە بەسوڵتان دووپات بکاتەوە کە دەرهەق بە ئیبراهیم ئەنجامیدابوو.

ئەگەرچی مستەفا لاوێکی جوان و ئازاو بەجەرگ و خۆشەویستی خەڵک بوو، بەلام بۆ جارێکی دیکەو دووبارە، روکسلانە توانی پیلانەکەی خۆی جێبەجێ بکات. مستەفا لە نێو سەربازانی سوپاکەی سوڵتاندا زۆر خۆشەویست بوو و کەس گومانی لەوە نەبوو کە لەداهاتوودا جێی باوکە تەمەن (٦٠) ساڵاناکەی خۆی دەگرێتەوە. (گیوم پۆستەل)ی نووسەری فەرەنسایی لەوبارەیەوە نووسیویەتی: « *مستەفا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەڕەوشت و خوێندەوارو وریا بوو و، لەهەموو روویەکەوە ئامادەی گەیشتنە تاج و تەخت بوو. بەلام رۆستەم و روکسلانە بۆ بەدناوکردنی و لابردنی لەسەر رێگا، دەستیان دابۆ چاندنی تۆوی بەدگومانی و بۆ جارێکی دیکە ئەوەی دەرهەق بە ئیبراهیمیان کردبوو، بەرامبەر بە مستەفا، دووپاتیان کردەوە.*»

بۆ جارێکی دیکە سوڵتان بابەتەکەی خستە بەردەم راوێژکارە یاساییەکانی و چیرۆکێکی خەیاڵیی لەبارەی کۆیلەیەک بۆ گێڕانەوەکە لە کاتێکدا جێی متمانەی خاوەنەکەی بووە، هەستاوە پارەوپولی خاوەنەکەی دزیوەو لە دژی دەستی

بەپیلانگێڕی کردووە. دیارە مەبەستی سوڵتان لە کۆیلەکە مستەفای کوڕی بوو ولەمبارەمیەوە پرسی بەموفتی دەربار کردو موفتی دەرباریش فتوای ئەوەیدا کە ئەگەر کەسێکی ئاوها هەبێ ئەوا دەبێ بەئەشکەنجەو کوشتن سزابدرێت.

دوای دەرچوونی ئەم فتوایە، لە ٢١ی ئەیلولی ١٥٥٣ (١١ی شەوال-ی ٩٦٠ی کۆچی) کاتێک کە سوڵتان لەگەڵ سوپاکەی لەئاسیای نێوەڕاست بوو، مستەفای بانگ کردە چادرەکەی خۆی. هاوەڵەکانی مستەفا پێیانگوت کە نەچێ، بەڵام مستەفا بەشێوەیەکی سەرزەنیشتکارانەوە پێیگوتن ئەگەر بڕیار وابێ گیانی لەدەست بدات، باشتر وایە بەدەستی کەسێک بێت کە هێناویەتە دنیاوە.

چادری مستەفا لەتەنیشت چادری پاشایەتی هەڵدرابوو و، ڕۆژی دوایی بەپێی نەریتی باوی ئەودەمە، بەسواری ئەسپ ئەو مەودا کورتەی نێوان دوو چادرەکەی بڕی. چادری سوڵتان زۆر مەزن و پڕشکۆبوو و بەسەر چەند حوجرەیەکدا دابەش دەبوو و، زەوییەکەی بەفەرشی گرانبەها داپۆشرابوو و دیوی ناوەوەی بەقوماشی زێڕدووراو ڕازێندرابۆوە. لەچوار دەورەی هۆڵەمەزنەکەی نێو چادرەکە، مێزو کورسی دانرابوون و لەنێوەڕاستی هۆڵەکەش، مێزێکی پێچکە کورتی زیو دانرابوو.

مستەفا سڵاوی لە پاسەوانەکانی سوڵتان کردو لەئەسپ دابەزی، بەدوو قەراوڵەکەی پێش خۆی گوت لەبەردەرگا بوەستن و چاوەڕێی بن. ئینجا بە مەبەستی دیتنی باوکی پێی نایە چادرەکەوە، بەڵام لەجیاتی دیداری باوک لەگەڵ خوڵامی کەڕ ولاڵدا بەرەورووبۆوە کە یەکێکیان گوریسێکی ئاوریشمی پێبوو. ئەودەمە واباو بوو کە پیاوی گەورەیان بەگوریسی ئاوریشم دەخنکاند و ئەوەش دەبووە هۆی ئەوەی کە کاری خنکاندنەکە خێراتر بەئەنجام بگات . هەروەها بۆ ئەوەی کەس نەزانێ کێ کووشتوویەتی پێشتر زمانی ئەو خوڵامانەی کە بۆ بەجێ گەیاندنی ئەو کارە رادەسپێردران، دەبڕدراو پەردەی گوێچکەکانیشیان دەدڕاندن. بەپێی گوتەی خەڵک، مشتومڕێکی توندو لێکدان وپێکدادانێکی سەخت لەنێوان مستەفا کە بەرگری لەخۆی دەکردو ئەو خوڵامانەی کە دەبوایە بیخنکێنن، ڕوویدا و بەدرێژایی ئەو ماوەیە سلێمان لەپشت پەردەکەوە وەستابوو و گوێی دەدایە ئەو شەڕو پێکدادانە. کاتێک کارەکە کۆتایی پێهات و کوڕە خۆشەویستەکەییان کوشت، بێئەوەی بچوکترین هێمای بەزەیی یان پەشیمانی تێدابیندرێت، لەپشت پەردەکە هاتەدەرەو بەوردی سەیری تەرمی کوڕەکەی کرد.

هەر کە سوڵتان گەڕایەوە قوستەنتەنییە، درۆیەکی گەورەیان ڕێکخست؛ گوایە نامەیەک گەیشتبۆ دیوانی هومایون کە بەمەرەکەبی سپی لەسەر کاغەزی ڕەش، هەواڵی کوشتنی کوڕە خۆشەویستەکەی سوڵتانی تێدا نووسرابوو. سلێمان مەندیلەکەی خۆی بەزەوی داداو یەخەی خۆی دادڕی و فرمانیدا تەواوی فەرشەکانی کۆشک بەبەراوەژوویی ڕابخەن و سێ ڕۆژ بۆ کوڕە ناکامەکەی پرسە دانێن. ژمارەیەک مەڕیان سەربڕین و بەسەر هەژاراندا دابەشیان کردن. لەڕۆژی ناشتنی تەرمی مستەفادا، دەرمانێکیان لەچاوی ئەو ئەسپانە کردبوو کە تەرمەکەیان دەگواستەوە سەرقەبران و بەردەوام ئەسپەکان فرمێسکیان دەڕشت.

ئێستاکە رێ بۆ سەلیمی کوڕی روکسلانە والابوو.

* * *

دەبێ سلێمان لە دواین سالەکانی سەڵتەنەتەکەیدا زۆر نارەحەت بووبێت. دوو ساڵ دوای کوشتنی کورەکەی، (ئۆژییە گیزلین دۆبووز بەک)ی باڵیۆزی ئیسپانیا لە قوسەنتەنییە لەو بارەیەوە نووسیویەتی: «بەسەرنجدان لەوەی کە سلێمان ساڵانێکی دووروردرێژ بە سەلامەتی و کامەرانییەوە ژیاوە، ئێستا پێدەچێ پێستی دەمووچاوی لەبەر نەخۆشییەکی شاراوە وارەش هەڵگەڕابێت.دەنگۆی ئەوە هەیە کەوا تووشی شێپەنجە، یان برینی گەدە بووبێت. کاتێ رێگەدەدا باڵیۆزێک سەردانی بکات، ئەوا لەترسی ئەوەی نەوەکا بیرەوەرییەکی تاڵ لای کابرا بەجێی بێڵێ، سووراو لەدەم و چاوی دەداو، لەو باوەڕە دایە کە کاتێ ولاتانی بیانی بزانن هێشتا تەندرووست و بەهێزە، پتر لێیدەترسێن.

من هەندێ هێمای حاشا لێنەکراوم لەکاتی خواحافیزیدا تێدا بەدی کردن و دیتم دەموچاوی لەگەڵ ئەوکاتەی کە بۆ یەکەمجار دیتبووم زۆر جیاوازە.»

پێنج ساڵ دوای کوژرانی مستەفا، روکسلانەش مرد و لەبەر ئەوەی کە ئافرەت بوو مردنەکەی بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدرا. سلێمان رێگەی بەخۆی نەدا لە ناوشوێنە گشتییەکاندا پرسەی بۆ دانێن. دەرگاکانی ساختومانەکەی روکسلانە مۆرومۆم کران و لەوێ بەدواوە سلێمان بەتەنیا نانی دەخوارد. (دۆمینی)ی سکرتێری باڵیۆزخانەی ڤینیز لەو بارەیەوە نووسیویەتی: « سولتان لەماوەی ئەو چەند مانگەی دواییدا زۆر کزبووە و وەک مردووانی لێهاتووە. بەهۆی نەخۆشی شەکرەوە لاقی ئەستوور بوونەوە و دەموچاویشی ئاوساوە. رەنگێکی سەیری بەخۆوە گرتووە. لە مانگی ئازاری رابردوودا، دووجار لەخۆ چووە و لەوکاتەوە تائێستا جارێکی دیکەش وای لێهاتۆتەوە، لە خۆچوونەکەی ئەم دواییەی بەشێوەیەک بووە کە ئەوانەی لەدەوروبەری بوونە گومانیان لەوە هەبووە داخۆ زیندووە یان مردووەو هیوایەکی ئەوتۆیان بە ژیانی نەبووە.»

سوڵتان کەموکورتی رۆحیشی تێدا بەدی دەکرا و وەک بەرەبابەکەی چیتر حەزی نەدەکرد بەشداری لە دانیشتنەکانی دیواندا بکات. ئەم کارەش بووە هۆی ئەوەی کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە دەسەلاتی سوڵتان کەم بێتەوە؛ چونکە وا باوبوو کە دەبێ سوڵتان ئاگای لەهەموو ئەو رووداوانە بێت کە لەولاو ئەولای ئیمپراتۆرییەتەکەیدا روویان دەدا. ئەو پێشینەیەی کە لە بەخشینی پلەوپایە بەرزە دەوڵەتییەکان بەهاورییانی و لەوانە ئیبراهیم و رۆستەم بەرقەراری کردبوو، بووە هۆی پەیدابوونی خووی ناپەسندی پارەپەرستی و ماڵ کۆکردنەوەو خۆ دەوڵەمەندکردن. کاتێ دوای ماوەیەکی کورت لەمەرگی روکسلانە، رۆستەمیش کۆچی دوایی کرد، سامانێکی زۆری لەپاش بەجێما و، ئەمەش بۆ کەسێک کە ژیانی وەکو کۆیلەیەک لە فێرگەی کوڕانی بەدیاری هێندراوەوە دەستی پێکردبوو، سەرسوڕ هێنەربوو.

سامانی نێوبراو بریتیبوو لە: ٨١٥ گوند، ٤٧٦ ئاشی ئاو، ١٧٠٠ کەنیزەک و

خولام، ٢٩٠٠ زرێ، ٨٠٠٠ مەندیل، ٧٦٠ شمشێر، ٦٠٠ بەرگ قورئان و ژمارەیەکی زۆر کڵاوزرێی زێرین و لغاو ورکێفی زێڕی ئەسپ و دوو ملیۆن دراوی زێڕ.
ئەو نەریتەی کە سلێمان لەواڵاکردنی دەستی برادەرانی خۆی بۆ پارەکۆکردنەوەو کڕین و فرۆشتنی پلەوپایە دەوڵەتییەکاندا دایهێنابوو، وەک نەخۆشییەکی کوشندە بە سەرانسەری ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا بڵاوببۆوە. بەڵام لەهەمووشتێ خەراپتر ئەوەبوو کە ئەو قۆناغە، بوو بەدەستپێکی فرمانڕەوایی کردنی ئافرەتانی حەرەمسەرا کە حەرەمسەرایان وەک ناوەندێکی فیتنەو پیلانگێڕی لێکردبوو و بەم پێیە بوونە هۆی ئەوەی داهاتوویەکی شوم چاوەڕێی وڵات بکات. ئەو قۆناغە کاتێ دەستی پێکرد کە روکسلانە بەئاشکرا دەیگوت: « من شەو و رۆژ لەگەڵ سوڵتاندا دەژیم و هەر کارێکی حەزم لێی بێ پێیدەکەم.»
لەگەڵ ئەوانەشدا سلێمان کەسایەتییەکی بەرجەستەبوو. لەڕادەبەدەر دڵ رەق بوو، بەڵام نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کەوا لەو سەردەمەدا بێڕەحمی و دڵڕەقی شتێکی ئاسایی بوو و تەنها تایبەتیش نەبوو بە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانییەوە.
لە ئەورووپاش نمونەی زۆر لەدەمارگیریی توندوتیژی ئایینی بەرچاودەکەوت کە خەڵکیان بەناوی کافرو مورتەدەوە بەزیندوویی دەسوتاندو ئەشکەنجەیان دەدان. رەنگبێ هەر لەبەر ئەو دڵڕەقییەی ئەو سەردەمەش بووبێت کە خەڵکی ئەو سەردەمە کەمتر لە خەڵکی ئەمڕۆ لە ئەشکەنجەدان دەترسان و ئەشکەنجەدانیان پێ سزایەکی ئاسایی بووە.
ئەگەرچی سەردەمی سەڵتەنەتی سلێمان بەهۆی کوشت و کوشتارە خێزانییەکانی نێوخۆییەوە لەککەدار ببوو، بەڵام لەهەمانکاتدا ژیانی هانری هەشتەمی پاشای بەریتانیا کە لەگەڵ سلێماندا هاوچەرخ بوو، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ هی سلێماندا نەبوو.
سلێمانیش وەک زۆربەی کەسایەتییەکانی سەردەمی رێنیسانس، بەیەک ئەندازە دڵرەق و هەستومر بوو؛ شیعری دەگوت و بایەخێکی تایبەتیشی بەمەسەلە سیاسییەکان دەدا.
بەقەدەر ئەوەی لەشەڕدا توندو دڵڕەق بوو، تەلارو کۆشکی مەزنی درووست دەکردن. وێڕای ئەو مزگەوتە گەورەو مەزنەی کە لە قوستەنتەنییە ناوی ئەوی بەسەرەوەیە، بەهاوکاری میعمارەکەی (سینان) کە ئەویش کوڕە خولامێکی بەدیاری هێندرا و بوو،بینای جۆر بەجۆری لە عەمباراوی چل ستوونەوە بگرە تا دیواری دەورەی شاری کۆنی (قودس)ی درووست کردن.
لەگۆڕەپانی شەڕیشدا سەرکردایەتی ئەو سوپایەی کە لەڕووی رێکوپێکییەوە لەسەرووی هەموو سوپاکانی دنیابوو، دەگرتە ئەستۆ و ئێرانییە شیعەکان و مەجەرە کافرەکان، ئەو دوژمنانە بوون کە لەڕادەبەدەرو رقی لێیان دەبۆوەو ئەغڵەب بۆخۆی بەشەخسی هێرشی دەکردنەسەر. بەبڕوای ئەورووپاییەکان سلێمان مەتەڵێک بوو کە هەڵنەدەهێندرا، بەڵام لەماوەی سەڵتەنەتە درێژەکەیدا قوستەنتەنییە بوو بەناوەندی باڵیۆزخانە بیانیەکان وتەنانەت ئەلیزابێتی یەکەمی شاژنی بەریتانیا، لەبەرامبەر

پاشـای کـاتۆلیکی ئیـسـپـانیـادا، داوی یارمـەتی لەسلێـمـان کـرد. پەیماننـامـەی دۆسـتـایەتی نێـوان سلێـمـان و فـەرەنسـا کـە لەسـاڵی ١٥٣٥ (٩٤٢ی کـۆچی) دا ئیمزاکرا، بەدرێژایی دوو سـەدە بەفاکتۆرێکی چارەنووسـساز لەگۆڕەپانی سیاسیی ئەوروپا لەقەڵەم دەدرا.

سلێمان بەو شێوەیەی کە خۆی حەزی لێدەکرد، واتا لە گۆڕەپانی جەنگدا مرد. تەمەنی ٧٢ ساڵان بوو کە لەشکرەکەی بۆ شەڕکردن لەگەڵ ماکسی میلینی دووەمی ئیمپراتۆری ئۆتریش بەڕێخست. سوڵتانی پیر بەڕادەیەک کزولاواز ببوو کە تەنانەت نەیدەیوانی سواری ئەسپ بێت . لەم رووەوە خـستبوویانە نێو کـەژاوەیە کەوە، بەڵام هێشـتـا گـوڕوتینـی دەروونی خـۆی لـەدەست نەدابوو؛ چونکە لـەسـەر رێگەی خـۆی و لەشاری بودا فرمانی دا پاشای ناوچەکە بەتاوانی بێ توانایی لەسێدارە بدەن.

ئەو لەوکاتەیدا کە هێزەکانی لەگەڵ هێزە ئۆتریشی و ئەڵمـانیاییەکاندا خـەریکی شـەڕێکی خـوێناوی بوون، لەشـەوی پێنجی ئەیلولی سـاڵی ١٥٦٦ (١٩ی سـفـەری ٩٧٤ی کۆچی)، لەنێو چادرەکەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد، بەڵام هەواڵی مردنی بۆ مـاوەی سێ هـەفـتـە بەپەنـهـانی هێڵـدرایەوەو، پزیشکە تایبەتییـەکەیـان خنکاند بۆ ئەوەی نەوەکـا ئەم نهێنیـە ئاشکرا بکات. هەمـوو ئەوانەش بۆ ئەوەبوو تا سـەلیمی کوڕی روکسـلانە کە ئەودەم لە ئاسیـای نێـوەڕاست بوو، دەرفـەتی ئەوە پەیدا بکات خۆی بگەیەنێتە قوستەنتەنییە.

چەند رۆژێک تـەرمی سـوڵتـانیـان بـەچاوی واڵاو دەمـوچاوی سـوراو لێـدراوو قژی رەش کراوەوە، لەسـەرتەخت دادەنیشـاندو، لەناو چادرەکەی خۆیدا کە تەنهـا سەرۆک وەزیرو هـەندێ لەو خـوڵامانـەی کە ئاگایان لەنهێنیی مەرگی سـوڵتـان بوو و، رێگەیان پێـدرابوو هاتووچۆی بکەن، دایاننابوو. ئەم شـانۆگـەرییـە ترسناکـە هـەمـوو رۆژێ دووپات دەکـرایەوە تاکـەس ئاگـادار نەبێ و خـەڵکەکـە نەزانن کـە سـوڵتـان مـردووە. پەیامـەکـانیـان لە پەیکەکـان وەردەگـرت و دەیانبـردنە نێـو چادری سـوڵتـان و وەڵامەکانیان دەهێنانەوە. تەنانـەت کاتێ شەڕ کۆتایی پێهات و چادری پاشایەتییان کۆکـردەوە، تەرمی سلێمـانیـان خسـتـە نێو گـالیسکەیەکـەوەو بەشێوەیەک بوو کە رووخسـاری عـەبوس و تێکسـرەماوی لەدوورەوە بەباشی دەبیندراو سـەربازەکانیشی کە رووەو قوستەنتەنییە دەگەڕانەوە، هەلهەلەیان بۆ لێدەدا.

کـاتێ ئەم مـەوکیـبـە گـەیشـتـە نزیک پایتـەخت، هەواڵی مـردنی سـوڵتـانیـان بڵاوکـردەوە. هەر لەوێ سـەلیم خـۆی کرد بە سـوڵتان و کـاتێ کە پیـاوان وزانایانی ئایینی مـردنی سلێمانیـان راگەیاند، دەنگی هاوارو شیوەن و فیـغانی خەڵک لەناو درەخـتـەکـانی جـەنگەڵدا دەزرینگایەوەو گەڵای درەخـتـەکـانی دەلەراندەوەو ئەوانەی لەسـوڵتـانەوە نزیکبـوون ئەو دیمەنەیان بە هـاودەردی سـروشت لەگەڵ ئەو خـەڵکەداو لەهەمبەر ئەم کارەساتە گەورەیە تەفسیرکرد.

تەرمی سلێمـانیان شوشت و بەپێی نەریتە ئایینییەکان، دەستەکانییان لەسـەر سـینگی دانـاو لۆکـەیـان لەگـوێ و لوت و زاری ئاخنی و لەدواسـاتدا کـە دەیانـویست لەکفنێکی ئاوریشـمیی باوێن، یەکێ لەپیاوانی ئایین وەڵامی ئەو پرسیارانەی بەگوێدا

چرپاند کە فریشتەکانی بەردەرگای بەهەشت (نەکیرو مونکیر) لێیدەکەن. ئەوجا لەسەر لاکەلەکەی چەپە درێژیان کرد و سەریان لە قیبلە کرد و لەتەنیشت ئەو مزگەوتەی کە سینان بۆی درووستکردبوو، شاردیانەوە. قورئان خوێنەکان ماوەی چل شەو چل رۆژ، هەر رۆژەی چل جار قورئانیان بۆ خەتم کرد.

* * *

### فەسڵی سێیەم

### فرمانڕەوایی ئافرەتانی حەرەمسەرا

لەو ماوە سێسەد ساڵییەی کە بەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانیدا تێدەپەڕی، دە سوڵتانی بەرایی، ئیمپراتۆرییەتێکی بەهێزیان بەسی ملیۆن نفوس کە بە ٢٠ زمان دەئاخڤین، پێک هێنابوو و، هەر بستێکی ئەو خاکە، بەزەبری شمشێری سوڵتانە جەنگاوەرو دلێرەکانی عوسمانی کە خۆیان سەرکردایەتی سوپاکانیان دەکرد، بەدەست هێندرابوو.

ئەگەرچی دڵڕەق و بێبەزەیی بوون، بەڵام لەهەمانکاتدا سیاسەتوانێکی لێوەشاوەی ئەوتۆبوون کە لەوسەردەمە دا لە دنیادا هاوتایان نەبوو.

حەزیان لە هونەر و جوانی بوو و، مێژوونوس وبیناسازو شاعیریشیان تێدا هەڵکەوتبوو. بەکورتیەکەی رەنگبێ عوسمانی گەورەترین سیلسیلەیەک بێت کە دنیا بەخۆوەی دەیتووە، بەڵام ئێستاکە لە پڕێکا هەموو شتێ گۆڕا بوو و، لە نێوچوون و لادان و دارمان جێی شان و شکۆی پێشووی گرتبۆوە؛ دلێرانی گۆڕەپانەکانی جەنگ جێی خۆیان دابوو بەو پیاوانەی کە زۆربەی کاتی خۆیان لە نێو حەرەمسەرا دا بەسەر دەبرد. پلەوپایە بەرزە دەوڵەتیەکان ببوون بە وەسیلەی ماڵ کۆکردنەوەو گیرفان پڕکردن و، سەیر لە وەدابوو کە ئەم بارودۆخە تاسەدەی بیستەمیش درێژەی کێشا. ئیدی قسە لەسەر یەک دوو سوڵتانی لێنەوەشاوەو بێ توانا نەبووکە لە هەموو سیلسیلەیەکدا هەن، بگرە ئەم لادان و داتەپینە وەک هێڵێکی نەپچڕاوەی لێهاتبوو کەوا کەم تا زۆر هەموو ئەو (٢٥) کەسەی دوای سلێمان لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشتن، هیچ کامیان بەبێ جیاوازی،توانا و تایبەتمەندییەکانی سوڵتانێکی بەهێزو لێوەشاوەیان تێدا بەدی نەدەکرا .بەشێوەیەک کە پرۆفیسۆر بارنێت میلەر لەکتێبی *«لە پشت دەروازەکانی بابی عالی»* دا، نووسیویەتی: *«مەودایەکی گەورە لەنێوان سلێمان و ئەو جێنشینانەی کە هەر لەدوای ئەو جێگەیان گرتەوە درووست بوو.ئەوانەی لەدوای سلێمان لەسەر تەخت دانیشتن، نە سەرکردەیەکی سەربازی باش بوون و نەسیاسیەتمەدارێکی لێوەشاوە؛ ئەوان بە بەهۆی ژیانی گۆشەگیرانە وبێکارییەوە تووشی خەمۆکی ببوون و خۆشی و لەززەتەکانی ژیانیان لە کاری بێ بەرنامە، بەڕەڵایی و سەرسەرییایەتیدا دەدۆزییەوە.»* ئەم گۆڕانە بەڕادەیەک سەرسووڕهێنەرەکە هەندێ لە مێژوونووسان ئەگەری ئەوەیان خستۆتەڕوو، کە بنەماڵەی عوسمانی لەگەڵ مەرگی سلێماندا لەناوچووەو خەڵکی دیکە جێی

سوڵتانیان داگیرکردووە.

سەلیم دەمو چاوێکی ئاوساوی هەبوو و پتر بەو کەسانە دەچوو کە بە بەردەوام دەیانخواردەوەو لەو رووەوە خێرا نازناوی (مەیخۆر) یان سەردابڕی. هێشتا چەند مانگێک بەسەر دەسەڵاتدارییەتی سەلیمەوە تێنەپەڕی بوو، کە لە هەر چوارلای پایتەخت پڕووپاگەندەی ئەوە بڵاوبۆوە کە سلێمان باوکی راستەقینەی سوڵتانی نوێ نەبووە.

(فۆن هامێر) کە گەورەترین نووسەری مێژووی عوسمانییە، ئاماژە بەم پڕۆپاگەندانە دەکات و لەو بارەیەوە نووسیویەتی: « *ئەگەرچی راستی ئەم پڕۆپاگەندانە ناسەلمێندرێن، بەڵام دوورنیە ئافرەتێکی سەرسەری و سەربزۆزی وەک روکسلانە یەکێک لە ئەویندارەکانی خۆی هێنابێتە حەرەمسەراوە.*»

ئەگەرێکی دیکەی ئەم باسە ئەوەیە کەوا باوکی راستەقینەی سەلیم، ئیبراهیم بووبێ؛ چونکە (لوئیجی باسانۆ)ی مێژوونووسی ئیتالیایی، کەکاتی خۆی بە منداڵی و لەساڵانی سەرەتای سەڵتەنەتی سلێمان وەک خۆڵام لەدیوانی عوسمانیدا بووە، پێ لەسەر ئەوە دادە گرێ کە لەسەرەتادا روکسلانەی دایکی سەلیم لای ئیبراهیم بووە و دواتر لە لایەن ئەوەوەپێشکەشی سوڵتانی کراوە. ئاشکراشە کە کەنیزەکێکی وا جوان و رازاوە بۆماڵینی ژوورەکانی حەرەمسەرا نەهاتبۆ دنیاوە.

راستی مەسەلەکە هەرچییەک بێت، بە قەولی (لۆرد ئۆرسلی)ی مێژوونووسی ئینگلیزی: «*پیاو سەبارەت بەوەی کە ئایا خوێنی راستەقینەی بەرەبابی عوسمانی لە دەماری ئەو (٢٥) سوڵتانەی دوای سلێماندا گەڕاوە یان نا؟ دەکەوێتە گومانەوە.*»

* * *

یەکەم کاری سەلیم پاش گرتنە دەسەڵات ئەوەبوو کە تەواوی ئافرەتانی حەرەمسەراکەی باوکی بۆ ئەدیرنە دوورخستنەوە و ژنە نوێیەکەی، واتا سوڵتانە نوربانوی دایکی کوڕە گەورەکەی خۆی، هێنایە حەرەمسەراوە. نوربانو، بە (١٥٠) خزمەتکارەوە پێی نایە حەرەمسەرای سەڵتەنەتییەوەو خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی وەک روکسلانە بەسیاسەت بازییەوە خەریک بێت. مەرگی روکسلانە کاری ئەوی ئاسانتر کرد و ئیدی مەجبور نەبوو لەگەڵ شاژنی دایکدا رکابەری بکات. بەڵام نوربانو چاوەڕێی دەرفەتێکی لەباری کرد و ئەم دەلیڤەیەش بە مردنی سەلیم هاتەکایەوە؛ دوای مردنی سەلیم، خۆی بوو بە (سوڵتان والیدە)و جڵەوی کارەکانی گرتەدەست.

هۆی ئەم چاوەڕوانییە چەندین ساڵەیە ئەوە بوو کە سەلیم بە بەردەوام مەست و سەرخۆش بوو و، و لەلای خۆیەوە بچوکترین بایەخێکیشی بە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات نەدەدا. بەڵام شانسی هەبوو؛ دوایین سەرۆک وەزیری سلێمان واتا (سوقولەلی محەمەد)ی لەباوەکییەوە بۆ بەمیرات مابۆوە، ئەم کابرایە بەلێزانی و کارزانییەوە کاروباری وڵاتی بەڕێوەدەبرد و لەشکری دەنارده بەرەکانی شەڕ.

نوربانو تێگەیشتبوو کەوا لەڕوانگەی دانیشتوانی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی و وڵاتانی ئەورووپاوەش، سوقولەلی باشترین و تۆکمەترین پەردەیە بۆ داپۆشینی ناشایستی و لێنەوەشاوەیی مێردەکەی و سوڵتانیش بەم بارە ڕازی بوو و، هەرگیز

لەگۆڕەپانی شەڕدا سەرکردایەتی سوپاکەی نەگرتە دەست و بگرە لەجیاتی ئەمە، لە دوورەوە شەڕابی دەخواردەوە.

ئەم خووە ناشیرین ودزێوە بەخێرایی بەنێو سەرانی وڵاتدا بڵاوبۆوە. تەنانەت موفتی و پیاوانی ئاینیش، یاساکانی شەرعی پیرۆزیان خستە ژێر پێ و بەپێچەوانەی فرمانی قورئانی پیرۆز، دەستیان دایە شەڕاب خواردنەوە. لەم ڕووەوە لەبازاڕی قوستەنتەنییە باوی ئەو نوکتەیە بوو کە دەیانگوت: *«ئەرێ ئەمڕۆ کێ پارەی خواردنەوەکەمان دەدا، مەلا، قازی یان خەلیفە؟»*

(حافظ)ی شاعیری بەناوبانگی ئێرانی، لەژێر کاریگەرییەتی ئەم رەوتەدا شیعرێکی گوتووە کە تێیدا هاتووە: «*نۆشینی شەڕاب شیرینترە لە ماچی کچانی لاو*»(١٠). کاتێ موسڵمانە خواپەرستەکان داوایان لە موفتی شار کرد کە ڕێگە نەدا ئەم شیعرە بڵاوبێتەوە و فتوای ئەوەبدات کە بەپێچەوانەی ڕێنماییەکانی شەرعە، موفتی ئەم کارەی نەکردو فتوای ئەوەی دا کە: «*مادامەکی سوڵتان خۆی شەڕاب دەخواتەوە، تەواوی ژێردەستەکانی مافی ئەوەیان هەیە لاسایی بکەنەوەو شاعیرەکانیش پێی هەڵابڵێن.*»

ئەو وێنەی کە (باربارۆ)ی باڵیۆزی ڤینیز لە سەلیم بۆ ئێمەی جێهشتووە بەو شێوەیەیە: «*هەر کەسێ دەموچاوی ئاوساوی بدیبایە کە بەهۆی زێدەڕۆیی لەخواردنەوەی شەڕابدا، سوورهەڵگەڕابوو و، چاوی بەهەیکەلی ئەستوورو کردەوە سەرسەرییانەکەی بکەوتبایە، مومکین نەبوو وەک سەرکردەیەکی جەنگی یاخود فرمانڕەوایەک ڕێزی لێ بنێ.*

*ئەو هەڵسان و دانیشتنی لەگەڵ ئافرەتان و خواجە سەرایانی پێ لە کاروباری ئیداری وڵات گرنگتربوو. هەموو کاتی خۆی بەگەمەی شەهەوانی و خواردنەوەی شەڕابی قوبرس بەفیڕۆ دەدا.*» کاتێ بەئاشکرا ڕایگەیاند کەوا بیر لەداهاتوو ناکاتەوە و تەنها بۆ چێژ وەرگرتن لەژیانی ڕۆژانە دەژییەت، فەلسەفەی ژیانی خۆی ئاشکرا کرد.

ئەو شەڕانەی کە ڕوویاندەداو ئەو سەرکەوتنانەی کە بەنێوی ئەوەوە تۆمار دەکران، بەلایەوە گرنگ نەبوون. تەنها یەکجار بایەخی بەجەنگ دا و ئەو جارەش کاتێک بوو کە تورکەکان لەشکرکێشییان بۆسەر قوبرس کرد. لێرەدا پەلەی ئەوەی بوو هەرچی زووتر سەرکەوتن بەدەست بێنن بۆ ئەوەی بتوانێ عەمبارەکانی خۆی لە شەڕابی نایابی قوبرسی پڕبکات. سەلیم بوتڵە شەڕابێکی بە یەک قوم هەڵدەداو بۆ خواردنەوەی ڕۆژانەی پێویستی بەشەڕابی پتر هەبوو. هەر لەبەر ئەوەش کاتێ یەکێ لە وەزیرە ڕکابەرەکانی سوقولەلی پێشنیازی ئەوەی کرد سوپایەک بنێرن بۆ داگیرکردنی قوبرس کە ئەودەم سەر بە کۆماری ڤنیزبوو، خێرا پێشنیازەکەی پەسندکرد.

سوقولەلی دژی ئەم شەڕەبوو، بەڵام سەلیم لەماوەی هەشت ساڵی دەسەڵاتی خۆیدا یەک جار بەرهەڵستی بڕیاری سەرۆک وەزیرەکەی خۆی بۆوە و ئەویش ئەو جارەبوو، کە هەوڵی داگیرکردنی قوبرسیان داو هۆیەکەشی زۆر ڕوون بوو؛ سەلیم

دەیەویست عەمبارەکانی خۆی بە شەڕابی نایابی قوبرسی بئاخنێ.
سەلیم توانی دوای ئابلۆقەیەکی سەخت و دڵڕەقییەکی وەحشیانە لەدژی دانیشتووە مەسیحیەکانی ئەو دورگەیە، ئامانجەکەی خۆی کە هەمان بەدەستهێنانی شەڕاب بوو،بهێنێتەدی، سەربازە تورکەکان ڕێگەیان پێدرا نیکۆزیا تالان بکەن و سێ هەزار کەس لەدانیشتوانی ئەو شارەیان قەتڵوعام کرد. کاتێ شارۆچکەی فاماگۆستا، دوای دوو ساڵ بەرگریی دلێرانە کەوتە دەست تورکەکان، تەواوی سەربازانی نێو بنکە سەربازییەکەی ئەو شارە، قەتڵوعام کران و فەرماندە دلێرەکەییان کە ناوی براگادنیۆ بوو، بەزیندوویی کەوڵ کرد و پێستەکەیان پڕ لە کا کرد و بۆ نیشاندان خستیانە بەرچاوی سەربازە تورکەکان. ڕەنگبێ بێ جێ نەبێ ئەگەر باس لەوەش بکەین کە هاوکات (ئیڤانی تۆقێنەر)ی قەیسەری روسیا، دەستی بەسەر شاری وتین ئێشتاین داگرت و، فرمانی دا سەری فەرماندەی فینلەندییەکان کە لە شەڕدا بەرگرییەکی قارەمانانەی کردبوو، ببڕن بەسەر نێزەی وەکەن و لەسەر ئاگر بیبرژێنن.
مەسیحییەکان لەو ڕەشەکوژییەی کە لە قوبرس دا ڕوویدا، تووشی ترس و سام ببوون. بەتایبەت کە تورکەکان پێشتر بەڵێنیان دابوو سەربازانی بنکە سەربازییەکەی دوورگەکە پەنا دەدەن. لەمڕووەوە، دەوڵەتی ڤینیز و ئیسپانیا دەستیان خستە نێو دەستی یەکتری و گەلە کەشتییەکیان خستە ژێر فرمانی دۆن *خوان ئۆتریش*،کە لە دوو سەد کەشتیی سەوڵی پێکهاتبوو و، ڕایانسپارد تا بۆ هەتایە کۆتایی بەفەرمانڕەوایی تورکەکان لە دەریای ناوەڕاستدا بێنێ.(١١) لەبەرامبەردا تورکەکانیش گەلە کەشتییەکی مەزنتریان بەسێسەد کەشتیی سەوڵی، کۆکردەوەو ناردیانە مەیدانی جەنگ. سەوڵ لێدانی کەشتییەکانی هەردوولا لەئەستۆی ئەو کۆیلانە بوو کەوا لەدوو ڕیزی (٥) کەسیدا دادەنیشتن و سەوڵێکی گەورەیان پاش و پێش پێدەکرد. ئەوەش لەکاتێکدا بوو کەنیوەی لەشیان و لەپشتێن بەسەرەوەیان رووت بوو و، قاچیان لە خوارەوە زنجیرا کرابوو. هەرکە گەلە کەشتیی تورک لە داردانێل دەرچوو، مەچەکی هەریەک لەو سەوڵ لێدەرانە قوڵفە وزنجیری تێخرا، بۆ ئەوەی بواری هیچ جۆرە بەرگری، یان ڕاکردنێکیان لەبەرامبەر ئەو قەمچییانەی کە پێیان دەکەوتن نەمێنێ .قەمچی بریتی بوو لە پەتێک کە لە ئاودا دەیانخووساند تاپتر بێشێنێ .ئەم ئەشکەنجەیە عەزابێکی دیکەشی لەگەڵدا بوو کە بەپێی گێڕانەوەی کۆیلەیەکی مەسیحی بەم شێوەیە بوو : *«زۆربەی کات چەند منداڵێکی هاروهاجی تورک، چێژ و ڕابواردنی خۆیان بە ئەشکەنجەدان وسووکایەتی کردن بە یەخسیرەکان وەدەست دێناو ئەوان « واتا یەخسیرەکان » دەبوایە بە سەبر و دان بەخۆ داگرتنەوە ئەم سوکایەتی پێکردنانە تەحەمول بکەن و گلەیی نەکەن . تەنانەت دەبوایە دەست و پێی ئەم منداڵانە ماچ کەن و لێیان بپاڕێنەوە بۆ ئەوەی وازیان لێبێنن ولێیان نەدەن.»*
کۆیلەکان چەندین ڕۆژ لەنێو دەریای نێوەڕاستدا بەسەوڵ لێدانەوە خەریکبوون تا لە مانگی ئۆکتۆبەری ١٥٧١ (جمادی الأخر-ی ٩٧٩ی کۆچی) لە کەنداوی لیپانێو

رووبەڕووی گەلە کەشتیی دوژمن بوونەوە. هەرچەندە ژمارەی کەشتی تورکەکان لەهی دوژمن پتربوو، بەلآم دیسان شکستێکی سەختیان بەگەرودا کرا و تورکەکان ٢٦٦ کەشتییان لێ نغرۆ بوو،(٥٠) هەزار تورک کوژران و پانزدە هەزار کۆیلەی مەسیحیش ئازادکران. بەلآم ئەم سەرکەوتنە هێندەی نەخایاند؛ چونکە دوای ماوەیەکی کورت هێزو سەرکەوتووەکان بلآوەیان لێکرد و ئەم هێزە تۆکمە بێ هاوتایە لێک هەلوەشایەوە. لەلایەکی دیکەوە سوقولەلی بەخێرایی بەدرووستکردنی گەلەگەشتیەکی دیکەوە خەریک بۆوە و بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و لەماوەی (١٨) مانگدا توانی گەلەکەشتیەکی مەزن پێک بێنێتەوە. بەشێوەیەک کە کاتێ ئاشتی لەنێوان قوستەنتەنییەو ڤینیزدا بەرقەراربوو، سوقولەلی توانی بە توانجەوە بە بالیۆزی ڤینیز بلێ: *«ئێمە بە داگیرکردنی قوبرس بازوویەکی ئێوەمان بڕی، کەچی ئێوە بەتەفرو تووناکردنی گەلەکەشتیەکەی ئێمە، تەنها ریشی ئێمەتان بڕی. بازووی براو پێوەناندرێتەوە، بەلآم ریشی هەلکەندراو سەر لەنوێ وبەهێزتر لەجاران دەڕوێتەوە.»*

سەلیمی (مەیخۆر)، دوای سەلتەنەتێکی (٨) سالە بەشێوەیەک کە لەگەل ژیانی دانەدەگونجا، مرد. دوای ئەوەی چەند بوتلە شەڕابێکی قوبرسی خواردبۆوە، ئارەزووی ئەوەی کردبوو بچێ لەجێگەیەک کە بای وێدەکەوت خۆی بشوا. هەرکە قالدرمەکان سەرکەوتبوو و گەیشتبۆ سەر عەردی مەڕمەڕ کراوی حەمام، لەپڕا خلیسکی بردبوو و سەراوسەر بەربووبۆوە و، بەهۆی شکانی کەللەسەری دەمودەست مردبوو.

لە کانوونی یەکەمی سالی١٥٧٤ (رمضان-ی ٩٨٤ی کۆچی)، سولتان موورادی سێیەمی کوڕی سەلیم، جلەوی دەسەلاتی گرتەدەست و نوربانوش بوو بە شاژنی دایک. جارێکی دیکە زنجیرە ململانێیەکی تووند لەنێو حەرەمسەرادا دەستی پێکردەوە. ئەو ململانێیە یەک سەدەی خایاندو تورکەکان بە (کادنلەر سەلتەنەتی- فرمانڕەواییی ئافرەتان) نێوی دەبەن. لەم سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر شاژنی دایک و سولتانە، لەسەرەتادا بەنهێنی وهێمنانە و دواتر بە دڕندەخوویی، بۆ بەدەستهێنانی دەسەلات و سامان، لەگیانی یەکدی بەربوون.

* * *

نوربانو، وەک یەکەم سولتانەی سەلیم لە کۆشکێکی جوان و رازاوەی کۆتایی شەقامی زێڕیندا دەژیا. ئێستا دوای ئەوەی کە بووە شاژنی دایک، گۆڕانێکی زۆری بەسەر بارودۆخی خۆی داهێنا و، شوێنی دانیشتنی خۆی گواستەوە بۆ سەرەتای جادە نێوبراو و نزیک شوێنی کوڕەکەی،تا لە دەرگاکانی چوونە ژوورەوەی حەرەمسەراو دیوانی هومایونەوە نزیک بێت و بتوانێ بچێتە ژوورەکەی سەر بورج و لەوێوەش گوێی لەو قسانە بێت کە لە دیواندا دەکرێن.

موورادی سێیەم کابرایەکی تووندی وەها نەبوو کە نوربانو لە سەرۆکاریکردنیدا تووشی گرفت بێت، بابایەکی لاواز، رەنگ زەرد و بەژن ناوەندی بوو، ریشێکی درێژی سووری هەبوو و لەڕادەبەدەریش حەزی لە ترياک کێشان بوو.

لەو سەردەمە خەڵکی پێیان وابوو هۆی رەنگ زەردیی سوڵتان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تریاک کێشانە.ئەمە هەر قسەبوو، بەڵام کاتێ وازی لە تریاک کێشان هێناو رووی کردە شەراب خواردنەوە، قەڵەو و گووپن بوو، ئەمەش تارادەیەک راستی ئەو قسانەی سەلماند کە لەبارەیەوە دەکران. حەزی لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت و شتی لەو بابەتە نەبوو و، پتر خەریکی نیگارکێشان و سەعات درووستکردن بوو!.

حەزی لێبوو سەر لەبەیانیان کاتی خۆی لەگەڵ شاعێران و نیگار کێشان و نووسەراندا بباتە سەر و هەر لەم رووەوەیەکە لە سەردەمی ئەودا ژیانی هونەری و فەرهەنگی قوستەنتەنییە نووزەی هاتەوەبەر.

موراد کتێبێکی بەنێوی *«مەهارەت نامە»* نووسی و بەو مینیاتۆرانەی کە خۆی کێشابوونیەوە، رازاندییەوەو چاپی کرد. هەروەها خەڵکی دیکەشی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی لەو بابەتەو ئەو کتێبانەی کە خۆی حەزی لێبوون، هاندەدا.

نوربانو زۆر کەیفی بەو جۆرە کارانە نەدەهات؛ چونکە ئیش و کاری دیکەی هەبوو و، پتر بیری لای رکابەرە بەهێزەکەی بوو. ئەم رکابەرەش کەس نەبوو جگە لە سوڵتانە بافو، کە دایکی تاقە کورەکەی مورادبوو. سوڵتانە بافو لە حەرەمسەرادا بە (سەفیە) بەناوبانگبوو، خواست و ئاواتەکانی زۆر لە هی شاژنی دایک پتربوون و لە شێوەی خواست و ئاواتەکانی روکسلانەبوون.

سوڵتانە بافو لە یەکێک لەخێزانە ئەشرافیەکانی ڤینیز بەنێوی (بافو) بوو. بەپێی هەموو ئەو چیرۆک و سەربوردانەی کە لەبارەیەوە گوتراون، سوڵتانە ئافرەتێکی موزەردی زۆر جوان بووەو لەکاتی رۆیشتندا وەک ئەوە وابووە کە سەما بکات. ئەو قسەو گوتانەی کە باس لە هاتنی بۆ حەرەمسەرای سوڵتان دەکەن، جیاوازو دژ بەیەکن.

هەندێک پێیان وایە کە گەمیەوانێکی تورک بەیەخسیری لەگەڵ خۆیدا هێنابوویە قوستەنتەنیەو هەندێکی دیکەش پێیان وایە راسپێردراوێکی نهێنی بووە کە ڤینیزییەکان ناردوویانەتە نێو حەرەمسەرای سوڵتانی عوسمانییەوە.

(بافو)یان لەتەمەنی سێزدەساڵیدا پێشکەشی موراد کردو شاژنی دایک لەرادەبەدەر رەقی لێدەبۆوە. هەر ئەو رۆژەی کە موراد دەسەڵاتی گرتە دەست، ململانێی نێوان ئەو دوو ئافرەتە ئاشکرابوو، ململانێیەکە لەنێو حەرەمسەرایەکدا روویدەدا کە ئێستاکە پڕبوو لە ڕێڕۆی تاریک و شێدار کە لێیانەوە دەچوونە ئەو ژوورە نوێیانەی کە رۆژبەرۆژ پتر دەبوون.

ئەم ژووروساختومانانە وابەبێ بەرنامەیی قوت دەکرانەوە کە لەسەردەمی مورادا بەتەواوەتی هەماهەنگی ورێکی شوێنەکەیان شێواندبوو.

سوڵتان و سوڵتانە جوانەکەی لەشوێنێکی پڕشکۆی مەزن دادەژیان، کە حەوزی مەلەوانی و تەنانەت دەریاچەی تایبەتیشی تێدابوو. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە لەتەنیشت ئەوانەوە و لەحەرەمسەرادا، ئافرەتە قەمپاتمەکان، شەش شەش و حەوت حەوت، لەژووری بچوک وناڕێکدا لەسەرزەوی دەنووستن و چاوەڕێی ئەوەبوون کە بەڵکو رۆژێک دابێ بتوانن سەرنجی سوڵتان بۆلای خۆیان راکێشن.

نوربانو كۆمەڵە ئامانجێكی هەبوو؛ یەكەم ئامانجی ئەوەبوو (سوقولەلی) واتا سەرۆك وەزیران، كە پێیوابوو لەرادەبەدەر راست كردارەو سازشكردن لەگەڵیدا سەختە، لەسەر رێی خۆی لاببات. لەم رووەوە بەهاوكاری قزلەر ئاغا، كە لەو سەردەمەدا خواجەیەكی پارەپەرست و كرێت بوو و بەفرۆشتنی پلەوپایە دەوڵەتییەكان سەروەت و سامانێكی باشی پێكەوەنابوو، هەوڵیدا پلانێكی وا رێك بێخێت كە لەئاكامدا سوقولەلی پێ لەسەر كار لابدات. ئەوە كارێكی ئاسان نەبوو؛ چونكە سوقولەلی كابرایەكی دەستپاك و جێی متمانەی سوڵتان بوو و، زۆر ئەستەم بوو كە لەخۆرا بەخیانەت تاوانبار بكرێت. بەم پێیە نوربانو نەخشەیەكی دارِشت و ئەو خاڵەی كردە نیشانە كە موراد زۆری بەلاوە گرنگ بوو، ئەویش پارەبوو.

موراد كابرایەكی زۆر پیسكە و قرنیسێكی وەهابوو كە زۆر بەبێ شەرمی پلەوپایە دەوڵەتییەكانی دەفرۆشت و چیشی دەستكەوتبایە، لەژێر سەری و لەبن دۆشەگەكەی خۆیدا حەشاری دەدا. وای لێهات جێی نەما پارەی تێدا حەشاردا، بۆیە فرمانیدا لە ژێر تەختە خەوەكەی چاڵێك لێدەن و رۆژێ چی دەستكەوتبایە، بەشەو لەو چاڵەی دەكرد. كاتێ دایكی پێیگوت كەوا سوقولەلیش بەفرۆشتنی پلەوپایە دەوڵەتییەكانەوە خەریكەو بەو شێوەیە مافی ئەو زەوت دەكاو لەپارەو دەرامەتی ئەو دەدزێ، موراد بەرقداچوو و، بریاری دا سوقولەلی بكوژێت. كوشتنی سەرۆك وەزیران بەشێوەیەك رێك خرا كە وەك دەست درێژییەكی ئاسایی و لەكاتی دانیشتنی دیوانی هومایونیدا، كەتێیدا سەرانی وڵات لەسەر تەختی درێژ و لە سێ لای دادەنیشتن، بەئەنجام بگات. سوقولەلی لەنێوەراستی تالارەكە دادەنیشت و وەزیرەكانی دیكەش لەلای راستەی دادەنیشتن. لەوكاتەدا سەربازێك كە داواكاریەكی بەدەستەوەبوو، هاتە ژوورو بەرەولای سەرۆك وەزیر چوو. هەركە لێی نزیك كەوتەوە، خەنجەرەكەی خۆی لەسەردڵی سوقولەلی رۆكرد. دەیان كەس شمشێریان هەڵكێشا بۆئەوەی دەمودەست بكوژ بەسزای تاوانەكەی بگەیەنن، بەڵام هەر لەوكاتەدا لەپشت پەنجەرە كون كونەكەوە دەنگی سوڵتان بەرزبۆوە و سەربازە بكوژەكەی بەخشی. هەموو شتێك لە جێی خۆی بوو؛ مەسەلەكە بەئاسانی و بێئەوەی هیچ سەرئێشەیەك بۆ سوڵتان بنێتەوە، كۆتایی پێهات. تەنها شتێك كە راست دەرنەچوو ئەوەبوو كە موراد دەیویست دوای كوشتنی سوقولەلی دەست بەسەر سەروەت و سامانەكەیدا بگرێ. كەچی كاتێ چوون ماڵ و حاڵی سوقولەلییان پشكنی، دیتیان سەروەت و سامانێكی ئەوتۆی نەبووەو كابرایەكی هەژار و بێ پارە بووە.

سوقولەلی دوایین سەرۆك وەزیربوو كە توانی دوای سەدان ساڵ، وڵات بەرێكوپێكی و لێهاتووییەوە بەرێوەبەرێت؛ لەماوەی ئەو دوازدە ساڵەی كە بەسەر مەرگی سلێماندا تێدەپەری، ئەوتوانیبووی قوبرس و چەند ویلایەتێكی رۆژئاوای ئێران و یەمەن بخاتە نێو سنووری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیەوەو، (تونس)یش لەژێر دەستی ئیسپانیا دەرهێنێتەوە كە بۆ ماوەیەك داگیری كردبوو. ئەو وڵاتەی كە موراد، یان باشتر وایە بڵێین دایكی دەسەلاتی بەسەردا دەگێرا، لە باكورەوە، لە هەنگاریا

تاکو کەنداو و سودان لە باشور، لە ڕۆژهەڵاتەوە، لەدەریای قەزوێن و سنوری ئێرانەوە تا ئۆران و تونس لەڕۆژئاوا ،درێژی هەبوو. هەروەها دەریای سپی نێوەڕاستیش هێشتا هەر لە نێو سنوری ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدابوو.
لەوێ بەدواوە پۆستی سەرۆک وەزیران دەست بەدەست دەبوو. کارامەیی ولێزانیی ئەو کەسانەی کە پۆستەکەیان بەدەستەوە دەگرت هیچ بایەخێکی نەبوو، بگرە بەندبوو بەوەی کە سوڵتان حەزی لەکێ بێ پۆستەکەی ببەخشێت. شەوێکیان موراد بەجلی ئاساییەوە بە ناو بازاڕی قوستەنتەنییە دادەگەڕا، گوێی لەقسەی چێشت لێنەرێک بوو بە نێوی فەرهاد، کە گلەیی لە نارێکی و بەهەڵە بەڕێوەبردنی وڵات هەبوو، موراد هەندێ پرسیاری لێکرد و وەڵامەکانی بەشیاو و لەجێی خۆ زانین. ڕۆژی دواتر کابرای چێشت لێنەریان بانگ کردە باب عالی و خستیانە جێی سەرۆک وەزیرانی ئەوسا. بەو شێوەیە فەرهادی گومناو، بوو سەرۆک وەزیرانی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی!.

* * *

دوای لەنێوچوونی سوقولەلی، شاژنی دایک ئاراستەی هێرشەکانی خۆی ڕووەو ڕکابەرە بە هێزەکەی، واتا سوڵتان بافو وەرگێڕا. ئاشکرایە کەوا نەیدەتوانی بیکوژێت، بۆیە بڕیاری دا بۆ جارێکی دیکە بەهاوکاری قزڵەرئاغا، بافو لەبەرچاوی سوڵتان بخات و بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەیەکی زۆر کچی جوان و ڕازاوەی وەهای کە زۆر لە سوڵتانە بافو جوانترو دڵگیرتربوون، ناردە ژووری نووستنی سوڵتان. موراد کە پێدەچێ کابرایەکی بێ ئیرادە بووبێ، لەوکاتەدا هێشتا تووشی گەندەڵی نەببوو. ئەو وێنەیەی موراد کە لە مۆزەخانەی بەریتانیادا هەیە، گوزارشت لە جیاوازیی ڕووخساری دەکا لەگەڵ سەرەتای دەست بەکاربوونی وەک سوڵتان؛ لەو کاتەدا پیاوێکی بەژن ناوەندی و زۆر قەڵەوە و، دەڵێی ئەوەی مل بێ پێوەی نییە وسەری بەخڕی کەوتۆتە نێو شانەکانیەوە. ڕەنگی دەموچاوی سوورو سپییەو قیافەیەکی پاشایانەو جوان وپتەوی هەیە. ریشی کەمرەنگ و نیمچە بۆرەو، جلەکانی زۆر ڕازاوەو پرشکۆن. موراد حەزی لە لەززەتەکانی ژیان بوو و، زۆریش کەیفی بەمۆسیقا دەهات. هەرکاتێ لەناو حەرەمسەرادا کۆنسێرتێکی ڕێک بخستایە، فرمانی دەدا چاوی مۆسیقاژەنە پیاوەکان ببەستن. عاشقی ئاهەنگ گێڕان و میوانداری بوو. بەکورتیەکەی پیاوێکی وابوو کە سەرەڕای ئەوینی بافو، لەبەرامبەر جوانی ئەو کەنیزەکە پەری ئاسایانەی، کە ڕۆژانی هەینی دایکی پێشکەشی دەکردن، خۆی پێ ڕانەدەگیردرا.
بەتایبەت کە دایکی و سەرانی وڵات لەو کاتەدا هانیان دەداو دەیانگوت: سوڵتانەی ئیتالیایی تەنها توانیویەتی منداڵێکی ببێ و چیدی زگی نابێ و ئەویش لەسەریەتی بۆ مانەوەی سیلسیلەی عوسمانی پتر منداڵ بێنێتە سەردنیاوە. لەئاکامدا چیوای پێنەچوو کە حەرەمسەرای سوڵتان پڕبوو لە جوانترین کچان و گوڵانی سەرتۆپی بازاڕەکانی کۆیلە فرۆشیی ڕۆژهەڵات و قزڵەرئاغا لەو کارەیدا هێندە جیدی بوو، کە نرخی کچی جوان لەبازاڕدا تاڕادەیەکی زۆر بەرزببۆوە.

بەسەرکەوتنی نوربانو لەسیاسەتەکەیدا، موراد لەو ئافرەتانەی کە هەریەکەو لەرەگەزێگ بوون، بوو بەخاوەنی (١٠٣)منداڵ. بەڵام عەشقە ڕێبوارییەکان شتێک بوون و ئەوینی قوڵی ئەو بەبافو شتێکی دیکە. هەرچەندە کە ئیدی بافو شەوانە لەگەڵ سوڵتاندا نەدەنووست، بەڵام بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵیدابوو. کاتێ کە نوربانو لە ساڵی ١٥٨٣ (٩٩١ی کۆچی)، دنیای جێهێشت، بافو هەناسەیەکی ڕاحەتی هەڵکێشاو، بوو بە حاکمی حەرەمسەرای سوڵتان. ئەو بەوە ڕازی بوو کە مێردەکەی بەشەو لەگەڵ ئەم وئەودا ڕابوێری، بەڵام لەبری ئەوە گوێ لەبیروبۆچوونەکانی لەمەڕ بەڕێوەبردنی وڵات بگرێ.

لەو ساڵانەیدا کە شەڕو ناکۆکی لەنێو ئافرەتانی حەرەمسەرادا لە ئارادابوو، وردە وردە سیما و شێوەی شاری قوستەنتەنیە دەگۆڕا.

بێگومان زۆربەی خەڵکی شار، کە لە دەرەوەی کۆڕو کۆمەڵی پاشایەتیدا دەژیان، ئاگایان لەو ململانێیە نەبوو کە لەو دیو دەروازەی (بابی سەعادەت) لە ئارادابوو. ژیانیان زۆر سەخت بوو، بەشێوەیەک کە (گیبۆن)، سەبارەت بە قوستەنتەنییە نووسیویەتی: *« هەڵکەوتی جوگرافیایی قوستەنتەنییە، کە لە شوێنێکی زۆر جوان و کەنار دەریابوو، بەشێوەیەکی سرووشتی کردبووی بە پایەتەختی ئیمپراتۆرییەتێکی مەزن. هەرچەندە کۆڵانەکانی بێ ناونیشان بوون و خانووەکانی لەدار و تەختە و لەرزۆک بوون، بەڵام گۆشەو کەناری ئەم شارە گەلێ شوێنی خۆش و ڕازاوەی بۆ ڕابواردن و کات بەسەربردن لێبوو.»*

لەو جێگەیەی ڕا کە ئاو لە ئایینی ئیسلام دا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیەو سەرچاوەی پاکو خاوێنی و ژیانە، لەسەرانسەری شاردا کانیاویان درووست کردبوون. هەموو کاتێ ئاو وەک خێرو بەرەکەتێکی ئیلاهی لەقەڵەم دەدرا و ئێستاکە لەو شارەدا، لەشێوەی کانیاو و حەوزو عەمباراو، دەخرایە بەردەستی خەڵک.

ئاوی کانیاوەکانی کوێستان بەهۆی تونێلی ژێر زەوییەوە دەگەیشتە شارو لەعەمباراو و بورجی ئاوی تازە درووستکراودا، کۆ دەکرایەوە.ئینجا هەر لەوێش دەپاڵێوراو دەدرایە ماڵی دەوڵەمەندان و عەمباراوە گشتییەکان.

گەرماو (حەمام)ە کانی شار زۆر پرشکۆبوون و ئاوی گەرم و هەڵمیان هەبوو.بازاڕی گەورەی قوستەنتەنییە کە دیواری بەرزی لەدەورەبوو، هەشت دەروازەو (٦٧) دالآنی تێدابوو ،و نەتەنها شوێنی کۆبوونەوەی خەڵک بوو، بگرە سوپەر مارکێتێکی بێ وێنەش بوو، کە (٤٠٠٠) دوکان و مەغازەی تێدابوو کە تێیاندا لە وشترەوە بگرە تا مورەبای پەڵکی گوڵ دەکڕاو دەفرۆشرا.

لەباکوری بسفۆر و لە گەڕەکی *پڕا* و *کالآتا* (١٢) کە لەو سەردەمەدا بەدەوروبەری شار لە قەڵەمدەدرا، شوێنی عەیش و نۆش و ڕابواردنی وا پڕشکۆی لێبوو، کە شەو تاکو بەیانی پڕبوون لەمشتەری. ئەو کەسانەیش کە زۆریان خواردبایەوە، پەرداخی گەورەی چەلاوی سەروپێیان فڕدەکرد و پێیان وابوو کە ئەگەر وابکەن، بەیانی خومار نابن و تووشی ژانە سەریش نابن. لەسەرانسەری شاردا پتر لە سێسەد دوکانی سەروپێ فرۆشی لێبوو کە سەروپێ و گیپەیان بە سیرێکی زۆرەوە لێدەنا؛ چونکە

بەپێی قسەی ئەولیا ئەفەندی نووسەری تورک: *«ناکرێ سەروپێ بەبێ سیر لێبندرێت؛ چونکە هەرچەندیش سیر بۆنێکی پیسی لێبێت، بەڵام هەمدیس بەیەکێک لە خێرو بەرەکەتە ئیلاهییەکان لەقەڵەم دەدرێت.»*

ئەوانەی کە دوای خواردنی گیپە و سەروپێ ویستبایان خۆیان لەدەست بۆنی سیرەکە رزگار بکەن، دەفری گەورەی مەشکەفی سەربە باوی، کە زەنجەفیل و دارچینیشیان بەسەرداکرابوو، هەڵدەقوڕتاند و هەندێ لەوانەیش کەنەیاندەویست گوێیان لەپرتە و بۆڵەی ژنەکانیان بێت، لە دوکانەکەی تەنیشت سەروپێ فرۆشەکە عەتری گوڵی سور، یان سوومبوڵ و بەرەی سنەوبەریان بەسەرو گوێلاکی خۆیان دا دەکرد.

ئەوانەی کە دەوڵەمەندبوون، پتر جلی جوانی لە بابەت عەبای درێژ و فەراجیان دەپۆشی کە بەقەدیفەی بۆرِسا گوڵدۆزی کرابوون. خانووەکانیان ڤێللاو کۆشکی پرشکۆی ئەوتۆبوون کە کەوتبونە نێو دارستانەکانی سنەوبەرو چنارو لە کەنار کەنداوی داردانێڵ بنیادنرابوون. ئەغلەبی خەڵکی و تەنانەت ئەوانەی کە داهاتێکی ناوەنجییان هەبوو، لەماڵەوە کۆیلەی رەش پێست (خوڵامکارە) یان راگرتبوو کە بە پاکو خاوێنی و ئیش و کاری ماڵەوە خەریکبوون.

چێشت لەسەر ئاگردان لێدەنراو، خوڵامکارە رەش پێستەکان، بە پەڕی وشترمر باوەشێنی ئاگرەکەیان دەکردو پۆلووەکانیان دەگەشاندنەوە.

لە بچوکترین و ئاساییترین ماڵەکانیشدا حەرەمسەرا هەبوو؛ تەنانەت ئەگەر ئەو حەرەمسەرایەتایبەت بوویێت بە تاکە ئافرەتێکی داپۆشراوەوە.پیاوەکان هەمیشە بەتەنیا نانیان دەخواردو خواردن لەسەر ڕەفەیەکی گەڕۆکەوە لە بەشی دەرەوەڕا دەنێردرایە حەرەمسەراوە.

بازاڕ پڕی سەوزەو کەرستەی هەرزان بوو و، خەڵکی هەژارو دەست کورت بەئاسانی دەیانتوانی خواردنیان پێ ئامادەبکەن. هەروەها سیروپیوازیش بۆتێکەڵ کردن بەگۆشتی نەکوڵەک وسەروپێ فراوان بوو.شیروماست وبرنج زۆر هەرزان بوو .ئەوانەی کەشوێنی کارکردنیان لەماڵەکانیان دووربوو، چەند سەلکەپیوازێکیان لەگەڵ یەک دوونان لەبەرپشتی خۆیان دەبەست وبەم پێیە بۆ نانخواردن تەنها پێویستیان بەشتێکی زۆرئاسایی هەبوو کە ئەویش ئاو، یان کانیاوێکی پاک بوو؛ چونکە دەبوایە بەر لەنانخواردن دەموچاوی خۆیان بشۆن و ئەمە لە ئاییندا فەرز کرابوو.

لەزستاندا، ژووری ماڵەکانیان بەمەقلیی ڕەژوو کە خۆڵەمێشیان بەسەردا دەکرد، گەرم دادەهێنا. ئەم توێژە خۆڵەمێشە تا ماوەیەکی زۆر و دوای ئەوەی کە خوڵامکارەکە جێی رادەخستن ژووری گەرم رادەگرت. مەسەلەی خوڵامکارە و گرفتی لەو بابەتە لەئارادا نەبوو، چونکە بازاڕی کۆیلە فرۆشیی قوستەنتەنییە جگە لەڕۆژانی هەینی، هەموو رۆژێ لەبەیانییەوە تا نیوەڕۆ کراوە بوو. ئەم بازاڕە لە شێوەی کاروانسەرایەکی بچوک بوو کە دەرگایەکی داری گەورە و حەوشێکی بەرینی هەبوو، چواردەورەی بە ژووری بچوک و هەیوانی ئەستووندار گیرابوو تا کۆیلەکران

بتوانن تێیدا بحەسێنەوە. ئەم بازاڕە تایبەت بوو بەکڕین و فرۆشتنی کەنیزەکی ماڵەوە کە ئەغڵەبیان ڕەش پێست بوون و کڕیاران بەوردی لە ددان و ماسولکەو دەست و پێی کۆیلەکانیان دەڕوانی و ئەو کارەیان پتر لە ماڵات و ئەسپ کڕین دەچوو تا مرۆڤ کڕین.

ئاشکرایە کەوا کڕینی کچێکی جوانکیلەی چەرکەسی، یان گورجی بۆ هاوسەری و رابوردن، مەسەلەیەکی دیکە بوو؛ چونکە باشترین و جوانترینی ئەو کچانەیان بۆ سوڵتان دەبردو لەڕاستیدا کچی چەرکسی وا دەگمەن ببوون کە بازرگانە کۆیلە فرۆشەکان ناچاربوون چۆن لەوڵاتی دیکە ئەسپ و ماینی رەسەنیان پەروەردە دەکرد، ئاوهاش بە پەروەردەکردنی کچانی جوانی چەرکەسییەوە خەریک بن. کێڵگەکانی پەروەردەکردن و راهێنانی کچانی چەرکەسی، سودێکی بۆ وەچەکانی داهاتووش هەبوو؛ چونکە ئەو باوک و دایکانەی کە زانیبوویان کچەکانیان لەبازاڕەکانی قوستەنتەنییەدا چەند پڕ بایەخن، رازی دەبوون لەسەر ئەوەی کە کچەکانیان بکووتن تا لەمەترسی تووش بوون بە نەخۆشی ئاوڵە کە دەموچاویانی دەگۆڕی و کرێتی دەکردن و جوانییانی لەنێو دەبرد، بیانپارێزن.

کووتان لەدژی نەخۆشی ئاوڵە لە قەوقاز و وڵاتی چەرکەسەکانەوە دەستیپێکرد و دواتر هاتە رۆژئاوا، لەنێو پزیشکەکانی قوستەنتەنییەشدا باو بوو. هەرچەند پزیشکان لێهاتوو و بەتوانا بانایە دیسانیش چارەسەرکردنی ئافرەتانیان بەلاوە ناخۆش بوو؛ چونکە هەرگیز بواری ئەوەیان پێنەدەدان لەنزیکەوە سەیریان کەن و چارەسەریان بکەن. لەمڕووەوە ئەوان هەرچییەکیان لەدەست هاتبایە ئەنجامیان دەدا و پتر کاریان بریتی بوو لەوەی کە زێروو لەسەر لەشی نەخۆش دانێن و ئەم کارەش بەهۆی کەنیزەک و خواجە سەرایانەوە ئەنجامدەدرا. بەرهەمهێنان و دەستاودەست پێکردنی زێروو لەکۆنترۆڵی حکومەت دابوو و، ژمارەیەکی زۆریشیان دەنارده ئەڵمانیاو روسیا. باشترین جۆری زێروسو لە ئەنادۆڵ دەستدەکەوت و، بەوە بەناوبانگبوون کە پتر لەهەموو جۆرەکانی دیکە خوێنی نەخۆش دەمژن. کاتێ چارەسەرکردن بەهۆی (زێروو)ەوە کۆتایی پێدەهات، بەشێوەی تایبەتیی تورکەکان،کە بریتی بوو لەپێداکردنی قاوەی کووتراو بەشوێنی برینەکە، بەری خوێنیان دەگرت و ئەمەیش لەهەمانکاتدا دەبووە هۆی ئەوەی نەخۆش ئارام بێت، بەڵام کاتێ قاوەکە وشک دەبوو، سەر جێگەی نەخۆش پڕدەبوو لە قاوەی وشک و وەک خیز دەرژایە سەر جێگەو نەخۆشەکان پێی سەغڵەت دەبوون.

لەو سەردەمەدا، ئەغڵەبی پیاوانی تورک لەوە رازیبوون کە یەک ژنی مارەکراویان هەبێ و ئەوەش رەنگبێ لەبەر ئەوە بووبێت کە جیازی بووک لەلایەن ماڵی زاواوە دەکرا. پتر کوڕان لەتەمەنی سێزدە و چواردە ساڵیدا کچانی یازدە و دوازدە ساڵییان دەهێنان و هیچ شتێکیان لەبارەی هاوسەرییەتی و ژن و مێردایەتییەوە نەدەزانی. جیابوونەوە (تەڵاق)یش کارێکی ئاسان بوو، بەڵام هەندێ شتی بەدواوەبوو؛ چونکە بەپێی یاساکانی ئیسلام، هیچ پیاوێک نەیدەتوانی ئافرەتێکی تەڵاقدراو مارەبکاتەوە مەگەر سێ مانگ و دەرۆژ بەسەر تەڵاق دانەکەیدا

تێپەڕبووبایە. ئەگەر پیاوێک دوو جار ژنەکەی تەڵاق دابایە، هەمدیس دەیتوانی دوای کۆتایی هاتنی ماوەی دیاریکراو (عدە) بۆ لای بگەڕێتەوەو سەلەنوێ مارەی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر ئەمجارەش تەڵاقی بدابایەوەو دوای تەڵاقدان ویستبای بۆ جاری چوارەم مارەی بکاتەوە، نەیدەتوانی مەگەر ئەوەی کە ژنەکەی مێردی بە یەکێکی دیکە بکردایەوە، واتا ئەودەم دەیانگوت بەجاش مارەکراوەتەوە.

ئەم کارە بۆ پێشگیریکردن لە گرتنەبەری رێگەی تەڵاقدان دانرابوو، کاری بەجاش مارەکردنەوەش ببووە هۆی ئەوەی کە بۆ کۆمەڵە خەڵکێک پیشەیەکی نوێ دروست بێت؛ کابرا دەبوو بە مێردی یەک شەوەی ئەو ئافرەتانەی کە سێ تەڵاقە ببوون. ئەم کەسانە پتر خەڵکی پیر و لەکارکەوتوویوون و بەپارە ئەم کارەیان ئەنجامدەداو مەترسی ئەوەیان نەبوو کە بچنە لای ئەو ئافرەتانەی کە لێیان مارە دەکران.

تەڵاق و ژن هێنانەوە، لەناوچینێکی دانیشتوانی قوستەنتەنییەدا لەبرەو دابوو، ئەو چینەش ئەو پیاوانە بوون کە چەند ژنێکی قەمپاتمەیان هەبوو، ئەم کارەی ئەوان دەبووە هۆی ئەوەی کە لەماڵەوە دا لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا تووشی شەڕو هەرا و لەئاکامدا تەڵاقدان بن، بەتایبەتیش کاتێک کە ئافرەتەکان هەستیان بەوەدەکرد پیاوەکەیان لەرووی بەئەنجام گەیاندنی ئەرکی هاوسەرییەتی دا مافیانی پێشێل کردووە؛ چونکە عادەت وابوو ئەگەر کابرایەک شەش ژنی قەمپاتمەی هەبوایە و هەر شەش شەوەکەی هەفتە لەلای ئەو ئافرەتانە بوایە، دەبوایە شەوی هەینی لای ژنە مارەکراوەکەی خۆی بایە.

ئاشکرایە کە بۆ چێژ وەرگرتن لە ژیانی قوستەنتەنییەی سەدەی شانزدەهەم، دەبوایە پیاو تورک بوایە، چونکە ژیانی دانیشتوانی دیکەو غەیرە تورکی وەکو مەسیحییەکان کۆمەڵێ کۆت و پێوەندی لەسەردانرابوو؛ ئەرمەنییەکان مەجبوربوون چەکمەی سوور، یۆنانییەکان چەکمەی رەش و جوولەکەکانیش چەکمەی شین لەپێ بکەن. هەروەها مەسیحیەکان مەجبوربوون دیواری ماڵەکانیان رەش کەن و هەمیشە جلی رەشیش بپۆشن و هەرکاتێ لە کۆڵاندا تووشی موسڵمانێک بووبانایە، دەبوایە لە ئەسپەکەی خۆیان دابەزن و رێز لە موسڵمانەکە بنێن.

گەشیتارو گەڕیدە مەسیحییەکان، بەردەوام تووشی ئەو موسڵمانانە دەبوون کە لە بە جێگەیاندنی رووکارەکانی ئاییندا، لەگەڵ یەکدیدا لەرکابەری دابوون و پێیان سەغڵەت دەبوون. یەکێ لەو گەڕیدە ئینگلیزانە کە نێوی (فایف موریسۆن)ەو لەو سەردەمەدا سەردانی تورکیای کردووە، بەنارەحەتییەوە لەوبارەیەوە نووسیویەتی:« *تورکێک بەگرژی کڵاوەکەمی لەسەرسەرم لابردو لەکاتێکدا کە سەراوین بەدەستیەوە گرتبوو، گوتی: کڵاوەکەت دەڵێی قاپە و واباشە میزی تێکەم. دوایی کڵاوەکەمی فڕیدایە سەر خاک و خۆڵی زەوی و من بەسەبرو لەخۆبوردنەوە هەڵمگرتەوە.*»

* * *

ئەو دیپلۆماتە بیانییە تاک و تەرایانەیش کە لەو سەردەمەدا لە قوستەنتەنیەدا ئاکنجی ببوون، بەتایبەتی یەکەم باڵیۆزی ئینگلیز کە لەلایەن شاژن ئەلیزابێتی

یەکەمەوە لە ناوەڕاستی سەڵتەنەتی مورادا، نێردرابۆ قوستەنتەنییە، لەگەڵ جۆرێکی دیکە لە ئاستەنگەکاندا بەرەوڕوو بوون؛ هەرچەند کە ئەلیزابێتی قرچۆک باڵیۆزێکی ناردبۆ دەرباری عوسمانی کە دەبوایە زۆر بەلێهاتوویی دیپلۆماسییەتی ئەو وڵاتە پیادە بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قروشێک موچەی نەدەدایە.

ئیدوارد بارتۆن، دووەم باڵیۆزی شاژن، ناچاربوو بۆ دابینکردنی بژێوی خۆی، داوای رۆژانە لە شاژن بکات؛ چونکە لەڕاستیدا ئەو نوێنەری کۆمپانیای ئینگلیزیی بازرگانیکردن لەگەڵ تورکیا بوو و هەرچەندە کە وەک باڵیۆزی شاژنی ئینگلیز کاری دەکرد، بەڵام موچەکەی لەبودجەی کۆمپانیاکەوە دەدرا.

ئەو باڵیۆزە سەرەتاییانەی وەک بارتۆن، لەڕاستیدا بەر لەوەی باڵوێزێکی دیپلۆماتیک بن، بازرگان بوون . لەپێنج ساڵی سەرەتای چالاکییەکانی کۆمپانیای بازرگانی کردن لەگەڵ تورکیادا، گەمییە ئینگلیزییەکان بیست و دووجار لەنێوان قوستەنتەنیە و ئینگلیزدا هاتووچۆیان کردو قوماشی خوری، قەڵایی، قوڕقوشم، چەرم وپێستی کەروێشکیان هێنایە تورکیا و لەوێشەوە ئاوریشمی خاو، (نیل) رۆن، کشمیش، شەڕاب، شاڵی بەدەست چندراو و خوری وشتریان بردە ئینگلیز.

لەو سەردەمەدا باشترین کاڵای تورکیا کە لە ئینگلیز نێوبانگێکی باشی هەبوو، خوری پەزەکانی ئەنقەرە بوو کە لە شارێکی بەو نێوەوە دەهێندرا و ئەمرۆکە پێی دەڵێن ئەنکارا . خوری نێوبراو لەو سەردەمەشدا هەر بەنرخ بوو؛ چونکە تورکەکان لەوە تێگەیشتبوون ئەگەر خورییەکە لە پەزەکە بکەنەوە، یان بەواتایەکی دیکە بیبڕنەوە، ئەوا رەق و زبر دەبێ، لێ ئەگەر مەڕەکەیان سەربڕیبایەو کەوڵیان کردبایە و ئینجا بیانفرۆشتبایە، ئەوا وەک ئاوریشم نەرم و جوان دەمایەوە.

ئیدوارد بارتۆن، سەر ئەنجام توانی شاژن رازی بکا کە هەندێ دیاری بۆ سوڵتان بنێرێت، بەڵام سەختترین کاری دیپلۆماتەکان ئەوەبوو کە کاتی چوونە لای سوڵتان وەربگرن و بتوانن بچنە حزووری سوڵتان . بارتۆنیش کاتێ کە ویستی دیارییەکانی شاژن پێشکەشی سوڵتان بکات، لەگەڵ ئەم گرفتەدا رووبەڕووبۆوە. ئەو دیارییانەی شاژن بۆ سوڵتانی ناردبوون، بریتی بوون لە دوازدە دەفری زێڕ، ٣٦ تۆپە قوماشی ئاوریشمی دەرەجەیەکی ئینگلیزی، ٢٠ تۆپە قوماشی زێڕدووراو، ١٠ تۆپە قوماشی ئاوریشم، شەش پارچە دەفری چینیی دەرەجە یەک و هەندێ شتومەکی بەنرخی دیکە...

لەو رۆژەیدا کە بۆ دیداری سوڵتان دیاری کرابوو، بارتۆن لەکاتێکدا کە جلی رەشی پۆشی بوو، لە باڵیۆزخانەی ئینگلیز کە کەوتبۆ گەڕەکی پڕاوە بەشێوەیەکی رەسمی هاتە دەرو بە قایەغ بەکەنداوی داردانێل دا تێپەڕی. ئەوانەی لەگەڵی دابوون بریتی بوون لە حەوت کەس لەهاوکارانی کە هەموویان جلی یەکدەستی خەنەیی تۆخیان پۆشی بوو. کاتێ بارتۆن لە نزیک ئەو شوێنەی کە پێشتر بابی عالی بوو لە بەلەم دابەزی، کەشتییەکی بازرگانی ئینگلیزی، وەک رێزلێنانێک چەند گوللە تۆپێکی تەقاندن. دووپاشاو چل جارچیی ئەسپ سوار، پێشوازییان لەبارتۆن و هاوڕێیانی کردو بەسواری ئەسپ تا حەوشی یەکەمی کۆشکی سوڵتانیان هێنان و لەبەردەم

دەروازەی دووەم کە دوو بورجی هەبوون و سەری بڕاوەی کارمەندە سەرپێچیکارەکانیان پێوە دەکرد، لەئەسپ دابەزین.
چوونە لای سوڵتان، دنیایەک ڕۆتین و ئەملاو ئەولای دەویست. گاردی ڕێزلێنان لەتەنیشت ئەو جادەیەی کە دەچووە باڵەخانەی دیوانی هومایونی، بەڕیز وەستابوون. دوای ئەوەی، بارتۆن بەبەردەمی ئەوانەی کە بۆ ڕێزلێنانی وەستابوون تێپەڕی، لەنێو باڵاخانەی دیوان، باڵیۆزی ئینگلیز نامەی ئەلیزابێتی دایە سەرۆک وەزیران و دواتر نانی نیوەڕۆیان خوارد.
خوانێکی درێژ لەیەکێ لەهۆڵەکان و لەسەر فەرشە گرانبەهاکان ڕاخرا و، سەدان دەفری خواردن و جۆرەها گۆشتی کوڵاو و سوورکراوەی حەیوان و پڵاوی جۆربەجۆرو زەڵاتەی باشیان لەسەردانا. تەواوی ئامادەبوان لەسەر ئەژنۆ دانیشتن و دەستیان بە خواردن کرد. دەیان خزمەتکار لەو مەشکانەی کە بەشانیانەوە بوو، شەربەتی گوڵاویان بۆ میوانان لەپەرداخ دەکردو دەیاندایە دەستیان.
نانەکە بەبێدەنگی و هێمنی خورا و، دواتر میوانەکان لەجێی خۆیان رابوون. لەوکاتەدا خوڵامە رەش پێستەکان لەسەر خواردنی بەرماوەی میوانەکان لێیان بوو بەهەرا و ئەمەش بەهیچ جۆرێک شایستەی میوانی و مەجلیسێکی لەو بابەتە نەبوو.
سوڵتان لە تالاری تەخت و لەحەوشی سێیەم، واتا لە دیوی دەروازەی (بابی سەعادەت) چاوەڕێ بوو، بەڵام بەر لەوەی ڕێگە بەبارتۆن بدەن بچێتە لای سوڵتان، ناچاریان کرد جلێکی تایبەت بپۆشێ. جبەیەکی زێڕدووراویان بەسەر شانی دادا و بردیانە نێو ساختومانەکەوە. ئینجا دەستکرا بە پێشکەشکردنی دیارییەکان و سەد خزمەتکار لەڕیزێکی درێژدا، یەک بەیەک دیارییەکانیان بەدەستەوە گرتبوو و نیشانی سوڵتانیان دەداو، ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە هێشتا بارتۆن سوڵتانی نەبینیبوو. تاقمێکی زۆر لە خواجەسەرایان و خوڵامانی کەڕوڵاڵ و کورتەبنە، دەورەی بارتۆنیان دابوو و، لێنەدەگەڕان بچێتە تالاری تەختەوە کە سوڵتان لەوێ دانیشتبوو.
کاتێ کە دوایین خزمەتکار بەدوایین تۆپە قوماشی دیارییەوە چووە تالاری تەختەوە، ڕێگەیان بەبارتۆن دا کە بەدوای ئەودا بچێتە ژوورەوە. بەڵام بەپێی دابونەریتی باوی ئەو سەردەمە کە پتر لەڕوانگەی مەترسی لە پەلاماردانی گیانی سوڵتانەوە بوو، دوو پاشا سەرقۆڵی جبەکەی باڵیۆزیان گرتبوو و، بەرەو تەختیان دەبرد. موارد لە کۆتایی هۆڵەکە لەسەر تەخت دانیشتبوو و، جگە لە پاشایەک نەبێ کە بەکووڕی و سەرشۆڕی لەتەنیشتی وەستابوو، کەس لەو ناوە نەدەدیترا.
سوڵتان جبەیەکی گرانبەهای پۆشی بوو و، لەسەر تەختێکی زێڕ کە لە تواوەی (٨٠) هەزار دراوی زێڕ درووستکرابوو و، لەلایەن ڕەعیەتە میسرییەکانییەوە وەک دیاری پێشکەشی کرابوو، دانیشتبوو. لە ژوور سەری، فەرشێکی ئاوریشمی سەوز، کە تان و پۆیەکەی لە زیو و مرواری بوو، بەدیوارەوە هەڵواسرابوو. بارتۆن کە هێشتا بەدەست پاشاکانەوە بوو، کڕنۆشی برد و دەستی پڕ لە ئەنگوستیلەی مورادی ماچ کرد. ئینجا پاشاکان بەتووندی کێشایانەوە پشتەوەو بەرەو دەرگای هۆڵەکەیان برد و ئەم دیدارە سەیرو سەمەرەیە کۆتایی پێهات. بارتۆن لەکاتێکدا کە

دوو هەزار سوار بەڕێیان دەکرد بەرەو قایەغەکەی خۆی گەڕایەوە.
لەو سەردەمەدا گۆڕینەوەی دیاری زۆر باو بوو، بەڵام پێدەچوو دەرباری قوستەنتەنییە کەوتبێتە ژێر کاریگەرییەتی دیارییەکانی ئەلیزابێتەوە؛ چونکە کاتێ کە موراد مرد، جێگرەکەی لەنامەیەکدا ئەلیزابێتی بە *«نەجیبترین ئافرەتی سەر رووی زەوی»* لەقەڵەم دا.
شاژن ئەلیزابێت، هەندێ دیاریشی بۆ سوڵتانە بافو ناردبوو کە بریتیبوون لە وێنەیەکی خۆی لە چوارچێوەیەکی نەخشێندراو بەیاقووت و ئەڵماس، سێ دەفری زێڕ، دە تۆپ قوماشی زێڕ دووراو، قوتویەکی زۆر جوان کە کەرستەی ئارایشی لە زێڕوزیو درووستکراوی تێدابوون و دوو پارچە دەفری چینیی نایاب.
بافو لە گەیشتنی ئەو دیارییانە زۆر خۆشحاڵ بوو و، لەرێگەی قزڵەر ئاغاوە لە بارتۆنی پرسی کەوا شاژن ئەلیزابێت حەزی لەچ جۆرە دیارییەکە؟ بارتۆن پێشنیازی کرد کە دەستە جلێکی ئافرەتانەی پرشکۆ کە ریشووی لێدەندرێ و لەناو تورکیادا زۆر جوانەو لەدەرەوەشدا دەگمەنە، دەتوانێ جێی سەرنجی شاژن ئەلیزابێت بێت.
بافو ئەم پێشنیازەی پەسندکرد و بەپەلە جلەکەی بەنامەیەکەوە ناردە خزمەت شاژن ئەلیزانێت کەتێیدا هاتبوو: *« من سڵاوە دۆستانەکانی خۆم دەنێرمە حزووری خاوەنشکۆی بەرێز. بولبولان بە ئاوازە دڵگیرەکانیان هەرگیز ناتوانن وەک ئەم نامە ساکارەی من پەیامی خۆیان بگەیەننە گوێی خاوەنشکۆ. ئەو دۆستایەتییە تایبەتییەی کە هەر کام لە ئێمە لەهەمبەر یەکدی هەمانە، وەک باخێکی پڕ لە گوڵ و باڵندەی دەنگخۆشە. من هەمیشە لەلای سوڵتان وەک نوێنەری خاوەنشکۆ دەبم ودەتوانن دڵنیابن کە لەهەموو بارودۆخێکدا هەوڵدەدەم رەزامەندی جەنابتان بەدەست بێنم.»*
بارتۆن دەبێ دیپلۆماتێکی زیرەک بووبێ؛ چونکە توانیبووی هێمایەکی تایبەت لەنێوان باڵیۆزخانەکەی و لەندەندا بەرقەرار بکات. لەو هێمایەدا سوڵتان ژمارە (١٠٥) و شاژن ئەلیزابێت ژمارەیان (٩) بوو. لەم رووەوە کاتێ مورادی سێیەم لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٥٩٥ (جمادی الاول ـی ١٠٠٣ی کۆچی)دا، هەشت ساڵ بەر لەمردنی ئەلیزابێت کۆچی دوایی کرد، بارتۆن ئەم رستەیەی خستە سەر ئەو راپۆرتانەی کە دوو هەفتە جارێک دەیناردە لەندەن: *« ١٠٥ یەکجار نەخۆشە و هەندێک دەڵێن مردووەو بەدوای کوڕەکەیاندا ناردووە.»*
لەڕاستیدا، چوار رۆژ بەر لەوەی بارتۆن ئەم نامەیە بۆ شاژن ئەلیزابێت بنێرێت، موراد بەهۆی نەخۆشی گورچیلەو (فێ)وە مردبوو. زیادەڕۆیی لەخواردن و خواردنەوەش بەیەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی مردنی موراد لەقەڵەم دەدران ، بەشێوەیەک کە باڵیۆزی ڤینیز نووسیویەتی:« خواردنی موراد بریتی بوو لە گۆشتی چەورو قورسی حەیوان ، شۆربای خەست و ئەو خواردنانەی کە یارمەتی زۆر پەرینیان دەدا؛ چونکە هەمیشە غەرقی دەریای شەهوەت بوو.» موراد لەکاتی مردنیدا، پەنجا ساڵی تەمەن بوو، (٢٥) ساڵیشی حوکم کرد. (٢٠)کوڕ و (٢٧) کچی لەپاش بەجێما و حەوت لە ژنەکانی لەکاتی مردنیدا زگیان هەبوو.

* * *

سوڵتانی نوێ، محەمەدی سێیەم، بیست و نۆ ساڵی بوو و، پیاوێکی کەتەی ریش و سمێڵ ئەستوور و خاوەنی هەیکەلێکی سامناک بوو. هەروەها مەیلێکی نائاساییی بەلای توندوتیژی و دڵڕەقیدا هەبوو. لەو باسەیدا کە لە مۆزەخانەی بەرتیانیا سەبارەت بەو نووسراوە، هاتووە کە چۆن باوکی لەبەر خاتری ئەو رەوشت و کردەوانەی بۆ ویلایەتە دووردەستەکان دووری خستۆتەوەو، چۆن رق و قینە سەرشێتانەییەکەی جار جارە بوونەتە هۆی ئەوەی کە کاری وەحشیانەی لە بابەت داغکردنی مەمکی ئافرەتان ئەنجام بدات.

هەرکە محەمەد زانی باوکی مردووە، بەسواری گەمییە سەولێیە تایبەتییەکەی (ئەمیرولبەحر)ی عوسمانییەوە گەڕایەوە بابی عالی. لەو کاتەدا، سەعات نۆی بەیانیی رۆژێکی ساردو سەرمای مانگی کانوونی دووەم بوو و، محەمەد لەشوکرانەی ئەوەی کە سەفەرەکەی بەسەلامەتی بەئەنجام گەیشتووە، تەواوی کۆیلە سەوڵ لێدەرەکانی ئازادکردو فرمانێکی ناردە حەڵەب تا نیو ملیۆن بنەگوڵی سونبول بێنن و بەر لەمەراسیمی ناشتنی باوکی لەو شوێنە بیان چێنن کە ئەو لێی دابەزیووەو بیکەن بەگوڵزار. کاتێ کە محەمەد بەعەبای ئەرخەوانی رەنگی خۆی، لەدوای تەرمی باوکییەوە رووەو مزگەوتی ئەیاسۆفیا دەڕۆیشت، تێکڕای دانیشتوانی قوستەنتەنییە، بەڕیز لەسەر شەقام وەستابوون و فەرماندەکانی گاردی تایبەتیی سوڵتان، چڵە دارخورمایان لەسەرسەری سوڵتان رادەوەشاند و دەرباریبە رەشپۆشەکان بەنیشانەی ماتەمینی، مەندیلێکی بچوکی رەشیان لەسەر نابوو.

هێشتا تەرمی سوڵتانی کۆچکردوو نەخرابۆ نێو گۆڕەوە، کە محەمەد چووە دیداری بافو.

دوازدە ساڵ بەسەردوا دیداری نێوان ئەم دایک و کوڕە دا تێپەڕ دەبوو، کەس نازانێ لەم دیدارە چارەنووسسازەدا دایک و کوڕ چییانگوت، بەڵام زۆربەی مێژوونووسان لەو باوەڕەدانە کە دایکی دڵڕەق و تینووە دەسەڵاتی محەمەد، بەکوڕەکەی خۆی گوت یاسای براکوژی پیادە بکات.

محەمەد سەرەڕای ئەوەی بە رووخسار خۆی لەم کارە نارەحەت نیشان دەدا– کە ئەم حاڵەتە لەناو فرمانڕەوایانی عوسمانی دا زۆر دەگمەن بوو–، سەرئەنجام پێشنیازەکەی دایکی پەسندکردو بەبێ ئەوەی کات بەفیرۆ بدات فرمانی دا تێکڕای برایە هەق و زڕەکانی کە ژمارەیان ١٩کەس بوو، بۆ دەست ماچ کردن بێننە لای. بەتەمەنترینی ئەو منداڵانە یازدە ساڵی بوو و، هەموویان منداڵی جوان و بەڕەوشت بوون.

هەرکە ئەو منداڵانە هاتنە تالاری تەختەوە، محەمەد پێی گوتن لەهیچ نەترسێن و نیازی ئەوەی نییە ئازاریان بدات، تەنها دەیەوێ بەیەکەوە سوونەتیان بکات. چەند دەلاکێک و هەندێ خوڵامی کەڕلاڵیش، لەژوورەکەی تەنیشتی هۆڵی دانیشتنی محەمەد، چاوەڕێی فرمان بوون.

سەرەتا، منداڵەکان یەک بەیەک بەدەستی دەلاکەکان سوونەت کران و دواتر لە

ژوورەکەی تەنیشت بەشێوەیەکی وەستایانە بەدەستی خولامە کەڕولاڵەکان و بەدوعای خێری موفتی شارەوە، بەپەتی ئاوریشمی خنکێندران. بەیانی ڕۆژی دواتر تەرمی منداڵەکانیان خستنە نێو نۆزدە تابووتی بچوکەوەو سوڵتان بەپێی نەریتی باوی ئەو سەردەمە، بەر لەوەی لەتەنیشت باوکیان بیاننێژن، سەردانی ئەم دیمەنە سامناکەی کرد.

ئەم تاوانە دڕندانەیە، بەپێی یاسای بەناوبانگ بە *ژیاننامە*، کە لەلایەن سوڵتان محەمەدی فاتیحەوە بەمەبەستی خۆ بە دوورگرتن لەو مەترسیانەی کە لەسەر مەسەلەی جێنشینی دەهاتنە ئاراوە، بەئەنجام گەیشت. لەو یاسایەدا هاتبوو:« *زۆربەی یاسادانەران ڕایانگەیاندووە هەر کام لە کوڕانی بەنێوبانگی من کە دەبنە سوڵتان، مافی ئەوەیان دەبێ تەواوی براکانی خۆیان لەسێدارە بدەن تا لەم ڕێگەیەوە ئاشتی لەسەرڕووی زەوی پایەدار بمێنێ.کەواتا ئەوان دەتوانن بەوێژدانێکی ئاسوودەوە ناوەڕۆکی ئەم یاسایە جێبەجێ بکەن*»، بەڵام ئەوەی کە ( *مافیان هەبێ*)، زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەیدا کە دایکێک کوڕەکەی خۆی ناچار بکات ئەم یاسایە دڕندانە و نامرۆڤانەیە جێبەجێ بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا، محەمەد ڕووخساری خۆی بەباشی پاراست و کاتێ هەواڵی مەرگی برایەکانیان پێدا، کە بەپێی نەریتی ئەودەمە بە مەرەکەبی سپی لەسەر پەڕاوی ڕەش نوسرابوو، بە پەلە بڕیاریدا مەراسیمێکی ماتەمینی ڕەسمی ڕێکبخرێت و تێکڕای پیاوان و کاربەدەستانی وڵات بەشداری تێدا بکەن.

ڕۆژی دوای ماتەمینی، محەمەد فرمانیدا بەبۆنەی داهاتنی وەرزی بەهار، حەرەمسەرا بێننەدەرو بەقەولی مەعروف ماڵ تەکێنی بکەن و ئەوەش بەمانای ئەوەبوو کە تێکڕای ژنە قەمپاتمەکانی باوکی ناردە ئەدیرنە. بەم پێیە ئەم ئافرەتانەش چوونە لای ئەو ئافرەتانەی کە بەر لەوان نێردرابوونە ئەوێ و هێشتا هەندێکیان لەوپەڕی جوانی و ڕازاوەیی دابوون.

ژمارەی ژنەکانی موراد هێندە زۆربوو کە ناچار بوون تەواوی گالسیکە، داشقەو ئەسپ و گوێدرێژ وهێسترەکانی دەرباری سوڵتان بۆ گواستنەوەیان بەکاربێنن. جگە لەو حەوت بێوەژنەی کە زگیان هەبوو و لە سۆنگەی ئەوەوە خرانە گوونیە و هەڵدرانە بسفۆڕەوە،تێکڕای ئافرەتانی دیکەی حەرەمسەرایان گواستەوە بۆ حەرامسەرای کۆن . ئیدی دایکانی ئەو نۆزدە مێر منداڵەی کە ڕۆژی پێشتر کوژرابوون، دەیانتوانی لەو شوێنە نوێیەدا بەهێمنی بگرین و بۆ منداڵەکانیان فرمێسک بڕێژن، چونکە ئەگەر پێشتر دەنگی گریان و ڕۆڵەڕۆیان لە بابی عالیدا بەرگوێی سوڵتان کەوتبایە، ئەوا دەمودەست فرمانی خنکاندنیانی دەردەکرد.

بافو، وەک (مسالینا)ی ئیمپراتریسی بەنێوبانگی ڕومی باستان، بەئەنقەست دەستی دایە گەندەڵ کردنی کوڕەکەی و وای بەباش زانی کە ئاسانترین ئەوزار بۆ پاراستی دەسەڵاتەکەی ئەوەیە کە هەموو هەفتەی جارێک فەزای حەرەمسەرا بە ئافرەتانی جوان و پەری شێوە بگۆڕێت و بەم شێوەیە سوڵتان سەرگەرم بکات. بەپێی گێڕانەوەی (فاین مۆریسۆن)ی گەڕیدەی ئینگلیزی کە بۆ کارێکی واپڕ

لەدەردەسەری دامەزرێندرابوو:« *کاتێک محەمەد لەسەر تەخت دانیشت، سوێندی خوارد کە هەرگیز هیچ ئافرەتێک قەمپاتمە نەکات و جگە لە سوڵتانەکەی خۆی لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی دیکەدا نەخەوێت و ئەم سوێندەشی لەبەر نارەحەتی خۆی لەکوشتنی برایەکانی خواردبوو، بەڵام زۆری پێنەچوو کە پەنجا کچی زۆر جوانی خاوەن کچێنییان پێشکەش کردو لەماوەی چەند مانگێدا (٥٠٠) ئافرەتی جوان هاتبوونە نێو حەرەمسەراکەیەوە*».

ئێستاکە ئیدی بافو هەموو دەسەڵاتێکی بەدەستەوەبوو. لەماوەی هەشت ساڵی بەناو دەسەڵاتدارییەتی کوڕەکەیدا، بافو بواری ئەوەی نەدا هیچ شەڕێک لە نێوان ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و نیشتمانەکەی (ڤینیز)دا، روویدات و بۆ گەیاندنی نامە و پەیامەکانی خۆی بە باڵیۆزی ڤنیز لە قوستەنتەنیەو شاژنی فەرەنسا کاترین دۆمیدسی، سوودی لەئافرەتێکی یەهودی بەنێوی کیارتسا وەردەگرت کە زۆربەی کات زێڕو زیو و خشڵی ئافرەتانی بۆ فرۆشتن دەهێنایە نێو حەرەمسەراوە.

بافو، کاریگەرییەتییەکی بێوێنەی بەسەر کوڕەکەیەوە هەبوو، بەڵام تەنها یەک جار نەبێ وئەویش ئەوکاتەی کە ئاگری شەڕی نێوان عوسمانی و مەجەر هەڵگیرسا، نەیتوانی سود لەم کاریگەیەتییەی ببینێ و رەوتی رووداوەکان بەپێچەوانەی ویستی ئەوەوە بوو. بافو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەگەر کوڕەکەی بچێتە گۆڕەپانی شەڕەوەو لەبەرچاوی نەمێنێ، رەحمی لەسەر نامێنێ و پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە کوڕەکەی نەچێتە گۆڕەپانی جەنگەوە، بەڵام لەساڵی ١٥٩٣ (١٠٠١ی کۆچی)، کاتێ ویلایەتەکانی ترانسیلوانی و والاشی لەدژی دەسەڵاتی عوسمانی راپەڕین و هێزەکانی نۆتریش و مەجەر بەسەرۆکایەتی (ماکسیمیلین)ی ئیمپراتۆری نۆتریش هاتنە نێو تخوبەکانی عوسمانیەوە، محەمەد ناچاربوو خۆی بچێتە بەرەی جەنگەوە.

بەر لەوەی لە قوستەنتەنییە تێبگەن کەچی روویداوە، هێزەکانی دوژمن لەڕووباری دانۆب پەڕینەوە و تورکەکانیان لەچەند پێگەیەکی گرنگ وەدەرنا. دەبوایە تورکەکان بەخێرایی بکەونە خۆ و لەم رووەوە بە محەمەدیان گوت کە پێویستە ئالاکەی پێغەمبەری خوا لە خەزێنە دەربێنێ و لە ژێریدا سەرکردایەتیی هێزەکانی بکات. محەمەد دوای ماوەیەک دوودڵی لەوەی بچێ یان نەچێ، سەر ئەنجام بڕیاری دا ئەم کارە بکات و ئەم کارەشی تاکە کارێکیەتی کە بەدرێژایی ژیانی وێڕای نارەزایەتیی دایکی بڕیاری لەسەرداوە و ئەنجامی داوە. بەڵام لەڕاسیتدا محەمەد خۆی سەرکردایەتی هێزەکانی نەکردو هیچ رۆڵێکیشی لەبەڕێوەبردنی جەنگەکەدا نەبوو، لەکاتێکدا لە گۆشەیەکەوە دوور لە گۆڕەپانی جەنگ وەستابوو، سەیری شەڕەکەی دەکردو سەرجەم دەسەڵات و تواناکانی سپاردبۆ دەست سەرۆک وەزیران.

هێزەکانی هەردوولا بۆ ماوەی سێ رۆژ لەدەشتی (سێرتس)ی هەنگاریا لەگەڵ یەکدی لەجەنگدا بوون. لەدوو رۆژی یەکەمدا نۆتریشییەکان ئەوەی کەوتە بەرامبەریان لەنێویان برد و محەمەد ترسی لێ نیشت و پێشنیازی پاشەکشێی کردو تەنها ئازایەتی ولێهاتوویی ئیتالیاییەک بەنێوی (چیکالا) کە موسڵمان ببوو و لەناو سوپای عوسمانی دا دەجەنگا، تورکەکانی لەشکستی یەکجارەکی رزگار کرد.

لەرۆژی سێیەمی جەنگدا ئەم کابرایە سەرکردایەتیی دژە هێرشێکی سوارە نیزامی کردو بەتەواوەتی چارەنووسی جەنگی گۆڕی؛ سی هەزار ئۆتریشی و مەجەر کوژران و ماکسیمیلین ناچار بوو بۆ رزگارکردنی گیانی خۆی رابکات. تەواوی ناوچە داگیرکراوەکان دەستیان بەسەرداگیرایەوە و، محەمەد توانی وەک سەرکەوتوو (فاتح)ێکی جەنگ بگەڕێتەوە قوستەنتەنییە و وەک قارەمانێک پێشوازی لێبکرێت.

ئێستا کە، کاریگەری و توانای بافو لەهەموو کاتێک پتر ببوو؛ بافو لەبەرامبەر بەرتیلدا سەرۆک وەزیری دەگۆڕی و بە فرۆشتنی پلەوپایە رەسمییەکانی دەوڵەت نەوەستا بوو، بگرە پلەوپایە دادوەری و سوپاییەکانیشی دەفرۆشت.

سەرانی وڵات و ئەوانەی کە بەتەنگ پاراستنی پلەوپایەکانیانەوە بوون، ناچار بوون بەرتیل بدەنە بافو. دیارە ئەمەش بووە هۆی هاتنەکایەی گەندەڵییەکی فراوان لەنێودامودەزگاکانی حکومەتدا؛ چونکە هەر خاوەن پلەوپایەیەک کە هەستی بەوەدەکرد ماوەی پلەوپایە کڕاوەکەی کۆتایی پێهاتووە، بەرلەوەی بافو پلەکەی بەیەکێکی دیکە بفرۆشی، دەستی دەکرد بە تاڵان و بڕۆی خەڵکی ولە گیرفانەکانی خۆی دەئاخنی.

جارێکیان سەرۆک وەزیرێک کە بودجەیەکی زۆری بۆ درووستکردنی گەلە کەشتیەکی نوێ پێ بەخشرابوو، سوڵتانی بردە کەنار دەریاو لەدوورەوە چەند کەشتیەکی کۆن و داڕزاوی وەک کەشیتی تازە درووستکراو نیشانی سوڵتانی داو بودجەی درووستکردنی گەلە کەشتیەکەشی لەباخەڵ نا.

محەمەدی سێیەم لەتەمەنی پەنجاودوو ساڵیدا مرد و مەرگی سوڵتان بووە مایەی خۆشحاڵی خەڵکی. ئەو دوایین سوڵتانێک بوو کە توانی لەسەردەمی دەسەڵاتی باوکیدا بەئازادی بژییەت و نۆزدە برایەکەی، دوایین شازادەبوون کە بەپێی یاسای براکوژی لەنێوبران. بەڵام ئەم کارە بەمانای ئەوە نەبوو کەشازادەو جێگرەکانی دیکە بەڕاحەتی و بەبێ ترسی خنکان و کوشتن بژییەن و لەهەندێ بواریش دا هەق بەلای ئەواندا بوو.

هێشتا زۆر بەسەر مردنی محەمەددا تێنەپەڕی بوو کە بافوشیان بەخنکاوی لەسەر جێگا دیتەوە، بەڵام مەرگی ئەو بەمانای کۆتایی هاتنی فرمانڕەوایی و دەسەڵاتدارییەتی ئافرەتانی حەرەمسەرا نەبوو. ئەو شازادانەی کە دوای محەمەد لەسەر تەخت دانیشتن، چارەنووسێکی زۆر خراپترو شوومتر لەوەی محەمەد چاوەڕێیان بوو؛ بۆ ئەوەی کە دڵنیابن هەرگیز شازادەکان لەدژی سوڵتان راناپەڕن و پیلانی دژ ناگێڕن، هەموویانیان لە ساختومانێکی نێو کوشکی سوڵتاندا زیندانی کردن و دیوارێکی بڵیندیشیان بەدەوری ساختومانەکەدا هەڵچنی و نێویان لێنا قەفەس، کە بەڕاستی نێوەکەی لەجێی خۆی بوو.

### فەسڵی چوارەم

### سالانی قەفەس

قەفەسی بابی عالی، وەک قەفەسە ئاساییەکانی دیکە شیشی ئاسنینی لە دەورەنەبوو، بگرە دەرگای ئاسنین و قوفڵی مەحکەمی پێوەبوون و بریتی بوو لەساختومانێکی دووقاتی خۆڵەمێشی رەنگ ولەنێو جەرگەی دیوارە بڵیندەکانی حەرەمسەرا دابوو و، کەوتبۆ بەرامبەر ژوورەکانی سوڵتانەی ئەودەم.
حەوش و باخچەی رازاوەی هەبوون و دیوارەکانی بەباشترین جۆری کاشیکاریی بابی عالی لەقەڵەم دەدران، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا شتێکی سامناکی تێدا بەدی دەکرا؛ قاتی خوارەوەی هیچ پەنجەرەیەکی تێدا نەبوو کە بەسەر باخچەو حەوشەدا بروانێ و لە پەنجەرەکانی قاتی سەرەوەشەوە تەنها دیمەنی بێ کۆتاییی دەریا دەبیندرا.
بەدێژایی دوو سەدەی دوای ئەو مێژووە، جاری واهەبوو لە تەمەنی دوو ساڵیەوە شازادەکانیان دەخستە نێو ئەو قەفەسەوە کە دواتر، یان لەسەر تەخت دادەنیشتن یانیش لەکۆتایی دا دەخنکان و ژیانی پڕ لەمەینەتییان کۆتایی پێدەهات . یەکێ لەشازادەکان نزیکەی پەنجا ساڵ بەبێ ئەوەی تاکە جارێک رێگەی پێ بدرێت بێتەدەرەوە، لەو قەفەسەدا ژیاو، کاتێ وەک سوڵتان لەسەر تەختیان دانیشاند، توانای قسەکردنی نەمابوو!
تەنها هۆگرو هاودەمی ئەم شازادە چارەڕەشانە، خولامە کەڕولاڵەکان بوون و ئەوانیش نەیاندەتوانی هەواڵی دنیای دەرەوەیان پێ بگەیەنن و حەرەمسەرایەکی بچوک کە چەند کە نیزەکێکی تێدابوو بەتاکە هاودەمی ئەو شازادانە لەقەڵەم دەدران. ئەو کەنیزەکانەش کە پێیان دەنایە نێو قەفەسەوە، دەست بەجێ تووشی چارەنووسی ئاغاکانیان دەبوون و هەرگیز مافی ئەوەیان نەبوو لەقەفەس بێنەدەر و ئەگەر لە رووی بێ ئاگاییەوە حامیلە بووبانایە، ئەوا دەست بەجێ دەیان هێنانە دەرەوەو لەئاوەکانی بسفۆردا نغرۆیان دەکردن. بەڵام ئەمە زۆر بەدەگمەن روویدەدا؛ چونکە ئەو ئافرەتانە پتر لە رێگای دەرهێنانی رەحم، یان بە بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی کە پزیشکەکانی حەرەمسەرا لە بۆن و عەمبەرو عود و هێل وزەنجەفیل وبیبەرو مێخەک درووستیان دەکرد، خۆیان نەزۆک دەکرد.
سوڵتان ئەحمەدی یەکەم کە لەساڵی ١٦٠٣ (١٠١٢ی کۆچی) جێی سوڵتان محەمەدی گرتەوە، ئامادە نەبوو یاسای دڕندانەی براکوژی جێبەجێ بکات و لەم

رووەوە ڕێگە چارەی قـەفـەسی هێنایە ئاراوە. ڕەنگبێ لە بەر دۆزینەوەی ئەو ڕێگە چارە مرۆڤانـەیەی کە دەبووە هۆی نـەکوشتن و ژیانی براکانی شانازیشی بەخۆیەوە کردبێ، بەلام بەئاسانی دەکرێ کاریگەرییەتی شومی سالانی درێژی زیندان بەسەر ئەو کەسـانەوەی کە نیـوەی تەمـەنیان لە قـەفەسدا تەنـها بە خـواردن و نووسـتنەوە تێپەڕیبوو و، ئێستاکە بە ئیشارەتێک و لەپڕێکەوە دەبوونە سولتان، بێننە پێش چاو.

هــەروەک ( ن. م . پـێـنـرز) کە یەکێکە لە توێژەرەوە بە ناوبانگەکانی رۆژئاوا، سەبارەت بە حەرەمسەرای عوسمانییەوە نووسیویەتی: « *قـەفـەس پتـر لەهـەمـوو کـۆشکێکی ئەوروپا، گـۆڕەپانـی گەمـەی دڕنـدانەو دڵرەقی و خـوێنـڕێژی بوو. لاوازی کەسایەتی، بەدەرەوشتـی و دەبەنگیی زۆربەی سولتانەکانی عوسمانـی و دارمانی پێ بەپێی و لەنێوچوونی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە قەفەسەوە سەرچاوەی دەگرت.*»

ئەحمەد لە ماوەی ئەو چواردە ساڵەی دەسەلاتیدا، داهێنانێکی دیکەشی کرد؛ بەر لەوەی لە تەمـەنی (٤٨) سـاڵیداو بەهـۆی نەخۆشی سیلەوە بمرێ، کێشـانی توتن و تەماکۆی بەنێو خەڵکی تورکیادا بلاوکردەوە. لەسەرەتادا، پیاوان و ڕێبەرانی ئاینیی ولات، بە توندی دژایەتی ئەم کارەیان کرد و شێخولئیسلامی قوستەنتەنییە کە بە بەرزترین پلەی ئاینیی نێو ولات لەقەڵەم دەدرا، بەکارهێنانی توتن و کێشـانی مەنع کردو فتوای دا:« *کێشانـی توتن بەپێچەوانەی فەرموودەکانی قورئانە و کارێکی دزێو و ناپەسندەو پێویستە موسلمانە ڕاستەقینەکان خۆی لێ بەدوور بگرن.*»

ئەم فتوایە تا ئەوکاتە کاریگەر بوو کە زانایەکی دیکە گوتی لە قورئاندا شتێکی لەو بابەتە نییە ؛ چونکە زاناکە ئەوەی سەلماند کە لە قورئاندا ناوی توتن نەهاتووە. بەم پێیـە شێـخولئیـسـلام ناچار بوو لـە فـتواکـەی پاشگەزبێتـەوە و دوای ئەمـە بەڕێژەیەکی یەکـجـار زۆر لەسـەرانسـەری تورکـیـادا، دەسـتکرا بە چاندن و بەرهەمهێنانی توتن.

* * *

لەسـەردەمی دەسـەلاتدارییەتی ئەحـمەددا، مستەفای جێگری، پتر لە دە ساڵی تەمـەنی خـۆی لەنـاو قـەفـەسـدا بەسـەر برد و لەم ڕووەوە ئەمـە بە یەکەم نموونەی کاریگەرییەتی شومی ئەم کردەوە نامرۆییە بەسەر جۆری مرۆڤدا لە قەڵەم دەدراو لەم مێژووە بەدواوە هەمـوو سـولتانەکانی عوسـمـانی لە ئەوانی پێش خـۆیان شـێت تر، گـەندەڵتـر و دەبەنگتـر بـوون. کـاتێ مـسـتـەفـا لەسـەر تەخت دانیـشت و جڵـەوی دەسـەلاتی گرتـە دەست، بەتەواوەتی عەقڵ و هۆشی خۆی لەدەست دابوو و شێتێکی تەواوبوو.

دوو لەو خـولامـە مێرمندالانەی جێی سـەرنجـی خۆی، کـردنە حـاکمی دیمەشق و قـاهیـرە و ئەوە لەکـاتێکدا بوو کـە ئەوانە هێشـتـا منداڵ بوون و هیـچـیـان نەدەزانی. یەکێ لە وەزیرکانی لادا بۆ ئەوەی پۆسـتەکەی بدا بەو کابرا لادێیـەی کە لەکاتی ڕاودا ئاوی دابـۆیە. باڵوێزی فـەرەنـسـای لەهـیـچ و خـۆڕایی لە کـۆشکی حـەوت کـەلوو دا زیندانی کـرد. لەئاکامـی ئەم کردەوە تەلاس و سـەر شێتانەیە، دوای سێ مـانگ زۆر بەڕێزەوە لەدەسـەلاتیان خـست؛ ڕاوێکی پێنج ڕۆژییـان بۆ ڕێکخـست و کـاتێ لە ڕاو

گەڕایەوە، ئیدی سوڵتان نەمابوو. بۆیە بۆ جارێکی دیکە گەڕاندیانەوە نێو قەفەس.
دوای ئەو برازایەکەی عوسمانی دووەمیان لەساڵی١٦١٨ (١٠٢٧ی کۆچی)دا، کردە سوڵتانی عوسمانی. بەڵام بەداخەوە ئەو زۆر لە مستەفا شێتتر بوو؛ چێژی لە تیرهاویشتن بەکەوان وسێرەگرتن لە بوونەوەرە زیندووەکان وەردەگرت، لەم رووەوە یەخسیرەکانی شەڕیان بۆ ئەم گەمە شەیتانییەی سوڵتان دەکردە نیشانەو سووتەمەنی. بەڵام کاتێ یەخسیرەکان تەواوبوون و کەسیان نەمان، سوڵتان پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە دەبێ خوڵامە مێرمنداڵەکانی نێو کۆشک بۆ ئەم کارەی بەکاربێنن. دوای چوار ساڵ سەڵتەنەتی پڕ لەخوێن رێژی و کاری ناشایست، یەنیچەرییەکان بڕیاریان دا لەسەر کاری وەلانێن و لەدەسەلاتی بێخن. عوسمان کە هێشتا موی لێ نەهاتبوو، هەوڵی ڕاکردنی دا، بەڵام کاتێ یەنیچەرییەکان لەبڕیارەکەی خەبەرداربوون، بەبێ چەک هێرشیان بردە حەوشی یەکەمی بابی عالی و بەدارو ئازاڵە دەرگای بابی سەعادەتیان شکاندو هاتنە نێو حەوشەی سێیەمەوە کە تایبەت بوو بەسوڵتان. لەوێ هەواڵیان پێدرا کە عوسمان لە یەکێ لەژوورە قایم و قوفڵ دارەکانی حەرەمسەرادا خۆی حەشارداوە. یەنیچەرییەکان ئەم دەرگایەشیان شکاندو عوسمانیان راپێچی زیندانی حەوت کەلوو کرد کە ئەودەم وەک زیندانی باستیلی فەرەنسا بوو. عوسمان لاوێکی چوار شانە بوو و، سەرشێتییەکەی هێزێکی شێتانەی پێ بەخشیبوو، بۆیە لەوکاتەیدا کە پەلاماریان دا (٦) لە پیاوانی یەنیچەریی کوشت و سەرئەنجام خۆیشی بەدەستی یەنیچەرییەکان کوژرا. ئەمە یەکەم جاربوو کە لەمێژووی عوسمانیدا یەکێ لە سوڵتانەکان بکوژرێت.
بەهەر حاڵ گرفت لێرەدا ئەوەبوو کە کێ لەجێی عوسمان دانێن؟ سەیر ئەوەبوو کە بڕیاریان دابۆ جارێکی دیکە مستەفای چارەڕەش و شێت لەقەفس دەرهێننەوەو بیکەنەوە سوڵتان، بەڵام ئەم کارە هەر بەزار خۆش بوو.
ئەوکاتەی یەنیچەرییەکان تاقمێکیان خەریکی کوشتن و دەستگیرکردنی عوسمان بوون، ژمارەیەکی دیکەیان بەدوای مستەفادا دەگەڕان. مستەفا دەرگای قەفەسی لێنەکردنەوە بۆیە یەنیچەرییەکان ناچار بوون سەربانی ساختومانەکەی قەفەس کون بکەن. کاتێ سەربانیان کون کرد، دیتیان مستەفا لەکاتێکدا کە دوو کەنیزەکی لەتەنیشتە، لەسەر بالیف دانیشتووە و وەک شێتان زەردەخەنەیەکی بەسەر لێوەوەیە.
یەکێ لە سەرەبازەکان بەگوریس لەکونەکەوە چووە خوارێ، بەڵام مستەفا رێگەی نەدا دەرگاکە بکاتەوەو سەرئەنجام کودەتاچییەکان بەناچاری دەست و پێی مستەفایان بەست و لە کولانکەکەوە هەڵیانکێشایە سەرەوە. پیلانگێرەکان دەیانویست مستەفا سواری ئەسپێک بکەن و نیشانی ئەو حەشامەتەی بدەن کە لە حەوشی یەکەمدا کۆببوونەوە، بەڵام مستەفا هێندە لاواز و بێ هێز ببوو کە خۆی پێ لەسەر ئەسپ ڕانەدەگیرا؛ چونکە بەهۆی ئەو ئازاوانەی لە کۆشکدا روویاندابوو، خولامەکان لەبیریان چووبوو نانی بدەنێ. بۆیە یەکسەر بردیانە هۆڵی تەخت و بەزۆری زۆرداری لەسەر تەختیان دانیشاند و نیشانی خەڵکیان دا.
خولی دەسەلاتی مستەفا وەک خولی یەکەمی پڕبوو لە دەستەوستانی و شکست و

تەنها ساڵێک و چوار مانگی خایاند. دوای ئەو ماوەیە بەهێمنی خنکاندیان و بەیەکجاری لەکۆڵیان کردەوە.ئێستاکە ئیدی بەخێرایی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەرەو لە نێوچوون و دارمان دەچوو.
( سێرتامز رۆ)ی باڵوێزی جیمسی یەکەم، پاشای ئینگلتەرا، لە یەکێک لە راپۆرتە سەرەتاییەکانی خۆیدا نووسیویەتی: *« سەرانسەری سنوری ئیمپراتۆرییەتی سوڵتانی مەزن لەئاکامی ستەم و دەستدرێژی و تووندوتیژی چۆڵ کراوە و بەشێوەیەکە کە لە باشترین و پر پیت و بەرەکەتترین ناوچەکانی یۆنان و ئەنادۆڵدا، رەنگبێ پیاوێک سێ چوار رۆژ وتەنانەت شەش رۆژ سەفەر بکات بەبێ ئەوەی تووشی ئاواییەک یان گوندێک ببێ کە تێیدا بتوانێ خۆراک بۆ خۆی و ئالیک بۆ ئەسپەکەی دابین بکات.*
*داهاتی خەڵک هێندە کەم بووە کە تەنانەت هیچ پارەیەکیان بۆ سەرانەدان و بەشە خۆراکی سەربازان و خەرجییەکانی کۆشکی سوڵتان نەماوە. رەنگبێ تا ماوەیەک ئەم خەرجیانە لەرێی ئەو پارەیەی کە لەخەزێنەدا هەیە، یان لەرێگەی ئەو باج و سەرانە زۆرەی کە خراوەتە سەر بازرگانان و کرێکارانەوە، دابین بکرێ و بخرێتە بەردەست دەسەڵاتدارە چاوبرسی و درندەخووەکانەوە.*
*لەوە پتر ناتوانم باسی ئەوەبکەم کە چۆن نەخۆشی وەک خۆرە کەوتۆتە گیانی ئیمپراتۆرییەت و لاوازی دەکات. ئێمە هەموو رۆژێ چاوەڕێی گۆرانی فراوانتر و خوێزێژیی پترین. زاناترین کەسایەتییەکان خۆ لە گرتنە دەستی جڵەوی وڵات و بەرپرسیارییەتی ئەم کەشتیە شکاوە دەدزنەوە، بەڵام بەم زووانە دەبەنگ و شێتەکان ئەو کەشتییە لە گابەردێک دەدەن و خۆیان و خەڵکی دیکەش لەناودەبەن.»*
جێی سەرسوڕمان نییە کە باڵیۆزی ئینگلتەرا، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەکابرایەکی پیرو نەخۆش بچوێنێ کە لەبەر زۆری و جۆراوجۆری نەخۆشییەکانی شێت بووەو، تەواوی هێزو توانای خۆی لەدەست داوە. بۆیە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هەیبەت و سامی سەردەمی سوڵتان سلیمانی نەمابوو و، ئەوروپاییەکان وردە وردە ترسی ئەو سەردەمەیان لێ دەرەوییەوە، بەڵام لەوکاتەدا ئەوروپاییەکان لەگەڵ یەکتری و لەنێو خۆیاندا تووشی ناکۆکییەکی قووڵ ببوون ونەیاندەتوانی سوود لەم دەرفەتە زێرینە وەرگرن؛ وڵاتانی ئەڵمانی بەسەختی تووشی شەڕی ئایینیی ببوون، ئیسپانیا دوای مردنی فلیپی دووەم تووشی دارمان ببوو و، وەک تورکیا کەوتبۆ سەراولێژییەوە، روسیا بەدەست سەرهەڵدان و راپەڕینی جۆراوجۆرەوە دەینالاند و بەریتانیاش بەگیروگرفتی نێو خۆیی و پەرلەمانییەوە خەریک بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرکام لەو وڵاتە ئەوروپاییانە ئەگەر مەبەستیان بایە دەیانتوانی بەتەنها هێرش بکەنە سەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و لەو ئان و ساتەدا ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەهیچ جۆرێک بەرگری پێ لەخۆ نەدەکرا.
لەم کاتە پڕ لە ئاڵۆزی و پشێوییەدا، سوڵتانێک هاتە سەر گۆڕەپانەکە کە بەتەواوەتی لەوانی دیکە جیابوو؛ کاتێ مورادی چوارەم لەساڵی ١٦٢٣ (١٠٣٢ی کۆچی)دا کرایە سوڵتان، تەنیا (١٠) ساڵ بەسەر تەمەنیدا تێپەڕیبوو و، ئەوەش بەو

مانایە بوو کە لانی کەم قەفەس نەیتوانیبوو کەسایەتییەکەی بشێوێنێ. دایکی دووربین و شارەزای موراد، کە ناوی کەوسەم بوو، جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەست و بەلێهاتوویی و کارامەییەوە وەزیرو سەرۆک وەزیرانی باشی هەڵبژاردن. هەروەها وەک دایکێکی شەیدای کوڕەکەی، کارێکی سەمەرەی ئەنجامدا؛ کوڕەکەی هاندا تا هاوجنسبازی بکات، بەو هیوایەی بتوانێ لە پیلان و دەرئەنجامە مەترسیدارەکانی دەخالەتی ئافرەتانی حەرەمسەرا لە کاروباری دەوڵەت رزگاری بکات. ئەم ریگە چارەیە تا ماوەیەک کاریگەر بوو، بەڵام هەرکە موراد گەیشتە تەمەنی هەرزەکارییەوە و لە ساڵی١٦٣٢ (١٠٤١ی کۆچی)، جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەست، ئەم پاژەی ژیانی خۆی بەتەواوەتی لەبیرکرد.

* * *

موراد لە هەموو روویەکەوە پیاوێکی مەزن بوو. هەیکەلێکی گەورەو پتەوی هەبوو و، بەنموونەی دڵڕەقی لەقەڵەم دەدرا. دوایین سوڵتانێکی بەجەرگ و ئازا کە لە قوستەنتەنییە فەرمانڕەوایی کردبێ، موراد بوو. چاوانی رەش و کاریگەری لەنێو دەمووچاویدا کە نیوەی بەریشە خەنەییەکەی داپۆشرابوو، دیمەنێکی تایبەتییان هەبوو. هەمیشە جلی ئەتڵەسی شینی دەپۆشی و لە سەرانسەری ئیمپڕاتۆرییەتەکەیدا، لە ئەسپ تاوداندا رکابەری نەبوو. لەوسەردەمەدا تیرهاوێشتن بەکەوان، وەرزشێکی نیشمانی بوو و، تیرهاوێژەکان وەک زۆرانیگرەکانی یۆنانی باستان و یاریزانانی تۆپی پێی ئەمڕۆکە، بە قارەمانی نیشتمانی لەقەڵەم دەدران و هەرکام لەوانیش لایەنگری فەناتیکیان هەبوون. موراد دەیتوانی لەگەڵ باشترینیاندا پێشبڕکێ بکات و دەیتوانی لە گۆڕەپانی ئەسپ تاودانی قوستەنتەنیەدا کە سێسەد مەتر درێژبوو، تیرێک لەو سەرەوە بهاوێتە ئەم سەر. لەڕم هاوێژی و شمشێربازی و نیشانە پێکان بەتفەنگیش، کەس خۆی لەقەرە نەدەدا. لە زۆرانێ گرتنیشدا بێ هاوتابوو و، هەمیشە ئامادەبوو لەگەڵ باشترین قارەمانانی وڵاتدا زۆرانێ بگرێ. بەوە بەناوبانگبوو کە هیچکەس لەدنیادا نەیدەتوانی مستی بکاتەوە.

موراد لەیەکەم رۆژی دەسەڵاتدارییەکەیدا بەرەورووی قەیرانی یەنیچەرییەکان بۆوە کە بە درێژایی ساڵانی بێ سەروبەری پێشوو، رێکوپێکیی کۆنی خۆیان لەدەست دابوو؛ سوێندی خۆیان لەمەڕ ژن نەهێنانیان، ژێر پێ نابوو، کوڕانی خۆیان هێنابۆ نێو ئەم هێزەو پۆستی گرنگیان پێ سپاردبوون. ئەم بارودۆخە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ سەردەمی سلێماندا هەبوو کە هێزەکانی یەنیچەری تەنها لە لاوانی بەدیاری هێندراو و ئەو کۆیلە مەسیحیانەی کە لە جەنگەکاندا بەیەخسیر دەگیران و کەسایەتیان دیار نەبوو، پێک دەهات. لە سۆنگەی ئەوەی کە بەدرێژایی ساڵانی پێشوو سوڵتانێکی گەندەڵ جێی سوڵتانێکی گەندەڵی دیکەی گرتبۆوە، یەنیچەرییەکانیش لەخستنەڕووی داواکارییەکانیاندا رووقایمتر ببوون و ئێستا کار گەیشتبۆ ئەو جێیەی بەسەرەونخوون کردنی مەنجەڵەکانیان کە نەریتێکی کۆن بوو، دوایان لە سوڵتان دەکرد سەرۆک وەزیرو شانزدە لە سەرانی وڵات بکوژێ. موراد ناچاربوو تەسلیمی ئەو خواستەی یەنیچەرییەکان بێت، بەڵام هەستی بەوەکرد کە

زۆر بچوک کراوەتەوەو سوکایەتی پێکراوە، بۆیە هەر زوو بەزوو بڕیاری دا تۆڵەیان لێبکاتەوە. لەم ڕووەوە بەهێمنی ژمارەیەک لە سەربازە وەفادارەکانی دەوروبەری خۆی کۆکردەوەو لەکاتێکدا کە یەنیچەرییەکان بە هیچ شێوەیەک چاوەڕێی ئەم کارە نەبوون، سەرانی یەنیچەرییەکانی دەستگیر کرد و خنکاندنی و پتر لە شەش سەد کەسی لە بارەگاکانیاندا لە سێدارەدا. زۆری نەبرد موراد ڕێگەچارەیەکی ئاسانی بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی وڵات دۆزییەوە؛ هەر بچوکترین گومانێکی لەیەکێک پەیداکردبایە، فەرمانی دەدا لەملی بدەن.

لە ساڵی ١٦٣٧ (١٠٤٦ی کۆچی) دا، بەنێوی عەدالەت و دادپەروەرییەوە (٢٥)هەزار لە خەڵکی ژێر دەسەڵاتی خۆی لە سێدارە دا و لەوانە ژمارەیەکی زۆریشی بەدەستی خۆی سەربڕین.

« *تۆڵە بەسەبرە، ئەمما بەزەبرە*»یان « *قەرزکۆن دەبێ، بەلام نافەوتێ*» لە درووشمەکانی موراد‌بوون.

موفتی گەورە، لەبەرخاتری ئەوەی گلەیی لەبارودۆخی ڕێگاوبانەکان کردبوو، ملی بەپەتەوەکرا و، سەرۆکی ئۆرکێستراکەی خۆی لەبەرخاتری ئەوەی کە مۆسیقایەکی ئێرانی لێدابوو، لەسێدارەدا. لەگەڵ ئەوانەشدا تریاککێشانی بەتەواوەتی وکێشانی جگەرەو نێرگەلەی لە شوێنە گشتیەکاندا یاساغ کرد. وەک هاروونە ڕەشید حەزی لەوەبوو شەوانە بەجلی ئاساییەوە لە کۆشک دەربچێ و سەردانی قاوەخانەکان بکات و ئەگەر لەو کاتەدا یەکێکی بدیبایە کە قەننە، یان نێرگەلە دەکێشێ، خۆی پێدەناساند و دەمودەست لەملی کابرای دەدا. جارێکیان باخەوانی کۆشک و ژنەکەی لەکاتی کێشانی نێرگەلەدا دیت، فەرمانی دا قاچی هەردووکیان ببڕنەوەو لەکاتێکدا کە قاچیان خوێنی لێدەچۆڕایەوە، ئەم دووبەخت وەرگەڕاوەی بۆ عیبرەت نیشانی خەڵک دەدا.

ئاشکرایە، کە دوای ماوەیەک جڵەوی دڵڕەقی و دڕندەخوویی موراد لەدەست خۆیدا نەما و، خەڵکی بە تۆمەتی سەیرو سەمەرە ئەشکەنجە دەدا؛ جارێکیان کابرایەکی ڤینیزی بەنێوی زانتی ژورێکی زیادەی لەسەربانی ماڵەکەی خۆی درووست کردبوو، موراد بەبیانووی ئەوەی کە ئەم کابرایە دەیەوێ لەدوورەوە سەیری ئافرەتانی حەرەمسەرا بکات، فەرمانی دا بەجلی ژێرەوە لە سێدارەی بدەن. جارێکیشیان پاچڤەکارێکی فەڕەنسایی ژوانێکی نهێنی لەگەڵ ئافرەتێکی تورک دا، دادەنێت، بە بیستنی ئەمە موراد فەرمانیدا کابرای چارەڕەش لەچوار میخ بدەن. بەسەعات لەسەر دیواری کۆشکێک دادەنیشت و بەتفەنگ تەقەی لەو ڕێبوارە بێ تاوانانە دەکرد، کە بە بن دیواری کۆشکدا تێپەڕدەبوون و لانی کەم ڕۆژێ دەکەسی بەم شێوەیە دەکوشت. جارێکی دیکە فەرمانیدا تاقمێک لە ئافرەتانی حەرەمسەرا کە لەنێو چیمەنی بەردەم حەرەمسەرا دانیشتبوون و پێکەوە قسەیان دەکرد، بە تاوانی ئەوەی گاڵەگاڵیان کردووە، لە دەریادا نغرۆ بکەن.

ڕۆژێکیان دیتی ئەو بەلەمەی کە تاقمێک لە ئافرەتانی حەرەمسەرای تێدابوو، لە بابی عالی نزیک بۆتەوە، فەرمانیدا تۆپباران بکرێت . کاتێ سواری ئەسپ دەبوو

ودەچووە گـەڕان، هـەر بەخت وەرگـەڕاوێک کـە بەپێـشی کـەوتبـایەوە، یان ڕێی لێبگرتبایە، خێرا دەیسپاردە دەست جەللاد. زۆر روویداوە ئەم سولّتانە ستەمکارە بەتیروکەوان دڵی موسافیرە چارەڕەشەکانی کون کردبێ.

مـوراد چووبایە هـەر جێیەک، قـەرە عـەلی سـەرۆکی جـەللادەکانی لەگـەڵدابوو، ئەویش ژمارەیەکی زۆر بزمار و هۆرەی ئاسن و چەکوچی بۆ وردکردنی دەست وپێی خـەڵک و قـوتووی پڕ لە تۆزی کـوێرکـەری بەبەرپشتـێنەوە بوو. لەکـاتـی دیکەدا کـە هەستـی دڕندەخـوویـیەکـەی کـەم دەبۆوە، ئینجـا حـەزی دەچووە ئەوەی ئازاری ئافرەتانی حەرەمسـەرا بدات. بەپێی گێڕانەوەی ( سێرجۆرج کورتاپ) کـە لـەو سەردەمەدا سەردانی قوستەنتەنییەی کردووە:« *سولّتان حـەوزێکی مـەلەوانی هـەبوو کە لە بەردی سماق دروستکرابوو و، نێوەڕاستیشی دوورگەیەکی پڕ لەدار و درەختی تێدابوو. بۆ ئەوەی کـەس نەتوانێ حـەوزەکە ببینـێ و نەوێرێ لێی نزیک بێتـەوە، لە دەوروبەری حـەوزەکـە حـەسارێکی درووست کـردبوو و، فـەرشی جـۆراوجـۆری پێ هەڵواسیبوو. موراد کەنیزەکەکانی حەرەمسـەرای ناچار دەکرد خۆیان رووت کەنەوەو بچنە نێـو ئاوی حـەوزەکـەوە، ئینجا بەتفـەنگە ساچمـەزەنەکەی کە زیانێکی ئەوتۆی نەدەگـەیاند، سێرەی لێدەگـرتن. جـاری واش هەبوو ئاوی حـەوزەکـەی هێندە زیاد دەکرد کە کەنیزەکەکان تێیدا نقوم دەبوون و، بۆ رزگارکردنی گیانی خۆیان دەکەوتنە تەقەللاوە و ژمارەیەکی زۆریشیان کە مەلەوانیان نەدەزانی، دەخنکان. کاتێ سولّتان لەو گـەمە دڕندانەیە تێردەبوو، فرمـانی دەدا خواجە سـەراکان ئاوی حـەوزەکە بەتاڵ بکەن و ئەو ئافرەتانەیش کە نەمردوون رزگاریان بکەن.*»

لەو سـەردەمەدا قـوستـەنتـەنییـە لەوپەڕی هـەژاری و چارەڕەشی دابوو؛ لەسـاڵی ١٦٣٧ (١٠٤٧ی کـۆچی) دا، بـەهـۆی تاعـونەوە رۆژانـە پتـر لە ٥٠٠ کـەس گـیـانیـان لەدەستدەدا. بازرگانێکی ئینگلیزی بەنێوی ( *ئـابـل کـوک*) کە لەوسـەردەمـەدا لە قوستەنتەنییە بووە، لەنامەیەکدا بۆ ماڵ و منداڵەکەی بەناهومێدییەوە نووسیویەتی:« *لەکاتەکانی رۆژدا، دەرچوون لەماڵەوە بێ مەترسی نییە و بەشـەویش لە سەرانسەری شاردا گیانلەبەرێک بەرچاو ناکەوێ. سەگەکان بەهۆی برسیەتییەوە هێندە بێپەروا و رووقایم بوونە کە پیاو ناوێرێ لێیان نزیک بێتەوە.*

*خـەڵک کـڕین و فـرۆشتن بە تـەرمی مـردووەکـانیـان دەکـەن. پەرێشـانی خـەڵک ناهێندرێتە پێش چاو و مومکین نییە ئێوە بتوانن لەو حاڵە تێبگەن. تکاتان لێدەکەم داوا لە خـەڵک بکەن لە کـەلیسـاکـان دوعـامـان بۆ بکەن؛ لەبارودۆخـێکی وەها شەپرێودایـن و وا تووشی برسیەتی بووینە، کە تەنانەت مشکیش دەخۆین.*»

سولّتان، هەموو ئەو بەدبەختی و ناکامییانەی بە ئاسایی وەرگرت و فـرمـانیدا پەنجا کەس لە سەرانی وڵات بەتۆمـەتی ئەوەی نەیانتوانیوە پێشبینیی ئەم گرانییە بکەن ــ لەکاتێکدا کەس نەیدەتوانی پێشبنیی ئەو بارودۆخە بکات ــ، لە سێدارە بدەن. سەبارەت بەتاعونیش گوتی:« *ئەمساڵ هاوین خواوەند خەڵکی هیچ وپوچ سزا دەدات. رەنگبێ لەزستانیشدا نۆرەی خەڵکی باش و درووستکار بێت!*»

مـوراد بە هـەمـوو دڵڕەقی و دڕندەخـوویـیـەکـەیەوە لانیکەم وەک سـولّـتـانەکـانی

دامەزرێنەری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، دلێرو بەجەرگ بوو. لەساڵی ١٦٣٨ (١٠٤٨ی کۆچی)، یەکەم لەشکر کێشیی مەزنی خۆی لەدژی ئێران ئەنجامداو بەپێی نەریتی باوی کۆن، کە دەبوایە خۆی لەو دەست بەسەرداگرتنەدا بەشدار بێت، شاری بەغدای داگیرکرد. سلێمانی قانوونیش جارێک ئەم شارەی لەساڵی ١٥٣٤ (٩٤٠ی کۆچی) داگیرکردبوو و، خستبوویە سەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، بەڵام جێنشینەکانی لەدەستیان دابوو. لە ١٦٣٨/٣/٨ (سلخ ذیعقده ١٠٤٧ی کۆچی)، ئاڵای ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەئسکۆداری کەنارەی ئاسیایی بسفۆر هەڵدراو، سوپای مەزنی سوڵتان، سەفەری (١١٠) رۆژی خۆیان رووەو سنورەکانی ئێران دەست پێکرد.

سەفەرێکی وا دوورو درێژ، پێویستی بەلانی زۆری کەرستەی رەفاه و خۆشگوزەرانی هەبوو؛ موراد بەپێچەوانەی سلێمان کە لەکاتی شەڕدا بەژیانی ئاسایی سەربازی قەناعەتی دەهات، فرمانی دا شانزدە لە ئافرەتەکانی حەرەمسەرای بۆ سواری چەند گالیسکەیەک بکەن و بەهۆی خواجەسەرایانەوە پاسەوانییان لێبکرێت و و لەم سەفەرەیدا لەگەڵی بن.(١٣)

ئۆردووگای ئسکۆدار بەشکۆو سەربەرزی رۆژهەلاتیی خۆی، بریسکەیەکی تایبەت بەخودی هەبوو و ئێستا هەموو شتێک ئامادەی ئەم ڕێپێوانە دوورو درێژەبوو. ژمارەی سوپا بەو خەڵکەی کە لە گوندەکانی سەر رێگا بەسەرباز دەگیران، لە زیاد بووندا بوو و سوپا وەک زێیەکی پان و رەنگاورەنگی لێ هاتبوو کە سەربازە لادێیەکان وەک جۆگەلەی بچوک دەرژانە نێویەوە. وایلێهات ژمارەی سوپاکەی موراد گەیشتە نیو ملیۆن کەس و هیچ کەسێ لەو سەردەمەدا توانای ئەوەی نەبوو خۆ لەبەرامبەر ئەم سوپایە بگرێ.

لە ١٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٦٣٨ (١٤ی رجب-ی ١٠٤٨ی کۆچی)، ئاڵای لەشکری عوسمانی لەبەرامبەر شاری بەغدا هەڵدرا و موراد بەغدای گەمارۆدا. سەربازگەی ئێران، بەناهومێدییەوە بەرگری دەکردو مورادیش بەشەخسی خۆی هێزی بزوێنەری پێویست و سەرکەوتووبەخشانەی دەدایە سوپاکەی و دەیورووژاندن؛ لەگەڵ سەربازاندا سەنگەری لێدەداو سەبارەت بەدیاریکردن و تۆپباران کردنی بنکەکانی دوژمن، راو سەرنجی خۆی دەخستەڕوو. سەرەڕای ئەوەیش کە بەردەوام سەردانی چادرەکانی حەرەمسەرای دەکرد، بەڵام ئەغڵەبی شەوان زینی ئەسپەکەی خۆی لەجیاتی بالیف لەژێر سەر دەنا. لەیەکێک لەهێرشەکاندا، سەربازێکی کەتەی ئێرانی لەحەساری بەغدا هاتەدەر و داوای کرد کە بەجەرگترین سەربازی تورک بێتە شەڕی و لەگەڵی دەستەو یەخەبێت، موراد بەبێ دوودڵی و دواکەوتن خۆی چووە مەیدانەوەو بەیەک لێدانی شمشێر سەری کابرای تا چەنەگە قەلاشت و کردی بەدوولەت. لەکۆتایی ئەوساڵەدا عوسمانییەکان توانیان دەست بەسەر بەغدادا بگرن و موراد فرمانی دا سەربازی نێو سەربازگەکە قەتڵوعام بکەن. ئەم قەسابیە لەماوەی یەک رۆژدا بەئەنجام گەیشت و لەو ٣٠,٠٠٠ کەسەی کە لەم سەربازگەیەدابوون، تەنها(٣٠٠) کەسیان لێ قوتار بوو. لەم بەینەدا رووداوێکی ترسناکی دیکەش

روویداو ئەویش ئەوەبوو کە لە ئاکامی تەقینەوەی عەمبارێکی باروت، بەرێکەوت چەند سەربازێکی تورک کوژران، موراد بە ئەندازەیەک رقی هەستا کە بڕیاریدا (٣٠) هەزار کەسی دیکە بکوژن، بەڵام ئەمجارەیان دانیشتوانی بێگوناهی شار، کە زۆربەیان ئافرەت و منداڵ و پەککەوتە بوون، بوونە قوربانی.

موراد زۆر حەزی لە پڕوپاگەندەکردن بوو، بۆیە بڕیاری دا ئاهەنگی ئەم سەرکەوتنەی خۆی بەشێوەیەک لەقوستەنتەنییەدا بگێڕێت کە تاماوەیەکی زۆر دانیشتوانی پایتەخت لەبیریان نەچێتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش کاتی گەڕانەوەو ئەوکاتەی کە گەیشتنە نزیک قوستەنتەنییە، فرمانەکانی خۆی لەرێگەی کۆتری نامەبەرەوە بەسەرانی وڵات راگەیاند .(١٤)

ئینجا کاتێ وەک سەرکەوتوویەکی جەنگ هاتە نێو قوستەنتەنییەوە، بەشکۆو گەورەییەکی وا کە نایەتە سەرزمان، چووە بابی عالی. ئەو لەکاتێکدا کە سواری ئەسپ جەنگییە رەشەکەی بوو، رزێ یەکی تایبەتی کە لە کاتی شەڕدا دەیپۆشی و تان پۆکەی لەزێڕو پۆڵابوو، کردبۆ بەر خۆی و کەوڵە پڵینگێکیشی بەسەر شان دادابوو، کە لاچکەکانی بە دەرزیلەیەکی ئەڵماس وێک هێندرابۆوە.مەندیلێکی گەورەی لەسەرنابوو کە سێ جەقەی ئەڵماسی پێوەکرابوو، حەوت ئەسپی زین وبەرگ بە ئەڵماس نەخشێندراو و بیست ودوو کەس لە ئەشراف و ئەفسەرانی ئێرانیش کە هەریەکەی زنجیرێکی زێڕیان لەملدابوو، بەدوایدا دەرۆیشتن.

تامەزرۆیی خەڵک بۆدیتنی سوڵتان بەڕادەیەک زۆربوو کە خەڵکی تەنانەت لەسەربانەکانی خۆیان کۆببوونەوە بەڵکو بتوانن لەدوورەوە چاویان بەسوڵتانی قارەمان و سوپا سەرکەوتووەکەی بکەوێ کە کەمەریان لەژێر باری دەستکەوت و غەنیمەتەکانی شەڕدا چەمابۆوە.تێکڕای کەشتیەکان وەک رێزلێنان تۆپیان تەقاند و ئەمەش بەشێوەیەک بوو، کە دەتگوت دەریا ئاگری گرتووە. ئەوە دوایین جاربوو کە سوڵتانێکی قارەمان و سەرکەوتووی جەنگ دەگەڕایەوە پایتەخت، بەڵام موراد توانیبووی دەست بەسەر بەغدادا بگرێتەوەو سەرەڕای هەموو دڵڕەقی و خوێنڕێژییەکەی کە لە سۆنگەیەوە سەرتاسەری ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی نوقمی خوێن ببوو، لانیکەم دەکرێ بڵێین کە بەم کارەی خۆی توانیبووی بۆ ماوەیەکی کاتی، وڵاتەکەی لەداڕمان و لەنێوچوون رزگار بکات.

موراد لە شوباتی ١٦٤٠ (ذیعقدە-ی ١٠٤٩ی کۆچی) لەکاتێکدا کە بەهۆی زیادەڕۆیی لەمەی خواردندا تووشی تایەکی سەخت ببوو و، لەسەرەمەرگدابوو، دوا فرمانی خۆی لەمەڕ لە سێدارەدانی ئیبراهیمی برای دەرکرد کە دەبووە جێگری خۆی (چونکە بۆ خۆی منداڵی نەبوو). واپێدەچوو کە موراد حەزی لێ بووبێت ناوی وەک دوا سوڵتانی مەزنی سیلسیلەی عوسمانی لەمێژوودا تۆمار بکرێت و نەیویستووە ئیمپڕاتۆرییەتەکە بسپێرێتە دەست جێگرێکی لێنەوەشاوە، بەڵام جێبەجێکردنی ئەم فرمانە لەلایەن شازنی دایک (کەوسەم) ەوە تەگەرەی خرایە بەردەم؛ چونکە وای لێکدابۆوە کە ئەگەر ئیبراهیم بمرێت ئەوا دەسەڵاتەکەی ئەویش کۆتایی پێدێت، بۆیە لەپەیامێکدا بەدرۆ بە موورادی راگەیاند کەوا ئیبراهیمیان

خنکاندووه، موراد بەبیستنی ئەم هەواڵە زەردەخەنەیەکی سامناکی کرد و مرد.

* * *

ئیبراهیم بیست و چوار ساڵان بوو، لە دووساڵییەوە لە قەفەسدا زیندانی کرابوو و، سەردەمی دەسەلاتدارییەتی مستەفا و عوسمان و موورادی لەنێو قەفەسدا بەسەربردبوو. هیچ زانیارییەکی سەبارەت بەسیاسەت و بەڕێوەبردنی جەنگ و شتی لەو بابەتەوە نەبوو. سەرانسەری ژیانی لە دڵەڕاوکێ و مەترسی خنکاندا بەسەربردبوو. هەربۆیە کاتێ سەربازەکان هاتنە نێو قەفەسەوە و پێیان ڕاگەیاند کە بۆتە سوڵتان، بڕوای نەکردو پێیوابوو هاتوون بیکوژن و بە یارمەتی کەنیزەکە نەزۆکەکان، هەرچی کەرەستەو کەلوپەلی نێو ماڵی بە بەردەستان هات، خستیە پشت دەرگای ژوورەکەی و تێیدا سەنگەری گرت.

هەموو هەوڵەکان بۆ ڕازیکردن و هێنانە دەری لەپشت ئەم سەنگەرە، لەگەڵ شکستدا بەرەوڕووبوونەوە. سەرئەنجام سەرۆک وەزیران ڕێگە چارەیەکی دۆزییەوە، ئەویش ئەوەبوو کە فرمانی دا تەرمی موراد بێننە حەوشەی قەفەسەوەو لەئیبراهیم پاڕانەوە کە لە پەنجەرەی نهۆمی سەرەوەڕا سەیری تەرمی موراد بکات. ئیبراهیم بەبینی تەرمی موراد بۆ چەند ساتێک لەترسان و لەخۆشیان رەق وەستا. ئینجا بەڕاکردن لەقاڵدرمەکان هاتە خوارێ و لەدەوری تەرمی موراد سووڕی دا و هاواری دەکرد : « *ئاخیرەکەی قەسابی ئیمپراتۆرییەت لەنێوچوو!* »

هەرکە ئیبراهیم لەسەر تەخت دانیشت، دەرکەوت کە پیسترین و بێ کەڵکترین سوڵتانی عوسمانییە. وێنەیەکی ماوە، لەو وێنەیەدا روخسارێکی مۆن و رەش هەڵگەڕاوی وەک سەرخۆشانی هەیەو مەندیلەکەی بەلایەکدا لار بۆتەوە.

لەو ساتەوەی کە لەسەرتەخت دانیشت، تەنها یەک بیری لەمێشک دابوو ئەویش ئەوەبوو، کە چۆن تۆڵەی ساتە بەفیڕۆچووەکانی تەمەنی لەژیان بکاتەوە. بەڕادەیەک لە رابواردن و خۆشگوزەرانیدا زیادەڕۆیی کرد، کە تەنانەت ئافرەتانی حەرەمسەرا لێی کەوتنە تەقە و ناڕەزاییان دەربڕی. پێویست ناکا باسی ناڕەزایەتی سەرانی وڵاتیش بکەین، هەر لێی دەگەڕێین.

دایکە تینووە دەسەڵاتەکەی ئیبراهیم واتا کەوسەم، لە بەڕێوەبردنی کاروباری حەرەمسەرادا ناشی نەبوو؛ چونکە سێ سوڵتانی بەخێو کردبوو و، سێ جاریش ببووە شاژنی دایک. بۆیە جارێکی دیکەش ڕێگەی بەنێوبانگی دابینکردنی کەرستەی خۆ سەرگەرمکردنی سوڵتانی گرتەبەرو بەدەیان کچی لاوی پەری رووخساری ناردە سەر جێگەی سوڵتان.

گرتنەبەری ئەم ڕێگایە هۆکارێکی دیکەشی هەبوو؛ ئیبراهیم سەرەڕای ئەوەی کە لەڕادەبەدەر حەزی لە نزیکی ئافرەتان بوو، جار جارە بەهۆی بێ توانایی جنسییەوە لەحاڵی خۆی بێزار دەبوو، دایکی نیگەرانی ئەوەبوو نەوەکا هیچ کوڕێک یان جێگرێکی لەدوا بەجێ نەمێنێ و وەجاخ کوێر بێت، چونکە ئیبراهیم دوایین پاشماوەی سیلسیلەی عوسمانی بوو.

سەر ئەنجام پاش دوو ساڵ لە گرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن ئیبراهیمەوە،

یەکەم منداڵ، لەکۆی دە منداڵەکانی لە دایک بوو.

ئیبراهیم بەختی هەبوو؛ بەر لەوەی یەکەم منداڵی چاو بە دنیا هەڵێنێ، کەوسەم بردبوویە لای جادوگەرێک بەنێوی ( جین چی حوسەین)، یان حوسێنی جنگر کە ئیدعای ئەوەی دەکرد دەتوانێ وابکا پیاو منداڵی لێ وەپاش کەوێ.

جادوی ئەم کابرایە لەگەڵ لە دایکبوونی یەکەم منداڵی ئیبراهیم تێکی کردەوە و ئیبراهیم کابرای جادوگەری خەڵات کردو، پلەوپایەکی گرنگی ئایینیشی پێبەخشی و سەروەتێکی زۆری بەسەردا باراندا.

بێ توانایی جنسی ئیبراهیم، کە بەدرێژایی تەمەنی لەگەڵی دابوو، سەرچاوەی لەحەزی بێ سنورو تینوێتی جنسیی ئەو کابرایەدا بوو کە بەرامبەر بەئافرەتان هەیبوو. زۆری پێ نەچوو کە ئافرەتانی حەرەمسەرای لەبەرچاوکەوتن و ناچاربوو لەگەڵ ئەو کەنیزەکانەدا بخەوێ کە مافی نارەزایەتی دەربڕینیان نەبوو. لەم کارە دا دایکیشی نەیدەتوانی یارمەتی بدات، بەڵام کەسێکی دیکە هەبوو کە وێڕای ئەوەی سوڵتانەی ئیبراهیم بوو، دەڵاڵێکی باشیش بوو. ( شەکەرپارە) کە سوڵتانەی ئیبراهیم بوو، دوژمنی بابە کوشتەی کەوسەمیش بوو. شەکەرپارە یەکێک بوو لەو ئافرەتانەی کە سوڵتان زۆر کەیفی پێدەهات و شارەزایی و توانایەکی باشی هەبوو لە دۆزینەوەو رەوانەکردنی کچانی لاوی پەری شێوە بۆ باوەشی سوڵتان . شەکەرپارە گەیشتبۆ ئەو قەناعەتەی کە ئەگەر بتوانێ کچی جوان و دڵخوازی سوڵتان بۆ کەیف و زەوقی سوڵتان راوبکاو بەسوڵتانیان بناسێنێ، دەسەڵات و پلەوپایەیەکی باشی دەبێ و، قەت لەبەر چاوی سوڵتان ناکەوێ. بەم پێیە ئیبراهیم گالیسکەیەکی بەخشڵ نەخشێندراوی پێ بەخشیبوو کە شەکر پارە بەمەبەستی دۆزینەوەی کچی جوان سەری شوێنی لەبابەت گەرماوە گشتییەکانی پێ دەدا.

ئەگەر لەم سەردانانەدا شەکەر پارە چاوی بەکچی موفتی گەورە نەکەوتبایە کە خەریکی خۆشوشتن بوو، ئەوا قەت ئەم نهێنییەی ئیبراهیم ئاشکرا نەدەبوو و، قەتیش ئاوا ریسوا نەدەبوو.

شەکەر پارە هەواڵی ئەوەی دایە سوڵتان کەوا جوانترین کچی قوستەنتەنییەی دۆزیوەتەوە.ئیبراهیم بەبیستنی ئەم هەواڵە کاردانەوەیەکی خێرای لەخۆی نیشاندا و دەیویست بەهەر نرخێک بێت ئەم پەری شێوەیە تام بکات، بەڵام بۆی دەرکەوت کە بەدەستهێنانی کچی کەسایەتییەکی وا پایەبەرزی ئایینی، کارێکی هێندە ئاسان نییە.

تەنیا یەک رێگە هەبوو و، ئەو رێگەیەش ئەوەبوو کە ئیبراهیم هەڵیبژارد؛ بەدوای موفتی دانارد و لەکاتێکدا کە موفتی لە ترسان واقی وڕمابوو، خوازبینی لێکردو کچەکەی لێخواست. کاری وا لەمێژووی سیلسیلەی عوسمانیدا کە تێکڕای سوڵتانەکانی کوڕی کەنیزەکەکان بوون، رووی نەدابوو، بەتایبەتیش کە موفتی هەندێ پڕوپاگەندەشی سەبارەت بە زیادەڕۆییەکانی حەرەمسەرا بیستبوو. بەڵام ئەوەشی دەزانی کە ئەگەر بە ئاگایی و لێزانییەوە هەنگاونەنێ، ڕەنگبێ سەری لەسەردانێ. بۆیە لە وەڵامدا گوتی: هیچ شتێک پتر لەو کارە خۆشحاڵی ناکا ئەگەر

بێتو کچەکەی ببێت بەهاوسەری سوڵتان، بەڵام هەروەکو سوڵتانیش ئاگادارە پێچەوانەی شەرعە ئەگەر پیاوێکی ئایینی بە زۆر کچەکەی خۆی بەمێرد بدات. بۆیە بەڵێنی دا کە هەموو هێزو توانای خۆی بۆ رازیکردنی دڵی کچەکەی بخاتەگەڕ، بەڵام ئەگەر دیسان کچەی رازی نەبوو ئیدی ئەو هیچ گوناهێکی نیە و ئۆباڵی ئەم کارەی ناکەوێتە ئەستۆوە.

هەروەک مەزندە دەکرا، دوای چەند رۆژێک موفتی زۆر بە ئەدەبەوە وەڵامی کچەکەی خۆی گەیاندە سوڵتان و ئەویش ئەوەبوو کە مێردی پێ ناکات. ئیبراهیم کە ئەمەی زۆربەلاوە گران بوو، رقی هەستاو فرمانی بەشەکەرپارەدا، کە هەر چۆنێک بێت کچی موفتی وا لێبکات کە رازی بێت. کاتێ شەکەرپارەش لەو کارەدا شکستی خوارد، ئیبراهیم فرمانی دا چاودێری کچە بکەن و رۆژێکیش ڕاسپێردراوەکانی کچەیان ڕفاندو هێنایانە حەرەمسەراوە.

ئێستا، کچی موفتی گەورە دەبوو بەترس و سامەوە لەو دیمەنە پڕ لە شەرمەزارییانەی حەرەمسەرا بڕوانێ، بەڵام ئەو کچێکی چاو نەترس بوو؛ چەندین شەو و رۆژ بەرگری لەخۆی کردو ئامادە نەبوو بچێتە پاڵ سوڵتانەوەو سەر ئەنجام سوڵتان ناچار بوو بە سەرزەنیشت و سووکایەتی پێکردنەوە، بینێرێتەوە لای باوکی. لەوێ بەدواوە، موفتی گەورە بوو بە دوژمنی بابەکوشتەی سوڵتان و سوێندی ئەوەی خوارد کە تا سوڵتان نەکوژێ، ئۆقرە ناگرێ.

لەم بگرەو بەردەیەدا ئیبراهیم بە ڕێنمایی دایکی، دەستی کرد بە لەنێوبردنی سەرانی وڵات و گەورەکانی نێودەوڵەت. کاتێ کەوسەم لای ئیبراهیم شکایەتی لەوە کرد کە ئازاڵەی پێویست بۆ سووتاندن لەنێو سۆپاکانی حەرەمسەرای نادرێتێ، ئیبراهیم سەرۆک وەزیرانی دەستگیر کردو دواتریش لە سێدارەی دا. کاتێکیش کە ژمارەیەک لە خواجەسەراکان لە ڕێی حەجدا بەدەستی چەتە دەریاییەکان ڕووتکران و بەپەلبەستکراوی برانە دوورگەی کێرت، ئیبراهیم لەشکرکێشییەکی سەرشێتانەی بۆ ئەم دوورگەیە کردو ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە کێرت موڵکی کۆماری ڤینیز بوو و، لەنێوان کۆماری ڤینیزو دەوڵەتی عوسمانیشدا پەیمانی ئاشتی هەبوو. ئەم شەڕەبووە هۆی گەمارۆدانی قەڵای کاندی کە چەپەری سەرەکیی دوورگەکەبوو و، بیست وپێنج ساڵی رەبەق لەبەرامبەر تورکەکاندا وەستا و بەرگری کرد.

کردەوە سەیرو ناوازەکانی ئیبراهیم، زۆر لەکارو کردەوەی شێتان دەچوون تا لە مرۆڤی ئاسایی؛ ریشی خۆی بەدنکە ئەڵماس دەڕازاندەوە، مەیلێکی نەخۆشانەی بەلای بۆنی عەمبەردا هەبوو و،ئەو بۆنەی لە ڕیش و جل و تەنانەت پەردەکانی ژوورەکەشی دەدا. کاتێ یەکێک لە ژنەکانی حەکایەتی پاشایەکی بۆ گێڕایەوە کە هەمیشە جلی لە کەوڵی سمۆرە دووراوی پۆشیبوو، ئیبراهیم بڕیاری دا ببێ بەپاشای کەوڵە سمۆرەپۆش و فرمانی دا تێکڕای جل و پەردەو تەنانەت دیوارەکانی ژوورەکەشی بە کەوڵی سمۆرە بڕازێننەوەو تەنانەت قاپوتی لە کەوڵە سمۆرە درووستکراو بە بەر پشیلەکانی کۆشکیش دابکەن. بەڵام دۆزینەوەی ئەو هەموو کەوڵە سمۆرەیە کارێکی هێندە ئاسان نەبوو، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە ئیبراهیم دیوانی

هومایونی کۆکردەوەو فرمانیدا لەسەرانسەری ئیمپڕاتۆرییەتەکەیدا، بەدوای کەوڵە سمۆرەدا بگەڕێن و سمۆرە ڕاو بکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا، تەواوی ئەم کارە سەرشێتانانە بە بەراورد لەگەڵ ئەو کارەساتە سامناکەی کە لە دوایی دواییەکانی سەڵتەنەتە (١٨) ساڵەکەیدا بووە هۆی قەتڵوعامی ئافرەتانی حەرەمسەرا، بەشتێکی ئاسایی لەقەڵەم دەدرێن. ئەم کارەساتە جەرگبڕە کاتێ دەستی پێ کرد کە شەکەرپارە هەواڵی ئەوەی گەیاندە سوڵتان کەوا لە شاردا پڕوپاگەندەی ئەوە هەیە گوایە یەکێ لە ئافرەتانی حەرەمسەرایان لە پاڵ پیاوێکدا دیووە. ئاشکرایە کە شتی وا مەحاڵ بوو، چونکە شەکەرپارە لە گێڕانەوەی پڕوپاگەندەکەدا نەباسی وردەکاری و چۆنیەتی دیتنەکەی دەکردو نەناوی ئافرەتەکەشی دەهێنا، بەڵام ئیبراهیم پێویستی بەبەڵگەو شاهید نەبوو، بۆیە باوەڕی بەقسەکانی شەکەر پارەکردو قزڵەر ئاغای ڕاسپارد تا ئەو ئافرەتە بدۆزێتەوە. چەند ئافرەتێکی حەرەمسەرا خرانە بن ئەشکەنجەو ئازارەوە، بەڵام ئەوە هیچ سوودی نەبوو و، نێوی کەسیان نەدرکاند. دیار نیە ئاخۆ سەبارەت بەمە ڕێککەوتنێک لە نێو ئافرەتانی حەرەمسەرادا هەبووە، یان ئەوەتا لە بنەڕەتدا ئافرەتێکی وەها لەنێویاندا نەبووەو ڕووداوێکی وا کە شەرکەرپارە باسی لێوە دەکرد، درۆ و بوختانی هەڵبەستراوبوو؟

ئیبراهیم سێ ڕۆژی تەواو بە ڕق و قینەوە لەدەوروبەری حەرەمسەرا پیاسەی دەکرد، کاتێ محەمەدی کوڕی کە هێشتا بۆ هاویشتنە نێو زیندان بچوک دەهاتە پێش چاو، گاڵتەیەکی نابەجێی کرد، سوڵتان وا تووڕە بوو کە خەنجەرە بەخشڵ نەخێشێندراوەکەی لە کالان دەرهێنا و لەدەمووچاوی کوڕەکەی دا. برینێکی قوڵ و کوشندە نەبوو، بەڵام محەمەد تادوا ساتی ژیانی شوێنی ئەم برینەی بەدەموچاوەوە ما.

سەرئەنجام ئیبراهیم بڕیاری دا دەستبەکار بێت و وەک بەڕێوەبەری قوتابخانەکە کاتێ قوتابی کەتنکەر لە ڕیز نایەتەوە دەر و دان بەهەڵەکەی دانانێ، تەواوی قوتابیان تەمبێ دەکا، ئەویش بڕیاری دا تێکڕای ئافرەتانی حەرەمسەرا سزا بدات. هیچکەس و تەنانەت قزڵەر ئاغاش نەیدەتوانی پێشبینی ئەوە بکات کە ئیبراهیم بەتەمای چییە. ئیبراهیم بڕیاری دا جگە لەشەکەرپارە، تەواوی ئافرەتانی حەرەمسەرا، کە ژمارەیان خۆی لە (٢٨٠) ئافرەت دەدا، لە دەریا بهاوێ و لەنێویان بەرێ. بۆیە دەستە دەستە ئافرەتانی حەرەمسەرایان لێکدی بەستن و خستیاننە نێو ئەو جەواڵە گەورانەی کە بەردیان لەبن کردبوون و بردیاننە کەنار دەریاو هەر جەواڵێکیشیان خستە نێو بەلەمێکەوە. دواتر ئەو چەند بەلەمەیان بەپەتێکەوە لە بەلەمێکی گەورەتر بەست بۆ ئەوەی خواجەسەراکان بتوانن لە کەنار دەریا دووریان بخەنەوەو لەنێوڕاستی دەریادا، نغرۆیان بکەن.

تێکڕای ئافرەتانی حەرەمسەرا نغرۆ بوون، جگە لە یەکێکیان نەبێ کە سەری جەواڵەکەیان باش نەبەستبوو و،توانیبووی بەهەوڵ و تەقەللایەکی زۆر لەسەر ئاو بمێنێتەوە. کەنیزەکی نێوبراو دەستی بە هاتوهاوار و یاریدەخواستن کرد و

کەشتییەکی فەرەنسایی کە بەوێدا تێدەپەڕی ڕزگاری کرد. بەر لەوەی کەسەرئەنجام بگاتە پاریس، ئەو کارەساتەی کە بەسەر خۆی و ئافرەتانی حەرەمسەرادا هاتبوو، بۆ ئەوانەی لە ناو کەشتییەکەدا بوون گێڕابۆوە.

بەرلەوەی هەواڵی ئەم ڕووداوە وەک پڕۆپاگەندە بەنێو قوستەنتەنییەدا بڵاوبێتەوە، ڕووداوێکی دیکە ڕوویدا کە شایەتی بۆ ڕاستی ئەم کوشتارە سامناکە دەدا. یەکێ لەو سێ سەد مەلەوانانەی قوستەنتەنییە لەکاتی تێپەڕین بە بسفۆڕدا، لەکاتێکدا کە خۆی بەسەر لێوی بەلەمەکەیدا شۆڕکردبۆوە و لە پاشماوەی کەشتییەکی نغرۆبوو دەگەڕا، لەقووڵایی دەریادا چاوی بەهەندێک شت دەکەوێ کە دەجووڵێن ، بەپەلە خۆی دەهاوێتە نێو ئاوەوە.

هەرچەندە ئەوکاتە هێشتا چاویلکەی ژێر ئاو نەدۆزرابۆوە، بەڵام مەلەوانەکان دەیانتوانی بچوکترین شتەکان لە قولایی دەریادا ببینن؛ زاری خۆیان پڕ لەڕۆنی شل دەکرد و هەر کە دەگەیشتنە نزیک شتەکانی ژێر دەریا، ڕۆنەکەیان ڕۆدەکرد و لەژێر ئاو وەک خڕۆکەی ورد و بریسکەداری لێ دەهات و مەلەوانەکان دەیانتوانی هەموو شتێ و تەنانەت دەرزییەکیش بدۆزنەوە.

مەلەوانی نێوبراو گێڕایەوە، لە قولایی دەریادا ژمارەیەکی زۆر کیسەی سەرگرێ دراوی دیووە کە لەشێوەی ئەستوونی لەگەڵ جووڵەی شەپۆلەکانی دەریادا، لاژە لاژیان بووە و،کاتێ سەری یەکێکیانی کردۆتەوە، چاوی بەتەرمی چەند ئافرەتێک کەوتووەو لەترسان ڕایکردووە و سەر ئاو کەوتۆتەوە.

لەماوەی چەند ڕۆژێکدا، ئەم هەواڵە بووە قسەی سەر زمانی کۆڕ و کۆمەڵی شاری قوستەنتەنییەو ئەمەش باشترین دەرفەتی دایە دەست موفتی گەورە تا تۆڵەی خۆی لەئیبراهیم بکاتەوە. موفتی ولایەنگرانی بڕیاریاندا ئیبراهیم لێبێخن و کوڕە حەوت ساڵانەکەی(محەمەد) لەجیاتی ئەو لەسەرتەخت دانیشێنن. بەڵام ئەم کارە دەبوو بەوردی و لێهاتووییەوە بەئەنجام بگات؛ لەسەرەتادا نامەیەکیان ئاراستەی شاژنی دایک (کەوسەم) کرد، کە ئافرەتێکی بەدەسەڵات بوو و، لەنامەکەدا هاتبوو: « *سوڵتانی هەنووکە لەئاکامی زوڵم و ستەم، وڵاتی عوسمانی بەرەو لەنێوچوون بردووە، فرمانڕەوایی وڵات کەوتۆتە دەستی ئافرەتانەوەو خەزێنەی وڵات ناتوانێ ئەو برسییانە تێر بکات و خەرجیی ئەوانی پێ نادرێت. خەڵک تووشی هەژاری و وەرشکستی بوونەو سوپای کافرەکان لەناوچە سنوورییەکان پەلاماری شارەکانیان داوین و گەلەکەشتییەکانیان گەرووی داردانێل یان بەستووە.»*

لەسەرەتا دڵ کەوسەم نەدەچۆ ژێر بار و بەرگری دەکرد، بەڵام سەرئەنجام خۆی دابەدەستەوەو ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە کوڕەکەی لێبێخن. شێخولئیسلام و موفتی گەورەی قوستەنتەنییە، کۆبوونەوەیەکی گەورەیان لەمزگەوتی ئەیاسۆفیا ڕێکخست و خواستەکانی خۆیان ڕاگەیاند. خەڵک پشتیوانیی خۆیان بۆ دەربڕین و تەنانەت تاقە کەسێکیش ناڕەزایەتی دەرنەبڕی.

ئێستاکە ڕێگا والابوو؛ یەنیچەرییەکان ڕووەو دەروازەی بابی سەعادەت بەڕێکەوتن و داوای دیداری ئیبراهیمیان کردو کاتێ چاویان بەسوڵتان کەوت و

بڕیاری کاربەدەستە ئایینیی و دەوڵەتییەکانیان بەکورتی بەسوڵتان ڕاگەیاند، ئیبراهیم بە هێمنی بڕیارەکەیانی قەبوڵ کرد؛ چونکە لەوە پتر چیدیکەی لەدەست نەدەهات.

ئیبراهیم لەسەر ئەوەرازی بوو بیگەڕێننەوە قەفەس و تا دوا ساتی ژیانی لەوێدا بژییەت، بەڵام هێشتا موفتی گەورە دڵی دانە کەوتبوو، دەیویست خوێنی ئەو کەسەی کە کچەی ڕفاندبوو، بڕێژێ. لەو جێگەیەوە کە ئەو ڕێبەرێکی ئایینی بوو، دەبوایە کارەکەی وا بەئەنجام بگەیەنێ کە لایەنی شەرعیی تێدا ڕەچاو کرابێ و کارەکەی بەپێی شەرع بێت . بۆیە هەرکە ئیبراهیمیان ناردەوە نێو قەفەس، تاقمێک لەپیاوانی ئایینی چاویان بەموفتی کەوت و بەپێی ئەو بەرنامەی کە پێشتر دایانڕشتبوو سەبارەت بەوەی کە *«ئەگەر هاتو پاشایەک لەجیاتی ئەوەی کارە گرنگەکانی وڵات بسپێرێتە خەڵکی کارامەو بەتوانا، ئەو پۆستانەی بەپارە بە خەڵکی ناکارامە فرۆشت، ئایا دەکرێ بەپێی یاساکانی شەرعی پیرۆز ئەم پاشایە لەکار لابدرێت و بکوژرێت؟»* پرسیان بەموفتی کرد. موفتیش لە کورتترین فتوایەکدا کە مەرگ و ژینی کەسێکی پێوە بەندبوو، گوتی: بەڵێ.

سەیر لەوەدایە ئەمجارەیان ئیبراهیم کە ساڵانێکی درێژی لە ترس و دڵەڕاوکێی خنکان بەدەستی خولامە کەڕولاڵەکان لە قەفەسدا بەسەر برد بوو، لەوە دڵنیابوو کە ئەم قەیرانە لەماوەی چەند ڕۆژێک کۆتایی پێ دێت و دەگەڕێتەوە سەر کورسی دەسەلات. بۆیە کاتێ تاقمێک بەمەبەستی کوشتنی چونە نێو قەفەسەوە، ئیبراهیم بە پێچەوانەی (٩) ساڵ پێش، بەبێ ترس و بەڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لێکردن. بەڵام ئەمجارەیان بە پێچەوانەی جاری پێشوو، نۆرەی ئەوەبوو پەتەکەی بخەنە ملەوەو خنکاندیان.

دەسەڵاتدارییەتی ئیبراهیم سەرەڕای ئەو سەرکەوتنە مەزنەی کە تورکەکان لە جەنگی قەزاقەکانی ناوچەی دۆن و داگیرکردنی شاری ئازۆف دا بەدەستیان هێنا، لە کۆی گشتیدا پڕبوو لە کارەسات ؛ جەنگی ناتەواوی کێرت خەزێنەی وڵاتی هەڵلووشیبوو و، بەتاڵی کردبوو، تەواوی ئەو سەرپێچیانەی کە لەسەر دەستی موراد بە تووندوتیژی و بێباکییەوە چارەسەرکرابوون، سەر لە نوێ دەستیان پێکرا بۆوەو باری وڵات وەک جارانی لێهاتبۆوە، زۆربەی داهاتی وڵات لە حەرەمسەرا خەرج دەکرا، بۆیە خەڵک و سەرانی وڵات، بە کوشتنی سوڵتانیش دڵیان ئۆخەی نەدەکردو دەیانویست سەردەمی دەسەلاتدارییەتی ئافرەتانی حەرەمسەرا کۆتایی پێ بێت و ئەم کارەش بە کوشتنی (کەوسەم) دەهاتەدی.

کوشتنی دایکی سوڵتان بە پێچەوانەی ئەو نەریتەی کە تورکەکان سەبارەت بە کوشتنی سەرانی وڵات هەیانبوو، بە شێوەیەکی ترسناک و قێزەون بە ئەنجام گەیشت. کەوسەم کە پێشتر لەوە ئاگادار ببوو کە بە تەمان بیکوژن، لە ژوورەکانی تەنیشت جادەی زێڕین ڕایکردبوو و لە ژوورێکی نزیک دەروازەی گالیسکە خانە کە کەوتبۆ پشت ساختومانی دیوانەوە، خۆی حەشاردابوو . یەنیچەرییەکان، تەواوی کۆشکەکانیان پشکنی و سەرئەنجام پیرەژنی تەمەن(٦٢) ساڵانی بێ ددانیان لە

باوڵێکی گەورەی جل و بەرگدا دۆزییەوە کە خۆی تێدا حەشار دابوو. یەنیچەرییەکان زۆر بە تووندوتیـژییـەوە پیـرەژنیـان راپێچ داو سـەرەتا ئەنگوسـتـیلەوگـوارە و بازنەکانیان لێکردەوە و جکەکانیشیان لە بەرداکەند ، ئینجا کە هیچی لە بەردانەما، قاچەکانیان گرت و تا بەر دەرکی دەروازەی گەورە رایانکێشا. پیرەژن تا دواسات هەر بەرگری دەکرد، بەڵام پەتێکیان خستە مل و خنکاندیان، خوێن لە گوێ و لووتی فڕکەی دەکرد و جلی بکووژەکانی سوور کرد.

شەکەر پارە تا ماوەیەکی باش چارەنووسێکی باشتری هەبوو؛ سوڵتانەی نێوبراو دوای مـەرگی مـێـردی یەکـەمی، سـەر لە نوێ مـێـردی کـردەوە. بەڵام کـە مـێـردی دووەمیشی مرد، بووبە بەناوبانگترین دەلاڵی قوستەنتەنییەو لەو کارەدا توانا و لێهاتووییەکی لە رادەبەدەری هەبوو. شەکەر پارە لە کڕین و فرۆشتنی کچانی لاو و راهێنانیان لە سەر سەما و گۆرانی گوتن و هونەرەکانی دڵداریداو دواتر ناردنیان بۆ لای کوڕانی لاو و پاشا دەوڵەمەندەکان، پسپۆڕ بوو. لەم رووەوە نازناوی (سوڵتانەی پیس)(١٥) یان پێ دا بوو.

ئێستا، کە شەکە پارە پیر ببوو، دوژمنەکانی مەرگێکی ئارامتریان بۆ هەڵبژارد بوو؛ بە پێی نەریتی باوی تورکـەکـان بە فنجـانە قـاوەیەک کـە وردە شـووشـە و مـوویان تێکەڵکردبوو، دەرمان داویان کرد و دوای ئەوەی کە گەدە و ریخۆڵەکانی هەلابەهەلا بوون، چەند سـەعاتێک ئازاری چێشت و مرد. نوێنـەری بانکی جێنێوا لە راپۆرتێکدا کە لەوبارەیەوە ناردوویەتی، نووسیویەتی: « پیرەژنی *دڵرەق* کە بە *سوڵتانەی پیس* بە *ناوبانگ* بوو، کـوژرا.» لەو راپۆرتەدا بەئاسـانی دەتوانین هێماکانی خۆشحاڵی لە رووداوەکە ببینین.

## فەسڵی پێنجەم

### فرمانڕەوایی وەزیران

بەدرێژایی سەدەونیوێک دوای ئەو مێژووە، کە بە سەردەمێکی چارەنووسساز لە پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو ئەوروپا لە قەڵەم دەدرێت، سوڵتانەکانی عوسمانی ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەبوو. بارودۆخی سوڵتانەکان وەک ئەو پیرەمێردانە وابوو کە لەبەر پیری و بێزاربوون لە زێدەڕۆیی و ماندوێتی، دەیانویست پاشماوەی تەمەنیان بە هێمنی بەسەر بەرن و کارەکانی خۆیان دەسپاردە خەڵکی دیکە. سوڵتانەکانی عوسمانی هێشتا شان و شکۆی خۆیان لەڕووی رووخسارو کۆشک و تەلارەوە پاراستبوو؛ جگە لە لویسی چواردەهەمی پاشای فەڕەنسا کە بە سوڵتانی خۆر بە ناوبانگ بوو، هیچکام لە کۆشک وتەلارەکانی ئەوروپا خۆیان لەقەرەی کۆشک و تەلارەکانی عوسمانی نەدەدا. هێشتا سوڵتانەکانی عوسمانی هەوەسبازییەکانی خۆیان لەبابەت حەزی بێ سنوریان بەڕاو و عەشقیان بەچاندنی گوڵی لاله مابوو، بەڵام لە زۆربەی بوارەکاندا سنوری ئاساییان نەدەبەزاند.

محەمەدی چوارەم کە لە ساڵی ١٦٤٨(١٠٥٨ی کۆچی) لەسەر تەخت دانیشت، سیاسەتمەدارێکی گەورەی وەک سەرۆک وەزیرانی لە سوڵتانی پێشووەوە بۆ بە میرات بەجێما، کە کاروباری وڵاتی بەلێهاتوویی و زانایییەوە بەڕێوە دەبردو ڕێنمایی سوڵتانیشی دەکرد.

ئەم کابرایە یەکەم کەسی بنەماڵەی کۆپرولو بوو کە لە سەردەمی منداڵی و لایەن دایکی سوڵتانەوە، ئەم پۆستەی پێ بەخشرابوو. ئەندامانی بنەماڵەی کۆپرولو بە باوک و کوڕ و براوە، بۆ ماوەی سەدەونیوێک چارەنووسی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانییان بەدەستەوە بوو، بەڵام لەکاتێکدا کە سەرۆک وەزیرەکان کەسانێکی شارەزاولێهاتوو بوون ، بە پێچەوانەوە ئەو سوڵتانانەی کە یەک لەدوای یەک دەسەڵاتیان گرتەدەست، هەر هەموویان تەمبەڵ و نەزان بوون، بۆیە ڕازی بوون بەوەی کە جڵەوی کاروباری وڵات بسپێرنە دەست ئەو وەزیرانە.

لەو سەردەمەدا، چارەنووس یەکێ لە سەیرترین گەمەکانی خۆی کرد، لەو گەمانەی کە هیچکەس لە نهێنیەکانی تێناگا؛ چونکە سەرەڕای لێهاتوویی و کارزانی وەزیرەکان، ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی بەرەوڕووی شکستی یەک بەدوای یەک و سەختی ئەوتۆ بۆوە، کە لە ئاکامیان وردەوردە خاکەکەی پارچە پارچە دەبوو و، ئیدی وڵاتانی دەوروبەر ئەو ترسی و سامەی جاران لە هێزی سەربازی عوسمانی هەیان

بوو، دەرەوییەوە.
یەکەم کەسی بنەماڵەی کۆپرولو کە پۆستی وەزیرایەتی پێ بەخشرا، کابرایەکی ئەلبانی بوو بەنێوی محەمەد؛ کاری خۆی بە شاگردیی چێشت لێنەر لە کۆشکی سوڵتاندا دەست پێکرد و لەسەر راسپاردەی دایکی سوڵتان محەمەد کە نێوی (تەرخان) بوو، لە ساڵی ١٦٦٥ (١٠٦٦ی کۆچی)و لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا، کرایە سەرۆک وەزیر. ئەم دەست نیشانکردنەی سوڵتان، بەرای پاشاکانی ئەندامی دیوانی هومایونی، بە یەکێ لەهەوەسبازییەکانی سوڵتان لەقەڵەم دەدرا؛ ئەوان لەو باوەڕەدابوون کە کۆپرولو لەرادە بەدەر پیرەو سەرەڕای ئەوە نەخوێندەواریشە. بەڵام هیچ کاتێ سەرانی وڵات وا بەسەهو نەچوو بوون؛ کۆپرولو بەرلەوەی پۆستی وەزیرایەتی پێ بسپێردرێت، لە دیمەشق و تەرابلوس و قودس دا وەک پارێزگار(والی)، ئەوپەڕی لێهاتوویی لە خۆی نیشان دابوو، ئێستاش کە پۆستی وەزیری پێ سپێردرابوو، بە مەرجێک ئەوپۆستەی وەرگرتبوو کە سوڵتانی لاو گوێڕایەڵی تەواوی کردەوەو بڕیارەکانی بێت و، کۆپرولو لەلادان و دانانی کاربەدەستانی وڵاتدا ئازادی و دەسەڵاتی تەواوی هەبێت.
پێدەچوو کۆپرولو بە باشی لە بەڵێنی سوڵتان، یان (دایکی سوڵتانەکان) تێگەیشتبێ، بۆیە تا لەداهاتوودا هیچ پاشگەزبوونەوەیەک روونەدات، مەرجەکانی خۆی بە موفتی گەورەش ئیمزا کرد. هەرکە ئەم بەزم و رەزمە کۆتایی هات، محەمەد کۆپرولو پتر لەوەی لە قالبی وەزیردابێ، پۆستی جێگری سوڵتانی هەبوو، بۆیە هەوڵیدا بەسوود وەرگرتن لەو دەسەڵاتە، کاروباری وڵات رێک بخات. ئەویش وەک موراد لەسەر ئەو بارەڕە بوو کە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە پێویستە لەسەرەتادا دەزگای دەوڵەت لە بێژنگ بدرێ و شەڕێکی بێ ئامان لەگەڵ خەڵکانی گەندەڵ و دزو بەرتیلخۆردا بەرپا بکات. کارمەندانی دەوڵەت، دادوەران و سەرانی سوپا لە بێژنگ دران و لەماوەی (٥) ساڵدا (٣٥) هەزار کەس لە سێدارە دران. زوولفەقاری سەرۆکی جەللادەکانی قوستەنتەنییە، دانی بەوەدا ناوە کە لەوماوەیەدا بە تەنهایی و بۆخۆی، نزیکەی(٥) هەزار کەسی خنکاندووە، بەڵام لە ئاکامدا تا رادەیەکی زۆر پێشگیری لە دزی و گەندەڵی کرا، هێزی دەریایی گیانی بەبەردا کرایەوەو گەلەکەشتیەکی نوێ دروستکرا و هاوێشترایە دەریاوە، سوپا بۆ جارێکی دیکە وەک هێزێکی رێکخراوی لێهات و چەندین شوێنی داگیرکراو دەستیان بەسەردا گیردرایەوە.
دوای هەموو ئەوانە و کاتێ کۆپرولو خەریکی ئامادەکردنی سوپایەک بوو تا هێرشی سەر مەجەرەکانی پێ بکات، تووشی نەخۆشییەکی کوشندەبوو. سوڵتان کە لە دەوروبەری ئەدیرنە خەریکی ڕاو بوو، لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە، بە پەلە خۆی گەیاندەوە قوستەنتەنییە. سەرۆک وەزیران لە کۆشکێکی سادە و بچوکدا دەژیا کە حەرەمسەرایەکی بچوکیشی هەبوو. سوڵتان چووە لای وەزیرو بە دڵێکی شکستەوە گوتی لە قوڵایی دڵمەوە ئامادەم دەساڵ لە تەمەنی خۆم ببەخشمە کۆپرولو تا رزگاری بێت. کاتێک داوای رێنمایی لە پیرەمێردی نەخۆش کرد، کۆپرولو بەبێ دوودڵی بە سوڵتانی گوت کە هەرگیز بەقسەی ئافرەتان نەکات، هەرگیز دەوڵەمەندێک نەکاتە

وەزیر و هەمیشە خەزێنەکەی بەپڕی و سوپاکەشی بەردەوام لە ئامادەباشیی جەنگدا ڕاگرێت. کاتێ وادەی مەرگی سەرۆک وەزیران نزیک بۆوە، سوڵتان دواپرسیاری خۆی لێکرد و لە کۆپرولوی پرسی کێ بکاتە جێگری؟ پیرەمێر لە وەڵامدا گوتی: « *من هیچ کەسێک ناناسم کە لە ئەحمەدی کوڕم لێهاتوو تربێت.*»

بەم شێوەیە ئەحمەد کۆپرولو لە تەمەنی (٢٦) ساڵیدا، واتا لەکاتێکدا کە تەنها (٦) ساڵ لە سوڵتان گەورەتر بوو، پۆستی سەرۆک وەزیرایەتی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی پێ بەخشراو بە لێهاتوویی و شارەزاییەکی پتر لە باوکی بۆ ماوەی(١٥) ساڵی ڕەبەق دەسەلاتی لە وڵاتدا گێڕا.

هەموو ئەو کەسانەی لە نزیکەوە دیتبوویان، لەو باوەڕەدا بوون کە ئەحمەد لە ریزی سیاسەتمەدارە بەرجەستەو نایابەکانە و، خاوەنی ڕەوشتێکی سەرنجڕاکێش و پیاوانە بووە. ئەگەرچی کۆپرولو موسڵمانێکی پابەند بە ئایین بوو، بەڵام ئازادی تەواوی بەخشییە پەیڕەوانی ئایینەکانی دیکە و فرمانی ئەوەی دا کە بە هیچ شێوەیەک ئازاریان نەدەن و توندوتیژیشیان لە هەمبەر نەکرێ. ڕێگەی بە مەسیحییەکانی قوستەنتەنییەدا تا کۆنە کەلیساکانی خۆیان نۆژەن بکەنەوەو کاتێ کە یەکێ لەسەرانی وڵات لەهەمبەر ئەم کارەدا نارەزایی دەربڕی و ڕایگەیاند، کەوا بەپێی یاساکان دەبێ نۆژەن کردنەوەی کەلیساکان تەنها بە داروبەردی خودی کەلیساکە بن، کۆپرولو لە وەڵامدا گوتی: «*ئەو کەسانەی کە ئەو یاسایەیان داناوە زۆر دەبەنگ بوونەو ئەو کەسانەش کە چوونەتە ژێر باری ئەم یاسایەوە لەوان دەبەنگترن. مەسیحییەکان دەیانەوێ ئەو کەلیسایانەی خۆیان نۆژەن بکەنەوە، کە بەدرێژایی ساڵانێکی دوور و درێژ بەر تاڵان و برۆ کەوتوون و تاڵان کراون. کەواتا لێگەڕێن با کەلیسای نوێ بنیاد بنێن. تەنها کارێک کە لەسەرمانە بیکەین ئەوەیە کە ئاگاداربین ئەم کارەیان لەسەر خەرجیی خۆیان بێت و لەسەرگیرفانی موسڵمانان نەبێت و، لەگەڵ ئەوەشدا سەرانەی خۆیان بە بەردەوامی بدەن. لەوە پتر پەیوەندی بە ئێمەوە نییە.*»

ئەو یەکەم سیاسەتمەدارێک بوو، کە بنەمای بازرگانی ئازادی لە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا داڕشت و کاتێ داوایان لێکرد سەبارەت بە کڕین و فرۆشتنی کاڵاکان هەندێ یاساو ڕێسا دابنێت، لە وەڵامدا گوتی : «*قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە هیچی نەگوتووە. دەبێ کڕین و فرۆشتن بە ئازادی و بە ڕەزامەندی کڕیارو فرۆشیار بێت.*»

* * *

محەمەد هیچ کاتێ دەستی لەکاروباری سەرۆک وەزیر وەرنەدا، هەرچەند کە ئەویش وەک سوڵتانەکانی دیکەی عوسمانی هەوەسبازیی تایبەت بە خۆی هەبوون، بەڵام ئەم هەوەسانەی دژی کاروباری وڵات نەبوون و لەگەڵ یەکدیدا دەگونجان.

ئەو لە تەمەنی (٨) ساڵییەوە شێت و شەیدای ڕاووشکار بوو. هێزێکی پێکهاتوو لە (٨٠٠) باڵندەبازی بۆ ڕاوی باڵندەکان ڕێک خستبوو و هەریەک لە بازەشکارییەکانی ملوانکەیەکی مرواریان بە ملەوە بوو و، سەرپۆشەکانیشان لە قوماشی زێڕدووراوی بەمرواری نەخشێندراو بوو.

سوڵتان هیچ گوێی له خەراپی یان باشیی کەش و هەوا نەبوو و، زۆربەی کات لەناوچەی ئەدیرنە خەریکی ڕاو بوو، تا سەر ئەنجام شەوێکیان بەهۆی ماندوویەتی و زێدەڕۆیی لەنێو بازەشکارییەکانیدا گیانی لەدەست دا. دوا ڕاسپاردەشی بە قوشچی باشی ئەوە بوو کە باش ئاگای لە تانجییەکانی بێت. محەمەدی چوارەم لە یەکێک لە ڕاوەکانیدا،(٣٠) هەزار کەس لە دانیشتوانی لادێیەکانی ئەوناوەی کۆ کردەوە و بۆ ئەوەی بتوانێ ڕاوشکار بکات، ناچاری کردن تەپڵ لێدەن و دەنگە دەنگ بکەن. لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژێکی تۆف و سارد بوو، لێزمەباران چادرەکاتییەکانی ئەو حەشامەتە زۆرەی ڕاپێچ داو لە ئاکامدا (٣٠)کەس گیانیان لەدەست دا. سوڵتان چووە سەرتەرمی قوربانییەکان و تاکە شتێک کە گوتی ئەوەبوو کەوا:« *بە دڵنیاییەوە ئەوانە پیلانیان لە دژی من گێڕاوە.بۆیە بەرلەوەی بتوانن هیچ کارێک بکەن، سزای ئیلاهییان بەسەردا نازڵ بووە!*»

محەمەد زۆری کەیفی بە هونەریش دەهات و ئەو مێژوونووسانەیش کە ڕووداوەکانی سەردەمی ئەویان بە ڕاوڕووییەوە دەنووسییەوەو باسیان لە ڕاوشکارەکانی دەکرد، لای زۆر خۆشەویست بوون .یەکێ لەو مێژوونووسانەی کە زۆر کەیفی پێدەهات نێوی (عەبدی) بوو. شەوێکیان لێی پرسی ئەمڕۆ چی لەبارەی سەڵتەنەتی ئەوەوە نووسیوە؟ عەبدی بەبێ پارێزییەوە لە وەڵامدا گوتی: چونکە ئەو ڕۆژە هیچ ڕووداوێک ڕووی نەداوە، هیچی نەنووسیووە. سوڵتان دەمودەست نێزەی ڕاوی خۆی تێگرت و برینداری کردو ئینجا بەسەریدا قیژاند: «*ئەوجا بابەتی نووسینت هەیە!*»

ئەگەرچی سوڵتان محەمەد مەیلی بەلای سیاسەتدا نەبوو، بەڵام لەهەر کوێیەک بوایە شان و شکۆی سەڵتەنەتی عوسمانی دەپاراست. دکتۆر( *جان کاوڵ*)ی جێگری سەرۆکی زانکۆی کەمبریج کە لەکاتی سونەت کردنی کوڕی سوڵتان لە ئەدیرنە بووە، ئەم ڕاستییە دووپات دەکاتەوەو دەڵێ: «*شازادەی لاو لەسەر ئەسپ بوو. ئەوانەی لەگەڵی دا بوون بە چەتری لەپەڕی وشترمر ساز کراو سێبەریان بۆ دروست دەکردو لە تیشکی خۆر دەیان پاراست و، تاقمێکیش پێش قەراوڵ جادەکەیان ئاوڕشێن دەکرد بۆ ئەوەی تەپ و تۆزی ڕێگەکە بمرێ.*

*شازادە بە شان و شکۆو ڕووی کردە چادرەکەی باوکی و ئەو پاسەوانانەی کە قەمچییان بەدەستەوە بوو لێ نەدەگەڕان خەڵک نزیک بێتەوەو تەنانەت پیاوە بەهەیبەت و سەنگینەکانیش لەو پاسەوانانە دەترسان کە وەک دێووشەیتان وا بوون . بەدوای ئەواندا تاقمێک کە پێک هاتبوو لە(١٠٠)خوڵام، گیشتنە جێ و هەریەکەیان دارێکی درێژی(١٠) مەترییان هەڵگرتبوو و گوڵ و مۆمیان پێوەکردبوو. ئینجا دارەکانیان لە بەرامبەر چادری پاشایەتی دانا، بەپێی نەریتی ئەوسا (١٠) منداڵە هەژاریش کە پارەی هەقدەستی دەلاکیان نەبوو، هاوکات لەگەڵ کوڕی سوڵتاندا، سونەت کران و بڕیاردرا تا کۆتایی ژیانیان موچەیەکی کەمیان پێ ببەخشرێت. مەراسمی سونەت کردن بەدەستی نەشتەرگەرێکی تایبەتی ئیتالیایی و بەیارمەتی گوێزانێک و چەند موکێش و قامیشێک بە ئەنجام گەیشت و نەشتەرگەرەکە وەک*

*هەقدەست لە دەفرێکی زیوین دا،(٦) هەزار لیرەی پێ بەخشرا. دوای ئەوە، بەم بۆنەیەوە مەراسیمی ئاهەنگ گێران و پێشبڕکێی وەرزشی ئەنجام دران.»*

زۆرجار سوڵتانی راوچی بەمانگ لە قوستەنتەنییە دوور دەکەوتەوە، بەڵام بابی عالی هەربە ناوەندی دەسەڵات لەقەڵەم دەدراو دەبوایە ئیشتیهای بێ کۆتایی هەزاران کارمەند و خەڵکی تەومزەلی دانیشتووی ئەوێ، کە ژیان و کاریان لەوێ بوو، تێر بکرێ. گەریدەیەکی فەرەنسی کە نێوی (ئۆبری دولامۆترای) بووە، باسی لەو بڕەگۆشتە کردووە کە ساڵانە بۆ بابی عالی هێندراوە و لەو بارەیەوە نووسیویەتی:

«٦٠،٠٠٠ سەرمەڕ–٢٠،٠٠٠ سەرگۆلک– ٢٠٠،٠٠٠ مریشک–١٠٠،٠٠٠ کۆتر–٣٠٠٠ *عەلەشیش.»*

بڕی ئەو خواردەمەنییانەیش کە لە بابی عالی خوراون، جێی سەرسووڕمانە؛ بەڵگەنامەیەک کە سەبارەت بەو خواردەمەنی و کەرستانەی لە ساڵی ١٦٦٠ (١٠٧٠–ک) دراونەتە عەمباری کۆشک ماوەتەوە، باس لەوە دەکات کەوا لە ساڵێکدا: تۆن و نیوێک ماکاڕۆنی(هەرشتەی بیانی)، ٩٠تۆن نۆک،٩٠ تۆن نیسک، ٩٠ تۆن باینجان ،٣٠٠ تۆن پیاز، ١٢ بەرمیل نیشاستە، ٣٠ تۆن هەنگوین ،٢٠ تۆن مۆم ، شەش هەزار کەللە قەند، ٤.٥ تۆن بیبەر، ٤ تۆن مێخەک، ٤ تۆن گوێزی هیندی، تۆن و نیوێک زەنجەفیل، ١١٠٠ کیلۆ زەعفەران، ٥.٥ تۆن خوێ، ٥٠٠ بەرمیل ڕۆنی زەیتون، ٧٠ بەرمیل سرکە،٢٠ بەرمیل ئاولیمۆ، ٣٠ بەرمیل ئاوی بەرسیلە ، ٣ تۆن خەنە و ٤٠ کیلۆش عەمبەر، هێندراوەتە کۆشک.

باڵیۆزە بیانییەکانیش لەو خواردنانەیان دەخوارد و بارتۆن یەکێک لەوانە بوو کە سەردەمی سوڵتان سلێمان دا لەو خواردنانەی خواردبوو. هەروەها بەرلەوەی (جۆرجیۆ باتیستا دۆنادۆ)ی باڵیۆزی ڤینیزیش ببەنە حزوری سوڵتان، بردیانە سەر خوانێک کە (١٣٠) جۆرە خواردنیان لەسەردانا بوو و، خواردنەکانیش لەنێو دەفری چینیی باڵندەسەوز کرابوون. ئەوکاتە ئەو دەفرانە بەوە بەناوبانگ بوون کە کاریگەرییەتیی ژەهر لە نێودەبن.

لەسەردەمی سوڵتان محەمەددا،بەرنامەیەکی دیکەش خرایە سەر ئەم میواندارییەو ئەویش ئەو نوکتەیە بوو کە لە نێو پیاوانی کۆشکدا باوی بوو و خۆشبەختانە باڵوێزی ڤینیز تێنەدەگەیشت ئەگینا بە دڵنیاییەوە پێی تێک دەچوو؛ محەمەد کەیفی بە مەسیحییەکان نەدەهات و هەموو کاتێ بەزمانی تورکی ئەم قینەی دەردەبڕی، وایدانابوو کە هەرکاتێ یەکێ لە باڵیۆزە ئەوروپاییەکان دەچووە لای و سەرۆک وەزیر مۆڵەتی دیتنی لێ دەخواست، دەیگوت:*«ئەو سەگە نان بدەن و دوایی پەتکی کەن و بیهێننەلام.»* ئەو ڕۆژە دوای ئەوەی نانێکی باشیان دەرخواردی باڵوێزی ڤینیزدا، سەرۆک وەزیر چووە خزمەت سوڵتان و گوتی:*«سەگەکەمان نان داوەو پەتکمان کردووەو ئێستا حەزدەکا بێت تەپ و تۆزی تەختەکەی خاوەن شکۆ بلێسێتەوە!»سوڵتان* بەکورتی وەڵامی دایەوەو گوتی:*«کەواتا با سەگەکە بێتە* ژوورەوە.» ئینجا باڵیۆزی ڤینیز لەکاتێکدا کە زەردەخەنەیەکی سەرکەوتوانەی لەسەر لێوبوو، بێ ئەوەی ئاگای لە هیچ بێت، هاتە نێو تالارەوەو رێگەی پێدرا دەستی

سوڵتان ماچ بکات.
ئەو وێنەیەی کە لە محەمەد بەجێماوە، محەمەد بە کابرایەکی بێبەش لە کامەرانی نیشان نادا، بە پێچەوانەوە دەموچاوێکی گەش و کراوەی هەیەو بەقسەی هەندێ لە مێژوونووسان هاوجنسبازیش بووە. هەرجارەی لە ئەدیرنە گەڕابایەوە، شێوەی هەڵسوکەوت و رەفتاری دەگۆڕا، چونکە رقی لەو رۆتینانە بوو کە دەبوایە لە قوستەنتەنییەو لە نێو کۆشکی سەڵتەنەتدا، پابەندیان بێت، هەروەها لە راویش بێ بەش دەبوو. ئینجا دووبرا هەقەکانی خۆیی بە بیردەهاتەوە وبە بەردەوام لەوە دەترسا پیلانێکی لە دژ بگێڕن، سەرئەنجام ئەو ترسە وای لێکرد لەلای خۆیەوە بڕیار بدا براکانی بکوژێ. شاژنی دایک کە هەستی بەو مەترسییە کردبوو، هەموو شەوێ ئەو دوو شازادە لاوەی لە پاشخانەی ژووری نووستنی خۆیدا حەشاردەدان. وای لێهات شەوێکیان سوڵتان بە خەنجەری هەڵکێشراوەوە خۆی بە ژووری دایکی دا کرد. ئەو دوو خولامە مێردمنداڵەی کە لەوێ بوون، لە ترسان نوتقیان گیرا. بەڵام یەکێکیان شاژنی دایکی وە ئاگاهێنا. تەرخان بە پەلە لەسەر جێگەکەی خۆی راست بۆوەو ئامێزی لە سوڵتان دا و لێی پاڕایەوە کە بەرلەوەی منداڵەکانی بکوژێت، ئەو بکوژێ. بەم شێوەیە تەرخان توانی گیانی منداڵەکانی لە مەرگ رزگار بکات.بەڵام ئەو دوو خولامە مێردمنداڵەی کە ئەم دیمەنەیان بەچاوی خۆیان دیتبوو، بۆ رۆژی دواتر تەسلیمی جەللاد کران.

* * *

سیاسەتمەداریی ئەحمەد کۆپرولو بووە هۆی سەقامگیربوونی بارودۆخی نێوخۆیی وڵات، بەڵام لە گۆڕەپانی شەڕدا بەخت رووی لێوەرگێڕا. ئەگەرچی توانی کۆتایی بە گەمارۆدانە(٢٥) ساڵییەکەی قەڵای کاندی بێنێت و دوورگەی کێرت بخاتەسەر سنوری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەوە، بەڵام لەدوو جەنگی مەزندا کە بایەخی مێژوویییان هەبوو، شکستی خوارد. ئەو جەنگانە یەکێیان لە ساڵی ١٦٦٣ (١٠٧٤ی کۆچی) روویدا کە ئەحمەد کوپرولو سوپایەکی سەدو بیست هەزار کەسی بە ١٢٣ تۆپەوە بردە شەڕی ئۆتریشییەکان. سوپا لە رووباری دانۆب پەڕییەوەو بەرەو باکوور هێرشی بردو سەرئەنجام لە دەوروبەری پەرستگەی سێنت گۆتهارد بەرەوڕووی لەشکری ئۆتریش و مەجەرەکان بۆوە. ژمارەی سەربازانی عوسمانی لە سەرکاغەز لە هی سوپای دوژمن پتر بوون، بەڵام لەبەرامبەر تۆپخانەی قورسی ئۆتریشییەکان، کە فەرماندە ئازاکەیان (پرەنس شارل دوک لۆرن) سەرپەرشتی دەکرد، خۆیان پێ رانەگیراو پەرتەوازە بوون. لە ئاکامدا دە هەزار سەربازی تورک کوژران و سی هەزاری دیکەشیان هەڵاتن و ئەمە یەکەم شکستی عوسمانییەکان بوو لەبەرامبەر ئۆتریشییەکاندا.
نۆ ساڵ دوای ئەم جەنگە، کۆپرولو هێرشی کردەسەر پۆڵۆنیا کە سەرکردایەتیی سوپاکەی لە ئەستۆی (یان سوبیسکی)ی پاشای داهاتووی پۆڵۆنیاوە بوو. بۆ یەکەمجار دەنگی قەیسەری روسیا بڵند بۆوە کە هاودەنگ لەگەڵ پاشای پۆڵۆنیا لەبەرامبەر«دەخالەتی سەربازیی تورکیا» ناڕەزایەتی دەردەبڕی.

وەڵامی پڕ لە بوغرایی، بەڵام مسیبەتباری کۆپرولو ئەوە بوو کە:«*هێزی ئیسلام هێندە پتەو و بەهێزە کە یەکێتی روس و پۆڵۆنیاییەکان بۆ ئێمە بچوکترین بایەخێکی نییە.*»

لە راستیدا ئەم یەکێتییە گرنگ بوو و، تورکەکان لەچەند شەڕێکی گەورەدا شکستیان خوارد. دوای چوار ساڵ هەندێ لەونیشانانە بەدەرکەوتن کەوا گوزارشیان لەوە دەکرد کە بەڵێ سوپای تورک، سوپا نەبەزەکەی جاران نییەو دەبەزێ.

ئەحمەد کۆپرولو چەند رۆژێ دوای ئیمزاکردنی پەیمانی ئاشتی، کۆچی دوایی کرد و بەلای هەمووانەوە ئاشکرابوو کەوا سوڵتان برا گچکەکەی ئەحمەد کۆپرولو (زادە)،کە بە قەدەر براگەورەکەی لێهاتوو و شارەزابوو، لەجێی دادەنێ، بەڵام ئەمەیان تاکەجار بوو کە سوڵتان محەمەد دەستی لەکاروباری سیاسی وەرداو بەسوود وەرگرتن لە ماف و دەسەڵاتەکانی پۆستی سەڵتەنەت، زاوا و شەریکەڕاوەکەی خۆی، قەرە مستەفای کردە سەرۆک وەزیر.

ئەم دەستنیشانکردنە گەلێ دەرەئەنجامی شومی لێکەوتنەوە؛ قەرەمستەفا نەک هەرکابرایەکی خوێنمژ بوو، بگرە لە ڕادەبەدەر گەندەڵ و پارە پەرستیش بوو. ساڵانی بەدبەختی و پڕ لە کارەساتی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی لە سەردەمی سەرۆک وەزیرایەتی ئەودا گەیشتە لوتکەی خۆی و ئەوەش کاتێک بوو کە لەساڵی ١٦٨٣(١٠٩٤-ی کۆچی )دا،شاری ڤییەننای گەمارۆدا .

هەرچەندە کە سەرانی وڵات و بەتایبەتیش سوڵتان مەیلیان بەلای جەنگدا نەبوو، بەڵام قەرەمستەفا بەهۆی دەست رۆیشتوویی و خۆشەویست بوونی لای ئاغاکەی و بەتایبەتیش ئەو نامە ساختانەی کەلەلایەن کاربەدەستانی وڵاتەوە سەبارەت بەهاودەنگیان بۆ جەنگ کۆی کردبوونەوە، بووە هۆی ئەوەی کە سەرئەنجام سوڵتان رەزامەندی خۆی لەسەر شەڕکردن نیشان بدات.

لەمانگی ئایاری ١٦٨٣ (جمادی الاخر-ی ١٠٩٤ی کۆچی)، قەرەمستەفا لەشکرێکی کۆکردەوە کە ژمارەیان بەپتر لە دووسەد هەزار کەس مەزندە دەکرا. چەند رۆژ بەرلەوەی سوپا رووەو مەیدانی جەنگ بکەوێتە رێ، سوڵتان بەمەبەستی هاورێیەتی و پشتیوانیکردن لە ئاوەڵ ڕاوەکەی، رازی بوو لەسەر ئەوەی خۆپێشاندانێکی گەورە ساز بدرێت و بۆ خۆی بێتە نێو چەکدارەکانییەوەو بەم شێوەیە عامەی خەڵک رەزامەندی خۆیان لەسەر ئەم جەنگە نیشان بدەن . رەنگبێ ئەمە سەمەرەترین نمایشێک بوو کە خەڵکی قوستەنتەنییە بۆ یەکەمجار دەیاندیت.

جەنگاوەرەکان لەچادری سەوز، سپی، سوورو نارنجیدا و، لە کەنارەی سەربە ئاسیای بسفۆر لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بوون. چادرگەی تایبەتیی سوڵتان، کەوتبۆ گۆشەیەکی ئەم چادرگە سوپاییە مەزنەو پەردەیان بۆ چادەرەکانی سوڵتان گرتبۆوە. لە نێوڕاستی ئەم چادرگەیە، تاوڵێکی گەورەیان هەڵدا بوو کە لە سێ حوجرە پێکدەهات و بریتی بوو لە ژووری نووستنی سوڵتان، شوێنی میوانداری لێکردن و دادگا. هەموو جۆرە جوانکارییەک لە گەرماوی تورکی بە ئاوی بۆرییەوە بگرە تا

دەگاتە خولامی مێردمنداڵەی جوانکیلە و خواجەسەرای رەش پێست لە دەوروبەرو نێو ئەم تاوڵەدا دەدیتران. یەکێ لە ئەرکەکانی ئەم مێرمنداڵە جوانکیلانە ئەوە بوو کەکاتی سوڵتان قاچ و قولی تەزیبان، بیانشێلابایە و گەرمیان بکردایەوە.
چادری قەرەمستەفا کە لە تەنیشت تاوڵەکەی سوڵتان هەڵدار بوو، بەقەدەر تاوڵەکەی سوڵتان گەورەو پڕشکۆ بوو. یەکێ لەئەندامانی باڵیۆزخانەی ڤینیز بەنێوی(بنتی) بەچاوی خۆی ئەم تاوڵەو ئەوەی دیبوو کە چۆن سوڵتانەیان لە کۆشکەکەی خۆیەوە کە کەوتبۆ ئەوبەری بسفۆڕەوە، هێناوەتە لای سوڵتان. کاتێ قایەغی سەڵتەنەتی گەیشتە کەنار دەریا، سوڵتانە سواری گالیسکەیەکی بەزیو نەخشێنراو کراو بەرەو چادرگە کەوتەڕێ.
مەراسیمی رانانی سەربازی لەگەڵ ئامادەبوونی سوڵتان و تێپەڕاندنی ئاڵای سەوزی پێغەمبەری ئیسلام بەهۆی یەکێ لە فەرماندەکانی سوپاوە دەستی پێکرد.
بەپێی نووسینی (بنتی) سەرەتا ئەو موفتییانەی مەندیلی واگەورەیان لەسەرنابوون کە پیاو بە زەحمەت دەیتوانی دەستی لێ بێنێتەوە، بەبەردەم سوپادا تێپەڕین. دوایی ژمارەیەکی زۆر سەگی گورگ بەزێن، بە وەڕین و هەراوهۆریاوە بەدیارکەوتن کە پیاو سامی لێدەکردن و لەگەڵ ئەوەشدا ئێلەگی زێڕدووراویان کردبوونە بەرو قلادەی سووریان لە مل کردبوون و لاق و لەتەریشیان سوور و زەرد کردبوون. دوا بەدوای سەگەکان، ئەو سوارانەی کە قلادەی پڵینگە شکارییەکانیان بەدەستەوە بو، بەدوو وشترەوە کە لاق و لەتەری ئەوانیشیان رازاندبووە، تێپەڕین.
یەکێک لە وشترەکان قورئانێکی لەسەر دانرابوو کە خرابۆ نێو قوتوویەکی سەوزەوەو ئەوەی دیکەشیان پارچەیەک لە عەبای پێغەمبەری موسڵمانانی لەسەر دانرا بوو.
دوایی سەد کەس لە هێزەکانی یەنیچەری لە کاتێکدا کە قابلەمەو قۆرییەکانی خۆیان پێک دەکێشاو تەقەتەقیان دەکرد، بەدوای ئەوانیشدا تیرهاوێژەکانی سوڵتان کە کلاوزرێیەکانیان لەبەر خۆر دەبریسکایەوە و سەرئەنجام سەد کەسی دیکە کە پێستی بەور و پڵینگیان بەسەر شان دادابوو و سەد سوارەی نێزەداری زرێ پۆش- ئەمە بە گۆڕانێک لەنێو سوپادا لەقەڵەم دەدرا- کە ئەسپەکانیان کەفیان لەدەم دەردەهات و جوتەیان دەهاویشتن، تێپەڕبوون.
سەرتاپای لەش و ئەسپەکانی ئەم سوارانە کە کلاوزرێی زێرینی بە پەڕی رەنگاورەنگ رازێندراویان لەسەر نا بوو، بە پارچەی بچوکی ئاسن داپۆشرابوو، بەشێوەیەک کە تەنانەت تەنیشت و کەفلی ئەسپەکانیشیان داپۆشرا بوون و ئەو کلاوزرێیانەی کە لەسەریاننابوون سیمایەکی سەیری پێ بەخشیبوون. لغاو و رکێفی ئەو ئەسپانەش زەرکەش بوو و، لەکاتی رۆیشتندا دەنگیان لێوە دەهات.
ئینجا سەرۆک وەزیران لە کاتێکدا کە تاقیمێک دەهۆڵچی و شەیپوورچی (کە ئەمە بە مارشی سەربازی تورکیا لەقەڵەم دەدرا) لە پێشییەوە دەڕۆیشتن، بەدیارکەوت.
بەدوای ئەویش دا ژمارەیەک خولامی مێردمنداڵەی کۆشک تێپەڕبوون، کە جلی

ڕەنگاوڕەنگیان پۆشیبوو و کڵاوە بەلادا شۆڕ بووەکانیان، زنجیری زێڕی باریکیان پێوەکرابوو.

هەردوا بەدوای ئەوانیش، سوڵتان محەمەد لە کاتێکدا کە جلێکی سپی بە خشڵ نەخشێندراوی پۆشیبوو، کەوڵە قووزێکی بەسەرشان دا دابوو و دەرزیلەیەکی ئەڵماسی گەورەشی لە مەندیلەکەی دابوو، بەدیارکەوت.

سوڵتان کە بەڕاوچی بەناوبانگ بوو، قیافەیەکی زۆر ئازایانە و بێ باکانەی نەبوو؛ بەپێی نووسینی (بنتی): «*قیافەکەی جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئەو مەوکیبە پڕشکۆیەدا هەبوو کە هاوڕێیەتییان دەکرد. ئەو بە شانی داکەوتوو، لووتی باریک، تەنکەڕیش، ملی باریک و هەیکەلی لاوازی بەهیچ شێوەیەک شکۆو هەیبەتی پاشاو سوڵتانی نەبوو. لە هەموو ڕووخساریدا تەنها چاوە ڕەشەکانی سەرنجی مرۆڤیان ڕادەکێشاو ئەمەیش شتێک بوو کە تایبەت بوو بە سیلسیلەی عوسمانییەوەو هەمووان ئەو تایبەتمەندییەیان هەبوو.*»

شەش گالیسکە کە بەهۆی یابووی سپی بچوکەوە ڕادەکێشران و ئافرەتە شۆخ و سەرتۆپەکانی حەرەمسەرایان لێ سوار ببوون و، بیست وشتر کە کەلوپەلی ئەو ئافرەتانەیان لێ بارکرابوون، پاشڕۆی ئەم سوپایە سەیروسەمەرەیان پێک دەهێنا. کۆمەڵە دەروێشێکی نیوەڕووت، کە بەروانکەی سەوزیان بەخۆوە کردبوون، لە دەوروبەری سوپا بەهەڵبەز هەڵبەز و بەدەم دەف و زوڕناوە، یاهو یاهویان بوو و، بەم شێوەیە هەستی ئایینیی سەربازەکانیان دەورووژاندو گوڕ وتینیان پێ دەبەخشین. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە بازرگانە کۆیلە فرۆشەکان بەهیوای دۆزینەوەی مشتەری، باشترین کاڵاکانی خۆیان دەخستەڕوو و(٢٠٠) شێتیشیان لە شێت خانە ڕاهێنابوو بۆ ئەوەی بە جوڵەو ئاکارەکانی خۆیان خەڵک بێننە پێکەنین. ئەم تاقمە شێتەیان بە زنجیری سپی، لێکدی بەستبوون و ژمارەیەک پاسەوانیش بە مەتارەی دەرمانەوە دەیانبردنە ئەم لاوئەولا و ئاگایان لێدەبوون تا ئەگەر سەرکێشی، یان لادانێکیان ئەنجامدا، بەو دەرمانەی بەدەستیانەوە بوو، هێوریان بکەنەوە.

هەندێ لەشێتەکان ڕووت و قووت بوون و هیچیان لەبەردانەبوو، هەندێکیان دەگریان و هەندێکیشیان قاقا پێ دەکەنین و لە پاسەوانەکان دەپاڕنەوە لێیان نەدەن. لەو سەردەمەدا لێدان و کوتانی شێتەکان باو بوو و، بە جۆرە چارەسەرکردنێکیش لەقەڵەم دەدرا.

لەوکاتەدا کەس نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە ئەو سوپایەی کە بەو شان و شکۆیە ڕووی دەکردە گۆڕەپانی جەنگەوە، ڕۆژێ دابێت تێک بشکێ، بەڵام قەرەمستەفا خواستی ئیلاهی لە پێش چاونەگرتبوو؛ دوو ڕۆژبەر لەوەی سوپاکە بەرەو گۆڕەپانی جەنگ بکەوێتە ڕێ، تۆفانێکی سامناک هەڵیکردو سوپای سوڵتان زەرەرو زیانێکی زۆری پێگەیشت.تۆفان چادرەکانی هەڵکەندن و سەرانسەری چادرگەکەی لێکردنە قوڕوچڵپاو. بەلای تورکەکان لە هەموو شتێ نەگبەتی تر ئەوە بوو کە با مەندیلەکەی سوڵتانی لە زەوی دابوو. هەموو ئەوانە بۆ ئەو سوپا پڕشکۆیەی کە سەربازەکانی جلی جوان و ڕازاوەیان پۆشیبوو و کڵاوی پەڕداریان لەسەر نابوو و، وەک ستونێکی

چەند کیلۆمەتری رووەو مەزنترین کارەساتی مێژوویی بەڕێکەوتبوون، بەنیشانەو هێمای شوم و نەگبەتی لەقەڵەم دەدران.
هەق وابوو بنکە سەربازییە لاوازە یازدە هەزار کەسییەکەی ژەنراڵ فۆن ئیشتارنبۆرگ کە لەپشت دیوارەکانی ڤییەننا سەنگەریان گرتبوو، لەبەرامبەر ئەم سوپا گەورەیەدا، یان دەروازەکانی شار بکاتەوەو یانیش بەهۆی برسییەتییەوە خۆ بەدەستەوە بدات و بەم شێوەیە قەرەمستەفاش سەرکەوتووی ئەم جەنگە نابەرابەرە بێت. لەمڕووەوە فەرماندەی عوسمانی کە لەسەرکەوتنی خۆی دڵنیابوو، هێرش کردنە سەرشاری دواخست و ئەم کارەش ئاکامی شومی لێکەوتنەوە. لەئاکامی ئەم بەدواخستنەدا، سوبیسکی دەرفەتی ئەوەی پەیدا کرد سوپاکەی خۆی لە پۆڵۆنیاوە بگەیەنێتە ڤییەننا و(پرەنس شارل لۆرن)یش هێزی یاریدەدەریان بۆ رەوانە بکات. لە کۆتایی مانگی ئاب دا، یەکێ لە سەربازەکانی سوپای سوبیسکی لەکاتێکدا کە نامەیەکی سەبارەت بە هاندانی گەمارۆ دراوەکان پێبوو، بە مەلە لە دانۆب پەڕییەوەو خۆی گەیاندە ڤیەننا. لە شەشی ئەیلول، واتا حەوت هەفتە دوای دەست پێبوونی گەمارۆی تورکەکان، گوللەی رووناک کەرەوە وەک هێمایەک بە گەمارۆدراوەکانی راگەیاند کەوا هێزی یاریدەدەری هەشتا هەزار کەسی گەیشتووەو ئامادەی یارمەتیدانیانە.
یەکەم ئەرکی سوبیسکی و شارل لۆرن ئەوە بوو کە دەست بەسەر ئەو بەرزاییانە دابگرن کە بەسەر ڤییەننایاندا دەڕوانی و ئەم کارەشیان کرد. ئەوشەوە سوبیسکی قسەی بۆ سەربازەکانی کردو گوتی:« *ئەمڕۆکە ئەرکی ئێمە تەنها رزگارکردنی شارێک نییەو بگرە رزگارکردنی دنیای مەسیحییەتەو ڤییەنناش دڵی ئەو دنیایەیە. سەربازانی دوژمن بە دیتنی ئێوە هیوای خۆیان لەدەست داوە، نائومێد بوونە، چەربەزمیان نەماوەو بەم زووانە ئەم دۆڵانە دەبن بە مەزارگەیان.*
*فرمانی من لەیەک رستەدا کورت کراوەتەوەو ئەویش ئەوەیە کە: بەدوای مندا وەرن چونکە کاتی ئەوە هاتووە کە ئێوەی لاو، ئازایەتی و نەبەردیی خۆتان نیشان بدەن.*»
لەیەکێ لە رۆژە خۆشەکانی مانگی ئەیلول، لە کاتێکدا کە هێشتا تەم و مژی بەرەبەیان دۆڵەکانی دەوروبەری شاری داپۆشیبوو و مژدەدەری رۆژێکی گەرم بوو، سوبیسکی و شارل لۆرن هێرشی خۆیان دەست پێ کرد. قەرەمستەفا کە لە زۆری ژمارەی سەربازەکانی بۆ سەرکەوتن دڵنیا بوو، فرمانی دا ئەو ۳۰.۰۰۰ یەخسیرەی کە لەسەر رێگای ڤییەننا دەستگیریان کردبوون، بکوژن و هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کە دوژمنەکانی بتوانن هێڵەکانی بەرگری سوپا گەورەکەی تێک وپێک بشکێنن و بڵاوەی پێ بکەن، بەڵام ئەوە روویدا و تەنانەت سوپای یەنیچەری تارومار بوو و، تەواوی لەشکرگەی تورکەکان کەوتەبەر دەستی ئەورووپاییەکان.
دەستکەوتی ئەورووپاییەکان یەکجار زۆر بوو؛ سوپای تورک ۳۰۰ تۆپ، ۹۰۰۰ عارەبانە تەقەمەنی و ۲۵۰۰۰ چادری لێ بەغەنیمەت گیرا. تورکەکان کە ترس دایگرتبوون، بەهەموو لایەکدا رایاندەکرد و هەر بابا بوو خۆی رزگار بکا. دوازدە

پاشاو فەرماندەی یەکە سەربازییەکان کوژران. بەڵام قەرەمستەفا، کە چاوی راستەی بریندار ببوو و بە دەسرەیەک بەستبووی، توانی خەزێنەی سوپاو ئاڵاکەی پێغەمبەر قوتار بکات.

نزیکەی (٦)ی دوای نیوەڕۆ، سوبیسکی کە تا ئەودەمە نانی نەخوارد بوو، گەیشتە چادرە پڕشکۆکەی قەرەمستەفا، کە وەک کۆشکێکی بچوک وابوو. سوبیسکی بەدیتنی ئەو هەموو شان و شکۆ و گەورەییەو، دیتنی ئەو هەموو دەفرە زێڕو زیوانەو، ئەو کەرستە گرانبەهایەی ئەوێ ، بەتایبەت ئەو باخچە بچوکەی کە بە حەوزو نافورەیەکی بچوکەوە لە گۆشەیەکی چادرە کە بۆ چەند کەروێشک و پشیلەو تووتیەک دروست کرابوو، واقی وڕما و شاگەشکە بوو. هەرکە قەرەمستەفا گەیشتە ئەدیرنە، وای لە خۆی کرد کە سوڵتان لەو شکستە گەورەیەدا بەبێ تاوانی بزانێت و بیبەخشێت، بەڵام قەرەمستەفا لەکاتی گەڕانەوەیدا لە بەرەی جەنگ هەڵەیەکی گەورەی کردبوو، کە بەگران لەسەری وەستا؛ قەرەمستەفا لەترسی ئەوەی نەوەکا پاشای شاری بودا لە هەنگاریا، کە شکست و ئابرووچوونەکەیی دیبوو، لای سوڵتان شایەدیی لەسەر بدات، هەستا بە لە سێدارەدانی ئەو کابرایەکە لە هەمانکاتدا زاوای سوڵتان واتا مێردی خوشکی سوڵتان بوو. خوشکی سوڵتان کە لەڕادەبەدەر نارەحەت ببوو، بڕیاری دا بەهەر شێوەیەک و بەهەر نرخێک بێت خۆی بگەیەنێتە قوستەنتەنییەو براکەی لەو رووداوە ئاگادار بکات و رووی راستەقینەی شکستەکەی قەرەمستەفا بخاتە روو. بەڵام لەبەر ئەوەی نەیدەوێرا بە ئاشکرا بچێتە قوستەنتەنییە جلەکانی خۆی گۆڕی و لە حەرەمسەرا هاتە دەرو بەنهێنی رێی پایتەختی گرتەبەر.

لە قوستەنتەنییە ئەندامانی دیوانی هەمایون و سەرانی یەنیچەری پشتیوانی خۆیان بۆ قسەکانی خوشکی سوڵتان دەربڕی و بەناچار محەمەد بە پێچەوانەی ویستی دەروونیی، رای خۆی گۆڕی. کاتێ کە جەللادە پەت بەدەستەکان بەرەو لای قەرەمستەفا چوون، قەرەمستەفا داوای ئەوەی کرد رێگەی پێبدەن دەستنوێژ هەڵگرێ و نوێژ بکات. ئەم داوایەی جێبەجێ کراو ئینجا لە کاتێکدا کە لەسەر چۆک دانیشتبوو، بۆ خۆی ئاڵقەی پەتەکەی کردە ملی خۆی و گوتی: *«خوا وای ویستووە»*. دوای ئەوەی کاری جەللادەکان کۆتایی پێهات، کەللەسەری قەرەمستەفایان پڕلە کا کردو بەسەردەروازەی دیوانی هومایونیانەوە کرد.

ئەو رۆژە (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی ١٦٨٣ (١٢ی شەوال-ی ١٠٩٤ی کۆچی) بوو. ئەگەرچی پێدەچێ هێشتا تورکەکان سەرنجی بایەخی مێژوویی ئەو رۆژەیان نەدابێ، بەڵام ئەو رۆژە دوایین هەوڵی عوسمانییەکان بوو بۆ پەرەپێدانی سنوری ئیمپراتۆرییەتەکەیان کە بەرەورووی شکست بۆوە، ئیدی لەو رۆژە بەدواوە ناچار بوون بەردەوام لە دۆخی بەرگریدا بن تا هێرش بردن.

* * *

وڵاتانی دیکە کە خۆیان لەمەتەرێز نابوو و چاوەڕێی ئەم دەرفەتە بوون، بەبێ دواکەوتن دەستیان کردە هێرش بردنەسەر عوسمانی. پاپا، جیهادو جەنگی سەلیبیی راگەیاند، رێبەرانی کۆماری ڤینیز بە یارمەتی پاپاو شاسوارانی سێنت

جان، كه له (رۆدس)هوه رووهودوورگهى مالّتا كۆچيان كرد بوو، گهله كهشتييهكيان ئامادە كرد، هێزى وشكانى ڤينيزييهكان هێرشيان كردەسەر بۆسنيا، ئەلبانياو يۆنان و دەستيان بەسەر شارى ئەسينادا گرت . لەهەمان كاتيشدا، سوپاى نۆتريش لە كرۆواتيا سوپاى توركەكانى بە چۆكدا هێناو ويلايەتى نێوبراوى دواى(١٥١) ساڵ لەژێر دەسەلآتى توركەكان رزگار كرد. پرەنس(شارل لۆرن)يش توانى دەست بەسەر قەلآى (بودا)دا بگرێ كە(١٤٥) ساڵ بوو لەژێر دەستى توركەكان دابوو. ئاشكرايەكە ژمارەيەكى زۆر لە سەربازانى تورك لەوشەڕانەدا گيانيان لەدەست دا، بەلآم سولّتان توانى لەم قەيرانە سەختەدا سەرى خۆى رزگار بكات و بە سەلامەت بۆى دەرچێ؛ سولّتان، بە ناچارى (زادە كۆپرولو)ى براى ئەحمەد كۆپرولوى كردە سەرۆك وەزيران و ئەويش پێى لەسەر ئەوە داگرت كە دواى چل ويەك ساڵ پاشايەتيى بێهودە، پێويستە سولّتان محەمەد لەسەر كار وەلابنرێت، بەلآم بەمەرجێك هيچى لێنەكەن و نەشى كوژن. دواى بەدەست هێنانى رەزامەندى ئەندامانى ديوانى هومايون و فەرماندەكانى سوپا، سلێمانى براى محەمەد كە تا ئەو دەم بيست وپێنج ساڵى تەمەنى خۆى لە قەفەسدا بەسەربرد بوو، لە قەفەس هێنرايەدەرو محەمەديان رەوانەى شوێنەكەى ئەو كردو سلێمانى لاوازو رەنگ زەرديان كردە سولّتان.

دوايين كەسى بەرجەستەى بنەماڵەى كۆپرولو توانى لەماوەى دوو ساڵدا بەشێك لە ناوچە لەكيس چووەكان بخاتەوە ژێر كۆنترۆڵى ئيمپراتۆرييەتى عوسمانى. بەلآم لە گرمەى شەرى (سالانكمەن) دا، دا كە بۆ جارێكى ديكە تورك و نۆتريشييەكان بە سەختى بەرەورووى يەكدى ببوونەوە، گيانى لەدەست دا. دواى ئەوە نەگبەتى لەسەر نەگبەتى بەسەر توركەكاندا بارى، بەتايبەتى كاتێك مستەفاى دووەم كە نزيكەى (٣١) ساڵى تەمەنى خۆى لە قەفەسدا بەسەر بردبوو و لەساڵى ١٦٩٥(١١٠٦ى كۆچى) لە جێى سلێمانى دووەم لەسەر تەخت دانيشتبوو، جەختى لەسەر ئەوە كرد كە لەشەرى دژ بە مەجەرەكان دا، فەرماندەيى سوپاى توركەكان بەدەست خۆيەوە بێت.

ئەم كارە كردەوەيەكى بێ هيوايانە بوو؛ چونكە مەجەرەكانى ژێر سەركردايەتيى(پرەنس ئۆژن دوسا ڤوا)، لە گوندى زنتۆن كە كەوتبۆ سەر لێوارى رووبارى تايس(تيسا)و يەكێك بوو لە لقەكانى رووبارى دانۆب، لەمەتەرێزدا بوون و چاوەرێيان دەكردن.

سولّتان فرمانى دا بەمەبەستى پەرينەوە لە رووبارەكە، لەو شوێنە پردێكى كاتى دروست بكەن. پرەنس ئۆژن، چاوەرێى ئەوەى كرد تا سولّتان و تۆپخانەكەى لەگەڵ پيادە نيزامى تورك كەوتنە ئەو بەرو ئەو بەرى رووبارەكەو لێك دابڕان، ئا لەوكاتەدا دەستى كردە هێرش بردن و سولّتان بەدەستە وستانيەوە، بەچاوى خۆى ديمەنى كوژرانى (٢٦) هەزار كەس و نغرۆبوونى (١٠) هەزار كەسى ديكەى ديت، كە بۆ رزگاركردنى گيانيان، خۆيان بەئاوى رووباردا دابوو. زادە كۆپرولوى سەرۆك وەزيران و چوار وەزيرى ديكەش گيانيان لەدەست دا.

ئا لەوكاتەدا ولآتە گەورەكانى ئەوروپا بۆ يەكەمجار لەوە تێگەيشتن كە بێ

دیفاعیی قوستەنتەنییەو دەستەوئەژنۆیی ئەوان لەبەرامبەر هێرشی ڕکابەرەکانیان بۆسەر عوسمانی، مەترسی بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەوان هەیەو ڕەنگبێ لە داهاتوودا ڕکابەرەکانیان بتوانن دەست بەسەر قوستەنتەنیەدا بگرن کە پێگەیەکی بازرگانی و سەربازی گرنگی لە ناوچەکەدا هەبوو. بۆیە هەریەکەیان بەبیانوویەک خوازیاری بێلایەنیی تورکیا بوون؛ بەریتانیا بە بیانووی ئەوەی ڕێی تێپەڕین بۆ هیند بپارێزێ، فەرەنساو ئیتالیا بە بیانووی پاراستنی دەریای سپی ناوەڕاست و ڕوسیا بە بیانووی پێشتگیریکردن لە فراوانخوازی وڵاتانی دیکەو... هتد، خۆیان لەمەسەلەکە کێشایەوە.

لەدوایین ساڵەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا، بەریتانیا و هۆڵەندا پێشنیازی ئەوەیان کرد پەیمانێکی ئاشتی لەسەر بنەمای ئەوەی هەر وڵاتەو سنوری ئەوسای خۆی بپارێزێ، ببەسترێ، واتا ئۆتریش و ڤینیز و پۆڵۆنیا، ببن بەخاوەنی ئەوزەوییانەی کە لە تورکیایان دابڕیبوون و ئەو شوێنانە بۆ هەتا هەتایە ببن بە مۆڵکی ئەوان.

دانوستانەکانی ئاشتی، لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٦٩٨ (جمادی الأول-ی ١١١٠ی کۆچی)، لە شارۆچکەی کارلڤۆیتس، کە کەوتبۆسەر لێواری ڕووباری دانۆب *(ئێستا لە نێو سنوری یۆگسلاڤیادایە و پێیدەگوترێ کارلڤۆتسی سرمسکی)*، دەستی پێکردو حەفتاو دوو ڕۆژیان خایاند. بەپێی ئەو پەیمانەی کە سەرئەنجام لە ٢٨ی کانوونی دووەمی ١٦٩٩(٥ی شعبان-ی ١١١٠ی کۆچی) ئیمزا کراو ناوەرۆکەکەی بۆ ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی تەزێی زەلیلی و دەستە وەستانی بوو، تورکەکان ناچار بوون دوو لەسەر سێی خاکی خۆیان بدەنە مەجەر و ئۆتریشییەکان و تێکڕای ئەو ناوچانەیش کە کەوتبوونە باکووری دەریای ئازۆف، لەگەڵ خودی دەریاکەدا، بدەنە ڕوسیا .

دیاریکردنی سنوری نوێ، نارەحەتی و دڵتەنگیەکی سەختی لە قوستەنتەنییەدا دروست کرد. لەوێ بە دواوە تەنها گۆڕینی سنورە جوگرافیاییەکان بنەمای پەیوەندییەکانی نێوان عوسمانی و وڵاتە ئەوروپییەکانی پێک نەدەهێنا، چونکە مەفهوم و واتای پەیمانی ئاشتی کارلڤۆیتس زۆر لەوە قوڵتر بوو و بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە ئیدیعاکانی عوسمانی سەبارەت بەدەست بەسەراگرتنی زەوی و فراوانخوازی دەهێناو ڕاشی دەگەیاند، کە پاراستنی بارودۆخی ئەوسای ئیمپراتۆری جێی سەرنجی وڵاتە ئەوروپیەکانە، هەر چەندە لەگەڵی لە شەریشدا نەبن...پەنجا ساڵی پێچوو تا عوسمانییەکان لەبایەخی پەیمانی ئاشتی کارلڤۆیتس گەیشتن و ئەویش ئەوکاتە بوو کە ناوەرۆکەکەی جێبەجێ کراو ئەستێرەی بەختی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ڕووی لە خامۆشی کرد.

* * *

تەنانەت لەو ساڵە پڕئاشوبیانەشدا، تاکە شتێک کە وەک خۆی مابۆوە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتبوو، بابی عالی و زێدەڕۆییە بێحەد و سنورەکانی بوو. ئەو جەنگانەی کە وردە وردە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی بچوک و بچوکتر دەکردەوە، لەو دیوی دەروازەی بابی سەعادەت هەستیان پێنەدەکرا. سوڵتان ئەحمەدی سێیەم لە

(٢١)ی ئابی سالی ١٧٠٣(١٠ی ربیع الاول-ی ١١١٥-ی کۆچی)دا، واتا چوار سال دوای بەستنی پەیمانی ئاشتی کارلڤۆیتس لەسەر تەخت دانیشت و زۆربەی کاتی خۆی و ئەو ماوە بیست و هەشت سالییەی تەمەنی دەسەلاتەکەی بۆ کاری سەمەرەو زێدەڕۆیی وشتی پوچ تەرخان کرد. کاتێ کچەکەی خۆی بە مێرد دا، میوانداریەکی یەکجار گەورە و پرشکۆی سازدا کە ١٥٠٠ کەس چێشت لێنەر، تەنها چێشتە جۆراوجۆرەکانیان لێ نابوو. سولتان فرمانی دا چلە نەباتی (٦) مەتری دروست بکەن و لە چادرەکانی نێوەڕاستی باخ دایان نێن بۆ ئەوەی میوانەکان هاوکات لەگەل رابواردن و سەیرکردنی نمایشی سیحربازی و بیستنی ئەو گۆرانی و مۆسیقایەی کە ٢٠٠٠ مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژ پێی هەلدەستان، لەو نەباتە (٦) مەتریانە بخۆن و دەمیان شیرین بکەن.

سولتان ئەحمەد زۆر حەزی لە گولی(لالە) بوو. ئەم گولە بەرێژمیەکی زۆر لە مەغۆلیستان دەڕوێت و لە نێوەڕاستی سەدەی شازدەهەمدا، بازرگانێکی هۆلەندی بنەکەی بردە ئەمستەردام و دواتر هۆلەندییەکان توانیان جۆرە جۆراوجۆرەکانی وەبەربێنن. ئەحمەد پتر لە ١٢٠٠ جۆری گولە لالەی لە هۆلەنداوە بۆ باخەکانی هێنا. خونچە دەگمەن و رەنگاوڕەنگەکان بە وردی و سەرنجێکی زۆرەوە لەگولخانە پان و بەرینەکاندا پەروەردە دەکران و هیچکەس مافی ئەوەی نەبوو لە دەرەوەی پایتەخت ئالوویر بە گولە لالە بکات و پێچەوانەوە سزادەدرا. ئینجا نێوی زۆر شاعیرانەشی لەو گولە لالانە نابوون و بازرگانێکی فەرەنسایی بەنێوی *ژان کلۆد فلاشە*، دوای سەردانی قوستەنتەنییە گەیشتە ئەو باوەڕەی کە «*گولە لالە و ئەسپ ئەو دووشتەن کە لای تورکەکان نرخیان لە گیانی مرۆڤێک پترە؛ چونکە کاتێ یەکێ لە بالیۆزە بیانییەکان بنە گولەلالەیەکی وەک دیاری پێشکەشی سولتان کردو بنەگولەلالەکە بزر بوو، سەرۆک وەزیران جارچی نادە کوچەو کۆلانەکانی قوستەنتەنییە تا بە خەلک رابگەیەنێ هەرکەس بتوانێ بیدۆزێتەوە خەلاتێکی باشی پێ دەدرێت.*»

هەموو بەهاران، ئەحمەد جەژنێکی گولەلالەی بەرپا دەکرد کە پتر لە شەوانی مانگەشەودا، ئەنجام دەدرا. گولدانە رەنگاوڕەنگەکانیان لەسەر ئەو داربەستانە(ئەسکەلانە) دادەنان کە چەندین کیلۆمەتر درێژبوون و لەنێوەڕاستی باخی سەلتەنەتیدا ساز کرا بوون و گۆی بلورینی پرلە شلەی رەنگاوڕەنگ و فانۆسیشیان دەخستە نێوان گولدانەکانەوە.

میوانان مافی ئەوەیان نەبوو جلێکی وا بپۆشن کە لەگەل ئەم دیمەنانەدا نەگونجێ.

هەزاران قەفەسی بولبول و کەناریان بە لق و پۆپی درختەکانەوە هەلدەواسی. ئەحمەد لە نێوەڕاستی باخ لە سەر سەکۆیەک دادەنیشت و سەرانی ولات و کاربەدەستانیش دەیانتوانی بە خزمەتی بگەن. هەندێ شەویش، ئافرەتانی حەرەمسەرا هەراجیی بێ پارەیان رێک دەخست و کەنیزەکی جوان و پەری شێوە، رۆلی فرۆشیاریان دەدیت و ئاشکرایە کە لەم هەراجەدا، تاکە کڕیار خودی سولتان بوو.

حەزو دڵبەندیی ئەحمەد بە گوڵی لالە، وردە وردە کاریگەرییەتی خستەسەر کاروباری وڵات و زۆربوونی خەرجیی ئەم ئاهەنگ و بۆنانە، خەزێنەی وڵاتی بەتاڵ کرد. سەرئەنجام وایلێهات بیر لە لادانی سوڵتان بکەنەوە، بۆیە لە یەکی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٧٣٠(١٨ی ربیع الأول-ی ١١٤٣ی کۆچی)، لە سوڵتانیەتیان خست و مەحمودی یەکەمیان لە جێ دانا. مەحمود کە هەستی بە مەترسی بارودۆخەکە کردبوو، بە پەلە فرمانی دا کۆتایی بەویەزم و رەزمە بێت و«سەردەمی گوڵەلالە» کۆتایی پێهات. مەحمودیش خولیای دیکەی لەسەر دابوون و هەرچەندە حەزی لە گوڵبازی نەبوو، بەڵام شێت و شەیدای چێژو هەوەسبازییەکانی حەرەمسەرا بوو. بەشێوەیەک کە(فلاشە)ی بازرگانی فەرەنسایی، کە خۆی کردبۆ برادەرێکی نزیکی قزڵەر ئاغا، دەگێرێتەوە: *«سوڵتانی نوێ حەزی لەوە بوو لە کونی دەرگاو لە پشت پەردەکانەوە بەدزی سەیری کردەوە و جوڵەی ئافرەتانی حەرەمسەرا بکات. بۆ نمونە خۆی لە پشت دەرگایەک حەشاردەدا و بەدزی سەیری ئەو ئافرەتانەی دەکرد کە بەژێرکراسی سپییەرە، بە قاچ و سەری رووتەوە دەچوونە گەرماو چێژێکی زۆریشی لەم کارەی دەبرد.*

*فرمانی ئەوەی دابوو درومانی ئەو ژێرکراسانە هەڵوەشێننەوەو لەجیاتی داوودەزوو، بەچەسپ لێکیان بدەن، بۆ ئەوەی کاتێ گەرماو پڕ لە هەڵم دەبوو، ئەو چەسپە خاوبێتەوەو پارچەکانی ژێر کراسەکانیش لێک جیابنەوە. ئەم کارە ببۆ مایەی پێکەنینی ئافرەتانی حەرەمسەراو سوڵتانیش چێژی لەم کارە وەردەگرت.»* سوڵتان بەرادەیەک کەیفی بەم کارە هاتبوو و هێندە خۆشحاڵ ببوو، کە زۆر بە ئاب وتابەوە ئەم مەسەلەیەی بۆ قزڵەر ئاغا گێڕابۆوە و قزڵەر ئاغاش بۆ فلاشەی گێڕابۆوە.

مەحمود لە ساڵی ١٧٥٤ (١١٦٨ی کۆچی) کۆچی دوایی کردو عوسمانی سێیەم کە برای بوو، جێی گرتەوەو ئەویش وەک خۆی کابرایەکی پڕوپووچ وبێ توانا بوو. بەڵام جیاوازیەکی تەواوی لەرووی زەوق و سەلیقەوە لەگەڵ براکەیدا هەبوو. سوڵتانی نوێ بابایەکی کەتەی رەش و ورگ ئەستور بوو،

(٤٥) ساڵانە بوو کە لەسەر تەخت دانیشت و گەورەترین ئارەزووی نان خواردن بوو. دەت گوت نەبەدەستی چێشت لێنەرەکانی کۆشک تێردەبێ و نەکەیفیشی بە خواردنەکانیان دێت، بۆیە هەموو شەوێ کە دنیا تاریک دادەهات جلەکانی خۆی دادەکەندو جلی ئاسایی دەپۆشی، لە کۆشک دەچووە دەرێ و رووی دەکردە چێشتخانە بەنێوبانگەکانی شارو لە چەند شوێنێک نانی دەخوارد، ئینجا بڕێکی باشیش خواردنی لەگەڵ خۆیدا دەبردەوە کۆشک بۆ ئەوەی ئەگەر لە نیوەشەودا برسی بۆوە بیخوات.

عوسمان سەرەڕای ئەو زگ دڕاوییە، زۆر حەزی لە دروستکردنی باڵاخانەو ساختومانی نوێ بوو. لەماوەی سێ ساڵی سەڵتەنەتەکەیدا، بە هۆی بێزاریی لە مۆسیقا، تێکڕای مۆسیقاژەنەکانی کۆشکی وەدەرناو لەبەر ئەوەی کەیفی بە ئافرەتانیش نەدەهات، کەمتر بەلای حەرەمسەرادا دەڕۆیشت و ئەم کارەشی بووە

هۆی بێ هیـــوایی ئافـــرەتانی حـــەرەمـــســـەرا. لە دەرەوەی بابی عـــالی، وڵات لە بارودۆخێکی مـەینەتبـار دادەژیا؛ بوکارتۆی گەڕیدەی ئیتـالیایی کە لەو سـەردەمـەدا سـەردانی قوستـەنتەنییـەی کردووە، نووسیـویەتی: «*پیـاو تا بەچاوی خـۆی نەبینێ ناتوانـی بڕوا بکات کـە جۆری مـرۆڤ وابە پۆخـڵـی دەژین. هـەمـوو ڕۆژێ لـە گۆشـەو کـەنارەوە داسـتـانی پڕ لەخـەم و مـەینەتی دەبیـسـترێ. بەیانیـێکیـان خـەرمـانێک کـەللەسـەری مـرۆڤم بینی کـە لەلای چەپی دەروازەی بابی هومـایون لەسـەر یەکـدی قەڵاقۆچکە کرا بوون و موچڕکم بەلەشدا هات. ڕۆژێکی دیکە ژمارەیەک زیندانییان، کە چەند مەسیـحییەکیشیـان لە نێودا بوون، لەسـەردیوارەکـانی (حـەوت بورج)ەوە هەڵدرانە خـــوارێ، واتا فـــڕێیـــان دانە ئـەو گـۆڕەپانەی کـــە پتـــر لە ســێـــدارەدانە سیاسیەکان لەوێ ئەنجام دەدرێن. من لە دوورەوە توانیم ژمـارەیەک لەو چارەڕەشانە ببینم کە هێشتـا زیندوو بوون و بەرووتی گـوڵمـێخـیان لـێ داکوتابوون و دەبوایە تا ئەوکاتەی بە مردن ڕزگاریان دەبێ لەو حاڵەدا بمێننەوە.*»

* * *

ئەم سـەردەمی چارەڕەشی و مـەینەتییـە کاتێ گـەیشـتـە لوتکە، کە مـسـتـەفـای سـێیـەمی جـێنشـینی عـوسـمـان، هەسـتـا بە ئەنجـامـدانی یەکێ لە دەبەنگانـەترین جـەنگەکانی مێژووی عوسمانی. مستـەفا لە ساڵی ١٧٦٧(١١٧١ی کۆچی) لە جێی ئامۆزاکەی خۆی دانیشت و دەمـودەست بڕیاریدا مل لەبەر ملی روسەکان بنێت. بۆیە سـوپایەکی کـۆکـردەوەو بە بارگـەو بنەیەکی زۆرەوە کـە ببـووە هۆی ئەوەی سـوپا بە هێـــواشی ڕێبکات، رووەو بـاکـــور کـــەوتـە ڕێ. هەریـەک لە فـــەرمـــاندەی یەکـــە سەربازییەکانی سوپاو پاشاکان، ڕێگەیان پێدرا بوو باری پەنجا وشتر کەرستـە و پێداویسـتـیی خۆیان لـەگـەڵ خۆیاندا ببن. هـەرچەند ئەو برە لە چاو بارگـەی ژەنراڵە رووسەکان، کە هەریەکەو ٣٠٠ عارەبانە کەرستە وپێداویستیی خۆیان بەدواوە بوو، زۆربەرچاو نەبوو.

ئەم شـەڕە پێنج سـاڵی خـایاندو تێیدا سـوپای هەردوولا وەک شێـتـان بەگـیانی یەکدی وەربوون و تا توانیـان لێکیـان کوشت. مسـتـەفا مـرد و مـردنیشی بووە هۆی ئەوەی کەمێک کـەف و کوڵی هـەردوولا بنیشێتەوەو سەرئەنجام ئەم شـەڕە بە بەسـتنی پەیمانی ئاشتی کوچک قینارچی لە ساڵی ١٧٧٤(١١٨١ی کۆچی) کۆتایی پێهات.

ئەم شـەڕە بۆ تورکـەکـان وەک کـارەسـاتێکی گـەورە وابوو؛ لە ئاکـامی ئەم شـەڕەدا تورکـەکـان نیـمـچـە دورگـەی کریمـەیان لەدەست دا و چـەند ویلایەتێکی دیکـەشیـان سپاردە دەست کاترینی قەیسەری روسیا.

لە پەیماننامـەی نێوبراودا بڕگەیەک هـەبوو کە لەو سەردەمـەدا زۆر سـەرنجڕاکێش نەبوو، بەڵام لە ساڵانی دواتردا بایەخ و گرنگییەکەی بەدیار کەوت. ناوەڕۆکی بڕگەکە بەم شـــێـــوەیە بوو:«*تورکـیـا بەڵێن دەدات هـەمیشـە پشتگیری لە ئایینی مـەسـیح و مـەسـیـحـیـەکـان و کـەلیـسـاکـان بکات و ڕێگە دەدات کـە باڵیـۆزەکـانی روسـیـا لە قوستـەنتـەنییە نوێنەرایەتیان بکەن.*» بەم شێوەیە ویلایەتی موسڵمان نشینی کریمە لە سنوری ئیـمـپڕاتۆرییـەت جیا بۆوەو، دەوڵەتی روسـیاش مـافی دەمڕاستی کردنی

هاووڵاتییە مەسیحییەکانی تورکیا و دەست تێوەردان بە قازانجی مەسیحییەکانی بەدەست هێنا.

ئێستا دوای ئەوەی چەند سەد ساڵ بوو ئەوروپای مەسیحی لە دژی تورکیای موسڵماندا دەجەنگا، ڕووبەڕووی بارودۆخێکی لە ڕادەبەدەر سەیروسەمەرە ببوو؛ دەبوو لەمەو دوا وڵاتانی ئەوروپایی هەوڵی پاراستن و مانەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی بدەن و ڕێگە نەدەن بڕمێ و لەنێو بچێ. هەروەها هەمیشەش لە ئامادەگی دابن بۆ ئەوەی وڵاتانی ڕکابەریان نەتوانن ئەو قوستەنتەنییەیە داگیربکەن کە بەقسەی قوستەنتینی یازدەهەم (دوایین ئیمپڕاتۆری بیزانس)، «*بە شـــــازنی شارەکانی جیهان لەقەڵەم دەدرا و توانیبووی تەواوی ناوچەکانی ژێرخۆر بخاتەژێر ڕکێفی خۆی و چۆکیان پێدابدات*».

## پەراوێزەکان

١- گیانلەبەرێکە لە تیرەی ڕێوی و پێستەکەی زۆر بەنرخە و شێوەی زۆر لەسمۆرە دەچێ(وەرگێڕ)
٢- لە ساڵانی دواییدا دەروازەی دیوان، پێیدەگووترا (بابی عالی). وردەوردە ئەم دەستەواژەیە بۆ بەشی دەوڵەتی وئیداریی کۆشکی سوڵتان بەکار هێندراو بێگانەکان ئەغلەب بە دەرباری عوسمانییان دەگووت (بابی عالی).
٣-دیوانی هومایون ئەنجومەنێکی راوێژکاری بوو کە لە هەفتەیەکدا چوارجار پێک دەهێندرا و لە ڕۆژانی شەممە بۆ سێ شەممە کۆدەبۆوە.
٤-نازناوی سوڵتانە لە داهێنانی ئەوروپاییەکانە و لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا، نازناوی سوڵتان بە بێ جیاوازی بۆ ژن و پیاو بەکار دەهێندرا و ئەمەش بە شێوەیەک بوو کە بۆ پیاوان بە پێشگر و بۆ ئافرتان بە پاشگر بەکاریان دەهێنا.
٥-لە کتێبی: **The Sultan His Subject By: R.Davey**
٦-ئەو کەسانەی کە ئالیک بۆ ئەسپ و خواردەمەنی بۆ سوپا دابین دەکەن.
٧-تراکتاتوس ناونیشانی ئەو کتێبە بوو کە لە سەدەی پازدەهەم زانیاریی سەبارەت بە کۆشک و پاشایەتی و داب و نەریتی خەڵک، بەدەستەوە دەدا
٨- **The Days of Crescent, By:G.E.Hubbard**
٩-لە کتێبی: **The History of the Imperial Estate of the Grand Seignur,By:M.Bandier, London 1963.**
١٠-خودی بەیتە شیعرەکەی حافز بەو شێوەیەیە:
ان تلخ وش که صوفی ام الخبائثش خواند اشهی لنا واحلی من قبله العذارا
١١-ئەم شازادە ئیسپانیاییە کوڕی ئاشەرعیی شارلکەن و زڕبرای فلیپی دووەمی پاشای ئەو وڵاتە بوو.
١٢-غالاتا یان گالاتا وشەیەکی یۆنانییە و بە مانای شیر دێت؛ چونکە لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی بیزانس ئەم شوێنە بازاڕی شیرفرۆشەکان بووە.
١٣-موراد تاکە سوڵتانی عوسمانی نەبوو کە لە کاتی ڕۆیشتن بۆ جەنگ ژمارەیەک لە هاوسەرەکانی خۆی لە گەڵ خۆیدا دەبرد. پەنجا ساڵ بەر لەو مێژووە کاتێ هێزی دەریایی ئیسپانیا کە بە«ئارما دای سەرکەوتوو» بەناو بانگ بوو، بەرەو بەرەی جەنگ لە گەڵ بەریتانیادا کەوتنەڕێ، نزیکەی ٦٠٠ ئافرەتیان لە گەڵ خۆیاندا برد.
١٤-بەکارهێنانی کۆتری نامەبەر لە سەردەمی شەڕی خاچ پەرستەکانەوە باو ببوو. دواتر تورکە دەوڵەمەندەکان کە سەردانی ماڵی خوایان دەکرد و دەچوونە مەککە، بە هۆی ئەو کۆترە نامەبەرانەوە هەواڵی سەفەرەکەی خۆیان بۆ خێزانەکانیان دەنارد.
١٥-Sultanasporca

## فەسڵی شەشەم

### سوڵتانەی فەرەنسایی

هێچ کاتێ تاکە هۆکارێک نەبۆتە هۆی لە نێوچوونی ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکان و، بەرەو هەڵدێرچوون و دارمانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیش تەنها لەبەر گەندەڵی سوڵتانەکانی نەبووە، هەر چەندە سوڵتانەکان بەرپرسیاریەتییەکی زۆریان دەکەوتە ئەستۆوە لە سۆنگەی ئەو لاوازییە دەروونییەی کە وردەوردە یەخەی سیستەمە تۆکمە حکومییەکەی سلێمانی قانوونی دەگرت، کە کاتی خۆی بە راستگۆیی و لێهاتووییەوە لەلایەن ئەو کـــویلە بە دیاری هێندراوانەوە بەڕێوە دەچوو کـــە لە قـــوتابخـــانە تایبەتیەکاندا پەروەردە دەکران. وردەوردە، کە سیستەمی ئیداری نێوبراو کەوتە دەست سـوڵتـانە بێ تواناکـانەوە و چوارچێـوە وڕیوشـوێنەکـان ژێرپێ نران و لە بیـرکران و خرم خرقینە جێی خۆی کردەوە، ئیدی دەزگـای ئیداریـی عوسمـانی نەیدەتوانی سەدی سەد لە ئەستۆی کۆیلەکانی پێشو بێت. هەروەها لەو کاتەوەی کە سەربازانی یەنیچەری رێگەیان بە خۆدا ژن بێنن، جەربەزەو جەنگاوەریی خۆیان لە دەست دا و وەک خەڵکێکی تەمبەڵ و گەندەڵیان لێهات کە ئیتر وەک سەربازێکی راستەقینە چاوەڕاونی شەڕیان لێ نەکرا. ئەمەش هەر درێژەی کێشا تا سەرئەنجام سوپای عوسمانی کە سەردەمێک وەک فاکتۆرێکی گرنگ و چارەنوسسازی نێو هەیکەلی ئیمپراتۆرییەت و شکۆو مەزنایەتی ئیمپراتۆرییەتەکە لە قەڵەم دەدرا، بوو بە فاکتۆری سەرەکی ئەم دارمانەی کە تووشی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بوو.

لەو بارەیەوە زۆر هۆکاری دیکە هەبوون و دەکرێ لە وانە باس لە: کڕین و فرۆشتنی پلە و پایە ئیـدارییـەکـان، بڵاوبوونەوەی گـەندەڵی و بەرتیل وەرگـرتن کـە تەواوی هێزەکانی دادەچۆڕاندو، هەروەها پان و بەرینیی سنوری ئیمپراتۆرییەت، کە بەڕێوە بردنیی لە ناوچە دووردوورەکانداو لە نێو نەژادە بیانییەکاندا دژوار دەکرد، بکەین،

وێڕای بوونی هیماکانی ئەم دارمانە، کە لای ئەوروپاییەکان وەک رۆژی روونـاک وا بوو، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە سەرەتای سەدەمی نۆزدەهەمدا لە کیشوەری ئەوروپا زۆر شوێنی وەکو یۆنان،دوورگەری کێرت، سربستـان ، بۆسنیا ، هەرزە گۆڤینیا، بولغاریا و ئەلبانیای ئێستا و نێوەی ویلایەتی مۆنتینیگرۆی لە ژێر دەستدا بوو. لە باشووری رووباری دانۆبیش، ویلایەتی مـۆڵداڤـیا و والاشی و بەشێک لە بسارابی کـە وڵاتی رۆمـانیـای ئێسـتـا پێک دێنن ، باج و سـەرانەیان دەدایە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی . کۆی گشتی دا ئەو شوێنانەی کە لە ئەوروپا لە ژێر

دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا بوون، ڕووبەریان دەگەیشتە (٤٠٠)هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشە، بەڵام پان و بەرینیەتی ئیمپڕاتۆرییەت تاکە فاکتۆری زیندوویەتی و مانەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی نەبوو و، بگرە جۆرە هەستێکی قووڵ بوو کە بە پێی قسەی ئیسکات فیتز جیراڵدی نووسەری ئەمەریکایی: *«ئەورووپا، یەک ناوچەی جوگرافیایی و ڕوسیاش یەک گەل بوو، بەڵام ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی خاوەنی جۆرە ئامانجێک بوو»*.

هەرچەند کە چەند ساڵ جارێک خاکی ئەو وڵاتە پارچەیەکی لێ جیادە کرایەوە، بەڵام ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی وەک جاران درێژەی بە ژیان دەدا و تورکەکان لەو باوەڕەدا بوون کە تا هەتایە ئەو ئیمپڕاتۆرییەتەیان دەمێنێ و ڕەنگبێ ئەم هەستە لە سرووشتیانەوە سەرچاوەی گرتبێ. دیپلۆماتێکی بەرجەستەی تورک بە نێوی فوئاد پاشا، بە باڵوێزی یەکێ لە وڵاتە بیانییەکانی گوتبوو: *«وڵاتی ئێمە لە هەموو وڵاتێک بە هێزترە، ئێوە هەوڵ دەدەن لە دەرەوەڕا بیڕووخێنن و ئێمەش لە ناوەڕا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هەر وەکو خۆیەتی و هەرگیز دانارمێ»*.

* * *

لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم (سەرەتاکانی سەدەی ١٣ ی کۆچی)، سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەم لە تەمەنی پەنجاونۆ ساڵیدا و لە کاتێکدا کە یازدە ساڵ بوو دەسەڵاتی دەگێڕا، دیارییەکی بەدەست گەیشت کە لە ڕادەبەری خۆشحاڵی کرد و گڕوتینی پێبەخشێ. ئەم دیارییە کچێکی پرچ زەردی فەرەنسی بوو، لوتێکی بچوکی هەڵگەڕاوەو دوو چاوی شینی گەورەو ودەموو لێوێکی بچووکی وەک خونچە گوڵ و چەنەگەیەکی خڕ (کە نیشانەی هێزو ئیرادەی مرۆڤە) ی پێوە بوو. کاتێ ئەم کچە جوانە لە کەلیسایەکی فەڕەنساوە بە کەشتی دەچووە لای دایک و باوکی کە خەڵکی نۆڕماندی بوون و لە دوورگەی مارتینیک نیشتەجێ ببوون، لە لایەن چەتە دەریاییە ئەلجەزایرییەکانەوە دزرا و پێشکەشی والی تورکی ئەلجەزیرە کرا. والیی نێوبراویش بە دیاری بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەمی نارد. ئەم کچە نێوی *(ئێمێ دووبوک دووریوری)* بوو کە نێوە بچوکەکەی مانای (مەحبوبە) ی دەگەیاند و دواتر بە (نەخشی دڵ) بە نێوبانگ بوو. نزیکترین برادەریشی ژۆزێفینی کچەمامی بوو، کە کچێکی پرچ ڕەشی خۆش دەڤ بوو و ئەویش لە دوورگەی مارتینیک دەژیا. هەر چەندە چارەنووس وایکرد ئیتر ئەم دوو ئامۆزایە هەرگیز یەکتری نەبیننەوە، بەڵام هەر کام لەو دوو ئافرەتانە بە شێوەیەک بوونە دەسەڵاتدارترین ئافرەتی وڵاتەکانیان و ڕۆڵێکی مەزنیان لە مێژوودا بینی. ئێمێ پاشماوەی ژیانی خۆی سەرەتا وەک هاوسەری سوڵتان عەبدولحەمید و دواتر وەک برادەر و مەحرەمی سوڵتان سەلیمی سێیەم و سەرئەنجام وەک «شاژنی دایک»ی مەحمودی دووەم، کە بە«چاکسازی کار» نێوبانگی دەرکرد، لە حەرەمسەرا دا بردەسەر. لەلایەکی دیکە ئامۆزا پرچ ڕەش و وریاکەی واتا ژۆزێفین *تاشەردۆپاژری*، بووبە هاوسەری *ناپلیۆن بۆناپارتی* ئیمپڕاتۆری فەڕەنساو، بوو بە یەکێک لە ئافرەتە بەنێو بانگەکانی مێژوو.

دەبێ ئێمێ کچێکی لە ڕادەبەدەر وریا و زیرەک بووبێت، چونکە زۆر بەخێرایی

توانی خۆی لەو ژیانە ساکارو سەختەی کەلیسا، کە پێشتر لە گەڵیدارا هاتبوو، دووربخاتەوە و خۆی لەگەڵ ژیانی نێو کۆشک و تەلاری عوسمانی کە کەنیزەکە جوانکیلەکان چندین کاتژمێر بەنیوەڕووتی لە گەرماوە تورکییەکانیدا ئاوی بۆن خۆشیان بە یەکدی دادەکرد، بگونجێنێ. پێدەچێ زوو لەوە گەیشتبێ کە بەرگریکردن لە بەرامبەر چارەنووسدا بێهودەیە و دەبێ بەوچارەنووسە رازی بێت کە تووشی هاتووە.

کەنیزەکەکانی حەرەمسەرا، کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەتی جوانی و ناسکیی (ئێمێ)وە و لەو ڕووەوە نازناوی (نەخشی دڵ) یان لەسەردانا. ئەویش کە خاوەنی زەوق و سەلیقەی تایبەتیی فەرەنسایییەکان بوو، بێ دواکەوتن خۆی بە جلی تورکی لەپابەت کراس و شەڵواری قەدیفەو سەردەستەی کەوڵە قووز کلاوێکی خڕ کە هەمیشە لەسەر لایەکی سەری دادەنا، ڕازاندەوە. پرچەزەرد و جوانەکەی خۆی کە تاسەر ستمی دەهات، بە لیرەی زێڕ ڕازانبدبۆوە، ئەم کارەشی بە شێوەیەک کردبوو کە پیاو کاتێ چاوی پێی دەکەوت پێی وابوو ئەو لیرە زێڕانە بە ڕێکەوت کەوتوونەتە نێو خەرمانەی پرچییەوە. بەڵام لەراستیدا هەر یەک لەو لیرانە بە زنجیرێکی زۆر ناسک، بەتاڵە مووەکانییەوە نووسێندرابوون.

زۆری پێ نەچووکە ئەو کچە فەرەنسایییەی کە تەرکی دنیای کردبوو و ژیانێکی زۆر ئاسایی و پڕ لە دوعاو پاڕانەوەی هەبوو، لەڕێورەسمێکی پڕ شکۆدا بەرەو ژووری نووستنی سوڵتان عەبدولحەمید رەوانەکرا. پێویست ناکا باس لە کەیف و خۆشی سوڵتانی بە تەمەندا چوو بکەین.

بۆ ساڵی دواتر واتا ١٧٨٣(١١٩٧ی کۆچی)، ئێمێ کوڕێکی بوو کە نێویان لێنا مەحمود و ئەمەش بووە هۆی خۆشحاڵیی لە رادەبەدەری سوڵتان عەبدولحەمیدی بە تەمەن داچوو، کە تا ئەو کاتە تەنها کوڕێکی بەنێوی مستەفا هەبوو.

دەبێ مەراسیمی منداڵبوون لە حەرەمسەرادا، بۆ ئافرەتێکی وەکو ئێمێ کە سەخت پابەندی دابونەریت و مەزهەبی کاتۆلیکی بوو، زۆر ئەستەم بووبێت. هەر کە کاتێ منداڵبوونی ئێمێ نزیک بۆوە، سەرەتا لانکی منداڵەکەیان هێنایە ژوورەوە کە سەرو خواریان لە نووشتەو دوعا گرتبوو وقورئانێکیشان خستبۆ نێویەوە، ئینجا بۆ پاراستنی منداڵ لە چاوزارو بەڵاو نەگبەتی، ئافرەتانی حەرەمسەرا بەدەم دوعا خوێندنەوە دەستیان کردبە ئەسپەندەر سووتاندن. دوایی مامانەکە کورسییەکی دارگوێزی تایبەت بە منداڵبوونی هێنا، کە پێشەکەی وەک ناڵە ئەسپ دروست کرابوو و، ئێمێ یان لەسەردا نیشاند. مامانەکە فرمانی پێدا توووند دەسکەکانی کورسییەکە بگرێت، ئینجا بەدەم «الله اکبر» گوتنەوە منداڵەکەی لە زگی ئێمێ دەرهێنا. هەر کە زانیان کوڕە، هەر هەموو ئەو ئافرەتانەی لەوێ بوون، دەستیان کرد بە هەلهەلە لێدان و ئێنجا ئێمێ یان بردەسەر جێگەو جوان دایانپۆشی و سەلکە پیوازێک و مێخەکێک و چەند خەرمووڕگێکیان وەک قوربانی لە تەنیشتی داناو قورئانێکیشیان لە ژوور سەری دانا. منداڵەکەیان شوشت وسێ دەنکە ئەسپەندەریشیان لە کونی ناوکی نا و دوایش کردیانە مەلۆتکە.

ئێستا بەشە ناخۆشەکەی تێپەڕی بوو، شەش ڕۆژ دوای منداڵبوون، ئێمێیان وەک بووک ڕازاندەوە و ئافرەتانی حەرمسەراش بۆ پیرۆزبایی لێکردنی هاتنە لای، بەڵام لەهەمانکاتدا ئێمێ مافی ئەوەی نەبوو تا چلەی نەچێ بە منداڵەوە بێتەوەدەر. کە چلەی چوو، لەکاتێکدا کە بۆنی عودی سوتاو ئەو ناوەی پڕ کردبوو و دەنگی مۆسیقایەکی هێمن دەبیسترا، مامان هات و منداڵەکەی لە گەرماوی مەرمەڕدا شوشت. بۆ ئەوەی لە داهاتوودا منداڵەکە لە چاووزار بەدوور بێت، مامان چند هێلکەیەکی هێنان و دوای ئەوەی هەندێ دوعای بەسەردا خوێندن، شکاندنی و منداڵەکەی پێ شوشتن . ئێنجا بۆ ئەوەی منداڵەکە نەگرییەت، لە جیاتی مەمکەمژە، ڕۆنی بادام، یان گوڵە خەشخاشیان لە پارچە قوماشێک دەکردو دەیانخستە دەمی منداڵەکەوەو بەم شێوەیە منداڵەکە خەوی لێدەکەوت.

* * *

هەرچەندە بۆ ئێمێ منداڵبوون کارێکی ناخۆش بوو، بەڵام لە دایکبوونی ئەم کوڕە، سوڵتانی لەڕادەبەدەر خۆشحال کرد وئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئێمێ لە کۆشکدا پێگەیەکی باش و جێی متمانەی دەست کەوێ. لەوێ بەدواوە سینەپەروەری دایکی مستەفا، لەبیر کرا و ئێمێ بوو بە ئافرەتی جێی سەرنج و تاقانەی دیدەی سوڵتان .عەبدولحەمید وا شاگەشکە ببوو کە بەپەلە فرمانی دا بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی گوڵە لالە لە باخەکانی کۆشکی سەڵتەنەتدا ڕێک بێخن و لە نێوەڕاستی باخدا، کۆشکێک لەنەبات دروست بکەن و بەگەڵای دارخورما کە هێمای فراوانییە، بیڕازێننەوە. لە هەموو لایەک قەفەسی بولبول و کەناری بە درختەکانەوە کرابوو، حەوزو ئافورە جوانەکانیش فەزایەکی دڵگیریان یان خۆڵقاندبوو.

دوایی پێشبڕکێی زۆرەوانی لە گۆڕەپانی ئەسپ تاوداندا بەئەنجام گەیشت و بێ ئەوەی کەس بتوانێ ئێمێ ببینێ، لەپشت پەردەیەکی تۆڕەوە ئەو ئاهەنگەی دەدیت و لە کۆتایشدا (٥٠٠) مەڕیان سەربڕین و بەسەر هەژراندا دابەشیان کردن.

بێگومان ئێمی کەیفی بە سوڵتانی بە تەمەن داچوو هاتبوو؛ چونکە عەبدولحەمید کابرایەکی خوێندەوار بوو و، بۆ هەتاهەتایە نەریتی ژیان لە نێو قەفەس و زیندانیکردنی شازادەکانی یاساغ کردبوو.هەروەها ئازادییەکی تەواویشی بە سەلیمی برازای بەخشیبوو کە لەهەمانکاتدا میراتگری تاج و تەختی عوسمانی بوو.(١) سەلیم کە هاوتەمەنی ئێمێ بوو، دوای مردنی عەبدولحەمید لە ساڵی ١٧٨٩(١٢٠٣ی کۆچی) بە نێوی سوڵتان سەلیمی سێیەمەوە لەسەر تەخت دانیشت. سەلیم شەیدای بیروباوەڕی ئازادیخوازانە و لیبراڵی سوڵتانەی فەڕەنسایی ببوو. کاریگەرییەتی ئاشکرای ئێمێ بەسەر سوڵتانی نوێوە دەبیندراو هیچ شتێک نەیدەتوانی ئەوین و دڵبەندیی ئەو دووە بە وڵاتی مەزنی فەڕەنسا لە نێوبەرێت، بەڵام ڕەنگبێ ئەم ئەوین و دڵبەندییە دوای سێ مانگ لە بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لەلایەن سەلیمەوە لەنێوچووبێت و ئەوەش کاتێک بوو، کە دانیشتوانی پاریس زیندانی باستیل یان داگیرکرد. بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە کە تەکانی ئەم ڕووداوە و هاوکات مەترسیی هەڵگەڕانەوەی یەنیچەرییەکان، سەلیمی ناچار کردبێ کە سوپایەکی نوێ

لە شێوەی سوپای فەڕەنسا دابمەزرێنێ، کە تەنیا فرمانیان لە خودی سوڵتان وەردەگرت و سەدی سەد پێی وەفادار بوون.

ئەم کارە بووە هۆی نارەزایەتی یەنیچەرییەکان، بەڵام لەو جێگەیەدا کە ئەفسەرانی تۆپخانەی فەڕەنسا بە فێرکردن و راهێنانی سوپای نوێوە خەریک بوون (*تەنانەت ناپلیۆنی لاو داوای ئەوەی کردبوو کە بەشداری لە فێرکردن و راهێنانی سوپای تورکدا بکات، بەڵام داواکەی رەتکرابۆوە*)و ئەفسەرانی هێزی دەریایی بەسەر لەنوێ رێکخستنەوەی هێزی دەریایی تورکیاوە خەریک بوون و ئەندازیارە فەڕەنساییەکان بە دامەزراندنی فابریکەیەکی تۆپ دروست کردن بەناوی «تۆپخانە»وە خەریک بوون و وانە سەربازییە فەڕەنساییەکان وردەگێڕدرانەسەر زمانی تورکیەوە، یەنیچەرییەکان بەشێوەیەکی کاتی خۆیان بێدەنگ کرد. سەلیم بەهاندان ئیمێ یەکەم بڵاوکراوەی هەفتانەی تورکیای بەناوی «ئاژانسی رۆژهەڵات»(٢) دامەزراند، کە بێگومان سوڵتانەی فەڕەنسایی لە خوێنەرە هەرە تامەزرۆکانی بوو.

* * *

پەیوەندییەکانی نێوان ئیمێ و سەلیم مەسەلەیەکی سەرنجراکێشی هێناوەتە ئاراوە و بەشێوەیەکە کە تائێستاش هیچ مێژوونووسێک نەیتوانیوە وەڵامی بۆ بدۆزێتەوە، یان بەتەواوەتی لە کون کەلەبەرەکانی بگات. لەو سەردەمەیدا کە ئیمێ بووە سوڵتانەی عەبدولحەمید، ئەو دووانە (واتا سەلیم و ئیمێ) یەکدییان دەناسی و عەبدولحەمیدیش هەموو جۆرە ئازادییەکی سەبارەت بە هەستان و دانیشتن لەگەڵ ئیمێ دا بە سەلیم بەخشیبوو، بەشێوەیەک کە سەلیمی لاو، لای ئەم ئافرەتە نازدارە کە بێ شک خۆی داپۆشیوەو لەژێر چاودێرییەکی توونديش دابووە، فێری زمانی فەڕەنسایی و وانەی سیاسی بووە. هەردووکیان لە تەمەنی بیست ساڵیدا بوون و لەرووی جوانیەوە سەرنجراکێش بوون و کەیفیان بە ئەدەبیات دەهات. سەلیم خاوەنی زەوق و سەلیقەیەکی فراوان بوو و لەو شازادانە بوو کە هەیکەل ئاکارەکانی لەهی ئافرەتان دەچوو. لامارتینی شاعیرو دیپلۆماتی فەڕەنسایی لەباسی سەلیمدا، بە شازادەیەکی تەنها، خەیاڵی، هەستەورو شەرمن، بە دوو چاوی بادامی و دەموچاوێکی درێژو پیاوێکی جیدی ناوی دێنێ.چەندین کاتژمێر لە گۆشەیەک دادەنیشت گوێی بۆ ئیمێ رادەدێرا کە کتێبی بۆ دەخوێندەوە.

بەڵام ئیمێ ئافرەتێکی خوێنگەرمی فەڕەنسایی بوو کە لە هەرەتی جوانی و لاویەتی دا ناچاربوو تەواوی ژیانی خۆی لە حەرمسەرادا بەسەربەرێت. سەلیم رووی لە حەرمسەرا وەرگێڕابوو و بەهیچ شێوەیەک بەلایدا نەدەرۆیشت و ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە هەرگیز نەبێ بە باوک. کەواتا دوور نییە ئەگەر بڵێین ئەم دووە دوای مەرگی عەبدولحەمید عاشقی یەکدی بووبن و پەیوەندییەکیشیان لە نێواندا هەبووە. راستییەکی سەرسوڕهێنەری دیکەش هەیە و ئەویش ئەوەیە، بۆچی سینەپەروەری دایکی مستەفای جێگری رەسمیی عەبدولحەمید، لەسەردەمی دەسەڵاتی سەلیمدا بە یەکجاری لە گۆڕەپانەکەدا نەماو ون بوو؟

ڕەنگبێ لەو جێگەیەیرا کە سەلیم تاکە لەمپەری سەر ڕێگەی تاج و تەختی کوڕەکەی بوو، دەستی دابێتە پیلان گێڕان، بەڵام مێژوو لەمبارەیەوە بێدەنگەو تەنها شتێک کە باسی لێدەکات ئەوەیە؛ ئێمێ کاریگەرییەتییەکی لە ڕادەبەدەری بەسەر سەلیمی سێیەمەوە هەبووە.

کەواتا دەبینین ئەو کچە پرچ زردە فەڕەنساییە، کە سەرەتا وەک کەنیزەک و دواتر وەک هاوسەری سوڵتانی بە تەمەندا چووی لێ دێت، نەک تەنها هاوسەرێکی وەفادار ودایکێکی فیداکار بووە، بگرە لە بەرامبەر ئەو ئازارو مەینەتییانەی کە چەشتبوونی، بوو بەدڵداری شازادەیەکی تێ گیشتوو و سوڵتانێکی ڕۆشنبیر، کە ئێمێی دەپیەرست و لەبەر خاتری ئەو ڕووی نەدەدایە هیچکام لە ئافرەتانی حەرەمسەرا.

* * *

لەگەڵ هەموو ئەوانەدا سەلیم لە سەردەمی سەڵتەنەتەکەیدا بەختی نەبوو؛ هەر کە فەڕەنساییەکان دەستیان بەسەر زیندانی باستیل داگرت و شۆڕشی مەزنی فەرەنسا دەستی پێکرد، کاترینی مەزنی ژنە قەیسەری ڕوسیا، دەرفەتی لە کیس نەداو چی لە دەستی هات کردی بۆ ئەوەی نائارامی لە وڵاتی عوسمانیدا دروست بکات. لە ساڵی ١٧٩٠(١٢٠٤ی کۆچی)، کاترین بڕیاری دا قەڵای (ئیسمەعیل) داگیر بکات، کە بەیەکێ لە پێگە گرنگ و چارەنووسسازەکانی عوسمانی لەسەر لێواری ڕوباری دانۆب لەقەڵەم دەدرا، شەست کیلۆمەتر لە دەریای ڕەش دوور بوو و لەلایەن بنکەیەکی سەربازی (٤٠) هەزار کەسییەوە دەپارێزرا.(پۆتمەکین)ی فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی ڕوسیا کە عاشقی کاترینیش بوو، بەدوای ژنەڕاڵ سوڤارۆفی دانارد و فەرمانێکی کورتی پێدا کە ناوەڕۆکەکەی بەم شێوەیە بوو: «بەهەر نرخێک بێت *قەڵای ئیسمەعیل داگیر بکەن.*»

سوڤارۆف، لەرووی سەربازیەوە خاوەنی عەقڵ و هۆشێکی بێ وێنە بوو و سەربازێکی توندوتیژو دڕ بوو کە لە هەموو ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمەکاندا هاوبەشیی سەربازەکانی خۆی دەکردو لەم ڕووەوە سەربازەکانی دەیانپەرست.

دروشمێکی بەنێو بانگی هەبوو کە سەربازەکانی بە بەردەوامی گوێیان لێدەبوو، سوڤارۆف پێی دەگوتن:«بڕۆنە پێش و زەبر بوەشێنن». زۆر کەیفی بەوە نەدەهات کە تەقە بکات و دەیگوت گوللە شێتە و سەرنێزە قارەمانی بەرەی جەنگە. شەش ڕۆژ دوای ئەوەی کە سوڤارۆف گەیشتە دەوروبەری قەڵای ئیسمەعیل، وەک هەمیشە فەرمانی هێرشبردنی دا و بەسەربازەکانی ڕاسپارد کە: «*براینە، یەخسیر مەگرن و بەزەییشتان بەکەس دانەیەتەوە، چونکە ئازوقەو خۆراک بەشمان ناکات و لەم ڕووەوە گوشارمان لەسەرە.*»ئێنجا هێرش دەستی پێکرد و دوای کوشتارێکی خوێناوی، هێزەکانی ڕوسیا دەستیان بەسە قەڵاکە داگرت.

لەم جەنگەدا(٣٤)هەزار سەربازی تورک گیانیان لەدەستداو کەش و هەوا بە ڕادەیەک سارد بوو کە نەتوانرا لاشەی کوژراوەکان بنێژدرێت. سەهۆڵە ئەستوورەکەی سەر ڕووباری دانۆبیان کون تێ کردو شەش ڕۆژی تەواو لەو کونانەوە لاشەی کوژراوەکانیان خستنە نێو ئاوی دانۆبەوە. سوڤارۆف کە وەک پۆتمەکین

کابرایەکی کەم دوێ بوو، سەرکەوتنەکەی خۆی بە رستەیەکی کورت بە فەرماندەکەی ڕاگەیاند: *«ئاڵای روسیا بەسەر بورجەکانی قەڵای ئیسمەعیلدا دەشەکێتەوە.»*
کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە سەنپترسبۆرگ، کاترین ئەرکی وەستاندنی بەریتانیای کەوتە ئەستۆ، کە هەوڵی ئەوەی دەدا لەو بەینەدا ناوبژیوانی بکات. بۆیە بە زەردەخەنەیەکی گاڵتە ئامێزەوە بە باڵیۆزی بەریتانیای گوت:*«هیوادارم ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ لە سەنپترسبۆرگ وەدەرمان بنێن، ڕێگەمان پێ بدەن لە قوستەنتەنییە نیشتەجێ بین!»*
پێ دەچوو مەحاڵ بێت کەس بتوانێ بەرلەو دارمانە بگرێت کە تووشی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی سەلیم ببوو، بەڵام ئێمێ هێشتا هەرچاوی هیوای لە فەڕەنسا بڕیبوو و چاوەڕێی ئەوە بوو کە فەڕەنسا یارمەتییان بدات.
سەلیم لە زومرەی ئەو فرمانڕەوایانەدا بوو کە بەر لە هەمووان دانیان بە کۆماری فەڕەنسادا هێنابوو و سەرەڕای ئەوەی کە لە سێدارەدانی لویسی شانزدەهەم و شاژن ماری ئانتوانت، ئێمێی زراوبردو کردبوو، سەلیم دوای ماوەیەک دوودڵی، یەکەم باڵیۆزی خۆی لە ساڵی ١٧٩٧(١٢١٢ی کۆچی)دا ناردە فەڕەنسا. لەو کاتەدا ناپلیۆن بۆناپارت و ژۆزێفینی ئامۆزای ئێمێ، ببوون بە هاوسەری یەکدی و ئێمێ و ژۆزێفین لەگەڵ یەکتریدا نامەیان دەگۆڕییەوە.
فەڕەنسا بە گەرمی پێشوازیی بە باڵیۆزی تورکیا کرد، هەرچەندە ناپلیۆن لە زووەوە سەبارەت بە قوستەنتەنییە گوتبووی: *« قوستەنتەنییە، گەورەترین پاداشتێکی ستراتیژیکییە کە ئەورووپا دەتوانێ بیداتە یەکێک.»* بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دۆستایەتیی نێوان فەڕەنسا و عوسمانی دە ساڵی خایاندو ئەم دۆستایەتییەش نەک تەنها لەسایەی ناردنی ڕاوێژکار و پسپۆرە فەڕەنساییەکان رووەو تورکیا پتەوتر بوو، بگرە کاریگەرییەتی هاوسەری ناپلیۆن لەپاریس و ئامۆزاکەی لە قوستەنتەنییە رۆڵێکی گرنگیان لەم پەیوەندییەدا هەبوو.
ناپلیۆن دوای ئەوەی کە هێرشی کردەسەر باکوری ئیتالیاو کۆتایی بە تەمەنی درێژی کۆماری ڤینیز هێناو دەستی بەسەر دورگەکانی ئیوانی داگرت، بوو بە دراوسێی عوسمانی و هەمیشە سەبارەت بەو دورگانەی کە ئەویان خستبۆ دراوسێیەتی عوسمانییەوە دەیگوت: *«گرنگی ئەم دورگانە بۆ ئێمە لەسەرجەم خاکی ئیتالیا پترە.»* ئەم بابەتە ببووە هۆی خۆشحاڵی سەلیم و ئێمێ بەبێ ئەوەی ئاگایان لەوە بێ کە هەرلەو کاتەدا ناپلیۆن لەنامەیەکدا بۆ بەردەم شاندی بەڕێوەبردنی فەڕەنسا نووسیبووی: *«هەوڵدان بۆ پاراستن و هێشتنەوەی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی بێهودەیەو هیچ سودێکی ئێمەی تێدانییە، پێویستە بەچاوی خۆمان دارمانەکەی ببینین.»*
بارودۆخی نێوخۆیی ئیمپڕاتۆرییەتەکەی سەلیم، ئەم بۆچوونەی ناپلیۆنی دووپات دەکردەوە؛ دەسەڵاتی ناوەندی لە قوستەنتەنیە، رووەو ئیفلیجبوونی یەکجارەکی بوو، والیی ویلایەتە گەورەو دوردەستەکان وەک دەسەڵاتدارانێکی سەربەخۆیان لێهاتبوو و، هەر بەناو سەربە پایتەخت بوون. میسر ئیدی لە ژێر دەسەڵاتی سوڵتانە

مەملوکەکاندا کە وەک یەنیچەرییەکان گەندەڵ ببون، نەمابوو و سەلیم هیچ بوون و دەسەڵاتێکی لە قاهیرە دانەبوو.
لە مانگی تەممووزی ساڵی ١٧٩٨(سفر–ی ١٢١٣ی کۆچی)، گورزەکە وەشێندرا؛ ناپلیۆن بە سوپایەکی (٤٠) هەزار کەسییەوە پێی نایە میسرەوە و ئەوەش لەکاتێکدابوو کە هێشتا میسر بەیەکێ لە ویلایەتەکانی عوسمانی لەقەڵەم دەدرا. سەلیم ناچاربوو بەگژ فەرەنسایییەکاندا بچێت و تەنانەت کاتێ بەدیارکەوت ناپلیۆن مەبەستی ئەوە بووە زەبرێک لە بەریتانیا بدات، نەک عوسمانییەکان( چونکە *ناپلیۆن بەسەربازەکانی خۆی گوتبوو: «مەبەستمان وەدەرنانی بەریتانیاییەکان لە ناوچە دەستبەرسەراگیراوەکانی رۆژهەڵاتیان و بەتایبەت بنکۆڵکردنی پێگەکانیان لەسەر لێواری دەریای سوورە»، هەروەها بە بوغرِاییەوە گوتبووی:«من ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیا تێکدەشکێنم.»*)،ئەم گرژییە خاوەنبۆوە.
لەوکاتەدا بەریتانیا هێشتا نەببوو بە ئیمپراتۆرییەت و پێکهاتبوو لە زەنجیرە نوێنەرایەتیەکی بازرگانی و هەندێ قەڵاوپێگەی سەربازی. ناپلیۆن دەیزانی ئەگەر بێتو میسر بکەوێتە ژێردەسەڵاتی فەرەنساییەکانەوە، ئەوا بەکردەوە بەریتانیاییەکان پێگەیەکی سەربازیی گرنگ لە کیس دەدەن، کە بۆ داکۆکیکردن لە هیند بایەخێکی فراوانی هەیەو رێگەیەکی بازرگانی کورتترو کەم خەرجتر لە رێگەی دەریایی ئەفریقیایە. سەرکەوتنی دەریا سالار نیلسۆن لە زارکی رووباری نیل بەسەر گەلە کەشتیی فەرەنسادا و پچرانی پەیوەندی سوپای ناپلیۆن لەگەڵ فەرەنسادا، بووە مایەی خۆشحاڵی و دڵگرمیی سەلیم، چونکە دەیزانی فەرەنسا هیچ گەلە کەشتیەکی دیکەی نییە کە بتوانی لە رێگەیانەوە یارمەتیی ناپلیۆنی پێبدات. بۆیە بەمەبەستی هاوپەیمانییەتی و یەکێتییەک لەگەڵ بەریتانیادا، لەگەڵ ئینگلیزەکاندا دەستی بەدانوستان کرد.

* * *

بەدرێژایی ئەو ساڵانە، ئێمێ بەیارمەتی مامۆستایانی فەرەنسایی، بەوردی و لێهاتووییەوە مەحمودی کوڕی پەروەردە دەکرد. ئێستا مەحمود ببووە لاوێکی باڵا بەرزی قۆزو بەتوانا، کە هەرچەند بەرەسمی جێنشینی یاسایی سەلیم نەبوو، بەڵام ئێمێ لەترسی ئەوەی نەبادا زیانێکی پێبگات بەوردی پارێزگاریی لێدەکرد، چونکە هێشتا دایکی مستەفا پێیوابوو کە مەحمود لەمپەری سەر رێگای بەدەسەڵات گەیشتنی کوڕەکەیەتی و چەند جارێکیش هەوڵی دەرمان خواردکردنی دابوو. ئەگەر بهاتایەو ئێمێ ئافرەتێکی دووربین نەبوایەو ژەهرناسێکی کارامەی بۆ جەڕباندنی خواردنەکانی نێو کۆشک دانەمەزراندبایە، بێگومان حەوت زەمان بوو مەحمود ئێسکیشی نەدەما. لە هاوینی ساڵی ١٨٠٧(١٢٢٢ی کۆچی)یش، کە ململانێی نێوان سەلیم و هێزەکانی یەنیچەری ئاشکرا بوو و چووە قاڵبی هەڵگەڕانەوەی سەربازییەوە، هەمدیس چیوای نەمابوو مەحمود گیانی خۆی لەدەست بدات.
لەو کاتەدا بەشی هەرەزۆری هێزەکانی یەنیچەری هاوشانی «سوپای نوێ» لە لێوارەکانی رووباری دانۆب دەجەنگان. سەلیم زۆر ناشیانە، وایزانی هێندە بەهێز

بووە کە دەتوانی بە گواستنەوەی ژمارەیەک لە یەنیچەرییە لاو و بەهێزەکان، پەرە بە سوپا نوێیەکەی خۆی بدات. بەڵام پاشماوەی هێزەکانی یەنیچەری کە لە قوستەنتەنییە مابوونەوە، بەبیستنی ئەم هەواڵە مەنجەڵەکانی خۆیان سەرەونخون کردو ئەمەش بەمانای ئەوە بوو کە ئامادەنین خواردنی سوڵتان بخۆن. دواتر هەندێ نوێنەریان ناردەلای موفتی گەورە و داوایان لێکرد فتوایەکیان لەسەر ئەوە بۆ بدات کە:«*ئاخۆ سزای کەسێک کە سوپایەکی نوێی جیا لە سوپای یەنیچەری دامەزراندبێ و بەنیازە بە لاوازکردنی یەنیچەرییەکان، بەهێزی بکات، چیە؟*.»

دوای چەند رۆژ لە پیلانگێڕیی پشتی پەردەو دوژمنایەتی، موفتی گەورە فتوایەکی بەم ناوەرۆکە دەرکرد کە:«*لەو جێیەیڕا کە سوڵتان هەستاوە بە بڵاوکردنەوەو برەوپێدانی شێوازی کافرەکان و بەنیازە سوپای یەنیچەرییەکان کە پارێزەرانی راستەقینەی ئیسلامن لەنێوبەرێت، بۆیە بەپێی دەقی راشکاوانەی قورئان سزای مەرگی بەسەردا* دەسەپێندرێت.»

بە بیستنی ئەم فتوایە، یەنیچەرییەکان بەخۆ کەوتن و بڕیاریاندا سەلیم لەسەر تەخت وەلابنێن، بەڵام هەرکە سەلیم ئەو هەواڵەی بیست، خێرا چووە قەفەسەوەو زڕبراکەی خۆی مستەفای هێنایەدەرو بەنێوی مستەفای چوارەم کردی بە سوڵتان ورایگەیاند کە گوێڕایەڵی فرمانەکانی دەبێ.

لە کاتێکدا کە مستەفا سەری لەم کارە سڕما بوو، سەلیم هەوڵیدا بە خواردنی قاوەی ژەهراوی خۆی بکوژێت، بەڵام کە مستەفا ئەمەی زانی رێگەی پێنەداو فنجانە قاوەکەی لەدەست دەرهێناو شکاندی. کاتێ یەنیچەرییەکان هاتنە نێو بابی عالییەوە، مستەفا لەسەر تەخت دانیشت و سەلیمیشی زۆر بەڕێزەوە رەوانەی قەفەس کرد.

رەنگبێ ئەگەر دۆست و لایەنگرانی سەلیم هەوڵیان نەدابایە سەلیم بگەڕێننەوە سەر تەخت، ئەم مەسەلەیە لێرەدا کۆتایی پێهاتبایە، بەڵام لایەنگرانی سەلیم، مستەفا بەیرەقداری پاشای ویلایەتی (رۆستۆک)ی بوڵغاریایان لەم مەسەلەیە ئاگادار کرد. مستەفا بەیرەقدار لەرووی سامان و دەسەڵاتەوە خۆی بە قەرزاربارى سەلیم دەزانی و لەوکاتە لەناوچەیەکی دوورەدەستی وڵات خەریکی جەنگ بوو. بەیرەقدار بەبیستنی ئەم هەواڵە بەپەلە بە (٤٠) هەزار کەسەوە خۆی گەیاندە قوستەنتەنییەو لەبەرەبەیانی رۆژی ٢٨ی تەمموزی ساڵی ١٨٩٨ (٣ی جمادی الاخر-ی ١٢٢٣ی کۆچی) لە دووری سێ کیلۆمەتریی پایتەختدا جێگیر بوو.

بەیرەقدار بە یارمەتی ژمارەیەک لە پیاوانی وەفاداری سەلیم، بە نهێنی هاتە نێو شارەوەو رووە دەروازەی بابی هومایون چوو و داوای چوونە ژوورەوە و بینینی سەلیمی کرد. کاتێ لەوەڵامدا پێیانگوتن کە رێگەیان پێنادرێ بچنە ژوورەوە، بەیرەقدار و هاوەڵەکانی هەوڵیاندا دەرگاکە بشکێنن و بچنە ژوورەوە. هەروا هۆریای پەلاماردەران مستەفای بە ئاگاهێناو، مستەفا گەیشتە ئەوباوەڕەی کە تاکە رێگای رزگاربوونی ئەوەیە کە سەلیم و مەحمود بکوژێت تا وەک دواکەسی سیلسیلەی عوسمانی لەدەسەڵاتدا بمێنێ.

هەرلەوکاتەیدا کە بەیرەقدار بەشکاندنی دەروازەی بابی هومایونەوە خەریک بوو،

مستەفا فەرمانی کوشتنی سەلیم و مەحمودی دەرکردو بۆ ئەوەی لە کوشتنیشیان دڵنیا بێت، بۆ خۆشی لەگەڵ جەللادەکاندا چووە قەفەس.

کاتێ جەللادە کەرۆلاڵەکان بە پەتەوە بەرەو ژووری سەلیم دەچوون، سەلیم دەرفەتی ئەوەی دەستکەوت کە ئێمێ ئاگادار بکات و داوتر هەندێ لەمپەری لەسەر رێگەی پەلاماردەران داناو خەنجەرکەی بەرپشتیشی هەڵکێشاو توانی دووانیان لێ بکوژێت، بەڵام جەللادی سێیەم پەتەکەی خستەملی سەلیمەوەو لەماوەی چەند خولەکێکدا سەلیم رووحی لەبەردانەما.

لەگەڵ ئەوەشدا، سەلیم بووە هۆی ئەوەی کە مەحمود لە مردن رزگاری بێت؛ دوای ئەوەی سەلیم هەواڵی هاتنی جەلادەکانی بە ئێمێ دا، ئێمێ دەستی کورەکەی خۆی گرت و رێک چەند چرکەیەک بەرلەهاتنی جەلادەکان، رایانکرد.

لەکاتێکدا کە جەللادەکان لە جادەی زێریندا بەدوای دایک و کوری هەڵاتووەوە بوون، یەکێ لە کەنیزەکەکانی ئێمێ کە ئافرەتێکی گورجیی چوارشانە بوو و لە حەرەمسەرا بە (مل ئەستور) نێو بانگی دەرکردبوو، رێی لێگرتن. ئەو بەتەنهایی هیچی لەدەست نەدەهات، بەڵام راوەستا تا جەللادەکان گەیشتنە تەنیشتی و ئینجا مەقلییەکی پڕ لە پشکۆی بەسەر ودەموچاویاندا پرژاند. ئەم کارەی کەنیزەکی گورجی، چەند چرکەیەک دەرفەتی گرانبەهای دیکە بە مەحمود بەخشی و توانی بە دووکەڵکێشی یەکێ لە حەمامە لەکار کەوتووەکانی کۆشکدا هەڵبگەرێت و لەکاتێکدا کە پەلاماردەران بە دوایدا دەگەران، ئەو توانی خۆی لەنێو کۆنە جل و پەرۆیاندا، حەشار بدات.ئا لەو کاتەدا بەیرەقدار توانی دەروازەی بابی هومایون بشکێنێت و بەخۆ بە سەربازەکانیەوە بێتە نێو کۆشکی سوڵتانەوە. کەس لە باخ و کۆشک و حەوش و گۆرەپانەکاندا نەدەدیترا، سەرئەنجام بەیرەقدارو هاوەڵەکانی چوونە نێو یەکێ لە کۆشکەکانەوەو لەپشت پەردەیەکی چەرمینی ئەستوور گوێیان لەدەنگی مستەفا بوو کە هاواری دەکرد: *«ئەگەر پاشای رۆستۆک سوڵتان سەلیمی دەوێ، لاشەی ئەم بەرازە پیسەی بدەنێ.»*ئینجا لاشەی سەلیمیان لە ژوورێکی تاریکەوە لە پەنجەرەرا هەڵدایە حەوشەوە. بەیرەقدار خۆی بەسەر تەرمی سەلیم داداو دەستی کردە گریان و لەوکاتەدا رەمیس پاشا، کە یەکێ لە هاورێیانی بەیرەقدار بوو هاواری کرد: *«ئایا رەوایە پاشای رۆستۆک وەک ئافرەتان شین و بابەرۆ بکات؟ وەرن با تۆڵەی سوڵتان سەلیم بستێنین.»* ئینجا پەردە چەرمینەکەیان لادا و بەیرەقدار چاوی بە مستەفا کەوت کە لەسەر تەخت دانیشتبوو، بەبێ دوو دڵی لەسەر تەختی هێنایە خوارو لە ئەرزی دا.

لە کاتێکدا کە بەیرەقدارو هاوەڵەکانی خۆیان بۆ کوشتنی مستەفا ئامادە دەکرد، رووداوێکی سەیر روویداو بواری ئەوەی نەدا کارەکەیان تەواو بکەن. مەحمود بە جلە دادرِدادرِ بووەکانی و بەدەموچاوێکی لە تەنوو هەڵاتوو بەدیار کەوت و بەدەنگێکی نێرانە کە دواتر بەدرێژایی (٣١) ساڵی دەسەڵاتەکەی بە بەردەوامی لێی بیسترا، فرمانی بە پەلاماردەران دا چاوپۆشی لە کوشتنی مستەفا بکەن و بنێرنە قەفەسەوە. بەیرەقدار چۆکی دادان و داوێنی سوڵتانی نوێی ماچ کردو مەحمود

راستی کردەوەو پێی گوت لە تۆڵەستاندندا پەلە نەکات و بەڵێنی پێدا بۆ خۆی لە کاتێکی گونجاودا تۆڵەی خۆی لە مستەفاو ئەو یەنیچەرییانە بکاتەوە کە هۆکارو رەگ وریشەی هەموو ئەو ئاژاوەگێڕی و نائارامییە بوونە. ئەو رۆژە بەرلەوەی رۆژئاوابێت، تۆپەکانی بابی عالی نەڕاندنیان و لەسەر تەخت دانیشتنی سوڵتان مەحمودی دووەمیان بەخەڵکی قوستەنتەنییە راگەیاند.

* * *

چەندین ساڵی پێچوو تا مەحمود توانی یەنیچەرییەکان سەرکوت و ملکەچی خۆی بکات. لە رۆژانی دوای دانیشتنە سەرتەخت، بەشێک لەشاری قوستەنتەنییە بەهۆی جەنگی دژبە یەنیچەرییەکان تووشی ئاگر تێبەربوون بوو و لەگەڵ خاکدا یەکسان بوو. مەحمود، مەحمودی بەیرەقداری کردە سەرۆک وەزیران، بەڵام لێرەدا مەحمودی بەیرەقدار تووشی هەڵەیەکی گەورە بوو، بەیرەقدار بە گومانی ئەوەی هەڵگەڕانەوەی یەنیچەرییەکان کۆتایی پێ هاتووە، تێکڕای هێزەکانی خۆی جگە لە چوارهەزارکەس، ناردەوە رۆستۆک و دواتر دەرکەوت کە بەهەڵەدا چووەو هێشتا یەنیچەرییەکان لە پیلان و ئاژاوەگێڕیدا بەردەوامن و ئەو چوار هەزار کەسە گلدراوە، بۆ بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ یەنی چەرییەکاندا بەس نین.

بەیرەقدار حەزی لە چێژو خۆشییەکانی ژیان بوو، باش دەیخواردو چاکیش دەیخواردەوەو لەزەتی لەو حەرەمسەرایە گەورەیە دەبرد کە بەهۆی پۆستەکەیەوە بەنسیبی ببوو.

شەوێکیان دوای ئەوەی تێری خواردو تێریش خواردییەوە، لە ئامێزی یەکێک لە کەنیزەکەکانیدا خەوی لێکەوت، لەوکاتەدا یەنیچەرییەکان هێرشیان هێنا، کۆشکی سەرۆک وەزیرانیان گەمارۆداو خانووەکانی دەوروبەری کۆشکیان ئاگرتێ بەردا. تا ئەو دەمەی کە بڵێسەی ئاگر نەگەیشتە کۆشکی بەیرەقدار و چەند دیوارێک نەڕمان، کەنیزەک لەخەوی هەڵنەستاند.

سەرۆک وەزیران لەجیاتی ئەوەی بۆ خۆدەربازکردن لە بازنەی گەمارۆی یەنیچەرییەکان بەدوای رێگەی هەڵاتندا بگەڕێت، بەو هیوایەی کە تا گەیشتنی هێزی یاریدەدەر بەرگری بکات، پەنای بردەبەر ئەو بورجە چوارگۆشەیەی کە کەوتبۆ پشت کۆشکەکەیەوەو چەک و تەقەمەنی تێدا عەمبار کرابوو. هێزی یاریدەدەر بە سەرۆکایەتی رەمیس پاشا واتا ئەو کەسەی کە پێی گوتبوو نابێ لەسەر لاشەی سەلیم وەک ئافرەتان شین و بابەڕۆ بکات، کاتێ گەیشتەجێ کە ئاگر سەرانسەری ناوچەی نێوان کۆشکی بەیرەقدار و کۆشکی سوڵتانی داگرتبوو، بەڵام کۆنەبورج هێشتا لە جێی خۆی بوو و بەیرەقداریش بەرگری دەکرد. لەوکاتەدا گوللەیەک بە عەمباری باروت و تەقەمەنییەکە کەوت و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی عەمبارەکە بتەقێتەوە ولاشەی بێ گیانی بەیرەقدار لە ناو کەلاوەی بورجەکەدا بکەوێتە دەست یەنیچەرییە شادمانەکان.

چەند رۆژێک شەڕی نێوخۆیی درێژەی هەبوو. مەحمود بۆی دەرکەوت کە ژیانی لەمەترسیدایە و تاکە رێگەی رزگارکردنی ژیانیشی ئەوەیە کە مستەفا لە نێوبەرێت.

بۆیە فرمانیدا لە قەفەسدا خنکاندیان و بەم شێوەیە وەک دوا پاشماوەی سیلسیلەی عوسمانیی لێهات و لە مەترسی کوشتن رزگاری بوو. ئێستا مەحمود لە خەراپترین ساتەکانی ژیانیدا بوو و خۆی پێ زۆر زەلیل ودەستەوستان دەهاتە پێش چاو؛ چونکە ناچار بوو مل بۆ تەواوی داواکارییەکانی یەنیچەرییەکان کەچ بکات و فرمانێک ئیمزا بکات کە بەپێی، تێکڕای چاکسازییەکانی سەلیم پوچەڵ دەبوونەوە .
جارێکی دیکە دەستبلاوی ، زیدڕۆیی و پارە بە فیڕۆدانەکانی پێشوو دەستی پێ کردەوە و بە درێژایی سێ ساڵی دوای ئەم رووداوە، یەنیچەرییەکان جڵەوی دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییان بە دەستەوە بوو؛ بەویست و ئیرادەی خۆیان سەرۆک وەزیریان دادەنا و لایاندەدا و سوڵتانی چاکسازی کاریش جگە لە چاوەڕی بوون بۆ بەدەست هێنانی دەرفەتێکی لەبار بۆ تێک وپێک شکاندنی ئەم دوژمنە مەترسیدارانەی خۆی و بنەماڵەکەی، چیدیکەی لە دەست نەدەهات.

* * *

مەحمود پیاوێکی بەژن رێک و قۆز بوو. گەڕیدەیەکی ئینگلیزی بەنێوی *چارلزمەک فارلن* کە چەند جارێک دیتبووی باس لە «*بەژن و بالای رێک، قەلافەت و هێز، سینگی پان، دەموچاوێکی جوان و شیرین و لەهەمانکاتدا بوغرا و چاوانی تیژو کاریگەری کە لێیانەوە بەناخی بەرامبەرەکانیدا* رۆدەچوو و هەرگیز ئۆقرەیان نەدەگرت » دەکات. بێگومان سوودی لە رێنوێنییەکانی دایکی( ئێمێ) وەرگرتووەو وەک سەلیم ئازادیخوازو شەیدای فەرەنسا بووە. دانیشتن لەسەر کورسی پێ لە پاڵ دانەوە بەسەر بالیفدا باشتر بووەو لەکاتی نان خواردنیشدا لەجیاتی ئەوەی پەنجەکانی دەستی بەکاربێنێ، چەنگاڵ و کەوچکی بەکارهێناوە، بەلام لە رادەبەدەر حەزی لە خواردنەوەی مەشروب بووەو زۆربەی کات لەگەڵ نانخواردندا شامپانیی خواردۆتەوەو بۆ ئەوەی مەستی و بۆنەکەی لەنێو بەرێت حەبی تریاکی زەرکەشی لە ئاوداتواندۆتەوەو خواردوویەتەوە.
هەرکە لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت، ژمارەی کەنیزەکەکانی حەرەمسەرای کەمکردەوە؛ چونکە عاشقی ئافرەتێک بوو بەنێوی (بەسمە)،کە ئافرەتێکی لاوی قەڵەو چوارشانە بوو و، لە گەرماوی حەرەمسەرادا پشتشۆر بوو. لە(بەسمە) بوو بەخاوەنی شەش منداڵ، کە هەر هەموویان یەک بەدوای یەکدا بوون. ئاشکرایە کە مەحمود کەوتبۆ ژێر کاریگەرییەتی ئەو(ئێمێ)یەی کە ئێستا ببوو بە شاژنی دایک و عاشقی ژیانی پڕ لە خۆشگوزەرانی و رابواردن بوو. گالیسکەیەکی نمونەی ئاوێنەداریان بۆ(ئێمێ) دروست کردبوو کە بەدەنکە ئەڵماس و پارچە ئاوێنەی بچوک رازێندرابۆوە.
ئێمێ زۆر حەزی لە خۆرازاندنەوە بوو، زۆربەی کات ئارایشێکی تیرۆتەسەلی دەکردو کەنیزەکەکانیشی خشڵەکانییان بۆ لەسەر سینییەک دادەناو بەدوایدا دەڕۆیشتن. تەنانەت کاتێ بە چەند قایەغێکی پڕشکۆوە کە هەریەکەیان(١٢) سەوڵ لێدەریان هەبوو، لە بسفۆڕ دەپەڕییەوە، چەند ماسییەکی دەستکردی خشڵ نەخشێندراویان بە زنجیر لە بەلەمەکان دەبەستەوە تا خەڵک وابزانی ئەو ماسییانە بەدوای بەلەمەکان کەوتوونەو هاوڕێیەتی (ئێمێ) دەکەن.

مەحمود بەهاندان و دەست لەپشت دانی ئێمێ، بڕیاری دا شارستانیەت و فەرهەنگی ڕۆژئاوایی بێنێتە وڵاتەکەیەوەو دوای ماوەیەکی کورت لە دەسەڵات گرتنەدەست، دەستی دایەچاکسازی. ئەو یەکەم سوڵتانی عوسمانی بوو کە بە یارمەتی پزیشکە فەڕەنسایییەکان کۆلیژێکی پزیشکی دامەزراند و ژمارەیەک قوتابیشی بەمەبەستی خوێندن ناردە پاریس ، لەندەن و ڤیەننا. سیستەمێکی پشکنینی تەندروستی هێنایەکایەوە با بتوانێ بەرەنگاری نەخۆشی تاعون بێتەوە کە تەنها لە ساڵی ١٨١٢(١٢٢٧ی کۆچی)دا ، سەدوپەنجا هەزار کەسی بەجاریک کوشت و یەک لەسەر دەی لە کۆی گشتیی ژمارەی دانیشتوانی قوستەنتەنییە کەمکردەوە. کاتێ گوێبیستی ئەوە بوو کە لە ساڵی ١٨٠٢ لە بەریتانیا سەرژمێری کراوەو ژمارەی دانیشتوانی لەندەن(٨٦٤٠٠٠) کەس بووە، ئەویش بڕیاریدا سەرژمێری بکرێت وەدەرکەوت کە ژمارەی دانیشتوانی قوستەنتەنییە (٦٣٠.٠٠٠) کەسە. مەحمود، ڕۆژنامەو بڵاوکراوەیەکی ڕەسمیی دەوڵەتی لە شێوەی (ژۆرناڵ ئۆفیشەڵ)ی فەڕەنسایی دامەزراندو فەرمانی دەرکردنی دراوی داو یەکەم پردی لەسەر کەنداوی داردانێل دروست کرد. هەروەها سەرەڕای دژایەتی ژمارەیەک لە خەڵکانی دواکەوتووی دژ بە پێشکەوتن، مەحمود فەرمانیدا جلی نیشتمانی دانیشتوانی وڵات بگۆڕدرێت و لەماوەی یەک شەودا شەڵوارە فشوفۆڵەکان و کراسە یەخەدارو سەردەستە لەکەوڵە قووز دوراوەکان و مەندیلە نیومەترییەکان نەمان و شەڵواری تەسک و چاکەتی درێژی ڕەشی سەرانسەر قۆپچەدار، کە بە« ئەستەمبوڵی» بەناو بانگ بوون و کڵاوی فینەی سوور کە لە مەراکیش راهێندرابوون، جێیان گرتنەوە.

ئیستراتفۆرد کنینگ کە لەو سەردەمەدا کارمەندی باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە قوستەنتەنییە بووەو دواتر بووە بە باڵیۆزی بەریتانیا لە عوسمانی، سەری لەم گۆڕانانە سوڕماوەو لەوبارەیەوە نووسیویەتی: *«ئەگەر یەکێک ماوەیەک لە تورکیا دوور بووبێت و ئێستا بگەڕێتەوە وڵات، تێدەگا کە چ گۆڕانکارییەکی سەرسوڕهێنەر ڕوویداوە، کار وابڕوات تا چەند ساڵی دیکە تەنانەت یەک مەندیل بەسەر لە سەرانسەری تورکیادا نابیندرێت. ئێستا، کارمەندان و خاوەن پیشە جۆربەجۆرەکان فینەی سوور لەسەر دەنێن و شەڵواری قەزاقی و چەکمە لە پێدەکەن و چاکەتێکی درێژی سوور یان شین، یان ئەوەتا ڕەش دەپۆشن کە تابن چەنەکەیان قۆپچەی پێوەیە و جلە کۆنەکانیان وەلاوە ناوە، کەس نابیندرێ کە بەشێوەی کۆن جلی پۆشیبێت.»*

گۆڕینی جلوبەرگ، کۆنەپەرستان و ئەو کەسانەی لەڕادەبەدەر تووڕە کرد کە دژایەتی هەموو جۆرە چاکسازییەکیان دەکرد؛ ڕێک وەک سەدەیەک پێشتر کە چاکسازییەکانی پێتری مەزن لە ڕووسیا دژایەتی لەگەڵ کراو کەسانێکی لەو بابەتە نێویان لەو ڕیفۆرمانە نابوو *«پارچەپارچەکردنی ڕوحی مسکۆی»*. لەو کاتەیدا کە سوڵتان مەحمود دەچووە نوێژی هەینی، دەروێشێک لغاوی ئەسپەکەیی گرت و هاواری کرد: *«هەی سوڵتانی کافر، خواوەند تۆڵەی ئەم کردەوە دژە ئایینیانەت*

*لێدەکاتەوەو سزات دەدا. تۆ خەریکە وا ئیسلام لە نێو بەری.»* بەڵام مەحمود بەرگری کردو داکۆکی لە تیۆری یەکسانی نێوان تێکڕای دانیشتوانی ئیمپڕاتۆرییەت کردو گــــوتی: *«من لە هاووڵاتیەکانم تەنها جیاوازی دەخەمە نێوان موسڵمانانی نێو مەزگەوتەکان، مەسیحیەکانی نێو کەلسیاکان و یەهودییەکانی نێو کنێسەوە، ئەگینا لە هیچ ڕوویەکی دیکەوە من جیاوازییان تێدا نابینم.»*

* * *

سەرەڕای بۆچوونە ئازادیخواز و کردەوە نوێخوازەکانی مەحمود، ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەودا بەخێرایی ڕووەو دارمان و لەنێوچوون دەچوو؛ ڕوسیاییەکان کۆنترۆڵی چەند ویلایەتێکی عوسمانی و پارچە زەوییەک بەدرێژایی کەنارەکانی رووباری دانۆبیان گرتە دەست و ئەگەر بهاتایە لە ساڵی ١٨١٢ (١٢٢٧ی کۆچی) ناپلیۆن هێرشی نەکردبایە سەر ڕوسیاو قەیسەر ئەلیکساندەری ناچار نەکردبایە سوپاکەی لەناوچەی دانۆب پاشەکشێ پێبکات ، ئەگەری ئەوە هەبوو ڕوسیاییەکان بتوانن دەست بەسەرناوچەیەکی فراوانتریش دابگرن. بەڵام مەحمود بەختی هەبوو؛ هیچ کام وڵاتە مەزنەکان نەیاندەویست قوستەنتەنییە بکەوێتەدەست ڕکابەرەکانیانەوە و هەموویان بڕوایان بە قسەکەی ژەنەڕاڵ فۆن مۆڵتکەی ئەڵمانی هەبوو کە ماوەیەک لەسەردەمی سەلیمدا لە تورکیا ببوو و بەسەر لەنوێ ڕێک خستنەوەی سوپای تورکیاوە خەریک ببوو. فۆن مۆڵتکە لەو باوەڕەدابوو کە *«پارچەپارچەکردنی تورکیا وەک لەت لەتکردنی ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماسە و دیارنییە قوستەنتەنییە کە گەورەترین و گرانبەهاترین پارچەیەتی، بەرکێ دەکەوێ.»*

بەریتانیا لەوە دەترسا ئەگەر ڕوسیاییەکان بتوانن دەست بەسەر قوستەنتەنییەدا بگرن، ڕێگەکانی هاتوچۆو پەیوەندی نیوان بەریتانیاو هیند، بکەونە مەترسیەوە، ئۆتریش لەوەدەترسا ئەگەر ڕوسیا بتوانێ عوسمانی داگیربکات، وابەهێزبێت کە ئیمپڕاتۆرییەتەکەی ئەوانیش لەنێوبەرێت.

ترس و گومانی ئەو وڵاتانە لە هەمبەر یەکدی هێندە بەهێزبوو کە کاتێ کۆنگرەی ڤیەننا لە دوای شکستەکەی ناپلیۆن لە ساڵی (١٨١٥) بەسترا، ئەو کۆنگرەیە بەشێوەیەکی ڕەسمی ڕایگەیاند کە: *«نابێ هەرگیز تورکیا بکەوێتە دەسەت وڵاتێکی بیانییەوە.»*

لەو کاتەدا کە ناپلیۆن بەرەو دورگەی (سەنت هێلن) دووردەخرایەوە، ئیدی مەحمود لەلایەن ڕۆژئاواوە مەترسی لەسەرنەبوو،بەڵام لە نێو سنورەکانی وڵاتەکەیدا، لە دوو ویلایەتی گرنگی وەک یۆنان و میسردا تێشکابوو. یۆنانییەکان لە هەموو کەمینەکانی دیکە پتر لە دژی عوسمانی ڕادەپەڕین و لە ساڵی (١٨٢١) (١٢٣٦ی کۆچی)، بەشێوەیەکی ئاشکرا نەفرەت و بێزاریی خۆیان لە تورکەکان دەربڕی. لە هیچ کوێیەکی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانییدا، دەسەڵاتدارییەتی تورکەکان وەک ئەو دەسەڵاتدارییەتییەی کە لە یۆنان هەیانبوو، توندوتیژ نەبووە؛ لەو مەڵبەندەدا، ژیان و ماڵ و کەرامەتی دانیشتوان هیچ جۆرە دڵنیاییەکی لەسەرنەبووە. ئەڵبەتە ئەو

یۆنانیانەی کە دانیشتووی قوستەنتەنییە بوون و لەسەردەمی سوڵتان محەمەدی فاتیحەوە ئایینەکەیان لەلایەن دەوڵەتەوە دەپارێزرا، باری گوزەرانیان وانەبوو، بەڵام لە نێوخۆی یۆناندا بارودۆخ بە شێوەیەکی دیکەو جیاوازبوو. لەوێ (لەیۆنان) ژمارەی لادێییە هەژارو دەستکورتەکان چەندین قات لە ژمارەی ئەو بیست هەزار تورکە بەڕاگەندەیەی کە دەسەڵاتداری ئەوێ بوون، پتر بوو.بۆیە هەر کە ڕاپەڕین دەستی پێ کرد، وەک چۆن بەنزین ئاگر بگرێ، بەخێرایی پەرەسەندو یۆنانییەکان تەواوی موسڵمانانی دانیشتووی یۆنانیان لە ژن و منداڵەوە بگرەتا پیروپەکەوتەکان، قەتلوعام کرد. زۆری نەخایاندو هەندێ شاری وەک ناوارینۆ و تریپۆلیتزا کەوتەژێر دەستی سەرهەڵداوان. لەهەر شاروقەڵایەکدا کە یۆنانییەکان سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا، سەرەتا بەڵێنی ئەوەیان بە تورکەکان دەدا کە هیچیان لێ ناکەن، بەڵام دواتر بەڵێنی خۆیان ژێر پێ دەنا و دەستیان دەدایە کوشت و کوشتاری تورکەکان. لە تریپۆلیتزا، یۆنانییەکان هەشت هەزار ژن و منداڵی تورکیان قەتلوعام کردو ئەم دڕندەییە بەشێوەیەک بوو کە (فینلی) لە مێژووی یۆناندا نووسیویەتی: «*مێژوونووسە یۆنانییەکان خۆیان لە گێڕانەوەی ئەم دڕندایەتییە بە دوور گرتووەو لە هەمانکاتیشدا هەموو جۆرە کردەوەیەکی تورکەکانیان بەدەنگی بەرزەوە مەحکوم کردووە.*»

کاردانەوەی قوستنەتەنییە لەهەمبەر ئەم کوشت و کوشتارە ئەوەبوو کە فرمانێکی بەپەلە بۆ تۆڵەستاندنەوە درا. لە ستراتیژیی سەربازیی تورکەکاندا، کوشتاری دوژمن بنەمایەکی پەسندو شایستەبوو، بەڵام کاتێ یەکێ لە ڕەگەزەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییەت کارێکی لەو بابەتەی ئەنجام بدابایە، ناویان لێ دەنا دڕندایەتی و بە توندترین شێوە سزایان دەدا. بەم پێیە ڕێبەرانی یۆنانیی دانیشتووی قوستەنتەنییە دەمودەست لە سێدارەدران و لە ڕۆژی جەژنی پاکدا، ئۆسقۆفی گەورە (گریگۆر یۆس)یان لە سێدارەداو تەرمەکەشیان بەسەر دەرگەی شوێنی دانیشتنیەوە کرد. هەرچەندە دیارنەبوو ئۆسقۆف چ ڕۆڵێکی لەم ڕاپەڕین و سەرهەڵدانانەدا هەبووە. چوار ئۆسقۆفی دیکەش لە شارە جیاجیاکان لە سێدارەدران و بەهەزاران یۆنانی گیانیان لە دەست دا. ئەم کوشت و کوشتارانە بۆ ماوەی چوار ساڵ و لەهەردوولاوە درێژەی هەبوو، لەو ماوەیەدا سوڵتان مەحمود بۆ پێشگیری کردن لەم کارانە هیچ کردەوەیەکی ئەنجام نەداو لە جێی خۆی نەبزووت.

لەو ماوەیەدا، یۆنانییەکان توانیان گەلەکەشتیەکی نوێ دروست بکەن، حکومەتێکی کاتییان دامەزراندو بەرەو باکور واتا بەرەو کەنداوی کۆرنت و ویلایەتی تسالی چوونە پێش و تەنانەت دەستیان بەسەر ئەسیناشدا گرت کە لەو کاتەدا بە شارێکی پلەسێ و دواکەوتوو لە قەڵەم دەدرا. لەسەرەتادا دەسەڵاتدارە ئەوروپاییەکان بەچاوێکی پڕ لە بایەخەوە لە جەنگەکانی سەربەخۆیی یۆنانیان نەدەڕوانی و ئەغڵەبیان وەک (مترنیخ)ی ڕاوێژکاری ئۆتریش بیریان دەکردەوە کە لە ساڵی ١٨٢١دا نووسیبووی: «*بەلای ئێمەوە گرنگ نییە ئاخۆ لەو دیو سنورەکانمانەوە سێسەد یان چوار سەد هەزار کەسێک یەکدی دەکوژن و دەخنکێنن و، یان ئەوەتا*

یەکدی *لە چوارمیخ دەدەن.»* بەڵام وردە وردە ئەم بۆچوونانە گۆڕانیان بەسەردا هات؛ بەڕای هەزاران قوتابیی زانکۆ و بیرمەندی ئەورووپایی، شانازی و سەروەرییەکانی یۆنانی باستان، لە یۆنانی نوێدا بەرجەستەببوون کە ئێستا بۆ سەربەخۆیی دەجەنگاو ئەم خەباتەی یۆنانییەکان لە خەباتە سەربەخۆیی خوازانەکانی نەتەوە بچوکەکانی دیکەی نێو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی جیابوو، ئەم خەباتەی یۆنانییەکان واتا و مەفهومێکی دیکەی هەبوو. لە ئاکامدا هەر ئەو هەستە بوو کە سەرنجی ئەورووپاییەکانی ڕووەو «تراژیدیای یۆنان» ڕاکێشاو کەسانێکی وەک لۆرد بایرۆن چوونە یۆنان و بەشدارییان لەخەباتی سەربەخۆیی خوازانەیاندا کرد.

دوای چوار ساڵ مەحمود گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە هەرگیز ناتوانێ بەبێ یارمەتی خەڵکی دیکە یۆنانییەکان بخاتەوە ژێر ڕکێفی خۆی، بۆیە داوای یارمەتی لە گەورەترین وڵاتی نێو ئیمپراتۆرییەتەکەی کرد کە میسر بوو. میسر بەیەکێ لە پێشکەوتووترین ویلایەتەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەقەڵەم دەدراو لەلایەن دەسەڵاتدارێکی لێوەشاوە بەنێوی (*محەمەد عەلی*) بەڕێوە دەچوو.

محەمەد عەلی، کوڕی ماسیگرێکی موسڵمانی خەڵکی ئەلبانیا بوو کە لەکاتی شەڕی فەڕەنسایی و ئینگلیزەکاندا، لەزارکی ڕووباری نیل بەئاوداچووبوو، چیوای نەمابووە نغرۆببێ کە کەشتیەکی دەریا سالار نیلسۆن پێڕادەگات و لەمردن ڕزگاری دەکات. محەمەد عەلی، سەرکردەیەکی سەربازی بێ هاوتابوو کە لەهەمانکاتدا نەخوێندەوار بوو، شانازی بەوە دەکرد کە تاکە کتێبێک کە خوێندوویەتەوە بریتی بووە لە ڕووخسارو دەموچاوی خەڵک و لەم ڕووەوە سەرناس بوو.

دوای تێشکان و گەڕانەوەی ناپلیۆن لە میسر، محەمەد عەلی لە دژی هێزە بەریتانیاییەکان دەستی دایە شەڕو کاتێ کە قاهیرەی ڕزگار کرد، بەشەقامێکدا تێپەڕی کە لە هەردوولای، سەری بڕاوەی ئینگلیزەکانیان بەسەر نێزەوە کردبوون. ئینجا دوابەدوای ئەمە، (٥٠) کەس لە سەرانی مەمالیکی میسری بانگهێشت کردە قەڵای قاهیرەو دەعوەتێکی پڕشکۆی بۆ ڕێکخستن، کاتێ کە میوانەکان خەریکی خواردنی دوا پاروویان بوون، محەمەد عەلی فرمانیدا دەروازەکانی قەڵاکە دابخەن و دواتر هەر هەموویان سپاردە دەست ڕەحمەتی شمشێری جەللاد و لەو (٥٠) کەسە تەنها یەک کەس توانی ڕزگاری بێت و بەم کارە محەمەد عەلی لەدەست ئەو مەمالیکانە ڕزگاری بوو کە چەند سەدەیەک بوو حوکمی میسریان دەکرد.

لەوێ بەدواوە محەمەد عەلی بوو بەتاکە فەرمانڕەوای میسرو ئێستاش وایلێهاتبوو مەحمود داوای یارمەتیی لێ بکات. محەمەد عەلی کە لەو کاتەدا ببوو بە پاشای میسر، داواکەی سوڵتانی قەبوڵ کرد، بەڵام لەبەرئەوەی دەیزانی بەهێزە، هەندێ مەرجی دانان و لەوەڵامی سوڵتاندا ڕایگەیاند کە بە دڵنیاییەوە یارمەتی سوڵتان دەدا، بەڵام بەمەرجێک سوریاو لوبنان و دورگەی کێرت بخرێنە سەر سنوری پاشایەتییەکەی ئەوەوە. مەحمود جگە لە قەبوڵکردنی ئەم مەرجە هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو. سەرئەنجام محەمەد عەلی سوپاکەی خۆی ناردە یاردەی سوڵتان و عوسمانییەکان بەهاوکاری سەربازەکانی محەمەد عەلی لە دژی یۆنانییەکان

دەستیان کردە هێرش بردن.
یۆنانییەکان کە ماوەیەکی درێژبوو وا ڕاهاتبوون لەگەڵ سوپای بێ سەروبەری عوسمانییدا بجەنگن، لە پڕ خۆیان لە بەرامبەر سوپای ڕێکوپێکی میسردا دۆزییەوە کە بەهۆی ئەوروپاییەکانەوە مەشقیان پێ کرابوو، ئەمە وایکرد کە یۆنانییەکان هیچی وایان لەبەرامبەر ئەم سوپایەدا پێنەکرێ، بۆیە ئەو شارانەی کە پێشتر یۆنانییەکان لەژێر دەستی تورکەکانیان دەرهێنابوون، یەک بەدوای یەکدا کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی میسرییەکان و هەمدیس سەرانسەری یۆنان خرایەوە سەر سنوری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی.
لەو کاتەدا بەریتانیا هاتە نێو مەسەلەکەوە. ڕای گشتی بەریتانیا، بە توندی نارەحەتی و بێزاریی خۆیان لە هەمبەر دڵڕەقی تورکەکان نیشاندابوو، (جۆرج کنینگ)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا پێی وابوو کە درێژەکێشانی شەڕ ئەگەری ئەوە دێنێتە ئاراوە کە ڕوسیا بیر لە هێرش کردنە سەر تورکیا بکاتەوە کە ئەو کاتە لەوپەڕی لاوازیدا بوو و، ئەمەیش دژی سیاسەتەکانی ئەوان بوو.
لەساڵی ۱۸۲٦ (۱۲٤۱ی کۆچی)دا، کنینگ، (دوک دۆولینگتۆن)ی فاتیحی جەنگی واتەرلۆی ناردە سەنپترسبۆرگ تا لەو بارەیەوە لەگەڵ قەیسەری ڕوسیادا بکەوێتە دانوستان .
لە مانگی حوزەیرانی ساڵی دوایی، هەر سێ وڵاتی بەریتانیا، فەرەنسا و ڕوسیا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کەبەیەکەوە پێشنیازی نێوبژیکردن بخەنە بەردەم تورکیا. هەروەها وڵاتانی نێوبراو، لەگەڵ ئەوەدا بەڵگەنامەیەکی نهێنیشیان ئیمزا کرد کە بەپێی ئەو بەڵگەنامەیە لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون ئەگەر سوڵتان ئەم پێشنیازەی ئەوانی قەبوڵ نەکرد ئەوا بەپێی پێویست دەستێوەردانی سەربازی ئەنجام بدەن.
هەروەک چاوەڕێ دەکرا، سوڵتان بەبێ سێ و دوو ئەو پێشنیازەی ئەوانی بەدەست تێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی لە قەڵەمداو ڕەتی کردەوە. مەحمود لەو باوەڕەدابوو کە یۆنانییەکان مافی گلەییان نییە، چونکە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەودا پارەیەکی زۆریان خستۆتە گیرفانەوە و قازانجێکی باشیشیان بەنسیب بووە. لەبەرامبەر ئەم وەڵامەدا، گەلەکەشتی سێ وڵاتی ئەوروپایی لە ژێر فەرماندەیی دەریا سالاری بەریتانیایی ( *سێر ئیدوارد کاردینگتۆن*)، لەدەرەوەی کەنداوی *ناوارینۆ* بەمەبەستی پێشگیری کردن لە هاتوچۆو بەکارهێنانی بەندەرەکە لەلایەن کەشتییە میسری و تورکییەکان ئارایشی جەنگییان دیت.
کاردینگتۆن فرمانی ئەوەی پێدرابوو کە لەشەڕدا دەست پێشخەری نەکات، بەڵام هەر کە تورکەکان دەستیان دایە تەقەکردن، ئیدی شەڕبوو بە ئەمری واقیع و لە ئاکامیشدا گەلەکەشتیی تورک و میسرییەکان لەنێوچوو، چونکە لە کۆی (۸۹) کەشتی، تەنها (۲۹)یان بەساغی دەرچوون و (٦۰) کەشتی نغرۆی دەریابوون. هەروەها لە کۆی گشتیدا تورک و میسرییەکان نزیکەی (٦۰۰۰) کەسیان لێ کوژراو ئەوەش لە کاتێکدابوو کە ئەوروپاییەکان بەهەمووی (۱۷۲) کەسیان لێ کوژا.بۆ تورکیا، ئەم جەنگە دوای جەنگی دەریایی لیپانتۆ، بە گەورەترین کارەسات لە قەڵەم

دەدرا کە لە ئاکامیدا تەواوی ڕێگاکانی پەیوەندی نێوان هێزەکانی محەمەد عەلی و میسر پچڕاو یۆنانییەکان توانیان دەست بەسەر ئاوەکانی دەوروبەری نیمچەدوورگەیان دابگرن و بەم پێیەش یۆنان بەرەو سەربەخۆیی تەواو هەنگاوی نا.

* * *

سەرەڕای ئەم جەنگ و دەرگیرییە بێ کۆتاییانە، تاکە ئاواتی مەحمود ئەوەبوو ولاتانی دەرەوە وازی لێ بێنن و بواری ئەوەی پێبدەن بەچاکسازیی نێوخۆییەوە خەریک بێت. لەنێوخۆی ولاتیشدا بەرەوڕووی گیروگرفتی مەزن ببۆوەو گرنگترینی ئەم گیروگرفتانەش سەرهەڵدانەوەی یەنیچەرییەکان بوو کە ئەمجارەیان سەریانی خوارد. بەپێی گوتەی ئیستراتفۆرد کنینگ: «*یەنیچەرییەکان فرمانڕوای ڕاستەقینەی ولات، بکوژی سوڵتانەکان و سەرچاوەی ترس و تۆقاندنی خەڵک بوون و جگە لە دوژمنەکانی تورکیا، هەموو کەس لێیان دەترسا.*»

مەحمود دەبوایە هەژدە ساڵ چاوەڕێ بێت تا سەرئەنجام بەکارێکەوە هەستێ کە لەمێژووی تورکیادا بە «ڕووداوی پیرۆز» باسی لێوەکراوە. مەحمود لەمانگی حوزەیرانی ساڵی (١٨٢٦) (ذیقعدە-ی ١٢٤١ی کۆچی) دیوانی هومایونی کۆکردەوە، چونکە پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کەپێویستە تەواوی کاروکردەوەکانی لایەنی یاساییان تێدا پارێزرابێ. باشترین کار ئەوەبوو کە وابکا یەنیچەرییەکان لەدژی ڕاپەڕن و دوایش سەرکوتیان بکات و ئەم کارەشی کرد. مەحمود ئەوەی بۆ سەرانی ئایینی و سیاسی ولات ڕوون کردەوە کەکاتێ یەنیچەرییەکان لەبەرامبەر سەرهەڵداوە یۆنانییەکاندا شکستیان دەخوارد، سوپای میسری کە بەئاسانی توانی سەر سەرهەڵداواندا سەرکەوێ ئەوەی سەلماند کە ئەو سوپایەی لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە مەشقی پێکرابێت، زۆر لە سوپاکانی دیکە بەهێزترەو لەسەرووی سوپای ئیمپراتۆرییەتەوەیە.

لە خستنەڕووی ئەم بابەتەدا دیسان مەحمود ژیری نواندو پێشنیازی هەڵوەشاندنەوەی سوپای یەنیچەری نەخستەڕوو، بگرە پێشنیازی ئەوەی کرد کە بە مەبەستی بەهێزکردن و بردنەسەری ئاست و توانا سەبازییەکان، سوپای نێوبراو لەگەڵ سوپا نوێیەکەی سەردەمی سەلیم لێک بدرێت. دیوان ڕەزامەندیی خۆی لەسەر ئەم پێشنیازە نیشانداو لەو بارەیەوە توانای پێویست و دەسەلاتی تەواوی بە سوڵتان بەخشی. مەحمود ئەو کەسانەی کە لە هەڵگەڕانەوەی یەنیچەرییەکان دەترسانی لەوە دڵنیا کردەوە کەوا دەتوانی بەئاسانی سەرکوتیان بکات، بەلام بەپێویستی نەزانی ئەوەیان لا بدرکێنێ کەوا لە ماوەیەک لەمەوبەرەوە، سوپایەکی تایبەتی (١٤) هەزار کەسی درووستکردووەو سەرکردایەتیشی سپاردۆتە دەست ئەفسەرێکی وەفاداری خوێنڕێژ کە بەزوویی بە (قەرە جەهەننەم) نێوبانگی دەکرد.

مەحمود بەپەلە فرمانی هەڵوەشاندنەوەی سوپای یەنیچەری ڕاگەیاند، بەلام کەسانی نێو سوپاکە دەنگی ناڕەزاییان بەرزکردەوەو مەنجەڵەکانی خۆیان سەرەونخون کردو ئەوەش هەمان ئەو کارە بوو کە سوڵتان چاوەڕێیی دەکرد. یەنیچەرییەکان لە ڕۆژی(١٤)ی حوزەیران (٧ی ذیقعدە)، لە گۆڕەپانی ئەسپ تاودان

کۆبوونەوە و تێکرا هاواریان کرد «*بمرێ سوڵتانی کافرو مەسیحی.*»

مەحمود کە سوو بوو لەسەر ئەوەی بەپێی بەرنامەو بەپشوودرێژییەوە کار بکات، سەرەتا چوار ئەفسەری بە ئاڵای سپییەوە ناردە لایان و پێی ڕاگەیاندن کە ئەگەر بڵاوە بکەن ، لێیان خۆش دەبێ و کاری پێیان نییە. بەڵام وەک چاوەڕێ دەکرا، نەک تەنها ئەم پێشنیازەی مەحمود رەتکرایەوە، بگرە یەنیچەرییە هەڵچووەکان، چوار ئەفسەرەکەشیان کوشتن و هەموو لە هەموو هاتنە نێو حەوشەی یەکەمی کۆشکی سوڵتانەوە و، بەپێی نەریتی کۆنیان لە ژێر ئەو دارچنارەدا کۆبوونەوە کە لە کاتی فیتنەگێڕی و ئاژاوەنانەوەدا لێی کۆدەبوونەوە .

لەو کاتەدا مەحمود بەسواری ئەسپێکی سپی بەدیارکەوت، جلی سەربازی پۆشیبوو و جەقەیەکی ئەڵماسی لە تەنیشتی فینەکەی دابوو. ئاڵا سەوزەکەی پێغەمبەری بەدەستی ڕاستی گرتبوو و بەدەنگی بەرز داوای لەتەواوی موسڵمانان کرد کە ملکەچیی خۆیان بۆ سوڵتان و خەلیفەی موسلمین دووپات بکەنەوە. ئەم دیمەنە کاری لە یەنیچەرییەکان کردو وای لێکردن پەلاماری سوڵتان بدەن. ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو کە قەرە جەهەننەم بەخۆکەوێ. بەیەک ئیشارەتی مەحمود، هێزەکانی قەرەجەهەننەم دەستیان بەتەقەکردو یەنیچەرییەکان وەک گەڵای دار هەڵدەوەرین بەسەر یەکدا بەردەبوونەوەو ئەوانەیش کە برینداربیوون هەوڵیان دەدا بەرەو گۆڕەپانی ئەسپ تاودان ڕاکەن. بەڵام ئەمەش بێسوود بوو، چونکە سوپاکەی قەرە جەهەننەم ڕێیان لێ گرتبوون. سەدان کەسی دیکە لەکاتێکدا کە هەوڵی ئەوەیان دەدا بچنەوە نێو سەربازگەکانیان گیانیان لە دەستدا، ئەوانەش کە لەو کوشتارە بە سەلامەتی دەرچوون، دەروازەی سەربازگەکانیان لەسەر خۆیان پێوەدابوو و چاوەڕێی هێرشی لەپڕی سوپاکەی قەرە جەهەننەم بوون. بەڵام هێرشی کۆتایی و ڕەشەکوژیی گەمارۆ دراوەکان کە بە یەکێ لە شێوازە باوەکانی سوپای تورکیا لە قەڵەم دەدرا ، هەرگیز رووی نەداو لەجیاتی ئەمە، قەرە جەهەننەم فرمانیدا تۆپێکی سەحرایی گەورەیان لەبەرامبەر هەرکام لە سەربازگەکان دابەست و ئینجا فرمانیدا سەربازگەکان بدەنە بەر تۆپ. ئەم فرمانە سەمناکە بەوردی جێبەجێ کراو ئەو سەربازگەو بنکە سەربازییانەی کەیەنیچەرییەکان خۆیان تێدا پەنادابوون، لەگەڵ خاکدا یەکسان کران. ساختومانی ئەو سەربازگانە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک لەژێر ئاگری تۆپخانەدا بوون و مەحمود لەو ژوورە چوارگۆشەیەیدا کەبەسەر دەروازەی بابی هومایوندا دەیڕوانی، چاوەڕێی بیستنی هەواڵی پێکدادانەکان بوو. کاتێ ساختومانەکان ئاگریان تێ بەربوو، یەنیچەرییەکان بۆ ڕزگارکردنی گیانیان خۆیان لەسەر دیوارەکانەوە هەڵدەدایە خوارەوە، بەڵام لەهەمانکاتدا هێزەکانی قەرە جەهەننەم یان بەگوللە دەیان پێکان، یان ئەوەتا بەسەر نێزە دەیان کوشتن. هێشتا شەڕێکی قورس مابوو، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە یەنیچەرییەکان پەنایان بردبۆ بەر عەمباراوی هەزارویەک ستوون، کە کەوتبۆ نزیک مزگەوتی ئەیا سۆفیاو بەدەریاچەیەکی ژێرزەمینی لەقەڵەم دەدرا. عەمباراوی نێوبراو خاوەنی (۳۳٦) ئەستوونی مەرمەری جوانە،کە لەدوازدە ریزی (۲۸)ی دانە، درێژەیەکەی پتر لە

سەدمەتر دەبێ و لەسەردەمی بیزانسدا و لە كاتی كەم ئاویدا، دەیتوانی بۆ ماوەی (١٥) رۆژ ئاوی خواردنەوی دانیشتوانی قوستەنتەنییە دابین بكات.
نزیكەی(١٠٠) یەنیچەریی بریندار، خۆیان گەیاندبۆ نێو ئەم عەمباراوە گەورەیەوە كە تەنها لەرێی ئەو كولانە بچوكانەی كە لە میچی عەمباراوەكەدانە روناكی پێدەگات و، تا دوا هەناسە بەرگرییان لەگیانی خۆیان كرد. شەرێكی دەستەویەخەی سەخت و خوێنین لەتاریكاییدا لەنێوان ئەو پیاوانەیدا كە ئاوی خواردنەوە تا سەرشانیان هاتبوو، روویداو ئەغلەب بەزەحمەت دەتوانرا دۆست و دوژمن لێك بكرێتەوە. سەرئەنجام دوا یەنیچریش كوژراو نغرۆبوو.
لەو رۆژەدا، لانیكەم دە هەزار كەس گیانیان لەدەست دا- هەندێ لە مێژوونووسان ئەم ژمارەیەیان تا (٢٠) هەزار كەسیش نووسیوە-و تەرمی ئەوانەی لە ئاگركەوتنەوەكەدا نەسووتابوون یاخود لە عەمباراودا نغرۆ نەببوون، فرێ درایە نێوبسفۆزەوە. تا چەند مانگ دوای ئەم رووداوە، تەرمی كوژراوەكان سەرئاو دەكەوتن و ماسییەكانی قوستەنتەنیە ناخۆش و بێ تام ببوون و گوشتیان نەدەخورا.
كاتێ مەحمود لەساڵ ١٨٣٩(١٢٥٥ی كۆچی)دا كۆچی دوایی كرد، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، یۆنان و میسری لەدەست دابوو و لەگەڵ فەرەنساو بەریتانیاو روسیا لە جەنگدابوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەچاوكاتەی كە مەحمود دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتبوو، بەهێزتر بوو؛ چونكە سەرەرای ئەو هەموو گیروگرفتە، لانیكەم مەحمود توانی ئاغای ماڵی خۆی بێ. ئەگەرچی پانتایی ماڵەكەی كەمتر ببۆوە، بەلام لە هەندێ رووەوە ئەوە بە قازانجی دەشكایەوە كە دەیتوانی بەوردی چاودێری هەموو كون و قوژبنێك بكات و بەهەموو لایەك رابگات. لەلایەكی دیكەوە هەرچەندە كورەكەی نەخشی دڵ، لەسەردەمی و دەسەلاتیدا زۆرجار تووشی هەڵەبوو، بەلام هەر ئەویش بوو كە پشتی ملی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی گرت و ناچاری كرد واز لە كۆت و بەندی سەدەكانی ناوەراست بێنێ وپێ بنێتە سەردەمێكی نوێوە.
چەندین ساڵ بەرلەمردنی مەحمود، دایكە فەرەنساییەكەی كە بەردەوام رێنوێنی دەكرد، دوای (٣٣) ساڵ ژیانی نێو حەرەمسەرا، دنیای بەجێ هێشت. لەو شەوەیدا كە ئێمێ لەسەرەمەرگدا بوو، مەحمود لە حەژمەتی ئەم رووداوە برپارێكیدا كە بۆ فرمانرەوای ولاتێكی ئیسلامی كارێكی زۆر بێ شەرمانە بوو؛ لەكاتێكدا كە باوبۆران خانووە دارینە لەزۆكەكانی قوستەنتەنییەی رادەژاند، دوو ئەفسەری پاسەوانی كۆشكی پاشایەتی بە قایەغێك لە كەنداوی داردانێل پەرینەوەو چوونە پەرستگای سەن ئانتوانتی گەرەكی پرا. قەشە (كریسۆ ستۆم)ی سەرۆكی پەرستگاكە لە ژوورەكەی خۆیدا خەریكی پارانەوە بوو كە چەند كەسێك لەدەرگایان دا .ئەفسەرەكان نامەیەكی سوڵتان مەحمودیان دایە قەشەكەو (كریسۆ ستۆم) دوای خوێندەوەی نامەكە لەگەڵ ئەفسەرەكاندا بەرێ كەوت و سواری قایەغی سەڵتەنەتی بوو. لەو لای كەنداوەكە ئەویان بەنێو باخە چۆڵەكاندا تێپەراندو بردیانە ژوورێكی پرشكۆوە كە بەپەردەی زێردووراو و فەرشی گرانبەها رازێندرابۆوە و، لەنێوەراستی

ژوورەکـەدا، ئافـرەتێک لەسـەر تەخـتـە خـەوێک درێژکـرابوو وپزیشکێکی یۆنـانـی ژوورسەری بوو.

دوو خـولامکارەی رەش پێـسـتـیش لە ژوورەکـە و لە بەردەرگـا وەسـتـابوون. لەگۆشەیەکی ژوورەکەدا، مەحمود لەکاتێکدا کە خەم و نارەحەتییەکی لە ڕادەبەدەری بە رووخسـارەوە دەبیندرا، وەستابوو. بەپێی قسەی قەشە یۆنانییەکە: *«چل سـاڵان دەهاتە پێش چاو، باڵای درێژ و قیافەیەکی نەجیبانەو سەنگینی هەبوو. ریشی ڕەش بوو و دەبریقایەوە و ئەمەش شکۆو جوانییەکی تایبەتی دەدا بەرووخساری.»*

قەشـەی نێوبراو تـەنها لەچەند سـاتێکدا توانیویەتی ئەم دیمـەنە ببینـێ، چونکە دەمودەست مەحمود فـرمـانیدا کە پزیشک و دوو خۆلامـەکە ژوورەکە بەجێ بێڵن. ئینجـا لەتەختەخەوەکە نزیک بۆوەو چۆکی دادان و بەدایکی گوت: *«تۆ حەزت لێبوو بەپێی ئایین و نەریتی باوباپیرانت دنیا بەجێ بێڵی و ئێستا کە من ئەم ویستەی تۆم هێنایەجێ.»*

قـەشـە کریسـۆسـتـۆم گـوێی بۆ دان پیـانـانەکـانی ئێـمـێ شل کـرد و بۆمـاوەی کـاتژمێرێک لەگەڵ ئەودا خەریکی دوعـا خوێندن و پاڕانەوە بوو و بەڵێنی رەحمـەت و لێبوردنی ئیلاهـی پێدا. هەر لەوکاتەدا سوڵتـان مـەحـمـود کە دوژمـنەکـانی نازناوی (سـوڵتانی مـەسیحی)یان لەسـەردانابوو، لە گـۆشـەیەکی ژوورەکەدا خـەریکی قـورئان خوێندن بوو.

بەم شێوەیە (ئێمێ)ی فـەرەنسـی بەپێی ئـەو ئایین و نەریتـەی کە پێینابۆ دنیـاوە، دنیای جێ هێشت و پاسەوانەکان قەشە کریسۆستۆمیان تا بەردەرکی پەرستگاکەی بردەوە، بەڵام بەکەسـی نەگوت لەو شـەوەدا چۆتە کوێ و، ئەو شەوە تا بەیانی دوعـای بۆ لێخۆشبوون لە رۆحی «ئێمێ دۆبوک دورێوی» فـەرەنسایی، دانیشتـووی مارتینیک و شازنی دایکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کرد.

* * *

## فەسڵی حەوتەم

## بەرەو کریمە

عەبدولمەجید شانزدە ساڵی بوو کە باوکی واتا مەحمودی بەنێوبانگ بە سوڵتانی چاکسازی کار لە ساڵی ١٨٣٩(١٢٥٥ی کۆچی)دا، کۆچی دوایی کرد. دایکی عەبدولمەجید کە سەردەمێک دەلاکی حەمام بوو، لەو باوەڕەدابوو کە زێدەڕۆیی کردنی مەحمود لەخواردنەوەی مەشروباتی رۆحیدا، بووەتە هۆی ئەم مەرگە ناوەختەی. لەم رووەوە بەتووندی دژی ئەوەبوو کورەکەی مەشروب بخواتەوەو بەردەوام زیانەکانی ئەم خووە ناپەسندەی بەگوێی کورەکەیدا دەچرپاند. بەسمە بڕیاریدا عەمباری مەشروباتی هاوسەرە کۆچکردووەکەی لە نێو ببات، بۆیە فرمانی دا نزیکەی پەنجا هەزار بۆتڵە شامپانیاو کۆنیاک و شەڕابی مەحمودیان لە دیوارەکانی حەساری شار داو ریشتیاننە نێو بسفۆڕەوەو هەموو ئەو پێک و پەرداخە کریستاڵانەی کە چەندین ساڵ بوو ئێمێ بە کۆکردنەوەیانەوە خەریکبوو، شکێندران و فڕێ دران.
لێ مەخابن بەسمەی دڵساف و لادێیی نەیدەزانی کە زێدڕووی لە رابواردن و بەڕێنیش بە قەدەر خواردنەوەی مەشروبات زیانی هەیەو مەترسی بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ هەیە؛ بەسمە بۆ ئەوەی کوڕەکەی بەلای مەشروب دانەڕواو سەری گەرم بێت، هانی دەدا لەگەڵ ئافرەتانی حەرەمسەرادا بنوێ، عەبدولمەجید لاوێکی لاوازۆکەی زەرد هەڵگەڕاوی نەرمڕەفتاربوو، بەڵام تەنانەت بۆ هەرزەکارێکی نەوباڵغی وا لاوازیش، خۆ راگرتن لەبەرامبەر ختختۆکەی دەست لە ملانێی ئەو کچە جوانانەی کەدایکی دەینارده پاڵی، کارێکی سەخت بوو. عەبدولمەجید لەسەرەتای سەڵتەنەتیدا، بەهۆی زێدەڕۆیی لەپەڕین رابواردندا، تووشی سستی و بێ هێزی بوو، بۆیەرووی لە مەشروب خواردنەوە کرد.
عەبدولمەجید لاوێکی بەرەڵڵانەبوو، هەروەها وەک بەرەبابەکەشی سەرشێتی و هێمای شێتایەتی تێدابەدی نەدەکرا، بەڵام کەیفی بە کاروباری دەوڵەت و بەڕێوەبردنی وڵات نەدەهات و پتر حەزی لەوەبوو سود لەو چێژو لەزەتانەی ژیان وەرگرێ کە سروشت خستبووینە بەر دەستییەوە. عەبدولمەجید کەیفی بە سروشت و کەش و هەوای بابی عالی نەدەهات و هەر کە گەورەتربوو گەیشتە ئەو باوەڕەی کە

پاراستنی دالآنی تەنگ و تاریک، حەوشی زۆرو ئەو کۆشکانەی کە بەئارەزوو و بەدرێژایی چەندین سەدە لە دەوروبەری کۆشکی سوڵتان قوت کراونەتەوە، دەبنە مایەی نارەحەتی و مەینەتی. بێگومان، بوونی بەردەوامی هەزاران کارمەندو خزمەتکار کە رۆژانە بەو دالآنە تەسک و تاریکانەی بابی عالیدا لە هاتوچۆدابوون، عەبدولمەجیدی پتریش نارەحەت دەکرد. بۆیە بڕیاریدا خۆی لەو فەزایە قوتار بکات و پانتایی گەروی داردانێڵ بکا بە نێوانی ژیانی تایبەتی خۆی و کاروباری دەوڵەتی و، کۆشکێک لەوبەری بسفۆر دروست بکا.

ئەم کۆشکەی کە بەفرمانی عەبدولمەجید دروستکراوە نێوی (دۆڵمە باخچە)یە کە لەرووی وشەوە ماناکەی دەکاتە (باخی پڕکراوە). ئەو زەوییە لیژانەی کە پێشتر موڵکی یەکێ لە شازدە تورکەکان بوو و لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانوونی، خەیرەددین (باربارۆسا)ی ئەمیرولبەحری بەنێوبانگ لە بڕی ١٦٠٠٠ کۆیلەی مەسیحی کڕیبووی و باشترین جۆری (کەلەم)ی نێو ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی تێیدا وەبەردەهێنا، ڕاست کراو، دەستکرا بە دروستکردنی کۆشک.

عەبدولمەجید میعمارێکی ئەرمەنی بەنێوی (بالیان) بۆ دروستکردنی ئەم کۆشکە ڕاسپاردو دەسەلآتی تەواو وبودجەیەکی بێ سنوریشی خستە بەردەست و تاکە مەرجێک کە بۆ ئەم میعمارە ئەرمەنییەی دانا ئەوەبوو کە دەبێ ئەم کۆشکە لە کۆشکی هەموو پاشایەکی سەر زەوی پڕ شکۆترو مەزنتربێت و سەرئەنجامیش هەر وایلێهات. کۆشکی (دۆڵمە باخچە) لە ڕووی سەلیقەو وردەکارییەوە نەبێ ئەگینا لە ڕووی شکۆو مەزنیەوە، کەم وێنەیە؛ تارمەی مەرمەڕی ئەم کۆشکە بەدرێژایی (٦٠٠) مەتر لەسەر لێواری بسفۆر درێژەی هەیە و ڕازاندنەوەیەکی زۆری پێوەدیارە، بەلآم کەمتر وردەکاری و ناسکی پێوە دیارە. پتر لە چواردە تۆن ئالتون تەنها لە ڕازاندنەوەو زێڕاوی هۆڵ و ژوورەکانی کۆشکدا بەکاربراوە. درێژایی تالاری تەختی سەڵتەنەت، سی مەترەو میچەکەی بەهۆی ئەستوونی زێڕی شێوە یۆنانی کە چوارچوار لە ڕیزێکدان، ڕاوەستاوەو گەورەترین ئاوێنەکانی دنیا بە دیوارەکانیەوەیەتی. تالاری میوانداری کردنەکەی، گەورەترین هۆڵی نانخواردنە لە جیهانداو چلچراکەی (کریستاڵەکەی) بن میچی ئەم هۆڵە کێشەکەی چل تۆنە.

مۆسیقاژەنەکان لە چوار بەلەکۆن کە لە گۆشەکانی ئەم تالارەو نزیک بە میچکە درووستکراون، بەلێدانی مۆسیقای خۆش و دڵگیرەوە خەریک بوون و ئافرەتی حەرەمسەرا لە پشت ئەم پەنجەرە کون کونانەی کە شێوەیان لەشێوەی باوەشێنی حەسیری دەچوو، دەیانتوانی ئەم ئاهەنگ و میوانداریيە مەزنانە ببینن.

قاڵدرمەی سەرەکیی کۆشک کە شێوەی مارپێچی هەیە، لە دولاوە دەگاتە نهۆمی سەرەوەو لێوارەکانیشی بەهۆی سەدان کریستاڵی ڕەنگاوڕەنگەوە ڕازێندرابۆوە. تەختە خەوی عەبدولمەجید لە زیوی خاو دروستکرابوو، گەرماوە مەرمەڕەکەشی بانیۆو سەکۆی لەمەرمەڕی سپی دروستکراوی تێدابوو کە مەرمەڕەکەی دەبریسکایەوەو نەخش ونیگاری مەل و گوڵیان لەسەر هەڵکەندرابوون. شێرەکانی ئاوی ئەو گەرماوەش هەر لە زیو دروست کرابوون و لە شێوەی قوو بوون.

عەبدولەجید دایکی (بەسمە)شی لەبیرنەکردبوو، تازەدایکی ببوو بە شاژنی دایک، بۆیە عەبدولەجید ژوورێکی بۆ دروست کردبوو کە تەواوی بۆفیەی جل و کورسیەکانی نێوی زەرکەش بوون. بەسمە نێوی خۆشی گۆڕیبوو و، نێوی لە خۆی نابوو (پەرتۆی عالی). سێسەد ژوورەکەی کۆشکی دۆلمە باخچە (٢٥) هۆڵیان هەبوو، بەڵام لەهەمان کاتدا لەبەشی دواوەی کۆشکەکە هەندێ ژووری بچوک و تاریک دروستکرابوون کە بەرچاونەبوون. لەهەریەک لەو ژوورانەدا سێ لە ئافرەتانی حەرەمسەرا بەو هیوایەی ڕۆژێ بتوانن سەرنجی سوڵتان بۆ لای خۆیان ڕاکێشن شەویان دەکردە ڕۆژ.

چیوای پێنەچوو کە هەواڵی دروستکردن و شان وشکۆی کۆشکی دۆلمە باخچە بەسەرانسەری ئەورووپادا بلاوبۆوەو ئەمەیش وای لە سوڵتانەکانی ئەو کیشوەرەکرد کە هەریەکەو کۆمەڵێ دیاری بە نرخ بۆ ڕازاندنەوەی کۆشکە تازەکەی بنێرنە خزمەت سوڵتانی عوسمانی. بەم پێیە کەرستەی نێو کۆشک هەمەرەنگ و هەریەکەی لەسەر شێوازێک بوو؛ سەعاتە دیوارییە کۆنەکانی، لەلایەن شاژن ڤیکتۆریاوە بەدیاری نێردرابوون، دەفرەچینی و کریستاڵەکان لەلایەن فرانسوا ژۆزێف، ئیمپڕاتۆری ئۆتریشەوە نێردرابوون، مێزو بۆفیەکانی کەلەسەر شێوازی ئاندرێ شال بۆل دروستکرابوون و وێنەی ئیمپڕاتۆری فەرەنسایان لەسەر دروستکرابوو، لەلایەن ناپلیۆنی سێیەمەوە بەدیاری نێردرابوون و هەروەها ئەو ڕایەخانەیش کە لە کەوڵی ورچی سپی جەمسەرەکان دروستکرابوون، دیاری قەیسەری ڕووسیابوون وتێکڕای ئەو شتانەیش لەیەک جێدا کۆببوونەوە.

کاتێ کاری دروستکردنی کۆشک کۆتایی پێهات، عەبدولەجید دیتی پارەیەکی زۆری تێدا خەرج کردووە، بەڵام دیسانیش هەر خۆشحاڵ بوو، چونکە دەیدیت ئەوجا دەتوانی ئەو کۆشکە کۆنەی کە چەندین ساڵ بوو دەیان داستانی پڕ لەمەینەتی و کارەساتی تێداڕوودابوو، بەجێ بێڵێ و لەنێو ئەو کۆشکە نوێ و پڕکۆشەیدا، نیشتەجێ بێت. ئیتر بابی عالی تەنها ببووە بارەگای بەڕێوەبەرایەتییەکانی دەوڵەت و لایەکیشی حەرەمسەرایەکی لێبوو کە ژمارەیەک لەو کەنیزەکانەی کە سوڵتانەکەیان مردبوو، تێیدا چاوەڕێی ئیزرائیلیان دەکرد.

دوای چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمودو ئەو گۆڕانە بەرچاوانەی کە لەژیانی خەڵکی تورکیادا هێنابوونیەکایەوە، ئێستا خۆ بەدیار خستنەکانی عەبدولەجیدو ئەو لەزەتەی کە عەبدولەجید لە پارە خەرجکردن دەیدیت و ئەو میوانییە پڕشکۆیانەی کە لە کۆشکە تازە دروستکراوەکەیدا ڕێکی دەخستن، وێردی سەر زمانی کۆڕکۆمەڵی قوستەنتەنیە بوون.

عەبدولەجید سەماکەرانی بالیەو سیحربازە بەنێو بانگەکانی بۆ خۆنیشاندان و سەرگەرمکردنی میوانەکانی لە ئەورووپارا دەهێنایە قوستەنتەنییە. هۆڵێکی شانۆی زۆر جوانی لە نێو کۆشکەکەیدا دروستکردبوو کە لەو شانۆگەرییانەی کە تێیدا پێشکەش دەکران خولامکارە مێرد منداڵەکان ڕۆڵی ئافرەتانیان دەبینی چونکە هیچ ئافرەتێک مافی ئەوەی نەبوو بەشداری لەو شانۆیانەدا بکات و دەوریان تێدابببینێ.

بیروباوەرە ئایینییەكانی خەڵكی توركیا بە ڕادەیەك توندوتیژبوو كە تەنانەت ئافرەتە لادێیەكان ئەگەر لەو كاتەیدا كە دانیان دەدایە مریشكەكانیان، كەڵە بابێك هاتبایە ئەوناوەوە، ڕووی خۆیان لێ دەشاردەوە!

زۆری نەبرد هەواڵێكی دیكەش هاتە سەر ئەو هەواڵانەی كە سەبارەت بە میوانی و زێدەڕۆییەكانی عەبدولمەجید، لەسەرزاری خەڵك بوون ؛ عەبدولمەجید ڕێگەی بە ئافرەتە هەڵبژاردەكانی حەرەمسەراكەیدا كە بۆ كڕینی شتومەك بچنە بازاڕو لە جیاتی ئەوەی لە نێو گالیسكەكانیاندا چاوەڕێی هێنانی شتومەك بكەن، خۆیان دابەزن و بچنە دوكانەكانەوەو شت بكڕن. هیچ سوڵتانەیەك نەیدەتوانی خۆی لە خت ختۆكەی ئەم دەرفەتە بپارێزێ و بەتایبەتیش كاتێ كە عەبدولمەجید وەك «هێمای پێشكەوتن» فرمانیدا ئافرەتانی حەرەمسەرا شێوازی جلوبەرگ پۆشینی خۆیان بگۆڕن و جلی مۆدێرن بپۆشن. قەیسەرییەكانی قوستەنتەنیە پڕببوو لەو كەلوپەلانەی كە ئافرەتانی حەرەمسەرا بە تامەزرۆییەوە دەیان كڕین .

گەڕیدەیەكی ئینگلیزی بەناوی ( توگای) لەوبارەیەوە نووسیویەتی: «*هیچ شوێنێك لەم دنیایەدا تەنانەت بولوارەكانی پاریس و ڕیجنت ئیستریتی لەندەنیش ناتوانن خۆیان لە قەرەی ئەو گەڵە شتومەكە بدەن كە لە بازارەكانی قوستەنتەنییەدا دەخرێنەڕوو*». لەو بەینەدا پێدەچوو هەندێ لەو شتومەكە نوێیانەی لە بابەت شووشەی بۆیاخی قژ زۆر سەرنجی ئافرەتانی حەرەمسەرای بۆ لای خۆی ڕاكێشابێ، چونكە عەبدولمەجید كوشتەی ئافرەتی قژ زەردو چاوشین بوو.

ئەو بیانییانەی كە نیشتەجێی قوستەنتەنیەبوون، دەیانتوانی شتومەكی دەگمەنی دروستكراوی ولاتانی ڕۆژئاوا، هەرلە ئابجۆی ئینگلیزییەوە بگرە تا پەنیری فەرەنسایی و صابوونی ئەڵمانیایی لە دوكانەكانی «پرا» و «ئیستامپا» دەستەبەر بكەن. (ئیستامپا) خۆی ئینگلیزی نەدەزانی، بەلام كوڕەكەی لە لەندەن خوێندبووی، لەمڕووەوە دوكانی ئیستامپا ببووە شوێنی كۆبوونەوەی ئەوروپاییەكان و ئیستامپا و كوڕەكەی هەموو جۆرە زانیارییەكیان سەبارەت بە وادەی هاتن و دەرچوونی كەشتییەكان و میوانداریەكان و..هتد، دەخستەبەر دەستی مشتەرییەكانیانەوە.

* * *

دوورتر لە دۆڵمە باخچەو لە باكوورییەوە، كۆشكێكی دیكەی وەك كۆشكە پڕشكۆكەی عەبدولمەجید هەبوو كە لەویشدا، پادشایەكی دەسەلاتدار و تاكڕەوی وەك عەبدولمەجید دەسەلاتی دەگێڕا. ئەم شوێنە ناوی (كۆشكی زستانە) بوو، كە لە سەرلێواری ڕووباری (نوا) لە سەنپترسبۆرگ بنیادنرا بوو و، ئەو پاشایە سەلاتدارەش كە حوكمی تێدا دەكرد، قەیسەری ڕوسیا و نێوی نیكۆلای یەكەم بوو.

لە ساڵی ١٨٥٣ (١٢٦٩ی كۆچی)، توركیا و ڕوسیا لە زۆر ڕووەوە پێك دەچوون؛ میوانداری و شەونشینییە پڕشكۆكانی دەرباری ئیمپراتۆرییەتی سەنپترسبۆرگ بە ڕادەیەك مەزن و پڕ لە باقوبریق بووە كە هونەرمەندی فەرەنسایی *هۆراس ڤێرنە*،لەو بارەیەوە نووسیویەتی: «*مرۆڤ پێیوابوو كەوا خەریكە لە ناو ئەڵماسەكاندا بنغرۆ دەبێ*». بەلام لەوێش ئەو باقوبریقە بۆ داپۆشین و پەردەپۆشكردنی ئەو هەژارییە

سامناکە بوو، کە باڵی بە سەر (٥٠) ملیۆن کەس لە دانیشتوانی روسیادا کێشابوو. وەک چۆن لادێییەکانی تورکیا سووکایەتییان پێدەکرا، ئاواش لەوێ ئەو خەڵکە بە چاوی سووک سەیر دەکرا، بەڵام لە هەمانکاتدا دەسەڵاتدارانی روسیا پتر لە عوسمانییەکان لە هەمبەر بارودۆخی جیهانیدا وشیارتر و چاو کراوەتر بوون.

گەڕیدەیەکی ئینگلیزی کە بانگهێشتی میواندارییەکی قەیسەری روسیا کرا بوو، سەری سورمابوو لەوەی کە چۆن ئەو پاشایە زاڵمەی کە بەچەند زمان دەدوا، تەنها لەسەر ئەوەی خزمەتکارەکەی داواکارییەکی ئەوی بە پێچەوانەوە جێبەجێ کردبوو، هێندەی شەق تێهەڵدابوو کە تاسەر لێواری مردنی بردبوو.

روسیاش وەک تورکیا، دواکەوتوو بوو؛ لەو کاتەیدا کە تورکەکان لەو باوەڕەدا بوون سوڵتان نوێنەر و خەلیفەی خوایە لە سەرزەوی، موژیکەکانی روسیاش زۆربەتووندی سووربوون لە سەر ئەو باوەڕەی کە قەیسەر هەفتەی جارێک بۆ راوێژکردن لەگەڵ یەزداندا دەچێتە ئاسمان.

هەموو میوانخانەکانی سەنپترسبۆرگ و تەنات کۆشکی زستانەی قەیسەریش، پڕ بوون لە مۆریانە و رەنگبێ هۆی ئەمەیش بگەڕێتەوە بۆئەو گایانەی کە شیری تازەیان لێدەدۆشین و لە سەربانی کۆشک وجێی دانیشتنی هاوسەری قەیسەر رادەگیردران.

نیکۆلا وەک عەبدولەجید کابرایەکی خۆش گوزەران نەبوو و پتر خۆی بە سەربازدەزانی؛ کاتێ کە سەردانی بەریتانیای دەکرد و لە کۆشکی باکینگهام و لای شاژن ڤیکتۆریا دابەزیبوو، فرمانیدا لە تەویلەی پاشایەتییەوە هەندێ کای بۆ بێنن تا لەو دۆشەگەی بکات کە لە روسیاوە لەگەڵ خۆیدا هێنا بووی و ئەمەش بووە مایەی سەرسوڕمانی ئامادەبوان و شاژنی ئینگلیز.

ڤیکتۆریا، قەیسەری بە (پاشایەکی تاکرە و دەسەڵاتدار) لە قەڵەم دەدا. ئاکاری زۆردارانە و نیگایە بوغراکانی بە هۆی ئەو عەیبەی کە لە یەکێک لە چاوەکانی دابوو، پتر کاریگەر بوون و بەشێوەیەک بووە کە ڤیکتۆریا نووسیویەتی : *«حاڵەتی چاوەکانی بەرادەیەک سامناکە کە تا ئێستا شتی وام نەدیتووە.»*

قەیسەر گەیشتبۆ ئەو ئەنجامەی کە کاتی ئەوە هاتووە دەست بە پەلاماردانی ئەملاوئەولا بکات و شان وشکۆی دەربارەکەی مەزنتر بکات و باشترین شوێنیش بۆ پەلاماردان ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمان بوو. زۆر بە ئاسانی گرژی و ناکۆکی بە بیانووی پتەو کردنی مافی روسیا لە مەڕ پاراستنی شوێنە پیرۆزەکانی مەسیحییەکان لە قودس کە بە پێی پەیماننامەی( *کوچوک قینارجی*)،لە حەفتا ساڵ پێشترەوە بە روسیا سپێردرا بوو و،تا ئەو ساتە جێبەجێ نەکرابوو، هاتە ئاراوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە نیکۆلا بەوردی هەنگاو بنێت، چونکە پێویستی بە پشتیوانیی بەریتانیا هەبوو.بەریتانیا لەو روانگەیەوە جێێ بایەخ بوو کە دوای شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٤٨، کە دارمانی سەڵتەنەتی لوئی فلیپ لە فەرەنسا و راکردنی فەردنیاند لە ئۆتریشی لێکەوتبۆوە، بە تاکەتاج وتەختی پتەوی ئەورووپا لە قەڵەم دەدرا. نیکۆلا لە زنجیرە دانوستانێکی سەیرو سەرشیتانەدا لەگەڵ سێر هاملتۆن سیمۆری باڵیۆزی بەریتانیادا، هەوڵیدا ئینگلیزەکان بکاتە هاوپەیمانی خۆی و، بەم شێوەیە رێگە بۆ

بەدیهاتنی مەرامەکانی خۆش بکات.قەیسەر بە مەبەستی دانوستانێکی تایبەتی، سیمۆری بانگ کردە کوشکی زستانەو زۆر بە نەرمی پێی گوت کە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە هەژارییەکی سامناکدایەو واباشە کە روسیاو بەریتانیا ناوچە ئەوروپاییەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە ژێر دەستی سوڵتان دەرهێنن و بە سەربەخۆیاندا بیبەشنەوە و گوتی: «*تورکیا بارودۆخێکی ئاڵۆزی هەیەو و وەک نەخۆشێک وایە کە لە سەرەمەرگدا بێت. ئەگەر رۆژێ لە رۆژان بەرلەوەی کە ئەو نەخۆشە کارەکانی رێکبێخرێن بمرێت، ئەوا جێی داخ و کەسەرێکی زۆرە و گەلێ گیروگرفت دێنێتە ئاراوە*». دەبوایە باڵیۆزی بەریتانیا لە قسەکانی قەیسەر تێگەیشتبێ، بەڵام چەند شەو دواتر و لە میانەی میوانداریەکی تایبەتی دووبارە قەیسەر رووی قسەی لە باڵیۆزی بەریتانیا کرد و راوبۆچوونەکانی خۆی بۆ خستەروو . لەگەڵ ئەوەشدا وای نیشاندا کە بە هیچ جۆرێک چاوی نەبڕیوەتە زەوییەکانی تورکیا و بەم قسەیە کۆتایی بە قسەکانی خۆی هێنا: «*ئیستاکە من دەمەوێ وەک دۆست و جێنتڵمانێک قسەتان لەگەڵدا بکەم. ئەگەر لەمبارەیەوە بەریتانیا لەگەڵ مندا رێک کەوێت، ئەوا شتێکی ئەوتۆ نامێنێتەوە. ئەوەی کە خەڵک دەیڵێن، یان بیری لێدەکەنەوە، بەلای منەوە گرنگ نییە* و زۆر بە *راشکاوییەوە* پێتان دەڵێم : *ئەگەر بەریتانیا بیهەوێ لە یەکێ لەم رۆژانە دا لە قوستەنتەنییە جێگیر بێت، ئەوا من رێگەی پێ نادەم، بەڵام منیش لە لای خۆمەوە بەڵێنتان پێدەدەم کە قوستەنتەنییە داگیر ناکەم*.»

چەند رۆژێک دواتر قەیسەر ئەوەی لە سێمور دووپاتکردەوە: «*پیاوە نەخۆشەکە لە سەرەمەرگدایەو، من بە هیچ شێوەیەک رێگە نادەم کە ئەم رووداوە غافڵگیرمان بکات. ئێمە دەبێ لە مبارەیەوە بگەینە رێککەوتنێک*».رۆژی دواتر کە *بێگومان* بۆهاندانی بەریتانیاییەکان بوو، گوتی: «*ئەگەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بڕمێت و بەریتانیا میسر داگیر بکات من هیچ دژایەتییەکم لەگەڵ ئەم کارەدا نابێ و سەبارەت* بە دوورگەی کێرتیش هەر ئەوە *هەڵوێستم* دەبێ.رەنگبێ *بەریتانیا چاوی* بڕیبێتە ئەم دوورگەیەوەو، پێموایە کەدەبێ *بەریتانیا* ببێ بە *خاوەنی* ئەم دوورگەیە».

باڵیۆزی بەریتانیا لەبەرامبەر ئەم پێشنیازە سەرسوڕهێنەرەداو لە وەڵامدا، گوتی لەو باوەڕە دانییە بەریتانیا حەزی لە داگیرکردنی میسر بێت، چونکە ئەوەی کە بەریتانیا مەبەستییەتی ئەوەیە کە رێگایەکی پەیوەندیکردنی ئەمینی بە هیندوستانەوە هەبێ. بەڵام وەڵامی قەیسەر سەرسوڕمانی سیمۆری لەوەندی کە هەشبوو پتر کردو، قەیسەر گوتی: «*زۆر باشە، وا لە وڵاتەکەتان بکە لەمبارەیەوە چاوێک بە سیاسەتەکانی خۆیدا بخشێنێتەوەو، ڕاو سەرنجی وڵاتەکەتان بە دوورودرێژی بە من ڕابگەیەنن. من لە دەوڵەتی بەریتانیا دڵنیام و لەو بارەیەوە هیچ جۆرە بەڵێن، یان رێکەوتنێکی نوسراویشم ناوێ و بگرە حەزم لە ڕاگۆڕینەوەی ئازادەو لەکاتی پێویستیشدا تەنها بەڵێنێکی جێنتڵمانانە بەسە*».

قەیسەر دەیویست چی بکات و بیری لە چی دەکردەوە؟ ئایا بەڕاستی پێیوابوو کە بەریتانیاییەکان وا بە ئاسانی ڕەزامەندی لەسەر پێشنیازەکانی دەدەن و باوەڕ بەو

درۆیە ئاشکرایانەی دەکەن؟ بەهەرحاڵ سیمۆر بە پەڵە ئەم مەسەلەیەی بە لۆردجان ڕاسێل، وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ڕاگەیاندو لە ڕاپۆرتێکدا کە لەو بارەیەوە ناردی، نووسی: *«قەیسەر کەوا بەسەختی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە بەم زووانە ولاتێکی دراوسێی دادەرمێ، بەدڵنیاییەوە ئەم بابەتەی لەلای خۆی وا گەڵاڵە کردووە، کە ئەگەر هەلومەرج بۆ لێک هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەباریش نەبێ، ئەوا بۆ خولقاندنی هەندێ ڕووداو کە ئەم لێک هەڵوەشاندنەوەیەی لێبکەوێتەوە، لەبارە».*

* * *

بێگومان، ئەم ڕاوبۆچوونەی سیمۆر دەوڵەتی بەریتانی هاندا تا بەوپەڕی ئەدەبەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا بەشێوەیەکی بنبڕ، هەموو جۆرە دانوستانێکی نهێنی سەبارەت بە مەسەلەی ڕۆژهەڵات، لەگەڵ قەیسەر دا ڕەت بکاتەوە. (٤)
نیکۆلا بە بیستنی ئەم وەڵامە زۆر نارەحەت بووە، چونکە پێشتر لەلای خۆیەوە دڵنیاببوو لەوەی کە لەگەڵ بەریتانیادا دەگاتە ڕێککەوتنێکی لەو چەشنەی کە خۆی گەرەکی بوو. بۆیە زووبەزوو دەستی کرد بە لۆمەی «پالمیرستۆنی بێ ئەدەب» و «سەگی تورکەکان» و سەبارەت بە مافەکانی روسیا لە پاراستنی شوێنە پیرۆزەکانی مەسیحییەکانی دانیشتووی تورکیا، پێداگرتنێکی سەیری لەخۆی نیشانداو لەو بارەیەوە هێندە چووە پێشەوە کە سەرئەنجام مەسەلەی بەرپرسیارییەتی روسیای لەبارو گوزەران و ژیانی پەیڕەوانی مەزهەبی ئۆرتودۆکس لەسەرانسەری خاکی عوسمانیدا هێنایە ئارایەوە.
بۆ جارێکی دیکە ئیستراتفۆرد کنینگی دۆستی دێرینی تورکیا گەڕایەوە گۆڕەپانەکە. کنینگ کە پێشتر باڵیۆزی بەریتانیا بوو لە قوستەنتەنییە، ساڵێک پێشتر خانەنشین کرابوو و، گەڕابۆوە بەریتانیا و پلەی (لۆرد)ی پێبەخشرابوو. ئێستا بەریتانیا نێوبراوی بەنازناوی (لۆرد ئیستراتفۆرد دۆردکلین) هوە دەناردەوە تورکیا. هەر کە مەترسی جەنگ پەرەی سەند، لەلایەن بەریتانیاوە فرمانی پێدرا هەموو هەوڵێکی خۆی بۆ هێورکردنەوەی هەردوولا (تورکیاو روسیا) بخاتە گەڕ، بەڵام ئیدی درەنگ بوو؛ نیکۆلا هێندە هاتبۆ پێش کە ئیتر توانای پاشەکشێی نەمابوو.
ئیستراتفۆرد، پیاوێکی سەیر بوو؛ بەیەکێ لە قوتابییەکانی پێشووی قوتابخانەی ئیتۆن لەقەڵەم دەدرا، کە زۆربەی سەردەمی کارو خزمەتی سیاسیی خۆی لە تورکیادا گوزەراندبوو و، کاریگەرییەتییەکی لە ڕادەبەدەری بەسەر عەبدولمەجیددا هەبوو.
ئۆرسلیی مێژوونووسی ئینگلیزی، نێوبراو بە: *«گەورەترین دیپلۆماتێک دەزانێ کە تا ئێستا لە خزمەت دەوڵەتی بەریتانیادا بووەو، بە پیاوێکیشی دەزانێ کە هەموو بەرپرسیارییەتییەکانی دەگرتە ئەستۆی خۆی و لەجیاتی ئەوەی کەسیاسەتی ولاتەکەی خۆی پیادە بکات، ڕێوشوێنی پێویستی بە ولاتەکەی خۆی نیشان دەدا».*
ئیستراتفۆرد، پیاوێکی باڵابەرزی بەهەیبەت و دەستپاک بوو. تورکەکان لە دڵەوە باوەڕیان پێی هەبوو و خۆشحاڵ بوون لەوەی کە مامەڵە و دانوستانی لەگەڵ

هیچکام لەدەسەڵاتدارانی تورکیادا نەکردبوو کەدەستیان بەخوێنی خەڵک سوور بوو. ئەو لە ژیانی دا دوو ئامانجی هەبوو؛ یەکەمیان ئەوەبووکە تورکەکان ناچار بکا لە سیستەمی دەسەڵاتی خۆیاندا هەندێ ڕیفۆرم ئەنجام بدەن و ئەوەی دیکەشیان ئەوەبوو کە خزمەت بە وڵاتەکەی خۆی بکات. بەڵام لە گەیشتن بەو ئامانجانەدا تووشی شکست و ناکامی بوو. ڕەنگبێ هۆیەکەشی بگەڕێتەوە بۆ ئەو دوژمنایەتییە شەخسییەی کە لە گەڵ ڕوسیادا هەیبوو، چونکە لە ساڵی ١٨٣٣دا، نیکۆلای قەیسەری ڕوسیا، نێوبراوی بە باڵیۆزی بەریتانیا لە ڕوسیادا قەبوڵ نەکردبوو. ئەم دوژمنایەتییە کە لەکاتی ئاشتی دا کاریگەرییەتییەکی ئەوتۆی نەبوو، ئێستا کە باسی جەنگ لە ئارادابوو، چەند جارێک بووە مایەی ناڕەحەتی دەوڵەتی بەریتانیا. بەڵام تورکەکان خۆشیان دەویست و نازناوی (بیوک ئیلچی ـ باڵیۆزی مەزن)یان پێ بەخشیبوو.
لەگەڵ نزیکبوونەوەی مەترسیی جەنگ، وردە وردە ئەوە بەدیار دەکەوت کە ئیدعاکانی ڕوسیا سەبارەت بە ڕزگارکردنی مەسیحییەکان و پاراستنی شوێنە پیرۆزەکان تەنیا بیانوویەک و پەردەیەک بووە بۆ شاردنەوەی مەرامە فراوانخوازانەکانی قەیسەر.
ڕۆژنامە سانسۆرکراوەکانی ڕوسیا بە «جیهادی پیرۆز» نێویان دەبرد، بەڵام هەمووان دەیانزانی کە ئامانجی سەرەکی قەیسەر، دەستبەسەراگرتنی قوستەنتەنییەیەو دەوڵەتی بەریتانیاش نەیدەتوانی ڕازی بێت لەسەر ئەوەی کە بەبەرچاویەوە پایتەختی عوسمانی بکەوێتە دەست ڕوسیا و شاڕێی ستراتیژیی خۆی لە پەیوەندیکردن بە هیندستان بپچڕێت.
لەنێوخۆی بەریتانیاش هۆکارە سیاسییەکان گۆڕابوون؛ ئەو نەوەیەی شەڕی فەڕەنساییەکانی دیبوو، جێی خۆی دابوو بە نەوەیەک کە هیچی لە شەڕ نەدەزانی و لە دڵیاندا، قین و نەفرەت لە فەڕەنساییەکان جێی خۆی دابوو بە ترسان لە ڕوسیاو بارودۆخ پێچەوانە ببۆوە.ئۆتریش و فەڕەنساش بە نۆرەی خۆیان لە ڕوسیا دەترسان، چونکە ئەگەر بهاتایە ڕوسیا توانیبای دەست بەسەر قوستەنتەنییەدا بگرێ، سەروەری دەریاییی فەڕەنساییەکان لە دەریای ناوەڕاستدا دەکەوتە مەترسییەوە، ئۆتریشیش لەوەدەترسا کە ئەگەر ڕوسیا لەڕادەبەدەر بەهێزبێ، ئەوا ڕەنگە پەلاماری سنوورەکانی ئەوانیش بدات.
ئینجا لەم ڕوانگەیەوە، وڵاتە ئەوروپاییەکان جارێکی دیکە پێشنیازی ئاشتییان دابە ڕوسەکان و نوێنەرانی تێکڕای وڵاتانی ئەوروپا جگە لەڕوسیا، لە ڤیەننا کۆبوونەوەو سەرئەنجام بۆ نەهێشتنی ناکۆکی ئایینیی نێوان تورکیاو ڕوسیا، هاوکێشەیەکیان دۆزییەوە. ئەم هاوکێشەیە کە پێدەچوو مەنتیقی بێت، بواری ئەوەی بە نیکۆلا دەدا کە بەبێ ئەوەی ئابڕووی بچێ لەم جەنگە بکشێتەوەو پاشەکشێ بکات. نیکۆلا لە نێوان خۆشحاڵیی گشتیدا ڕەزامەندی خۆی لەسەر ئەم هاوکێشەیە دەربڕی و وڵاتە ئەوروپاییەکان هاوکێشە پێشنیازکراوەکەیان خستە بەردەمی تورکەکان و دەوڵەتی بەریتانیا فرمانی بە باڵیۆزەکەی خۆی دا، کە هەموو هێزو توانای خۆی بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی تورکەکان لەسەری ڕازی بن و قەبوڵی بکەن.

کاریگەریی ئیستراتفۆرد بەسەر سوڵتانی عوسمانی هێندە زۆر بوو کە دەوڵەتی بەریتانیا دڵنیابوو لەوەی کە ئیستراتفۆرد دەتوانێ وا لە عەبدولمەجید بکات کە ئەم هاوکێشەیە قەبوڵ بکات، بەڵام ئایا ئیستراتفۆرد هی ئەوە بوو کە پشتی پێ ببەسترێ؟ لۆرد ئێبردینی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لەو بارەیەوە بەڕادەیەک گومانی هەبوو کە یاداشتێکی ناردە وەزارەتی دەرەوەو نووسی: «*من، شاژنم بۆ ئەوە ئامادەکردووە کە بتوانێ قەبووڵی ئەوە بکات کە لە پڕێکا ئیستراتفۆرد دەست لەکار بکێشێتەوە*». لۆرد کلاریندۆنی وەزیری دەرەوە لە وەڵامدا گوتی: جێی داخە کە دەوڵەت گومانی لە هەوڵەکانی ئیستراتفۆرد بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی هەیە.مەسەلەیەکی دیکەش کە ببووە هۆی مانەوەی ئیستراتفۆرد لە تورکیا ئەوەبوو، کە لەو کاتەدا هیچ ئەلتەرناتیڤێک بۆ جێ گرتنەوەی نەدەبیندرا. چیوای پێنەچوو کە ترسی دەوڵەتی بەریتانیا بووە ڕاستی و نەفرەتی ئیستراتفۆرد لە روسیا، کە لای ئیستراتفۆرد ببوو بەگرێیەکی دەروونی و، باوەڕیی بەوەی کە تورکەکان سووکایەتییان پێکراوە، بووە هۆی ئەوەی کە ئیستراتفۆرد نەتوانی بە باشترین شێوە ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێ. ئەو بە شێوەی ڕەسمی فرمانی وڵاتەکەی خۆی جێبەجێ کردو داوای لە تورکەکان کرد کە ڕەزامەندی لەسەر ئەو هاوکێشەیە بدەن کە ئەورووپاییەکان پێشنیازیان کردووە، بەڵام لە گفتوگۆ تایبەتییەکان و ئەو شێوازەی کە لە خستنەڕوو و ناساندنی نێوەرۆکی هاوکێشەکەدا بەکاری برد، بووە هۆی ئەوەی کە دەسەڵاتدارانی تورکیا کە بە باشی دەیانناسی بگەنە ئەو قەناعەتەی کەوا ئیستراتفۆرد ڕەزامەندییەکی ئەوتۆی لەسەر بڕیاری وڵاتەکەی خۆی نییە و لەگەڵیاندا ناکۆکە. بۆیە تورکەکان زۆر بەڕاشکاوی پێشنیازەکەی ڤییەننایان ڕەتکردەوەو بەو شێوەی کە ئۆرسلی نووسیویەتی: «*ئیستراتفۆرد بووە هۆکاری هەڵایسانی ئەو شەڕەی کە لەنێوان روسیاو بەریتانیادا بەرپا بوو*».

لەڕوانگەی تورکەکانەوە کە لە خۆشیان ئاگایان لە خۆ نەمابوو، ئیستراتفۆرد هێشتا هەر باڵیۆزی مەزن بوو. هەرچەندەکە تورکەکان بەهاندانی ئیستراتفۆرد کەوتبوونە جەنگەوەو ئیستراتفۆردیش ببوو بە هۆکاری کوژرانی هەزاران تورک، بەڵام تورکەکان بە یارمەتی فەڕەنسا و بەریتانیا توانیان روسیا بە چۆک دابێنن و شکستی بدەن و دەرفەتێکی بیست ساڵەی دیکە بە ئیمپڕاتۆرییەتە ڕوو لە نەمانەکەی خۆیان ببەخشن.

* * *

## فەسلی هەشتەم

## شێتەکەی کۆشکی دۆلمە باخچە

جەنگی کریمە کە سێ ساڵی خایاند، هێندە کاریگەرییەتی بەسەر ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی تورکیاوە نەبوو. هەندێ لە خەڵکی تورکیا نێوی چەند شەڕێکی گرنگی وەک بالاکلاوا، ئینکرمان و سواستۆپۆل یان هەر نەبیستبوو. لە ڕۆژانی جەژندا، کاتێ شازادە تورکەکان دەچوونە مزگەوت، سەر ڕێگەیان لە هەموو ئەو شتانەی کە بەجۆرێک نیشانگەری جەنگ بوو و، ڕەنگبوو گالیسکەکانیان تەکان بدات، پاک دەکرایەوەو لە پێش چاوی خەڵک ون دەکران.
زۆر لە خەڵکی تورکیا بەشداری ئەم جەنگەیان کرد کە یان کوژران، یان تووشی برسیەتی بوون، چونکە بەشە خۆراکی سەربازەکان بە مانگ دوا دەکەوت. بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەو وڵاتە شەڕیان پێ لە دیتنی خاتوو (فلۆرانس نایتینگێڵ)ی ئینگلیزی کە لە کەمپی ئسکودار بەپەرستاریکردن لە سەربازە بریندارەکانەوە خەریک بوو، باشتر بوو و بوونی ئەو ئافرەتە چاکەکارە قینێکی تاڵی لەنێو دڵی تورکەکاندا دەخوڵقاند.
کاتێ کە عەبدولەجید سەردانی بەرەکانی جەنگی کرد، سەربازە تورکەکان زۆر لەوە نارەحەت بوون کە دەیان دیت سوڵتانی عوسمانی شان بەشانی ژەنەڕاڵە ئەوروپاییەکان ئەسپ تاو دەداو سڵاو لەو سەربازە سەرو گوێلاک سوورە کافرانە دەکات، کە لە جیاتی شەڵوار، دامێنیان لە پێ دابوو و قولە ڕووت و توکنەکانیان لەژێر کێلتە سکۆتلەندییەکانەوە دەبیندرا.
جەنگی نێوبراو لە ساڵی ١٨٥٦ و بە ئیمزاکردنی پەیمانی پاریس کۆتایی پێهات و بە پێی ئەم پەیمانە سنوری تورکیا وەک خۆی مایەوەو روسیا وازی لە ئیدعایە ئایینیەکانی هێناو، دەریای ڕەش بەسەر کەشتیە بازرگانیەکاندا کرایەوە. بەڵام ڕێگەنەدرا گەلەکەشتیی سەربازی رووی تێبکەن. گرنگترین بڕگەی ئەم پەیماننامەیە ئەوەبوو کە وڵاتە ئەوروپاییەکان بەڵێنی ئەوەیان دەدا دەست لە کاروباری نێوخۆیی تورکیا وەرنەدەن.بەڕای ئیستراتفۆرد کە لەو بڕوایە دابوو مافی مەسیحییەکانی تورکیا تەنها لە ڕێگای ئەو چاکسازییانەوە دەپارێزرێ کە لەلایەن بێگانەکانەوە

بەسەر تورکیا دابسەپیندرێت، برگەی نێوبراو تاڵترین لێدانێک بوو کە بەدرێژایی ژیانی ئاراستەی دەکرا. بۆیە لەکاتی ئیمزاکردنی پەیمانەکەدا گوتی:*«بەلامـــەوە واباشترە کە دەستی ڕاستەم ببڕنەوە، بەلام ژێر ئەم پەیمانە ئیمزا نەکەم»*.

* * *

شەڕی کریمە ببووە هۆی ئەوەی کە بەشێوەیەکی کاتی ڕوسیا خەیاڵی هێرشکردنە سەر قوستەنتەنییە لە بیر خۆی بەرێتەوە. بەڵام ئێستاکە دەروازەکانی پایتەخت، بەسەر پەلاماردەرێکی بێرەحم و بەزەیی کە بەهیچ بنەمایەکی ئەخلاقییەوە پابەند نەبوو، کرابۆوە کە ئەویش هەمان سەرمایەدارانی ئەورووپایی بوون. عەبدولەجید لە پێنج ساڵی دوایی تەمەنی، بوو بە تاکە سوڵتانی عوسمانی کەبەدوای سودخۆرە ئەورووپاییەکانەوەبوو. عەبدولەجید بە بیانووی شەڕی روسیاو، بەمەبەستی نوێکردنەوەی سوپاکەی قەرزێکی زۆری وەرگرت، بەڵام بەشی زۆری ئەو پارەیەی لە کۆشکی دۆلمەباخچە خەرجکردو ئەوەی دیکەشی چووە گیرفانی خۆی و کار بەدەستانی دیکەی وڵات.

کاتێ کە یەکێ لە کچەکانی عەبدولەجید شوی کرد، عەبدولەجید چوار ملیۆن فرانکی لە جلی بوکێنی و جیازو مەراسیمی گواستنەوەی، کە هەفتەیەک درێژەی هەبوو، خەرجکرد. عەبدولەجید لەساڵی ١٨٦١ (١٢٧٧ـی کۆچی)،کۆچی دوایی کرد و براکەی عەبدولعەزیز لە جێی دانیشت و بەدیار کەوت کە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی نەک هەر لەڕووی ماددی، بگرە لە رووی مەعنەویشەوە، وەرشکست (نابووت)بووە.

سوڵتانی نوێ بابایەکی کەتەی ١٣٠ کیلۆگرامی بوو کە یەکەم کارێک کە کردی ئەوەبوو هەستا چوو تەختە خەوێکی بەدرێژی چوارمەترو پانیی پێویست بەڕادان دا تا جێی لەشە قەبەکەی و دوو سێ یەک لە ژنەکانی لەسەر جێگەک ببێتەوە. نێوبراو (٩٠٠) ژنی هەبوو کە بەهۆی (٣٠٠٠) خواجەسەراوە دەپارێزران.

هەموو شتێکی عەبدولعەزیز لە هەموو ڕوویەکەوە گەورەو قەبە بوو. عاشقی نانخواردن بوو و، زۆریش کەیفی بە هێلکەو ڕۆن دەهات و زۆربەی کات دوازە هێلکەی بە ژەمێک دەخوارد. بەڵام ئەغلەب خواردنەکەی بەردەمی خۆی تەواو نەدەکرد، چونکە عادەتی وابوو قاپی چێشتەکەی بەیەکێک بەو دەرباریانە دادات کە بەجۆرێک خولقی تێک بدابایە، بەتایبەت بەو کەسانەی کە ڕازی نەدەبوون بۆ دروستکردنی کۆشکی نوێ و هێنانی ئاژەلی درندەی وەک شێرو پڵینگ لە ئەفریقاوە پارەی بدەنێ.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، لەڕووی سیماو ڕووخسارەوە سوڵتانیکی عوسمانی بێ کەم و کورتی بوو. لەڕووی تەندروستییەوە ڕەنگبێ یەکێ لە تەندرووستترین ئەندامی بەرەبابە تەمەن ٤٠٠ ساڵانەکەی بوو بێ، بەڵام تەنها دەکرێ لەم ڕووەوە پێی هەلابلێین چونکە لەڕاستیدا کەللەسەری بەتاڵ بوو و، شتێک بەناوی مێشکی تێدا بەدی نەدەکرا. ئەو بەڵێنی ڕیفۆرم و پاشەکەوتی دارایی بەخەڵک دەداو لەبەرامبەریشدا ئەو بەڵینانەی نەدەهێنانەدی. هەرچەندە لەو ماوە (١٥) ساڵیەی کە

دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو تووشی هیچ جەنگێک نەهات، بەڵام کارە سەرشێتانەو دوور لە نەریتەکانی بووە هۆی ئەوەی قەرزی تورکیا بە بانکەبیانیەکان بگاتە ٢٠٠ ملیۆن لیرە.

* * *

لەسالانی دەیەی ١٨٦٠ (١٢٨٧-١٢٧٧ی کۆچی) عەبدولعەزیز لەگەڵ گرفتێکی نوێدا بەرەورووبۆوە و ئەویش ئەوەبوو کە خەڵک ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر جەختیان لەسەر داخوازی دەست پێکردنی چاکسازی و ریفۆرم دەکرد. لەمڕووەوە لە ساڵی ١٨٦٥ (١٢٨٢ی کۆچی)دا، واتا دوو ساڵ دوای کوژرانی *ئابراهام لینکۆڵ*ی سەرۆک کۆماری ئەمەریکا «*کۆڕی عوسمانییە نوێیەکان*»یش بەشێوەیەکی نهێنی لە قوستەنتەنییە دامەزرا. کۆڕی نێوبراو لەسەرەتادا تەنها ٢٤٥ ئەندامی هەبوو کە ڕێبەرەکەیان نووسەرێکی ئازادیخواز بەناوی *نامیق کەمال* بوو و دوو لە شازادەکانی ئەندامی بنەماڵەی دەسەلاتدار بەشدارییان لە کۆبوونەوە نهێنییەکانی ئەو کۆڕەدا دەکرد.

ئامانجی ئەنجومەنەکە زۆر ساکارو بریتی بوو لەوەی کەدەسەلاتە تاکرەوی و ئیستیبدادییەکەی ئەوسا بگۆڕێ بۆ پاشایەتیەکی مەرجدار (مشروطە)و پرۆگرامەکەشی لەبەر گیراوەی پرۆگرامی کۆڕێکی نهێنی ئیتالیا بەناوی کاربۆناری بوو.

داوێنی چالاکییەکانی کۆڕی نێوبراو کە بەپێشقەراوڵی بزاڤی تورکە لاوەکان لەقەڵەم دەدرێت، بەخێرایی پەرەی سەند. ئەندامەکانی شۆڕشگێرانێکی کەللەرەق و توندوتیژ نەبوون و مەبەستیشیان نەبوو کۆمەڵگای تورکی بکەن بە کۆمەڵگایەکی ڕۆژئاوایی، بەڵام هەوڵیان دەدا ڕێ بۆ ریفۆرمێک خۆش بکەن کە کاردانەوەیەکی توندی لەبەرامبەردا نەکرێت.

لە نێو لایەنگرانی کۆڕەکەدا نیشتمانپەروەرێکی مەزن هەبوو، کە چارەنووس وای دانابوو ڕێچکەی مێژووی تورکیا بگۆڕێت و ئەو نیشتمانپەروەرەش (میدحەت *پاشا*)بوو.

بنەماڵەی میدحەت پاشا، دانیشتووی بولغاریابوون ونێوبراو خوێندنی بەشێوازی کۆن تەواو کردبوو و، لە تەمەنی دەساڵیدا، قورئانی لەبەرکردبوو. لەسالانی دواتردا فێری زمانی فەرەنسی ببوو و، بەخێرایی لە بەدەستهێنانی پۆستە گرنگەکانی دەوڵەتدا چووبۆ پێشەوە. چەند مانگێک بەر لەوەی دەست بەکاری سیاسی بکات، ڕوخسەتی وەرگرتبوو و بەمەبەستی توێژینەوە لەبارەی ڕێکخراوە سیاسیەکانی ئەوروپا سەردانی چەند وڵاتێکی ئەوروپایی کردبوو. نێوبراو لە پلەی پارێزگاردا، جێی ڕێزو متمانەی خەڵک بوو و، باوەڕێکی پتەویشی بە دامەزراندن و بەرقەرارکردنی دەسەلاتێکی مەرجدار (*مشروطە*) هەبوو. سیاسەتمەدارێکی وریاو دەسەلاتخواز بوو کە بەڕوونی بۆی دەرکەوتبوو تاکە ڕێگای پێشگیری لە دارمانی ئیمپراتۆرییەتی وەرشکەستی عوسمانیی ژێر دەسەلاتی سوڵتانێکی شێت، ئەوەیە کە لە نێوخۆدا دەست بەریفۆرم و چاکسازی بکرێت.

کاتێ عەبدولعەزیز هەواڵی دامەزراندنی ئەم کۆڕە نهێنییەی پێگەیشت، زۆر ترساو تەنها لە دواساتدا لە لەسێدارەدانی ئەندامەکانی پاشگەزبۆوە. بەلام بەخێرایی فرمانی لێک هەڵوەشاندن و بلاوەپێکردنی کۆڕەکەی دەکرد. ئەم فرمانە کاریگەرییەتیەکی ئەوتۆی نەبوو، چونکە ژمارەیەکی زۆر لەو تورکانەی لە پۆستە گرنگەکانیان لەبەردەست دابوو، لەبەرامبەر جێبەجێ کردنی بڕیارە بێ سەروبەرەکانی سوڵتاندا هەستیان بەشەرمەزاری دەکرد. بەم پێیە هەرچەندە کۆڕی عوسمانیە نوێیەکان بەشێوەیەکی ڕەسمی هەڵوەشێندرایەوە، بەڵام بەشێوەیەکی نارەسمی کاریگەرییەکی پتری بەسەر خەڵکەوە پەیدا کردو پەرەسەندنێکی بەرچاوی بەخۆوە دیت . لەشارە گەورەکاندا، هەندێ لقی لێ دامەزرێندراو، ئەو پەنابەرە سیاسییە تورکانەی کە لە ئەوروپا دەژیان، بە قازانجی ئەم کۆڕە دەستیان کردە پڕوپاگەندە کردن.

زۆر لەو بیانییانەی کە لە تورکیا ئاکنجی بوون، ئاگاداری چالاکیەکانی ئەم کۆڕە بوون. میسیۆنێرێکی ئەمەریکایی بەنێوی (ڤان لێپ) لەدەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا لە ساڵی ١٨٦٤، لەمبارەیەوە نووسیویەتی:«*لێرە حزبێک هەیە کە بەشێوەیەکی گشتی پێکهاتووە لەو لاوانەی کە لە ئەوروپا خوێندوویانە و دەکرێ نێوی لێ بنێین تورکیای لاو. ئامانجی ئەو حزبە ئەنجامدانی ڕیفۆرمی بەرفراوان و قووڵە لە کشت کارو دامەزراوە دەوڵەتییەکاندا*».

میدحەت پاشا کاریگەرییەکی زۆری بەسەرلاوە خوێندەوارەکاندا هەبوو و، نێوی بەرامبەر بوو بە پێشکەوتن. عەبدولعەزیز بۆی دەرکەوت کە مەترسی ڕاپەڕین و نائارامی لە ئارادایەو لەبەر ئەوەیش کە پێیوابوو پارە چارەسەری هەموو گرفتێکە، بڕیارێکی سەیری داو ئەویش ئەوەبوو کە سەردانی ئەوروپا بکات. ماوەیەک پێشتر ناپلیۆنی سێیەم، عەبدولعەزیزی بۆ پاریس بانگهێشت کردبوو، هەرچەندە کە عەبدولعەزیز لەسەرەتادا نیازی وابوو داوەتەکەی ڕەتبکاتەوە، بەڵام ئێستا ڕای گۆڕابوو و، پێیوابوو کەبەسەردانی ئەوروپا دەتوانی دوو ئامانج بپێکێ و بەقەولی مەعروف بەتیرێک دوونیشان بکشێنێ؛ یەکەمیان ئەوەبوو کە ڕەنگبێ تورکە لاوەکان وای لێکدەنەوە کە چیدی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەروازەکانی خۆی بەسەر بیروباوەڕی ئازادیخوازانەدا داناخاو دووەمیشیان ئەوەبوو کە بێگومان ئامادەبوونی لە ئەوروپا دەتوانێ لەدانەوەی سودی قەرزە دوو سەد ملیۆن لیرەییەکەیدا یارمەتیی بدات. لەهزری بچوکی عەبدولعەزیزدا هەموو شتێک ئاوا بە سانایی چارەسەر دەبوو. پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەو سەردەمە، بەسەردەمی دان وستانی گەورە لە قەڵەم دەدراو، لەهەمان ساڵدا ئەمەریکا ناوچەی (ئالاسکا)ی بە بەهای (٧) ملیۆن دۆلار لە ڕوسیا کڕیبوو. کەواتا عەبدولعەزیز هەرگیز ئەوەی بەمێشکدا نەدەهات کە لە وەرگرتنی قەرزی نوێ بەمەبەستی دانەوەی سودی قەرزە کۆنەکانی، لەگەڵ گرفت دا بەرەوڕوو دەبێتەوە.

* * *

عەبدولعەزیز لە ساڵی ١٨٦٧ (١٢٨٤ی کۆچی)، سەردانی پاریس و لەندەنی کرد،

بەڵام ئاکامی سەردانەکانی بە پێچەوانەی لێکدانەوەو خواستەکانی دەرچوون. بەر لە دەست پێکردنی سەردانەکەی عەبدولعەزیز، ئەوروپاییەکان وەک ڕووناکبیرترین دەسەڵاتداری سیلسیلەی عوسمانی نێویان دەهێنا کە بۆ یەکەمجار سەردانی ئەوروپا دەکات. بەڵام دیتنی شان و شکۆو دەوڵەمەندیی فەڕەنساو بەریتانیا کاریگەرییەتیەکی وەهای کردە سەر عەبدولعەزیز کە تا کۆتایی تەمەنی تووشی گرێی خۆ بەکەم زانیی کرد. ئەمەش وایکرد کە بەشێوەیەکی شێتانە پابەندی ڕۆتین و شکۆی ڕووکەشی دەربارەکەی بێت و تەنانەت وای لێهات هەندێ لە وەزیرو کاربەدەستە پایە بەرزەکانی دەوڵەت لەبەرامبەر ئەم سەرکێشییە ڕاپەڕن و لێی هەڵگەڕێنەوە.
لە پاریس، ڕۆژە هێمنەکانی ئیمپراتۆرییەتی ناپلیۆنی سێیەم ڕووەو کۆتایی دەچوون، بەڵام پێشانگای گەورەی نێو دەوڵەتی، ژمارەیەکی زۆر لە پادشایەکانی ئەوروپا و هاوسەرەکانیانی لە چوار گۆشەی دنیاوە ڕاکێشابۆ پاریس. تا ئەو کاتە هەرگیز کۆبوونەوەیەکی وەها و بە ئامادەبوونی ئەو هەموو ئیمپراتۆر و پادشایە لەیەک کات و لەیەک شوێندا نەبیندرابوو. بەڵام هیچ کام لەوان بەقەدەر سوڵتانی عوسمانی سەرنجی فەڕەنساییەکانی ڕانەکێشا.
بەر لەهاتنی عەبدولعەزیز ڕۆژنامەیەکی پاریسی پێشبینیی ئەوەی کردبوو:«*سوڵتان بەسواری گالیسکەیەکی ئاڵتونی و لەکاتێکدا کە ژمارەیەک لە ئافرەتە پەری شێوەکانی حەرەمسەراکەی بەپێیان بەدوای دادەڕۆن و لە دوای ئەوانیشەوە ژمارەیەک فیل کە زنجیری زێڕیان لەملەو خولامەڕەش پێستەکان ڕایان دەکێشن، پێدەنێتە پاریسەوە*». بەڵام ڕاستی مەسەلەکە بە پێچەوانەوەبوو، چونکە کاتێ ئەو شەمەندەفەرەی کە سوڵتان لێی سوار ببوو هاتە نێو گاردۆلیۆنی پاریسەوە، فەڕەنساییەکان بە دیتنی بابایەکی کەتەی وەک عەبدولعەزیز کە جلی ئەستەمبۆڵی ساکاری پۆشیبوو و، فینەی سووری لەسەرنابوو، واقیان وڕما و تووشی نائومێدی بوون.
ناپلیۆنی سێیەم میوانداریەکی زۆر پڕشکۆی لە سوڵتانی عوسمانی کردو بەم بۆنەیەوە کۆشکی ئەلیزیی وەک کۆشکێکی ئەفسانەیی نێو ئەفسانەی هەزارویەک شەو لێکرد، بەڵام دیدار گفتوگۆکانی نێوان ئەم دوو ئیمپراتۆرە سەرکەوتنێکی ئەوتۆی تێدا بەدی نەکرا. چونکە کاتێ کە ناپلیۆن لەمیانەی قسەکردنەکاندا ئاماژەی بە خزمایەتی ئێمێ و ژۆزێفین کردو گوتی ئەوان لەلای نەنکیانەوە دەبنە خزمی یەکدی، سوڵتان زۆری پێ ناخۆش بوو و، کاتێ فەڕەنساش قەرزی نوێی نەدایە، ساردی نێوانیان گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. لە بەریتانیا عەبدولعەزیز چاکتری ڕابوارد، هەرچەندە کە میوانداریەتی ئینگلیزەکان بەقەدەر میوانداریی فەڕەنساییەکان پڕشکۆ نەبوو.
کاتێ سوڵتان لەگەڵ برازاکانی؛ موراد و عەبدولحەمید، لە دەریای مانش پەڕییەوەو پێی نایە سەرخاکی بەریتانیا، شاژن ڤیکتۆریا دوای چەند هەفتە بگرەو بەردە ئامادەبوو لە خەڵوەتەکەی خۆی بێتەدەر و چاوی بە سوڵتان بکەوێت، بەڵام لە

دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا لەمبارەیەوە نووسی: «*هیوادارم هەرگیز نەیەتەوە بەریتانیا*».
بەم پێیە ڤیکتۆریا عەبدولعەزیزی بانگهێشتی کۆشکی ویندسۆر کردو دەوڵەتی بەریتانیاش ئەوەی لەدەستی هات کردی، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانەش نەگەیشتە ئەو میواندارییەی کە فەرەنساییەکان لە عەبدولعەزیزیان کرد.
لەوبەرئەوبەری شەقامەکانی لەندەن، حەشامەتی خەڵک بۆ پێشوازی سوڵتانی عوسمانی وەستابوون، چونکە ئەگەرچی ئێستاکە جەنگی کریمە بووە بەشێک لە مێژوویان، بەڵام خەڵکی بەریتانیا هاوپەیمانە ئازاکەی خۆیان لەبیرنەکردبوو. لەو ساتەوەی کە عەبدولعەزیز لە بەندەری (دوڤێر) سواری شەمەندەفەربوو و، مەودای دوو کاتژمێریی نێوان ئەوێ و پایتەختی بەریتانیای بڕی و دوایش کە بە گالیسکەی ئاڵتونی و ئیسکۆرتی سوارە نیزامی پاسەوانانی پاشایەتی پێی نایە کۆشکی باکینگهام، زۆر بەسەختی کەوتە ژێر کاریگەری سەروەت و سامان و گەورەیی ئەو وڵاتەوە. بەڵام کاردانەوەشی سەرنج ڕاکێش بوو؛ چونکە ئەو شەوەی کە لەلایەن شارەوانی لەندەنەوە بانگهێشت کرابوو، سواری ئەسپێکی سپی بوو و، لە کاتێکدا کەسینگی جلە سەربازییەکەی دنیایەک نیشان و هێمای پێوەبوو و، جەقەیەکی ئەڵماسی گەورەشی لە فینەکەی دابوو، بەشداری میواندارییەکەی کرد. لوتکەی میوانداریی ئینگلیزەکان ئەو خۆنیشاندانە دەریاییە بوو کە لە بەندەری(ئیسپیت هێد) بەبۆنەی هاتنی سوڵتان ڕێکخرابوو، کە بەهۆی کەشوهەوای تۆفانیی دەریا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو سوڵتان وا تووشی دەریاگرتوویی بوو، کە شاژن ڤیکتۆریا لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیویەتی:«*سوڵتان لەسەر دەریا هەستی بە ناڕەحەتییەکی زۆر کرد. پەیتا پەیتا دەچۆوە نێو کەشتی و زۆر بەکەمی هاتە سەررووی کەشتییەکەوە، کە بەڕاستی جێی داخ بوو. چونکە دیمەنی خۆنیشاندانی گەلە کەشتییەکە بەڕاستی سەرنجڕاکێش و دیدەنی بوو*».
کاریگەرییەتییەکانی ئەم سەردانەی ئەورووپا بەسەر عەبدولعەزیزدا، کە تووشی گرێی خۆبەزل زانی ببوو، لەگەڕانەوەی تورکیادا، بووە هۆی پەرەسەندنی دەست بڵاوی و کارە سەیرو سەمەرەکانی و ئەمەش خەرجیەکانی کۆشکی دۆڵمەباخچەی لە ساڵێکدا گەیاندە دوو ملیۆن لیرە کە لەو سەردەمەدا پارەیەکی یەکجار زۆر بوو.
لەم کۆشکەدا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر نزیک بە (٥٠٠) خزمەتکار بە خزمەت کردنەوە خەریکبوون. هەموو شەوێ پتر لە سێسەد کەس لەگەڵ سوڵتاندا، لەسەر یەک سفرە نانیان دەخوارد. ٣٠٠ کەس لە مەتبەخ خزمەتیان دەکرد، (٤٠٠) مەیتەر لە تەویلەی پاشایەتیدا بەتیماری ئەسپەکانی سوڵتانەوە خەریکبوون، چوار سەد مۆسیقاژەن مۆسیقایان دەژەنی و ٢٠٠ کەسیش بە پاسەوانی و ئاگاداریکردن لە ئاژەڵەکانی باخچەی ئاژەڵانی سوڵتانەوە خەریکبوون.
ڕۆژ بە ڕۆژ سوڵتان شێتتر دەبوو. فرمانیدا، بەتێکڕای کتێبەوانەییەکانی قوتابخانەکانی سەرانسەری تورکیا دابچنەوەو لەهەر شوێنێک ئاماژەیەک بە

شکستەکانی تورکیا، یان شۆڕشی فەڕەنسی و مەسیحییەت کرابێ، لا ببردرێت.
لەنێو کۆشکدا، وەک ئاغایەکی لەبیانو و شێت ڕەفتاری دەکرد. جاری وا هەبوو ئەوانەی نێو دەرباری خۆی والێدەکردن کە لە بەرامبەری دا چۆک دابدەن و بەرلەوەی کە مەتڵەبەکانیان بخەنەڕوو، قاچی ماچ بکەن.
جارێکیان کارمەندێکی دەوڵەت کە نێوی عەزیز بوو ، نامەیەکی بۆ سوڵتان هێنا؛ سوڵتان لەوەی کە کابرا نێوی عەزیزو هاونێوی خۆیەتی هێندە تووڕەبوو کە سەرشێتانە فرمانی دا کە دەبێ هەر کەسێ لە دەزگای دەوڵەتدا نێوی عەزیز بێت بەپەلە نێوی خۆی بگۆڕێت.
جارێکی دیکە دیسان لە کەللەی داو بڕیاریدا هەرچی نامەی هاتوو هەیە سەر لەنوێ بەمەرەکەبی سوور بنووسرێنەوەو لەئەنجامدا دەزگای دەوڵەت، کە خۆی لە خۆیدا ڕووەو لەنێو چوون بوو تا ئەودەمەی کە بەسەر لەنوێ نووسینەوەی نامەکانەوە خەریک بوو، بۆ چەند ڕۆژێک لەکار کەوت.
سەرگەرمیی شەوانەی دووشت بوو:یەکیان گەمەکردن لەگەڵ سەربازکاندا، ئەویش نەک سەربازی ساختە، بگرە سەربازی ڕاستەقینە.
بەو مانایەی کە وای لە دوو دەستە سەرباز دەکرد کە بەو تفەنگانەی کە بۆ ڕاهێنان بەکاردەهاتن، لەگەڵ یەکدی بەشەڕ بێن و بۆخۆشی تابەرەبەری بەیانی لە پشت پەنجەرەوە سەیری دەکردن. سەربازەکان بە سەروچاوی ڕەش هەڵگەڕاوەوە شەویان دەکردە ڕۆژ.
سەرگەرمییەکی دیکەشی بریتی بوو لەوەی کە خۆی بەگەمەکردن لەگەڵ مریشک و کەڵەبابەکانییەوە خەریک بکات. خزمەتکارو ئەوانەی کەلە دەرباردا دەژیان، دەبوایە لەو ماوەیەدا قڕوقپ لە گۆشەیەک بوەستن و سەیری ئەم گەمەیەی سوڵتان بکەن، کە وەک شێتان سەری لەدووی ئەو پەلەوەرە بەستەزمانانە دەناو هەرکە یەکێکیانی دەگرت بەقاقا لێدانەوە بەرزترین و بەنرخترین مەدالیای ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەملەوە دەکرد. خزمەتکارەکانی دەربار لەسەریان بوو کە ڕێگە نەدەن هیچ کام لە مریشک و کەڵەبابەکانی سوڵتان بەبێ مەدالیاکانیان بێنە بەردەم سوڵتان. جاری وابوو تووشی گومانێکی سەخت دەبوو؛ جارێک لە کەللەی دا کەوا دەربارییەکانی دیانەوێ دەرمانداوی بکەن، بۆیە چەند ڕۆژ بە بەردەوامی تەنها هێلکەی کوڵاوی خواردو دەبوایە ئەم هێلکانەش لەلایەن شازنی دایکەوە بکوڵێندرابان و لە پارچە قوماشێکی ئەتڵەسی ڕەشدا بپێچرێنەوەو سەریان مۆر بکرێت. جاری واش هەبوو تووشی ترس لە ئاگر دەبوو و، ڕێگەی بەکەس نەدەدا سۆپاکانی کۆشک دابگیرسێنێ و تەنانەت چرایەکیش پێ بکات. بۆیە لەو شەوانەدا مۆمێکی پێدەکردو لەترسی ئەوەی نەوەکا بەربێتەوە و ئاگر بەر بداتە کۆشکەکەی، لەناو تەشتە ئاوێکی دادەناو ئینجا دادەنیشت و لەبەر ئەو ترووسکاییە کەمە، کتێبی دەخوێندەوە.
عەبدولعەزیز لەژیانی دا تاکە دڵخۆشییەکی هەبوو، کە ئەویش کەنیزەکێکی چەرکەسی (١٦) ساڵانە بوو کە نێوی (مێهری خانم) بوو. عەبدولعەزیز بۆ یەکەمجار دەنگی ئەو شۆخەی لە باخەکانی کۆشکدا بیستبوو کە گۆرانی دەگوت و هەر

لەوساوە عاشقی ببوو. لەوێ بەدواوە، شەوەکانی و جاری واش هەبوو ڕۆژەکانیشی لە ئامێزی ئەوپەری شێوەیەدا بەسەر دەبردو هەوەسە جۆراوجۆرەکانی (مێهری) دەهێنایە جێ و بەسەریەکەوە نزیکەی یەک ملیۆن لیرەی بۆ ئەم ئافرەتە خەرجکرد. وردە وردە پارەی خەزێنە کۆتایی پێهات و سوڵتانی بەساڵاداچووش تا دەهات شێتتر و نارەزایەتی خەڵکیش پتر دەبوو و، خۆی لەشێوەی حزبی هەڵوەشاوەی « *عوسمانییە نوێیەکان*»دا دەدیتەوە کە ئێستا شەهامەتیان پەیدا کردبوو و، بەدەنگی بەرزەوە خواست و ویستەکانی خۆیان دەردەبڕی و تاکە هیواشیان میدحەت پاشا بوو.

ئەمە درێژەی کێشا و، وایلێهات ڕۆژێکیان دووهەزار قوتابی قوتابخانەی زانستە ئایینیەکانی قوستەنتەنییە، لەو کاتەیدا کە سوڵتان دەچووە نوێژی هەینی ڕێیان پێگرت و داوایان لێکرد سەرۆک وەزیرەکەی خۆی لابدات کە هەواداری روسیا بوو.

عەزیز کە زراوی چوبوو، چەند ڕۆژێک بەخۆ بە دڵدارە چەرکەسییەکەیەوە، خۆی لە ژورێکی حەرەمسەرادا حەشاردا، سەرئەنجام گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە ئەگەر بیهەوێ پێشگیری لەسەرهەڵدان و شۆڕش بکات، هیچ چارەیەکی نیە جگە لەوەی کە میدحەت پاشا بانگ بکاتە پایتەخت و بیکاتە سەرۆک وەزیران. بەڵام هەر بەم کارەی، بەدەستی خۆی ماڵی خۆی وێران کرد.

* * *

ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی ئامادەی شۆڕش و سەرهەڵدان بوو. هەژاریی خەڵک بەهۆی دوو ساڵ وشکەساڵی ساڵی یەک بەدوای یەکداو نەهاتی، گەیشتبۆ لوتکەی خۆی و بارودۆخێکی واهاتبۆ ئاراوە کە هەردەم چاوەڕوانی تەقینەوەی لێدەکراو بە تاڵەمووێکەوە بەندبوو.

لە ٢١ی نیسانی ساڵی ١٨٧٦ (٢٥ی ربیع الأول-ی١٢٩٣ کۆچی)، بوڵغارییەکان کە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو لە بارودۆخی خۆیان نارازی بوون، بەئاشکرا ڕاپەڕین. بوڵغاریا لە ساڵی١٣٩٦ (٧٩٨ی کۆچی)یەوە، بەبەشێک لە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی لەقەڵەم دەدرا. هەرچەندە کە ڕەگەزو زمانی دانیشتوانەکەی وەک دانیشتوانی روسیا سلاڤ بوو و، پەیڕەوی کەلیسای ئۆرتۆدۆکسی بوون، بەڵام دیسان سەربە ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی بوون.

بەر لە جەنگی کریمە، بەمەبەستی گوشار درووستکردن بۆ ئەنجامدانی هەندێ ریفۆرمی ئایینی، لە شاری ئۆدسا کۆمیتەیەک پێک هێندرابوو. هۆیەکەشی ئەوەبوو کە دەیان ساڵ بوو هەموو ئەو ئۆسقۆفانەی کە لە قوستەنتەنییەوە دەنێردرانە بوڵغاریا، هەر هەموویان یۆنانی بوون و تەنانەت تاکە وشەیەکی بوڵغاریشیان نەدەزانی؛ بەشێوەیەک کە هەندێ لەو گەڕیدانەی کە لەو سەردەمەدا سەردانی بوڵغاریایان دەکرد، پێیان وابوو کەلیساکان و مەراسیمە ئایینیەکانی بوڵغارییەکان، یۆنانییە. تێکرای هەوڵ و تەقەللاکانی بوڵغارییەکان بۆ ئەوەی کە بتوانن لە کەلیساکانیاندا بەزمانی خۆیان مەراسیمە ئایینیەکانی خۆیان بەرێوە بکەن، لەگەڵ شکستدا بەرەوروو بۆوەو، روسیا کە بەردەوام خۆی بە دڵسۆزی

بولغارياييەکان دەزانی و ئامادەی هەڵایساندنی ئاگرێک بوو لەو وڵاتەدا، بەدەرفەتی زانی و هانیدان تا لە دژی عوسمانییەکان ڕاپەڕن.
سەرەتا سەرهەڵدانەکە لە کێوەکانی دەوروبەری شاری ( *باتاک*)ەوە دەستی پێکرد، کە خوادەزانی سوڵتانی سەرشێت دەیزانی کەوتۆتە کوێی نەخشەی جوگرافیاوە! بەڕای سوڵتان بولغاریا بەشێک بوو لە ئیمپڕاتۆرییەتەکەی و بریتی بوو کە باخی بەرینی گوڵە سووورەی قارنا،کە بەهۆیانەوە بۆن و بەرام بۆ ئافرەتانی حەرەمسەراکەی دابین دەکرا. سەرهەڵدانی باتاک بە ئاسانی لەلایەن ئەو هێزانەوە، کە لە قوستەنتەنییەوە نێردرابوون سەرکوت کرا. بەڵام ئەو بەزمە هەر بەوەندە کۆتایی نەهات، چونکە تورکەکان بڕیاریان دابوو دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بۆ هەتاهەتایە تەمبێ بکەن. هێزە چەرکەسییەکان کەماوەیەکی زۆر بوو موچەو خواردنی پێویستیان وەرنەگرتبوو و، تەنها بۆ تالان و بڕۆ دەچەنگان، نێردرانە ئەو ناوچەیەو ئەوانیش کوشت و کوشتارێکیان کرد کە لە مێژوودا وێنەی نەبوو.
لە ڕابردوودا ئەمجۆرە کوشتارانە کۆتایی بەمەسەلەکە دەهێنا، بەڵام بە ڕێکەوت و بۆ یەکەم جار لە مێژووی عوسمانیدا، ڕۆژنامەنووسێکی ڕۆژنامەی *(دەیلی نیوز لەندەن)* کە نێوی *(ج . ا . مەک گاهان)* بوو، لەکاتی ڕوودانی ئەم کارەساتە لە قوستەنتەنییە بوو. ئەم کابرایە بەرەچەڵەک ئەمەریکایی، پێشتر سەردانی ئاسیای ناوەڕاستی کردبوو و، کۆمەڵێ ڕاپۆرتی سەبارەت بە شەڕەکانی روسیا لەو ناوچەیە، بۆ ڕۆژنامەکەی ناردبوو.بەم شێوەیە مەک گاهان ناوبانگێکی باشی پەیداکردبوو،بۆیە هەر کە زانی لە باتاک سەرهەڵدان ڕووی داوە، لەگەڵ ( یوجین *شایلر)ی* باڵیۆزی ئەمەریکا لە قوستەنتەنییە، بەرەو ئەو ناوچەیە کەوتەڕێ.
ئەو ڕاپۆرتانەی کە مەک گاهان ناردنی، بەخاڵی وەرچەرخان لە مێژووی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا لەقەڵەم دەدرێن، چونکە تا ئەو سەردەمە خەڵکی دنیا بڕوایان بەو داستانانە نەدەکرد کە سەبارەت بە دڕندایەتی و بێ بەزەییەتی تورکەکان دەگوتران. بەڵام ئێستا نەدەکرا چاوپۆشی لەو ڕاپۆرتە ڕاستەقینانە بکرابایە کە مەک گاهان لەبارەی کوشتن و قەتڵوعامی خەڵک و دڕندایەتیی تورکەکان دەینارد نە دەرەوە.
تورکەکان، نزیکەی (١٢٠٠) کەسیان بەزیندوویی لە کەلیسای شاری باتاکدا سوتاند کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون و، لەکۆی گشتیدا نزیکەی (١٢) هەزار کەسیان کوشت.سوڵتان،(*ئەحمەد ئاغا*)ی سەرکردەی هێزی سەرکوتکاری ڕاپەڕینەکەی، لەبەر ئەو لێهاتوویی و ئازایەتییەی کە لە کوشتنی خەڵکدا لە خۆی نیشان دابوو، خەڵات کردو مەدالیای ئازایەتیی پێ بەخشی.
بەرەبەیانی ڕۆژی (٧)ی ئاب، خەڵکی بەریتانیا بە خوێندنەوەی یەکەم ڕاپۆرتی مەک گاهان لەو بارەیەوە تاسان. نێوبراو لەگەڵ ئەوەیدا کەباسی لە چوونی خۆی بۆ باتاک کردبوو، نووسیبووی: *«من لەکاتێکدا کە بە سەر پشتی ئەسپەوە بووم، بەسەدان کەللە سەری پاک و کۆکراوەی خەڵکم بینی، کە هەر هەموویان هی ژن و منداڵی بێدیفاع بوون. کاتێ کە پێمان نایە شارەوە، دنیایەک تەرمی بێ سەرو بێ دەست و*

پێ بەدی دەکران. لاشەی کچ و ئافرەتەکان لە قژە درێژەکانیانەوە دەناسرانەوە. گەیشتینە نزیک کەلیسا، لێرە ژمارەی تەرمەکان پتر بوو؛ بەشێوەیەک کە گۆڕەپانی بەردەم کەلیسا پڕبوو لەئێسقان و لاشەی بۆگەن. لە مەسافەی نێوان کەلیساو قوتابخانەدا چەند خەرمانە لاشەیەک بەدی دەکران کە بۆگەنێکی پیسیان لێدەهات. ئێمە پێمان نایە گۆڕەپانەکەی بەردەم کەلیساو چاومان بەو دیمەنە تۆقێنەرە کەوت. لەوێ ژمارەیەکی زۆر لاشەمان بینی کەبەهۆی تەقینەوەوە پارچە پارچە ببوون. من دەمتوانی لەو دەست و پێیە ناسکانەی کە لەزەوی کەوتبوون بزانم کە ئەمانەهی منالی بچوکن. لەنێو کەلیسادا، بارودۆخ خەراپتر بووە؛ لەوێ، ژمارییەکی زۆر تەرمی رووتم بینین کەوا خەریکبوو دەڕزین و بۆگەنیان کردبوو. لەژیانمدا دیمەنی واترسناک و تۆقێنەرم نەبینیووەو بەخەیاڵیشم دانەهاتووە. بەگشتی لەدەر و ناوەوەی کەلیسا، نزیکەی (٣) هەزار تەرم دەبیندرێت. لە قوتابخانەکەی تەنیشتیشی کەساختومانێکی جوان بووە، نزیکەی دوو سەد ژن و منداڵ بە زیندوویی سووتێندراون. سەرانسەری شارەکە ئەم دیمەنە تاسێنەرانەی پێوە دیارەو ئەو کەسەی سەرکردایەتیی خولقاندنی ئەم کارەسات و دڕندایەتییەی کردووەو ئێستا پارێزگاری ئەم ناوچەیە، لەلایەن سوڵتانەوە خەڵات کراوە. بە کورتیەکەی تورکەکان چییان لە دەست هاتووە کردوویانە».

هەفتەی دواتر مەک گاهان دووەم ڕاپۆرتی خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە ناردە لەندەن:

«لەوە دەترسم کەلەمەودوا نەتوانم بێلایەنیی خۆم بپارێزم، چونکە بەڕاستی تاساوم. لەو ماوەیەدا لێکۆڵینەوەی پێویستم ئەنجامداوەو، گەیشتوومە ئەو قەناعەتەی کە سەرژمێرکردنی تەرمەکان باشترین کارەو لێکۆڵینەوەی دیکە بێهودەیە، چونکە بەزانینی ئەو ئامارە هەموو شتێک روون دەبێتەوە. کاتێ ئێوە لە لێکۆڵینەوەکانتاندا بەرەو ڕووی ئەو ڕاستیە دەبنەوە کە تورکەکان شەست حەفتا گوندیان سووتاندووەو کاولیان کردوون و نزیکەی (١٥) هەزار کەسیان کوشتووە کەبەشی هەرەزۆریان ژن و منداڵ بوونە، ئیدی وا هەست دەکەن کە پێویست ناکات چیدی لەم مەسەلەیە بکۆڵنەوە، چونکە ئەو ژمارانە ڕاستی و ڕووی قێزەوێن و دڕندەیی تورکەکان بەدەردەخات.

سەبارەت بەو کەللە سەرانەی کە لەنزیک گوندێک سەگ دەمیان تێنابوون، هەندێ پرسیارمان کردو بۆمان دەرکەوت ئەو کەللە سەرانە هی (٢٠٠) کیژی لاو بوونە کە چارەنووسێکی خەراپتر لە مەرگیان هەبووە. ئەوان تا کۆتایی کوشت و کوشتارەکەو بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لەبەردەستی تورکەکان دابوونەولەو ماوەیەدا هەر هەڵ لەرزیوون. دوای ئەوەی تورکەکان شارەکەیان تالان و دواتریش کاول کردووە، سەرجەم خزم و کەسی ئەو کیژانەیان قەتلوعام کردووە. ئینجا لەملی ئەو کیژانەشیان داوەو دوایی تەرمەکانیان لەشار بردوونەتەدەر و، هەڵیانداونەتە پێش ئەو سەگانە».

بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵ و ڕاپۆرتانە، کاردانەوەیەکی سامناکی لەسەرانسەری

جیهاندا هەبوو؛ باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە قوستەنتەنییە یەکێ لە کارمەندەکانی خۆی کە نێوی( *واڵتەر بارینگ*)بوو، نارده باتاک بۆ ئەوەی بەچاوی خۆی ئەو مەسەلەیە ببینی و بزانی کە ئایا ئەو ڕاپۆرتانە ڕاستن، یان موبالەغەیان تێدایە. نێوبراو لە ڕاپۆرتێکدا سەبارەت بەم کارەساتە گوتی: «*ڕەنگبێ دزێوترین کارەساتێک، کە مێژووی سەدەی هەنووکەی پێ لەککەدار ببێ، لەم ناوچەیەدا ڕوویدا بێت.*»
هەرچەندە دەوڵەتی بەریتانیا هیچی لەدەست نەدەهات، بەڵام ئاگری هەستی دژە عوسمانی لەنێو خەڵکی ئەو وڵاتەدا بڵێسەی سەندو هەوڵەکانی دیزرائیلی، سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیاش بۆ شاردنەوەی ڕاستییەکان بەهیچ کوێیەک نەگەیشت و ئەنجامی نەبوو. لەویەیدا گلادستۆنی سەرۆک وەزیرانی پێشوو کە یەکساڵ پێشتر خانەنیشن کرابوو، هاتەوە مەیدان و نامیلکەیەکی سەبارەت بەو کارەساتانەی کە تورکەکان خوڵقاندبوویانن، بڵاوکردەوەو تورکەکانی بە نمونەیەکی بەرزی هەستە دژە مرۆییەکان لەقەڵەمدا.
ئەو کارەساتەی تورکەکان بەسەر خەڵکی بولغاریایان هێنابوو، لەسەرانسەری ئەوروپادا خەڵکی لەدژی تورکەکان وروژاند. بەڵام هۆیەکی دیکەش بۆ نارەحەتی خەڵک و بێزارییان لە تورکەکان هەبوو؛ عەبدولعەزیز ئامادەنەبوو سودی ئەو قەرزانە بداتەوە کە لەسەرمایەدارە ئەوروپاییەکانی وەرگرتبوو و، ئەمەش قین و نەفرەتی پایتەختە ئەوروپاییەکانی گەیاندبۆ لوتکە. تەنها لەسەنپترسبۆرگ نەبێ لەوێوە قەیسەر بە تەلگراف پیرۆزبایی لە سوڵتان کردو ئەم درندایەتیەی بە «*کارێکی عاقڵانە*» لەقەڵەمدا.

* * *

کاتێ میدحەت پاشا لە قوستەنتەنییە بووە سەرۆک وەزیران، گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە تەنها یەک ڕێگەی لەبەردەمە، هەرچەند کە ئەو ڕێگەیە مەترسیداریش بێت دەبێ سوڵتان عەبدولعەزیز لابدرێت. بەڵام تۆ مەڵێ برازاکەی و ئەو کەسەش کەوا بڕیارە لەجێی دابنێن واتا مراد، بابایەکی دائیم سەرخۆشی لاوازو بێ توانایە. مراد کە بە بەردەوام خەریکی خواردنەوەی کۆکتێلی کۆنیاک و شامپانیا بوو، لە ترسی لە سێدارەدان و خنکاندن بەدەستی خولامە کەروڵاڵەکانەوە دەژیا، بەڵام میدحەت پێویستی بەجێ نشینی سوڵتان بوو، بۆیە ناچاربوو، ئەم شازادە سەرخۆشە بەنێوی ( *مرادی چاکسازی خواز*) بەخەڵکی تورکیا بناسێنێت.
ئێستاکە میدحەت بۆ کودتاو لادانی عەبدولعەزیز لەسەر کورسیی دەسەڵات ئامادەگی تەواوی هەبوو. بۆیە هانای بۆ حوسێن عەونی وەزیری قسەزل، بەڵام دەست پاکی جەنگ بردو لەشەوی ٢٩ی ئایاری ساڵی ١٨٧٦ (٣ی ربیع الثانی ١٢٩٣ی کۆچی) کەمێک دوای نیوەشەو، ئەم دوو پیاوە کامڵە کەبۆچوونەکانیان زۆر لە بۆچوونی شۆڕشگێرە توندڕەوەکان دوور بوو، پیلانەکەی خۆیان جێبەجێ کرد.
گروهێکی بچووک کە وەزیری جەنگ (حوسێن عەونی) سەرکردایەتی دەکردن، بە قایەغێک لە قوستەنتەنییەوە بەڕێکەوتن ، لە بسفۆڕ پەڕینەوەو، خۆیان گەیاندە

کۆشکی دۆلمە باخچە. کاتێ وەزیری جەنگ پێی خستە سەر پلیکانەی کۆشکی مەرمەڕ، بایەکی تووندی دەهات. پێشتر سەربازەکان بەشێوەیەکی بازنەیی و بە چڕی، گەمارۆی کۆشکیان دابوو. عبدولعەزیز کە لە ژوورەکەی خۆیدا لە ئامێزی مێهری خانمی چەرکەسدا نووستبوو، بەدەنگی ئەو فیشەکانەی کە لە باخەکانی کۆشکەوە تەقێندران، لەخەو ڕاپەڕی. ژمارەیەکی کەم لەو کەسانەی کە لە هێزی پاسەوانیی پاشایەتی دابوون و سوێندیان بۆ سوڵتان خواردبوو، دوای کەمێک بەرگری، کوژران و شکستیان خواردو پیلان گێڕان بەرەو کۆشک کەوتنە ڕێ.
حوسێن عەونی بەزۆر خۆی خزاندە نێو تالاری تەختەوەو لەوێ چاوی بەژمارەیەک لەو خواجە سەرایانە کەوت کە لە ترسان دەلەرزین. قزلەر ئاغاش بەجلی نووستنەوە لەوێ بوو. هەرکە دەرگای تالار کرایەوە، ئەوان دەستیان بەهات و هاوار کرد، بەلام لەو کاتەدا تارماییەک لەسەر پلیکانەکان بەدەرکەوت و بێدەنگی بەسەر تالارەکە زاڵ بۆوە. ئەو تارماییە کەس نەبوو جگە لە عەبدولعەیز کە بەجلی نووستنەوە هاتبۆ دەر. شمشێرێکی هەڵکێشراو بەدەستی ڕاستیەوەبوو و، دەستی چەپەشی لەنێو دەستی مێهری خانم دابوو کە لە ترسان دەگریا. یەکەم کاردانەوەی عەبدولعەزیز ئەوەبوو کە ویستی مقاوەمەت بکا، بەلام کاتێ کە فتوای شێخولئیسلامی قوستەنتەنییەیان نیشاندا، کە پایە بەرزترین مەرجەعی ئایینی و دادوەریی ئیمپراتۆرییەت بوو و، بەپێی فتواکە ئەوی لە پاشایەتی یەخستبوو، خۆی دابەدەستەوەو ئەمەی بەخواست و ویستی ئیلاهی لەقەڵەم دا کە بەمەرەکەبێکی نەبیندراو لە نێوچاوانی هەریەک لە مرۆڤەکان نووسراوە.(٥)
لەو کاتەدا تارماییەکی ترسناکی دیکە بەسەر پلیکانەکانەوە بەدیارکەوت و ئەویش (پەرتۆی عالی) واتا شازنی دایک بوو. لەیەک چرکەدا هەموو ئەو داب و نەریتانەی لەبیرکرد کە بەدرێژایی (٥٠) ساڵی ژیان لە نێو کۆشکدا فێریان ببوو و، بۆوە بەسمەی کۆنە دەلاکی حەمام. ئەو ئافرەتە کەتەیە بەسەروقژی ئاڵۆزو دەموچاوی دانەپۆشراوەوە، هێرشی کردە سەر وەزیری جەنگ و بە نینۆکە لەخەنەنراوەکانی چڕنووکی بەدەمو چاوی حوسێن عەونیدا هێنا و نینۆکەکانی وا لە دەموچاوی ئەو کابرایە گیرکردبوو، کە دەموچاوی حوسێن عەونی لەیەک چرکەدا شەلالی خوێن بوو. دوایی شەقێکی وا قایمی لەبەر زگی حوسێن عەونی هەڵدا کە کابرا خۆی پێ نەگیرایەوەو کەوتە سەر زەوی.
لەنێو قوستەنتەنییەش بەزمێکی دیکە لە ئاردابوو کە پتر لە نمایشێکی کۆمیدی دەچوو؛
کەمێک بەرلەوەی ڕۆژهەڵبێت، میدحەت بەتەقینی یەکەم گوللە تۆپ هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە سوڵتان لەسەر کارلادراوە. بۆیە بەپەلە خۆی گەیاندە مراد کە ئێستاکە ببووە سوڵتانی عوسمانی، بەلام کردنی کارێک هەر بە قسە ئاسانە. مراد بەخەبەر هات و لەکاتێکدا کە هێشتا مەستی بەری نەدابوو، لە جێگە دەریان هێنا. سەرەتا وایزانی کاتی ئەوەهاتووە کەوا پەتی لەمل بکەن و بیخنکێنن و میدحەتیش بێهودە لە هەوڵی ئەوەدابوو وای لێبکات جلەکانی بپۆشێ. میدحەت باسی هەندێ لە

نائارامییەکانی نێو شاری بۆ کردو، هۆشداریی ئەوەی دایە کەوا ڕەنگبێ ڕوسەکان ئەم بارودۆخە بەهەل بزانن و هێرش بکەنە سەر وڵاتی بێ حوکمڕان. تاکە وەڵامی مراد بۆ ئەم قسانەی میدحەت پاڕانەوە و لاوانەوە بۆ ئەوەبوو، کەنەیکوژن. وای لێهات میدحەت بێزاربوو، بۆیە هەڕەشەی ئەوەی لێکرد کە ئەگەر تاج و تەخت قەبوڵ نەکات، ئەوا بەبێ دواکەوتن پلەو پایەی سوڵتانی بەبراکەی، واتا بە عەبدولحەمید دەبەخشێ. ئەم هەڕەشە بچوکە بەس بوو بۆ ئەوەی کە مراد والێبکات کە بەخێرایی بڕیار بدات، چونکە ئەم دوو برایە بەڕادەیەک ڕقیان لەیەکدی دەبۆوە کە هەر باس ناکرێ. بۆیە مراد وەک منداڵێکی تاساو بەدوای میدحەت کەوت و بەقایەغ بەرەو کۆشکی دۆڵمە باخچە بەڕێکەوتن.

ئەو دوو بەلەمەی کە یەکیان سوڵتانی پێشوو (عەبدولعەزیز) و ئەوەی دیکەیان سوڵتانی نوێ (مراد)یان تێدا بوون، لە ناوەڕاستی بسفۆڕ تووشی یەکدی بوون و بەتەنیشت یەکتریدا تێپەڕبوون. دەنگی شیوەن و فیغانی هاوسەرەکانی عەبدولعەزیز لە دوورەوە دەبیسترا. بەر لەوەی ڕۆژهەڵبێت سوڵتانی لێخراویان لە کۆشکی کۆندا ئاکنجی کردو دانیشتوانی قوستەنتەنییە بە بیستنی گرمەی دەنگی (١٠١) تۆپ کە بە ئیفتیخاری سوڵتان مرادی پێنجەم تەقێندران، لەخەوڕابوونەوە. بەڵام خەڵکی بەریتانیا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرو هاوکات لەگەڵ خەڵکی قوستەنتەنییە هەواڵی کودتاکەیان بیست. ئەمەش لە ڕێگەی ڕۆژنامەنووسێکی ئینگلیزییەوە بوو. ڕۆژنامەنووسە ئینگلیزییەکە دانیشتووی قوستەنتەنییە بوو و هەستی بەوەکردبوو کە خەریکە هەندێ ڕووداو ڕوودەدەن و کەمێک دوای نیوەشەو تەلگرافێکی بۆ ڕۆژنامەکەی لێداو تێیدا نووسی: *«پزیشکەکان گەیشتوونەتە ئەو باوەڕەی کە دەبێ (جین)ی ماڵوێران (عەبدولعەزیز) خوێنی لێ بگیرێت. دایە گەورە (شاژنی دایک)ی لەگەڵدایەو کوڕە مامەکەی جڵەوی کارەکانی گرتۆتە دەست».*

* * *

دوابەدوای ئەم ڕووداوە سەرسوڕهێنەرانە، زنجیرە ڕووداوێکی توونوتیژی ئامێزیش ڕوویاندا. پێنج ڕۆژ دوای لێخستنی عەبدولعەزیز، عەبدولعەزیزیان بەمەچەکی بڕاوەوەو لە کاتێکدا کە هێشتا خوێنی لەبەر دەڕۆیشت لە ژوورەکەی خۆیدا دۆزییەوە. گوایە لەگەڵ دایکی و مێهری خانمدا چاوەڕێی لەدایکبوونی منداڵەکەی مێهری خانم بوونە. بەپێی قسەکانی مێهری و دایکی کە دوای ئەم ڕووداوانە کردبوویانن، لەو ماوەیەدا عەبدولعەزیز زۆر نیگەران و ناڕەحەت بووەو چاوەکانی یەکجار بە قووڵداچوونە. عەبدولعەزیز شەوێکیان داوای لێکردوونە بە تەنیا جێی بێڵن بۆ ئەوەی بنوێ و کاتێ لە ژوورەکە چۆتەدەر داوای مقەسی لێ کردوون و گوتویەتی گوایە مووەکانی ڕیشی ڕێک دەخات، چەند کاتژمێر دوای ئەوە مێهری خانم سەری ژوورەکەی سوڵتانی پێشوو (عەبدولعەزیز) دەداو دەبینێ بەو مقەسەی کە داویانەتێ شادەمارەکانی دەستی خۆی لەمەچەکەوە بڕیوەو مردووە.

ئایا ڕاستی ڕووداوەکە هەر ئەوەندەبووە؟ ڕێکخستنی ڕیش کارێکی هاکەزایی

نەبووەو پێویستی بە وەستایەتی و لێزانیەوە هەبووەو هیچ پێناچێ یەکێکی وەکو عەبدولعەزیز کە هێندە بایەخی بە ڕۆتینات و شتی لەو بابەتەداوە، زانیبێتی بۆخۆی ڕیشی خۆی ڕێکبخات. لەگەڵ ئەوەشدا شاژنی دایک دانی بەوەدانا کە خۆی مقەسەکەی داوەتە دەست عەبدولعەزیز. ئەڵبەتە ئەم دان پیانانە لەلایەن ئافرەتێکەوە کە پەنجا ساڵی تەمەنی خۆی لە کۆشکدا بەسەربردبێت و ئاشنای دابونەریتی پاشایانە بێت، مایەی سەرسوڕمانە. هیچ کەس بەدڵنیاییەوە ناتوانێ بڵێ کە ئایا عەبدولعەزیزیان کوشت، یان بۆخۆی خۆی کوشت. بەڵام بەلای میدحەتەوە کە دەیەویست روخسارێکی شاهانە بەمرادببەخشی و لەچاوی خەڵکدا وەک پادشایەکی بەدەسەڵات و دەست ڕۆیشتووی نیشان بدات، پاککردنەوەی زەینی خەڵک لەم گومانانە زۆر گرنگ بوو. بۆیە (١٩) لە پزیشکە بەنێوبانگەکانی شاری قوستەنتەنییەی کە ژمارەیەکی زۆریان بۆ باڵیۆزخانەی بیانیەکان کاریان دەکرد، ڕاسپارد تاوەکو هۆکاری ڕاستەقینەی مەرگی سوڵتانی پێشوو بەدیار بخەن و ئەوانیش لەمبارەیەوە گوتیان عەدولعەزیز بۆخۆی و بەدەستی خۆی، خۆی کوشتووە.

چەند رۆژێک دوای مەرگی سوڵتان، هاوسەرەکەی (مێهری خانم)بە سەرمنداڵ بوونەوە مرد. بەوشێوەیەی کە ڕۆژنامەیەکی تورکی نووسیبووی: «*دڵەکوتەو ئەو گوشارە ڕۆحیانەی کەلە ئاکامی مەرگی سوڵتان تووشی ئەم شازادە خانمە شۆخەببوون، بووە هۆی جوانە مەرگ بوونی مێهری خانم و بەسەر منداڵبوونەوە مرد.*»

کاتی ناشتنی تەرمی مێهری، شەقامەکانی قوستەنتەنییە لە خەڵکی ڕەش پۆش جمەی دەهات. بەهەزاران کەس بە مردنی ئەم ئافرەتە شۆخ و شەنگە نارەحەت بوون و کاتێ تابووتەکەی بە بەردەم خەڵکدا بەرەو گۆڕستانی ئسکۆدار- کەتایبەت بوو بە پاشادو ئاغاکان و ناودارانی وڵات- دەبردرا، خەڵک لەبەرخۆیانەوە بۆی دەگریان و فرمێسکیان بۆ هەڵدەوەراند.

ئێرە کۆتایی ڕووداوە تووندوتیژی ئامێزەکان نەبوو. مێهری برایەکی هەبوو کە نێوی حەسەن بوو و لەنیشان پێکان بەدەمانچە زۆر بەنێوبانگ بوو. ئەویش وەک خوشکی بە عەبدولعەزیز وەفاداربوو، بۆیە بڕیاریدا بە کوشتنی وەزیری جەنگ تۆڵەی خوشک و زاواکەی بکاتەوە. حەسەن بۆ ئەوەی بێ باکتر بێت، ئەو ڕۆژە کەمێک حەشیشی کێشاو دوایی بەدوو دەمانچەوە کەلەنێو چەمکەکانیدا شاردبوونەیەوەو بەدوو دەمانچەی دیکەش کەلە گیرفانی نابوون، بەزۆری زۆرداری خۆی خزاندە نێو ژووری ئەنجومەنی وەزیرانەوەو بەیەکەم تەقە وەزیری جەنگ و وەزیری دەرەوەی کوشت. لەو کاتەدا سەربازەکان و ئەو پۆلیسانەی کەبەدوای کەوتبوون، دەستیان بەتەقە کرد. لەماوەی بیست دەقیقەدا بەسەریەکەوە ٧ کەس کوژران و (٨) کەسیش بریندار بوون.

بۆبەیانی ڕۆژی دواتر حەسەنیان بەبەرچاوی خەڵکەوە لەسێدارەدا حەسەن تا دواسات سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ویستوویەتی تۆڵەی عەبدولعەزیز لەو کەسە بکاتەوە کە لەسەرکار لایدا.

هەموو ئەو ڕووداوانەو ئەو ماوە درێژەی کە مراد لەقەفەسدا بردبوویە سەر، بووە

هۆی ئەوەی کە مراد کابرایەکی سەرشێت و بێکەڵکی لێدەرچێت. پزیشکێکی پسپۆڕی ئۆتریشی و یەکێ لە پزیشکەکانی دەربار هاوڕا بوون لەسەرئەوەی کە ئەم کابرایە شێتەو چارەسەریشی نییە. بۆیە ماوەی حوکمی مراد تەنها سێ مانگی خایاندو دوای ئەو ماوەیە بە فرمانی میدحەت لە پاشایەتی خراو، لە کۆشکێکی دیکەدا، زیندانی کرا. دوای مراد، برابچوکەکەی واتا عەبدولحەمیدی دووەمیان لەجێ دانا.

## فەسڵی نۆیەم

### شاری پیلانگێڕی

کاتێ لە ساڵی ١٨٧٦ (١٢٩٣ی کۆچی) عەبدولحەمید جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست، تەمەنی سی و چوار ساڵانەبوو و، بەدوایین سوڵتانی دیکتاتۆری عوسمانی لە قەڵەم دەدرێت. نێوبراو لە ساڵی ١٨٤٢ لە دایک ببوو و، دووەم کوڕی عەبدولعەزیز بوو و دایکی بەرلەوەی پێ بنێتە کۆشکی سوڵتانەوە سەماکەرێکی ئەرمەنی بوو کە کاتێ عەبدولحەمید حەوت ساڵان بوو، کۆچی دوایی کردبوو. (٦)
عەبدولحەمید بابایەکی کزو دزێو بوو، چاوە پڕ لە گومانەکانی کەوتبوونە نێو رووخسارێکی زەرد هەڵگەڕاوی باریکەوە و لوتیشی درێژو چەماوەبوو، دەمی بێ بەزەییانەتی پێوەدیاربوو و، ڕیشە ڕەشەکەشی کە دوای گەیشتنە دەسەڵات داینابوو، زۆر تەنک بوو. قیافەی بەشێوەیەکی سەیرو قوڵ، جیاوازیی لەگەڵ دەموچاوە خڕ و تەڕوبڕەکانی باوباپیرانیدا هەبوو. سەرداریی ئەستەمبوڵی کە دەگەیشتە سەرچۆکانی، هەیکە لاوازو بێ سامەکەی دادەپۆشی و فینەسوورەکەشی لەچاو دەموچاوە لاوازو ڕەق هەڵاتووەکەی گەورە دەهاتە پێش چاو.
پرۆفیسۆر ئەرمینیۆس ڤامبری-ی زانای مەجەری، کە باشتر لەهەر ئەوروپاییەکی دیکە عەبدولحەمیدی ناسیووە، سەبارەت بە عەبدولحەمید نووسیوویەتی: *«هەرگیز لەگەڵ پیاوێکی وەک سوڵتان عەبدولحەمید دا ڕووبەڕوو نەبوومەتەوە کە خاڵە بەرجەستەکانی کەسایەتییەکەی هێندە لەگەڵ یەکتریدا دژو نەگونجاو بن. دڵسافی و بێبەزەیی، سەخاوەت و قرچۆکی، بوێری و ترسنۆکی، زیرەکی و دەبەنگی، میانەڕۆیی و توندڕۆیی و زۆر تایبەتمەندی دیکە بەئاشکرا لەکردارو ڕەفتاریدا دەبیندران، بەڵام خەسڵەتێک کە باڵی بەسەر بوونی داکێشاوە شەرمنی و دوودڵی و ترس لەوەیە کە نەوەکا هەنگاوێکی هەڵەهەڵێنێ و ئەمەش بەسەر ڕەفتاری ڕۆژانەیدا ڕەنگی داوەتەوەو کاریگەرییەتییەکی قوڵی بەسەرەوە هەیە. ئەم خەسڵەتە ناشایستانە، لەگەڵ کاریگەرییەتی شومی ڕاسپاردەکانی حەرەمسەرا، عەبدولحەمیدی وەک بونەوەرێکی مەحروم لێکردووەو مێشکی لەکارخستووەو لەو گۆڕە کردوویەتی بەدەبەنگێکی بێ تواناو تاج و تەختەکەشی بۆ خەڵکی وڵاتەکەی وەک بەڵایەکی لابەلای لێهاتووە.»*
ڕەنگبێ گەورەترین بەدبەختیی عەبدولحەمید ئەوەبوو کە لەخۆی ڕانەدەدیت، خۆی لەگەڵ سیاسەتی ڕوو لەگۆڕانی وڵاتە ئەوروپاییەکان لەهەمبەر ئیمپڕاتۆرییەتەکەی کە

سەردەمێک لێی دەترسان و ئێستا وەک مۆرەیەکی لاوازو بێ دەسەڵات سەیریان دەکرد، بگونجێنێ. یان ئەوەتا نەیدەتوانی لەو گۆڕانکارییانە بگات کە لە ناوخۆی وڵاتەکەیدا لە ئاردابوون.

لەو سەردەمەدا، تەنانەت شاری قوستەنتەنییەش ڕوەو گۆڕان بوو؛ یەکەم هێڵی تەلگراف کەوتبۆ کارو یەکەم باری نەوت و ڕۆن گەیشتبۆ نێو شار، یەکەم مەکینەی هەڵمی لە پایتەختدا بەکارکەوتبوو و یەکەم قوتابخانەی فەرەنسایش لە گەڕەکی گەلاتا کرابۆوەو تێیدا منداڵانی تورک لە تەک منداڵە بیانییەکان بەخوێندنەوە خەریک بوون. وردە وردە کاریگەری شارستانیەتی ڕۆژئاوایی لەسەرانسەری وڵات پەرەی سەندو هەروەک باوە، شان و شکۆی شارستانیەتی ڕۆژهەڵاتیش لەگەڵ بالادەستی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی لەبەرچاوان ون بوو. لەو کاتەدا کە سوڵتانی نوێ لە نێوان ژیانی دوێنێ و ئەمڕۆدا لەهاتوچۆ دابوو، قوستەنتەنییەش ڕەنگ و ڕووی لەدەست دەداو لەشارێکی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەبوو بە شارێکی پڕ لە پیلانگێڕی.

لەسەرەتای گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن عەبدولحەمیدەوە، خەڵک هیوایان پێی هەبوو. بۆیە یەک هەفتە دوای ئەوەی لەسەر تەخت دانیشت، لەمەراسیمێکدا شمشێرەکەی عوسمانیان بەلاکەلەکەی وەکرد. بەیانی ئەو ڕۆژەی کە بڕیار وابوو ئەم مەراسیمە بەڕێوەبچێ، سوڵتان بە پێی نەریتی دێرین بەشیر خۆی شوشت. هەر لەو کاتەدا سەدان هەزار کەس لە ئافرەت و پیاوو منداڵی قوستەنتەنییە لە کەنار بسفۆڕ کۆبیوونەوە بەهیوای ئەوەی کە تەنانەت بۆ ساتێکیش بێت بتوانن سوڵتانی نوێ ببینن کە بڕیار وابوو لە کۆشکی دۆڵمە باخچەوە بچێتە مزگەوتی ئەیوب کە یەکێک بوو لەو چوار سەد مزگەوتەی ئەوسای قوستەنتەنییە.

ئەو ڕۆژە هەتاو بەدرەوە بوو و دەریای شین لەژێر تیشکی بەتینی خۆردا دەبریسکایەوەو خەڵکی قوستەنتەنییە دەیانتوانی شانازی بەوەوە بکەن کەوا کەنارەکانی دەریاکەیان هیچ کوێیەکی بەردەلان نییە و هیچ زێرابێکیش نارژێتە نێوی و وەک «گراند کاناڵ»ەکەی ڤینیز بەگەورەترین ڕێگای ئاویی نێو شار لەقەڵەم دەدرێت.

لەناو شاریشدا کوچەو کۆڵان و شەقامەکان لە حەشامەت جمەی دەهات و بەدەیان نەژادی جۆراوجۆری ئاسیایی بۆ پێشوازیکردن لە سوڵتانی نوێ کۆببوونەوە. خێزانی پاشا و گەورەکانی وڵات، کەمێ ئازادییان دەست کەوتبوو؛ هەرچەندە هێشتا بەحیجاب داپۆشرابوون، بەڵام لەودیو پەچە ئاوریشمییەکانیانەوە دەیانتوانی بەجوانی ئەو دیمەنانە ببینن. هەندێکیان سواری ئەو داشقانە ببوون کە گایەکان ڕایان دەکێشان و هەندێکیشیان سواری گالیسکەی سەرئاوالابوون کە تازە لە ڤیەنناڕا هێنابوویاننە قوستەنتەنییەو پایە بەرزەکانیش سواری ئەو گالیسکانە ببوون کە خولامێکی ڕەش پێستی خەڵکی (نۆبە)بە شمشێرێکی ڕووت، پاسەوانی لێدەکردن.

پیاوەکان دەمێک بوو لەو شوێنە وەستابوون کە بڕیار وابوو سوڵتان پێیدا تێپەڕبێت. هەندێکیان هەڵتروشکابوون و بەکێشانی قەننەو نێرگەلەوە خەریک بوون.

خەڵکی دەوڵەمەند تەنیا چەند قومێکیان لە نێرگەلەکە دەداو بە واتایەکی دیکە تەنیا (قەیماغ)ەکەیان دەکێشاو ئەوی دیکەیان فڕێ دەدا، بەڵام خەڵکە هەژارەکە بەرماوەی ئەوانیان کۆدەکردەوەو سەر لەنوێ لە نێرگەلەیان دەکردەوەو دەیان کێشا. وردە وردە کە ڕۆژ گەرمتر دەبوو، کاری دەستفرۆشەکان و ئەوانەی شوتی و شەربەتیان دەفرۆشت، ڕەونەقی پەیدا دەکرد.

منداڵەکان بەخواردنی ڕاحەتەڵقومەوە خەریک بوون و ئافرەتانیش بۆ ئەوەی تینویەتی خۆیان بشکێنن، بنێشتیان دەجوو و، هاوکات لەو باوەڕەشدابوون کە پووکیان پێ بەهێز دەبێ.

لەسەری هەر کۆلانێک میوەی جۆراوجۆری لەبابەت ترێ و هەرمێ و هەڵوژەو هەنار لەسەریەک قەلاقوچکە کرابوو و، لە تەنیشتیشیانەوە شەربەت فرۆشەکان بە فرۆشتنی خۆشاوی کۆخ و میوەی جۆراو جۆر کە بۆن و بەرامی بەتامیان لەگەڵ تێکەڵ دەکرد، خەریک بوون.

کەمێک بەر لە نیوەڕۆ، قایەغی سپی بە ئاڵتون نەخشێندراوی پادشایانە، لەکاتێکدا کە (١٤) سەوڵ لێدەر لێیان دەخوڕی، لەکەنداوی داردانێل هاتەدەرو سوڵتان لەژێر کەپرێکی ئەرخەوانیدا دانیشتبوو.

بەسەدان کەشتیی گەورەو بچوکی بیانی، ئاڵاکانی خۆیان بەنیشانەی ڕێزو ئیحترامیان بۆ مەوکیبی سوڵتانی هێنایە خوارەوە. سوڵتان لەنزیک مزگەوتی ئەیوب لە بەلەمەکەی دابەزی و سواری ئەسپێکی سپی بوو کە زین و لغاوەکەی لە ئاڵتون سازکرابوو. لەدەروازەی ئەدیرنە تێپەڕی و بەناو ئەو خانووەیەک قاتە دارینانەدا گوزەری کرد کە کەوتبوونە نێو کۆلانی تەنگەبەرەوەو پیاوانی پاسەوانی بەجلی تایبەتییەوە لەمبەرو ئەوبەری ئەم کۆلانانە بەڕیز وەستابوون.

هەر کە سوڵتان گەیشتە ئەو مزگەوتەی کە لەلایەن سوڵتان محەمەدی فاتیحەوەو لەباکووری ڕۆژئاوای شارو لەولای قەڵای هرتل دا، دروست کرابوو، شاری قوستەنتەنییە کەتا ئەوساتە هێورو هێمن بوو، بەدیتنی سوڵتان بەجموجۆڵ کەوتن لە پڕێکا دیمەنێکی پرشکۆی ئەو هەموو حەشامەتەی بەخۆوەدیت کە سەربازو مەلەوانە ئەلبانیاییەکان بەکڵاوی بڵیندوپەڕدار، چەرکەسەکان بەجلو بەرگی قەزافی، سوپاییەکان بەجلی زەردو شین، و بۆستانجیەکان کە لەهەمووان بوغراترو لوت بەرزتر بوون، بە جلوبەرگی سەربازیی ئەرخەوانی لە حەوشی مزگەوت ولەبەرهەتاو ریزیان بەستبوو.

سوڵتان لەژێر سێبەری دارچنارێک و لە تەنیشت حەوزو نافورەیەک لە ئەسپ دابەزی. بەیداخدار، ئاڵا کەسکەکەی پێغەمبەری دەست دایەو بردیە بن شەبستانی مزگەوتەکە کە شوێنێکی فێنک بوو و، دیوارەکانی لەبەردبوون و گومەزە مەرمەڕییەکەشی لەسەر ستوونی نەنەخشێندراوەوە بنیادنرابوو.

دوابەدوای ئەو شێخولئیسلام بە جبەیەکی سپی و عەبایەکی کەشمیری و مەندیلە گەورەکەی خۆی کرد بە مزگەوتەکەدا.

سوڵتان بەهەیبەت و شکۆوە و بەپێی وئەو نەریتەی کە لە کۆنەوە باو بوو،

بەهێواشی حەوت هەنگاوی بەرەو لای مورشیدی دەروێشەکانی مەولەوی قۆنیا هاوێشت، کە لەسەردەمی عوسمانەوە کە سەرسیلسیلەی بەرەبابی عوسمانی بوو، ئیمتیازی بەستنی شمشێریان لە تەنگەی سوڵتانە نوێیەکان پێ بەخشرابوو. دەروێش لاشانی چەپەی سوڵتانی ماچ کردو سوڵتانیش وەک یەکەم هەنگاوی پادشایانە سێ هەنگاو بەرەو لای سەرۆک وەزیران چوو و، ئەویش بەنێوی گەلەوە شاقەلی جلەکەی سوڵتانی ماچ کردو خستیە سەرچاوان.

لەگۆشەی شەبستانی مزگەوتەکە، گۆڕێکی لێبوو کە بەمەرمەڕ و زیو نەخشێندرابوو. ئەوە گۆڕی ئەبو ئەیووبی ئەنساڕی بوو کە بەیداخداری پێغەمبەر خوا بوو.(٧) لە تەنیشت ئەم گۆڕەو لەسەر مێزێک کە پارچە قەدیفەیەکی ئەرخەوانیی بەسەردا درابوو، شمشێری عوسمانیان لە کالانێکی شینی بە بەردی گرانبەها نەخشێندراو، دانابوو کە دووڕ و یاقوتە گرانبەهاکانی سەر دەسکەکەی، لەفەزای نیمچە تاریکی مزگەوتدا، دەدرەوشانەوە.

لەنێو شەبستاندا بێدەنگی حوکمی دەکردو تەنیا دەنگی پیاوانی ئاییینی و پایەبەرزانی مەزهەبی دەبیسترا کەلەژێر لێوانەوە ئایەت و دوعایان دەخوێند. دوای (١٧) دەقیقە بانگبێژ لە منارەی مزگەوتەکەوە بە دانیشتوانی شاری قوستەنتەنییەی ڕاگەیاند کە ئەمیرالمؤمنین لە مزگەوتایەو خەریکە مەراسیمەکە دەست پێدەکات. دواتر لە چەند چرکەیەکدا قایش و شمشێری عوسمانیان بە تەنگەی سوڵتانەوە کردو مەراسیمیش کۆتایی پێهات.

هەر کە سوڵتان شمشێری هەڵماڵراوی بەدەستە بچوک و ڕەشکۆکەکانی بەدەستەوەگرت، بۆ جارێکی دیکە بێ دەنگی بەسەر کۆڕەکەدا زاڵ بۆوەو تەنیا دەنگی ئەو کۆترانە دەهات کە لەشەقەی باڵیان دەداو لە هێلانەکانیانەوە کە کەوتبوونە گۆشەو کەناری گومەزی مزگەوتەکەوە دەفڕین. کاتێ عەبدولحەمید پێی نایە مەودای ڕووناکی مزگەوت، ئەو خەڵکە زۆرەی کە لەملاو ئەولاو دەوروبەری مزگەوت و لاکۆڵان و..هتددا کۆببوونەوە، لێکڕا دەستیان کردە بە (الله اکبر) گوتن.

کاتێ عەبدولحەمید سواری ئەسپە سپیەکەی بۆوە، بەقەولی یەکێ لە مێژوونووسان «*دەموچاوی نیگەرانییەکی قوڵ و هێماو نیشانەی مالیخۆلیای تێدا دەبیندرا*..» مەوکیبی سوڵتان بە هێواشی بەنێو کوچەو کۆڵانەکانی قوستەنتەنییەدا بەڕێ کەوت و ئەو حەشاماتە زۆرەی کە بە «*خلیفه الله فی الأرض*» نێویان دەهێنا، هەلهەلەیان بۆ لێدەدا.

قەیرانە سیاسی و ئابوورییەکان هیچ زیانێکیان بەم مەراسیمە پڕشکۆیە نەگەیاند؛ تورکەکان ئامادەی ئەوەبوون لە پێناو باشکردنی بارودۆخی وڵاتدا دەرفەت بە فەرمانڕەوای نوێیان بدەن تاکو هەندێ گۆڕانکاری ئەنجام بدات و بەتایبەتیش پشتیوانی لە میدحەت پاشا بکات کە پڕۆژە ڕیفۆرمی و چاکسازانەکانی جێی سەرنجیان بوون. لەو شادی و خۆشحاڵییە گشتییەدا، مەسەلەی بولغاریا لەبیر برابۆوەو پێدەچوو خەڵکی کوچەو بازاڕ لەو ڕۆژە خۆشەدا، بەلایانەوە عەبدولحەمید جگە لەوەی خەلیفە اللەو ئەمیر المؤمنین بوو، سوڵتانێک بوو کە بە ئەنجامدانی

ئەرکەکانی خۆی هەڵدەستێ. تەنانەت تاقە کەسێکیش لەو هەمووحەشاماتەی کە ئەوشەوە تا بەیانی لە گۆڕەپانی ئەسپ تاودان، پێیان لەزەوی کووتابوو، و هەڵپەڕیبوون و خۆشیان گوزەراندبوو، ئەوەیان بەخەیاڵدا نەدەهات کە ئەم عەبدولحەمیدە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەبێ بە قرنیسترین، فێڵبازترین، بەدگومانترین و بێ بەزەیی ترین پیلانگێڕی بەرەبابی عوسمانی.

هەمان ڕۆژ گلادستۆن نامیلکەکەی خۆی سەبارەت بە قەتلوعام و ڕەشەکوژیی خەڵکی بولغاریا، بلاوکردەوە. بەلام سولتان ئەمەی نەزانی کە هەر لەگەڵ گەیشتنی ئەم هەواڵە بەدەرباری سەنپترسبۆرگ، ژمنەڕاڵ ئیگناتێف بە خۆشحاڵییەوە بەقەیسەری گوتووە: *«ڕەشەکوژییەکەی بولغاریا ئیمتیازێکی گرنگی بە ئێمەی رووس بەخشیووە کەتا ئێستا لێی بێ بەش بووین، ئەویش پشتگیری رای گشتی بەریتانیایە.»*

* * *

لە ئەورووپا هەمووان چاوەڕێی کاردانەوە بوون و خەڵک کوشت و کوشتارەکەی بولغاریایان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. قەیسەری روسیا تینوی خوێن بوو، و سیاسەتمەدارانی وڵاتانی دیکەش دەیانزانی کە تورکیا لەسەر لێواری ڕاپەڕین و هەڵگەڕانەوەدایە. ویلایەتەکانی مۆنتینیگرۆ «کاراداغ» و سربستان ڕایانگەیاند کە *«لەنێوچوونی یەکجارەکیان پێ لە ژێر دەستەیی تورکە ستەمکارەکان باشترە.»* ویلایەتەکانی بۆسنەو هەرزەگۆڤینیش لەنێو بڵێسەی ئاگری تۆڵەستاندنەوەو وەحشی گەرییەتی تورکەکاندا، دەبوونە خۆڵەمێش و بولغاریا دواهەناسەی دەدا. ئەم ڕووداوانە بەلای ئەورووپاییەکان و بەتایبەت ئینگلیزەکان کە بەردەوام لەوەدەترسان ڕێگای خۆیان بەرەو هیند، کەبە کەناڵی سوێزی تازە لێدراوەوە، گوزەری دەکرد لەدەست بدەن، گرنگیەکی تایبەت و بایەخێکی مەزنی هەبوو؛ چونکە قەیسەر دەیویست سود لەم دەرفەتە وەرگرێ و بەناوی «ڕزگارکردنی مەسیحییەکان» هێزەکانی خۆی ڕەوانەی نێو خاکی عوسمانی بکات و بەدەست بەسەراگرتنی گەروی بسفۆر، ببێ بەخاوەنی هێزێکی بێ سنور. بەلام بەریتانیا بۆ بەرپەرچدانەوەو لەخۆ دوورکردنەوەی ئەم هەڕەشانەی قەیسەر، پێویستی بە بیانوویەکی لۆژیکی هەبوو تا بەهۆیەوە دەست بخاتە نێو کاروباری تورکیاوەو لە کۆتاییشدا ئەم بیانوەی چنگ کەوت.

بیانووەکە ئەوەبوو کە بەریتانیا وەک ئیمزاکەری پەیماننامەی ١٨٥٦ی پاریس ڕایگەیاند کە «ناتوانێ لەبەرامبەر ئەو تاوانانەی کە تورکیا لەهەمبەر هاووڵاتییە مەسیحییەکانیدا ئەنجامی دەدات، بێدەنگ بێ و دەست لەسەر دەست دانێ». هێشتا دوو هانگ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێنەپەڕی بوو کە عەبدولحەمید شمشێری پیرۆزی لەکەمەر بەستبوو کە بەریتانیا، وڵاتانی ئەورووپای ناچار کرد نوێنەرانی خۆیان بنێرنە قوستەنتەنییەو هەندێ پێشنیاز لەمەڕ چاککردنی بارو گوزەران و بەڕێوەبردنی وڵات، بۆ پاراستنی گیانی هاووڵاتییە مەسیحییەکان بخەنە بەردەم تورکیا.

عەبدولحەمید سەرەڕای هەموو کەم و کورتیەکانی، کابرایەکی نیشتمانپەروەربوو، بۆیە ئەم پێشنیازەی بەریتانیای بەدەست تێوەردانێکی ناماقوڵ لەقەڵەم دا. هەروەها میدحەت پاشاش هێندە زیرەک بوو کە بۆی دەرکەوێ کە؛ چونکە هۆکاری لادانی دوو سوڵتانی پێشوو بووە، ئەمجارەیان دەتوانێ چاوەڕێی پشتیوانی و قەدرزانیی لە سوڵتان هەبێ و لەو کاتەدا هەق بەلای ئەودابوو.
کۆنفرانسی وڵاتانی ئەوروپایی، بەهاتنی لۆرد سالزبۆریی وەزیری کاروباری هیندو نوێنەری بەریتانیاو، ژەنەڕاڵ ئیگناتێڤی نوێنەری قەیسەری روسیا، لە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٨٧٦ لە قوستەنتەنییە دەستی بەکارکرد. هەر کە نوێنەرانی نێوبراو لەگەڵ نوێنەری تورکیا لە تالاری بالاخانەی دەریاوانی کەبەسەر کەنداوی داردانێلدا دەیڕوانی لەسەر مێزی دانوستان دانیشتن، لەپڕ دەنگی (١٠١) تۆپیان بەرگوێ کەوت و دەستبەجێ نوێنەری تورکیا هەستایە سەر پێ و گوتی: «*بەڕێزینە، دەنگی ئەو تۆپانەی کە گوێتان لێیان بوو مانای ئەوەیە کەوا سوڵتان دەستووری وڵاتی ئیمزاکردووەو مافی تەواوی دانیشتوانی ئیمپراتۆرییەتی بەبێ هیچ جیاوازیەک قەبوڵ کردووە. لەبەرامبەر ئەم ڕووداوە گرنگەدا، بەرای من ئیدی دانوستان شتێکی بێهودەیە.*»
ڕاستی مەسەلەکە ئەوەبوو کە ئەنجامدانی ڕیفۆرم لە ڕێی یاسای بنەڕەتی «دەستوور»، لە سەردەمی سوڵتان مورادی پێنجەمەوە لە ئارادابوو، بەلام عەبدولحەمید ڕەزامەندی لەسەرنەدەداو قەبوڵی نەدەکرد، تا ئەو دەمەی کە ئەم بارودۆخە ناچاری کرد ڕەزامەندی لەسەر بدات. بڕیاردرا کە نوێنەرانی ئەنجومەنی شورای نیشتمانی لە ڕێی هەڵبژاردنی گشتی، بەبێ گوێدانە ڕەگەزو ئاینیان لە سەرانسەری ئیمپراتۆرییەتەوە هەڵبژێردرێن و ڕەوانەی پایتەخت بکرێن.
دیپلۆماتە ئەوروپاییەکان کە سەریان سوڕمابوو، ئیدی کارێکی ئەوتۆیان نەمابوو؛ چونکە ئیتر ئەو گۆڕانکارییە پێویستەی کە دەبوایە سوڵتان ئەنجامی بدات، ئەنجامدرابوو، بەلام لە ناخەوە توڕەبوون؛ چونکە هەستیان بەوەدەکرد «*کە ئەم ماستە موویەکی تێدا بێت*» و لەگەڵ ئەوەشدا نەیاندەتوانی هیچ بڵێن. بۆیە چەند ڕۆژێک لە قوستەنتەنییە مانەوەو هەندێ دانیشتنی چەند قۆڵییان ئەنجام دان و دوایی بارگەیان تێکناو بەرەو وڵاتەکانیان کەوتنە ڕێ.
خەڵکی تورکیا بە خۆشحاڵییەوە بەرەو سندووقەکانی دەنگدان کەوتنەڕێ تا نوێنەرانی خۆیان هەڵبژێرن یەکەم دانیشتنی ئەنجومەن لەیەکێ لە تەلارەکانی کۆشکی پڕشکۆی دۆڵمەباخچە بوو.
عەبدولحەمید لە کاتێکدا کە سەرداریيەکی ڕەشی پۆشیبوو و، دەستیشی کە پەنجەوانەیەکی سپی بەبەرداکردبوون، لەسەردەسکی شمشێرەکەی قەد پشتی دانابوو، بەشداریی ئەو مەراسیمەی کردو گوێی لە قسەکانی خۆی گرت کە لەلایەن وەزیری دەربارەوە خوێندرایەوە. نوێنەرانی گۆشەو کەناری ئیمپراتۆرییەت بەجلی جۆراوجۆرەوە ئامادەی ئەم دانیشتنە ببوون و بۆ ئەوەی سوڵتان ببینن شانیان لێکدی دەداو یەکتریان پاڵ دەنا، ژمارەیەک کە ژیرتر بوون، چووبوون لەلای ڕاستی

سوڵتانەوە دانیشتبوون، چونکە دەیانزانی بەم کارەیان وانیشان دەدەن کە لایەنگری دەسەڵاتی سوڵتانن.
عەبدولحەمید بەرەسمی سوێندی خوارد کە دەستوری وڵاتە دەپارێزێ و بۆ ئەوەی لێبوردوویی و پشوو فراوانی خۆی لەمەڕ غەیرە تورک و موسڵمانەکاندا نیشان بدات، زۆر ژیرانە میدحەت پاشای وەکو سەرۆک وەزیران هێشتەوەو ئەرمەنییەکی کردە جێگری سەرۆکی ئەنجومەن و دوو یەهودیشی وەک سکرتێری خۆی هەڵبژارد.
لە ئاکامی ئەم کردەوانەداو لەماوەی چەند هەفتەیەکدا، سوڵتان لای حزبی عوسمانییە نوێیەکان واتا لایەنگرانی ریفۆرم و هەروەها خەڵکی ئاسایی کە چاوی هیوایان تێ بڕیبوو، بوو بەکەسایەتییەکی پیرۆزو جێی ستایش. بەڵام هەردوو تاقمەکە، واتا هەم خەڵکی ئاسایی هەم لایەنگرانی عوسمانییە نوێیەکان، دوای ماوەیەکی کورت هیواکانیان وەک بڵقی سەر ئاوی لێ هات. بەڕای سوڵتان پێویست بوو هەندێ کردەوەی وا ئەنجام بدرێت کە بوار بۆ دەستێوەردانی بیانی لەکاروباری دانیشتووە مەسیحییەکانی تورکیا نەهێڵێ. لەم ڕووەوە هێشتا چەند ڕۆژێک بەسەر ڕۆیشتنەوەی نوێنەرانی وڵاتانی ئەوروپاییدا تێنەپەڕی بوو کە میدحەت پاشای بانگکردە کۆشکی دۆڵمە باخچە، کاتێ سەرۆک وەزیر خەریکی ئەوەبوو کەبەرەو لای سوڵتان بکەوێتەڕێ، هەندێ هێماو نیشانەی شومی بەدی کرد کە گوزارشتیان لە ڕوودانی کارەساتێک دەکرد. یەکەم هێمای ئەو کارەساتەی کە بەرێوەبوو ئەوەبوو کە سەربازەکان ماڵەکەیان گەمارۆ دابوو. دووەمیان؛ کە گەیشتە کۆشک، سوڵتان ماوەیەکی زۆر لە ژووری چاوەڕوانیدا هێشتیەوە بێ ئەوەی هیچی پێ بڵێ. سێیەمیان؛ کە ئەمیان شومترین هێما بوو، لە پەنجەرەی ژووری چاوەڕوانییەوە چاوی بە کەشتی گەشتوگوزاریی سوڵتان کەوت کە پێدەچوو ئامادەی ڕۆیشتن بێت و دووکەڵ لە دوکەڵکێشەکانیڕا دەهاتە دەری.
میدحەت نزیکەی کاتژمێرێکی لە چاوەڕوانیدا بەسەربردو تەنها دەنگێک کە دەیبیست دەنگی دوورە دەستی ئاوازی پیانۆیەکی نێو کۆشک بوو کە یەکێ لە ئاهەنگەکانی ئۆفن باخی لێدەدا. سەرئەنجام دوای ئەو چاوەڕوانیە دوورودرێژە، بەردەستێکی تایبەتی سوڵتان هاتە ژوورەوەو بەناڕەحەتییەوە بە میدحەتی ڕاگەیاند کە سوڵتان لەسەرۆک وەزیرایەتی لای داوەو کەشتی پاشایەتیش ئامادەیە تا بیگەیەنێتە هەر بەندەرێکی ئەوروپایی کە حەزی لێ بێ؛ چونکە دەبێ لەمەودوا بەدوور خراوەیی و لەدەرەوەی تورکیادا ژیان بەسەربەرێ.
ئەم کردەوەیەی سوڵتان لە ئاکامی توڕەبوون، یان ناڕەحەتیەکی کاتی نەبوو؛ لەسەردەمی کورتی «دیموکراسی»یەکەی میدحەتدا، میدحەت بێ سەروبەری و گەندەڵییەکی یەکجار زۆری لەکاروباری دارایی و خەزێنەدا دۆزیبۆوە کە سوڵتان دەستی لە هەموویاندا هەبوو سامانێکی یەکجار زۆر لە ئەوراقی بەهادارو پارەی کاش لە خەزێنە دەرهێندرابوو و، سوڵتان بەهیچ شێوەیەک ڕێگەی نەدەدا لەو بارەیەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدرێت.

* * *

لەسەرەتای دەست بەکاربوونی عەبدولحەمید، هێشتا ئەگەری شەڕ لەگەڵ روسیادا لەئارادابوو، بەڵام عەبدولحەمید هێندە بایەخی بەم مەسەلەیە نەدەدا؛ چونکە مەسەلەیەکی تاکە کەسی هەموو پانتایی زەین و هۆشی داگیرکردبوو. لەو جێگەیەیرا کە دوو لە کەس و نزیکەکانی پێشووی لە سەڵتەنەت خرابوون، ترسی ئەوەی کەنەوەکا ئەویش ئەوەی بەسەربێت، ئارام و قەراری لێ بڕیبوو. بۆیە بڕیاریدا کۆشکێکی تازە دروست بکا کە پارێزراو و مەحکەم بێت و بتوانی وەک بەندیخانە لە ناوەوە دەرگاکانی گاڵەبدا و بە ئارامی و هێمنی و بەبێ ترس سەربنێتە سەرسەرینەوە. ئەو کۆشکە گەورە بێ دەرگاو قوفڵانە جێی مەترسیی بوون و چونکە نەشی دەویست قەڵایەکی بورج و شوورەدار درووست بکا، بڕیاریدا شارێکی تازەو نوێ بنیاد بنێت.
دوایین سوڵتانی دیکتاتۆر و تاکرەوی عوسمانی کەسەر ئەنجام بووەهۆی لەنێوچوون و دارمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بەبێ هیچ دوودڵییەک فرمانیدا بەشێکی مەزنی ئەم شارە تازەیە لەسەر زەوییەک بنیاد بنێن کە پێشتر گۆڕستان بوو. شوێنی نێوبراو لەوبەری گەرەکی پڕا، لەبەشی باکوری کەنداوی داردانێل و نزیکەی کیلۆمەترو نیوێک لە کۆشکی دۆڵمە باخچەوە دوور بوو، کە کۆمەڵە خانوویەکی لەرزۆکی لەدار دروستکراوی پەراگەندەی تێیدا قوت کرابۆوەو، تاکۆشکی یلدیز (ئەستێرە)- ئەو کۆشکەی کە عەبدولعەزیزی مامی بەناوی یەکێک لە خاتوونەکانی خۆی کردبوو- درێژەی هەبوو.
عەبدولحەمید بڕیاریدا لەو شوێنە کۆشکێکی بنیاد بنێت و وەک مینووس-ی شای ئەفسانەیی دورگەی کێرت کە ئەشکەوتێکی پڕ پێچ وپەنای لەژێر کۆشکەکەیدا دروست کردبوو، وا بکات کە هیچکەس جگە لە خۆی سەر لەنهێنیەکانی کۆشک و ئەو تەرتیباتەی کە کردبووی، دەرنەکات.بۆ ئەم مەبەستە بەسەدان بیناو ساختومانی پەراگەندەی لەو چەند هیکتارە زەوییەی دەوروبەری کۆشکی یلدز قوت کردەوە کە لە کۆی گشتیدا دەیانتوانی (٥٠٠٠)کەس لە خۆوە بگرن. ئینجا دەتا دوازدە میعماری بە توانا دەست بەکاربوون، بەڵام هیچکامیان ئاگای لەکاری ئەوەی دیکەنەبوو؛ ئەو کرێکارانەی کە لە لایەک بە دروستکردنی حەرەمسەراوە خەریک بوون، هەرگیز چاویان بەو کرێکارانە نەکەوت کە لەلایەکی دیکە بە درووستکردنی گۆلێکی دەستکردەوە خەریک بوون، ئەوانەی کە فرمانیان پێدرابوو خانووە کۆنەکان تێک بدەن و زەوییەکە تەخت بکەن، بچوکترین زانیارییەکیان لەبارەی ئەو باخچەی ئاژەڵانەوە نەبوو کە کیلۆمەترێک دوور لەوان، کۆمەڵێ خەڵکی دیکە بە درووستکردنیەوە خەریک بوون.
بەسەدان کرێکار و بەننا، بەشەو بەڕۆژ خەریکی کارکردن بوون، بەڵام هەرگیز شەوکارەکان، چاویان بە کرێکارەکانی ڕۆژ نەکەوت و تەنانەت یەکتریشیان نەدەناسی. ئەندازیارێکی کارەبا بە دروستکردنی نیوەی کارگەیەکی کارەباوە خەریک بوو و، یەکێکی دیکە نیوەکەی دیکەی دروست دەکرد.
ئەو کەسانەی کە لە دارستانەکانی دەوروبەری بەلگراد دارەکانیان لەڕەگەوە

هەڵدەقەند، هەرگیز چاویان بەو سەدەها عارەبانەیە نەکەوت کە دارە هەڵقەندراوەکانیان دەگواستەوە قوستەنتەنییە تا لە دەوروبەری کۆشک دارستانێکی دەست نێژیان پێ درووست بکەن.

ئەو شوێنەی کە بۆ بنیادنانی کۆشکەکە هەڵبژێردرابوو، بۆ کەسێکی وەک عەبدولحەمید کەهەموو گیانی ترس و گومانی لێدەباری، بێ عەیب بوو. کوچەو کۆڵانە دزێوەکانی گەڕەکی پرایان بەدیوارێک شاردەوەو لای پێشەوەی کۆشکی یڵدزیان ڕووەو گەرووی بسفۆڕ و دیمەنی دڵڕفێنی دەریابنیادنا. ئەو کەشتیە چارۆگەدارانەی کە بە کەنداوی داردانێلدا هاتووچۆیان دەکرد، دەبوایە سەرەتا بەنێو دارستانە دەستکردەکانی کاج و سنەوبەر دا تێپەڕبن و دوایی بێنە ڕۆخ دەریاو سوڵتانیش بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی کەهەمووی دەمێ چاودێری بەسەرهاتووچۆی کەشتییەکانەوە هەیە، فرمانیدا هەندێ بورجی زێرەڤانی لەدەوروبەری کۆشک دروست بکەن و هەر کام لەو بورجانەش دووربینی بەهێزی تێدا دانان.

عەبدولحەمید بۆ ماوەی چەند مانگێک هەموو شەوێ لەگەڵ خزمەتکارێکیدا، بەنهێنی سەردانی شوێنی بیناکردنی کۆشک و ساختومانە نیوەچڵەکانی دەکردو بەسەری دەکردنەوە. سەرئەنجام کۆنە قەبرستانەکە بەدەیان ساختومان، پارکێکی بەرین بە گوڵێکی دەستکردو حەوزو نافورەو کانیاوی ڕازاوەو باخی گوڵەلالەو تەنانەت باخچەیەکی ئاژەڵان کە گیانلەبەری دەگمەن و کەم ژمارەی دوورترین ناوچەکانی دنیایان بۆ هێنابوو، لێ بنیادنرا.

باخچەی ئاژەڵانەکەی، بەسەدان توتی بۆ هێندرابوو کە قەفەسەکانیان بەدارەوەکرابوو. عەبدولحەمید لەو باوەڕەدابووکە ئەو توتییانە پارێزەری گیانی ئەون و ئەگەر بێگانەیەک لەوناوە بین، دەست بەهات و هاوار دەکەن و دەقیژێنن!

لە تەنیشت ئەو شەقامانەی کە چەوڕێژکرابوون و درەختەکانی قەرۆخیان چەتریان کردبوو، عەبدولحەمید کۆمەڵە قاوەخانەیەکی درووست کردبوو کە تێیاندا ڕاسپێردراوانی جێی متمانەی عەبدولحەمید ڕۆڵی قاوەچییەکانیان دەبینی و جلی قاوەچییان دەپۆشی و بۆنۆشینی قاوە فەرموویان لە سوڵتان دەکرد. عەبولحەمید جەختی دەکرد بۆ ئەوەی هەموو شتی ئاسایی و سرووشتی بێتە بەرچاو، دوای قاوەخواردنەوە کەلەکاتی پیاسەی بەیانیاندا ئەنجامی دەدا، حەتمەن پارەی قاوەکە بدات، بۆ ئەوەی کەس گومانی ئەوە نەکات کە ڕەنگبێ ئەم قاوەچییانە، پۆلیسی نهێنی بن.

تەنها شتێک لە دیمەنەکەی تێک دەدا، ئەو بنکە سەربازییە نارێک و زەرد ڕەنگانەبوون کە بەدرێژایی دیواری کۆشک بنیادنرابوون و چاودێریی ناوچە ستراتیژییەکانی وشکانییان دەکرد.

جگە لەوەش، کۆشکی یڵدز لە شارۆچکەیەکی تازە بنیادنراو دەچوو کەزۆر بەبێ سەلیقەیی بنیادنرابوو. عەبدولحەمید بە بەردەوامی ژووری دانیشتنی خۆی دەگۆڕی. ئەم ژووانە بە سەلیقەیەکی سەیر ڕازێندرابوونەوە؛ سەرانسەری زۆربەی دیوارەکان بە ئاوێنەی کۆن داپۆشرابوون و بەشێوەیەکیش دانرابوون کە سوڵتان بتوانی

چاودێری بچوکترین جوڵەی خەڵکی بیانی بکات.
فەرشە ئێرانییە گرانبەهاکان و مێزە تورکییەکان و گوڵدانە چینییە گرانبەهاکان، لە تەنیشت قەنەفە فەرەنساییە ئەرزان بەهاکان و کەلوپەلی لابەلای وەکو کاتژمێری دیواری و کەرستەی وازیی جۆراوجۆر، دانرابوون. تەڵەمشکێکی ئینگلیزی لە تەنیشت قتووە جغارمیەکی بەزێڕو گەوهەر نەخشێندراو، لەسەرمێزی سوڵتان دانرابوو. نزیکەی پەنجا پیانۆی جۆراوجۆر لە شوێنی جیاجیای کۆشک و ڕێک لەبەردەمی دەرگای ژوورەکان دانرابوون بۆ ئەوەی کاتێ خەڵک دێنەژوورەوە، ناچار بن بەڕیز ویەک بەدوای یەکدا بێنە ژوورەوە. ئەغلەبی ژوورو کۆریدۆرو تەنانەت ساختومانەکانیش بەهۆی تونێلی ژێر زەمینی و نهێنیەوە پەیوەندییان بەیەکدییەوە هەبوو کە جگە لە سوڵتان کەسی دیکە پێی نەدەزانین.
ئەو (سوڵتان) وەکو ئەوکەسانەی کە ئابڵۆقە درابێ، زۆربەی ژورەکانی لەشتی پڕوپوچ و بێ مانا ئاخنیبوو.
لەیەکێ لەو ساختومانانەدا، کەشتییەکی جەنگی بە پارچەپارچەکراوی لەنێو سندوقاندا ڕاگیرابوو کە کاتی خۆی لەبەریتانیا کڕدرابوو. ئەم کەشتییە سەرەتا هێندرابۆ نێو بسفۆڕەوە، بەڵام عەبدولحەمید هەر کەچاوی پێکەوتبوو، ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو کە نەوەکا لەدژی خۆی بەکاری بێنن، بۆیە فرمانیدا پارچە پارچەی بکەن و لەکۆشک داینێن. لەهەموو ئەو ژورانەش کە سوڵتان تێیاندا دادەنیشت، چەند دەمانچەیەکی لەسەرڕێ لە شوێنێک کە سوڵتان خێرا دەستی پێ ڕابگات، دانرابوون. ژمارەی ئەو دەمانچانە بەسەریەکەوە هەزار دانەبوون و عەبدولحەمیدیش بۆخۆی نیشان شکێنێکی کارامەبوو.
تاکە هێماکانی دنیای نوێ لە سنوری ژیانی تایبەتی سوڵتاندا، بریتی بوون لە شانۆیەکی تایبەتی کە لەهەوای ئازادو لەدەرەوە نمایشی تێدا دەکرا، بەلەمێکی ماتۆڕ کە لەنێو گۆلە دەستکردەکەی دابوو و، هێڵێکی تەلگراف (بروسکە) کە لە ڕێگەیەوە پەیوەندی بە سیخوڕەکانی خۆی دەکرد. سوڵتان ماتۆڕێکی بەرهەمهێنەری وزەی کارەباشی کە کۆشکەکەیدا دانابوو، هەرچەندە ئەودەم بەکارهێنەری گڵۆپی کارەبایی لە نێو قوستەنتەنییەدا یاساغ بوو، چونکە عەبدولحەمید پێی وابوو ئەو «دینەمۆ»یەی کارەبا درووست دەکات، هەمان ئەو «دینامیت»ەیە کە دەتەقێتەوە.
هەروەها سوڵتان فرمانیدا زیندانێکی بچوکیش لە تەنیشت باخچەی ئاژەڵان دروست بکەن بۆ ئەوەی کاتێ زیندانییەکان هات و هاوارو فیغانیان لێ هەدەڵدەستێ، دەنگیان تێکەڵ بەنەڕە و قریشکەی ئاژەڵەکان بێت و بەم پێیە عەبدولحەمید گوێی لەدەنگیان نەبێ.

* * *

ئێستا، کە شوێنی دانیشتنی نوێی عەبدولحەمید ئامادەببوو، ئەو دەیتوانی لەوێوە فەرمانڕەوایی بەسەر قوستەنتەنییەو سەرانسەری وڵاتدا بکات. شێوازی حکومەتەکەی بریتی بوو لە حکومەتێکی پۆلیسی و، کاربەدەست و ئەندامانیشی جاسوس و سیخوڕە بێشومارەکانی سوڵتان بوون کە ڕۆژانە لە ڕێی نامەو تەلگراف

(بروسکە)وە پەیوەندییان پێوەدەکرد. لەڕوانگەی ئەو پیاوە لاواز، لوت درێژو خەمۆکەی کە فەرمانڕەوایەتی بەسەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا دەکرد، هەموو کردەوەیەک، کاردانەوەیەک بوو لەبەرامبەر مەترسیی پەت بەمل داکردن و خنکان.
زۆری پێنەچوو وایلێهات نیوەی خەڵکی قوستەنتەنییە سیخوڕییان بەسەر نیوەکەی دیکەدا دەکرد.
سیخوڕی نەک هەر کردەوەیەکی دزێو نەبوو، بگرە دەبووە هۆی ئەوەی لەلایەن سوڵتانەوە خەڵاتیش بکرێی؛ جاری واهەبوو موچەی کارمەندانی دەوڵەت بەمانگ دوا دەکەوت، کەچی سیخوڕو پیاوانی ئاسایش لەکاتی خۆیدا و بەزیادەوەش موچەی خۆیان وەردەگرت.
ترس و دڵەڕاوکێی سوڵتان کە وەک نەخۆشیی لێهاتبوو، ڕۆژبەڕۆژ پەرەی دەسەند. گەورەترین ترسی ئەوەبوو کە دەرمانخوارد بکرێ و، ئەو ترسەش خەو و خۆراکی لێ حەرام کردبوو. ئاوی خواردنەوەیی لە کانیاوێکی تایبەتی و بەقتووی مۆرو مۆمکراوەوە دەهێندراو سوڵتان بەدەستی خۆی سەرمکەی دەکردەوە، شیری خواردنەوەشی لە کێڵگەیەکی تایبەت کە لە گۆشەیەکی کۆشکی یڵدز درووستکرابوو،دەهێنراو و جاری واهەبوو بۆ ماوەی چەند شەوڕۆژێک ئەو مانگایانەی کە دەیاندۆشین، چاودێرییان دەخرایە سەر و خواردنەکەشی لە مەتبەخێکی شێوە زینداندا لێدەنرا. هەرچەند عەبدولحەمید کابرایەی زۆر خۆر نەبوو، بەڵام زۆر حەزی لەپلاو، دۆڵمەی کدوو، هێلکەی کوڵاو و ماست بوو. پێش نانخواردن، کۆمەڵێ ڕێوشوێنی سەیرو سەمەرە بەمەبەستی پاراستنی گیانی سوڵتان و دوورخستنەوەی مەترسی دەرمانخوارد کرانی سوڵتان دەگیرایە بەر. عوسمان بەگ کە خزمەتکاری تایبەتی سوڵتان بوو و، نازناوی «پارێزەری گیان و تەندروستی سوڵتان»ی پێ بەخشرابوو، دەبوایە لەهەموو خواردنەکان پارووپەک بخوات. دواتر پارویەکیان دەرخواردی سەگ، یان پشیلەیەک دەدا و جاری واش هەبوو سوڵتان پاروویەکی دەدا بەو وەزیرو کاربەدەستانەی کە گومانی لێیان هەبوو. ئینجا دوای ئەو هەموو بەزم و ڕەزمە دەستی بە نانخواردن دەکرد.
تەنانەت کاتێ نانی دەخوارد دەبوایە هەموو کردەوە ڕۆتینییەکان ئەنجام بدرێن. سەرەتا دوو کۆیلەی ڕەش پێست بەجلی زێڕدووراوی یەک شێوەوە، دەفرەکانی خواردنیان لەسەر سینیەک دادەناو شاڵێکی کشمیری یان بەسەردادەدان و لەسەر مێزیان دادەنان.دواتر خواردنی سەرەکی کە پێشتر لێی تام کرابوو و تاقی کرابۆوە، لەسەر سینیەکی زیو دادەنراو قوماشێکی ڕەشیشی بەسەردا دەدراو، مۆرو مۆم دەکرا. سەرئەنجام کۆیلەیەکی ڕەش پێستی دیکە نانەکەی دەهێنا کە ئەویش وەک ئەوانی دیکە لە سەوەتەیەک دابوو و، مۆرومۆم کرابوو.
عەبدولحەمید بە هۆی ئەوەی کە گەدەی باش کاری نەدەکرد و زۆر خۆر نەبوو، ئەغڵەبی خواردنەکانیی بەنیوەچڵی، یان بەدەست لێنەدراوی بەجێدەهێشت و لەجیاتی ئەوەی نان بخوا، ئەو حەبانەی دەخوارد کە دکتۆر بۆی دانابوو. بەڵام خودی ئەم حەب خواردنە سادەو ساکارەش وردە وردە وایلێهات کە بە ڕێوشوێنی شاهانە

بخورێت کە پتر لەگاڵتەجاڕی دەچوو تا بەحەب خواردن. یەکێ لەو خواجە سەرایانەی کە جێی متمانەی سوڵتان بوو، بۆ کڕینی حەب دەنێردرایە شار. دواتر سوڵتان حەبەکانی لە تورەگەیەک دەکرد و ڕای دەوەشاندن بۆ ئەوە تێکەڵی یەکدی بن، ئینجا دەستی لە تورگەکە ڕۆ دەکردو حەبێکی دەردێناو دەیخواردو پێی وابوو بەم شێوەیە مەترسی دەرمانخوارد کردن کەم دەبێتەوە.
عەبدولحەمید جگەرەکێشێکی عەجایب بوو، بەڵام قەت جگەرەی بۆن خۆش و گرانبەهای نەدەکێشا؛ چونکە پێی وابوو ڕەنگبێ بەهۆی ئەم بۆن و دەرمانە بۆن خۆشانەوە دەرمانخوارد بکرێ. بۆیە فرمانی دەدا بچن لە قوستەنتەنییە لە هەرزانترین و خەراپترین توتنەکان کیسەیەکی بۆ بکڕن و قتوویەکی سەرموردا بۆی بێنن. خولامەکەی بۆی نەبوو تا سوڵتان داوانەکات سەری کیسەکە بکاتەوەو جگەرەیەکی بۆ بپێچێتەوە. کە فرمانیشی دەدا جگەرەی بۆ بپێچنەوە، دەبوایە ئەو خولامەی جگەرەکەی بۆ دەپێچێتەوە، دوای پێچانەوەی جگەرەکە خۆی جگەرەکە داگیرسێنێ و قومێکیشی لێدات، ئینجا دوای ئەمە سوڵتان بە ئاسودەیەیی باقیەکەی دیکەی دەکێشا. هەروەها سوڵتان لەوە دەترسا جلەکانی بەژەهر بکرێن، بۆیە دەبوایە براکەی (عیزەت) پێشتر جلەکانی سوڵتان بپۆشێ یان بە قەولی خۆی «گەرمیان بکات» ئینجا سوڵتان دەیکردنە بەرخۆی.
لەگەڵ ئەوەشدا کە عەبدولحەمید کابرایەکی هەوسبازو زۆرپەڕ نەبوو، بەڵام زۆربەی کاتی خۆی لە حەرەمسەردا دەبردە سەرو پێی وابوو ئەوێ تاکە شوێنێکە کە تێیدا دڵنیایە لەوەی دەرمانخوارد ناکرێ. بۆیە حەرەمسەرا، کە دوو سەد ئافرەتی قەمپاتمەی ئەوی تێدابوو، دنیای ڕاستەقینەی عەبدولحەمید بوو؛ لە نێو ئەو ئافرەتانەیدا کەوەک شورەیەک بە دەوری ژیانی عەبدولحەمیددا تەنرابوون و عەبدولحەمید دڵنیابوو لەوەی کە ژیانی دەپارێزن، لەوپەڕی ئاسوودەییدا دەژیا، بەڵام ئەو ئافرەتانە بەلای ئەوەوە پتر شتێکی مادی بوون تا ئەوێندارو دڵرفێن و خاتوون، ئەڵبەتە بێجگە لەو کچە پەری شێوانەی کە لە هەندێ بۆنەی تایبەتیدا پێشکەشی دەکران. دوای ماوەیەک، عەبدولحەمید تەنانەت لە کاروباری دەوڵەتی و ئیداریشدا ڕاوێژی بە ئافرەتانی حەرەمسەرا دەکردو ئەو کەسانەی کە لەدەرەوەڕا دەهاتنە لای ئەغلەب ئافرەتێکیان لە تەنیشت عەبدولحەمید دەدیت.
هیچکەس نەیدەزانی لەژێر ئەو عەبایە ئەستورەدا کام ژنی عەبدولحەمید خۆی حەشاردراوەو نامەکانی سوڵتان دەکاتەو بەپاککراوەیی دەیخاتە بەردەستی سوڵتان.
هەر چەندە عەبدولحەمید خۆشترین کاتی ئەو کاتەبوو کە لە حەرەمسەردا بوو و، ئەغلەب لەگەڵ منداڵەکانیدا گەمەی دەکردو هەندێ جاریش زۆر ناشارەزایانە پیانۆی لێدەدا. بەڵام هێندەی پێنەچوو لەژنەکانی خۆشی بەشک کەوت، سوڵتان چەندین ساڵ بەر لەو کاتە سەردانی مۆزەخانەیەکی وەک مۆزەخانەکەی مادام تۆسۆی لەندەنی کردبوو کە تێیدا هەیکەلی کەسایەتییە بەنێوبانگەکانی دنیایان بەمۆم درووست کردبوو، بۆیە فرمانی دا هەیکەلێکی خۆی درووست بکەن و لە گۆشەیەکی حەرەمسەرا داینێن بۆ ئەوەی ئافرەتەکان پێیان وابێ کە هەمیشە ئاگای لێیانەو

چاودێرییان دەکات!

لەو کاتەدا عەبدولحەمید تەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا رایدەبوارد کە ئەویش لە حەرەمسەرادا نەدەژیاو ئەمەش بۆ کەسێکی وەکو سوڵتان نەک هەر شتێکی دەگمەن، بگرە سەر سوڕهێنەریش بوو. عەبدولحەمید لەسەرەتای دەست بەکاربوونی وەکو سوڵتان، عاشقی «کچێکی قژ زەردی چاوکەش» بوو. ئەم کچە ناوی «فلۆرا کوردیە» بوو و، بەرەچەڵەک بەلژیکی بوو. ئەم کچە لە شەقامی پڕا کە گەڕەکێکی دەولەمەندنشین و ناوەندی کڕین و فرۆشتن و ڕابواردنی خەڵکی قوستەنتەنییەبوو، دوکانێکی فرۆشتنی کڵاو دەستێکشی هەبوو. عەبدولحەمید دووساڵ بەرلەوەی ببێ بە سوڵتان، چاوی بەم کچە کەوتبوو و، زۆر بەسەختی عاشقی ببوو. ئەم عەشقە تەنها لایەنی سۆزداری و شەهوانی نەبوو؛ چونکە لەگەڵ ئەوەشدا فلۆرا دوایین هەواڵ و ئەو پڕوپاگەندانەی دەگەیاندە سوڵتان کە لە کڕیارەکانەوە گوێبیستیان دەبوو.

لە سەرەتادا، ئەمە وەک ڕووداوێکی ئەویندارى گەرم لە قەڵەم دەدرا و دوای ماوەیەک هەواڵەکەی گەیەندرایە لەندەن. لەمڕووەوە کاتێ عەبدولحەمید لەسەر تەخت دانیشت، (دیزرائیلی)ی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لەنامەیەکدا بۆ سالزبۆری لەمبارەیەوە نووسیبووی: *«سوڵتانی نوێ تەنیا یەک ژنی هەیە و ئەویش کچێکی کڵاوفرۆشی (بەلژیکی)یە کە لە گەڕەکی پڕا دووکانی هەیە. عەبدولحەمید خوی بەوەوە گرتووە کەسەردانی ئەم کچە بکات و بە بیانووی کڵاو کڕین بەدیداری شاد بێت. ڕۆژێکیان سوڵتان بەکچەکەی گوتووە: «ئایا پێتوایە بتوانی ڕۆژێک ببی بە هاوسەرم؟» و کچەکە وەڵامی داوەتەوەو گوتوویەتی: «بۆنا؟» ئێستا ئەوەندەی ئاگام لێ بێ عەبدولحەمید ئەو کچەی هێناوەو هەر ئەم ئافرەتە (بەلژیکی)یە وای لە عەبدولحەمید کردووە ڕوو لە حەرەمسەرا نەکات. بە کورتیەکەی ڕەنگبێ ئەوەش ڕۆکسلانەیەکی نوێ بێت. ئێستا دەبێ چاوەڕێی ئەوەبین کە ئایا عەبدولحەمیدیش دەگاتە ئەو شان و شکۆیەی کە سوڵتان سلێمان پێی گەیشت؟.»*

ئەمە تاکە شتێک بوو کە عەبدولحەمید پێی وابوو بەهۆیەوە لەکامەرانیدا دەژیت، بەڵام پێ نەدەچوو ئەو کچەی هێنابێت. فلۆرا هەرگیز پێی نەنایە حەرەمسەرای سوڵتانەوەو لە خانوویەکدا دەژیا کە عەبدولحەمید بۆی کڕیبوو. هەرکاتێ سوڵتان حەزی لێ بایە ببینێ، بە گالیسکەیەکی سەرداخراو دەیان هێنایە کۆشکی یلدز. بەڵام لەو بەینەدا ڕووداوێکی تاڵ ڕوویداو ئەویش ئەوە بوو کە لەبەرئەوەی ئیدی فلۆرا دوکانی نەمابوو، نەیدەتوانی هەواڵ و پڕوپاگەندەکانی دەمی خەڵک بە سوڵتان بگەیەنێ و ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە سوڵتان لە فلۆرا دڵسارد بێ. لەمڕووە دوای ماوەیەک سوڵتان، فلۆرای لەبەرچاوکەوت چیواشی پێ نەچوو کە وابڵاوبۆوە دوکانەکەی فرۆشتووەو گەڕاوەتەوە بەلژیک.

دوای چەندین ساڵ، لەیدی لایارد-ی هاوسەری باڵیۆزی بەریتانیا لە کاتی سەردانی حەرەمسەرای سوڵتانی عوسمانیدا چاوی بەکچێکی جوانکیلە کەوت کە زۆر بەڕەوانی بەزمانی فەرەنسی قسەی دەکرد. کاتێ عەبدولحەمید بۆی ڕوونکردەوە

کـــە «ئەم کچە لە خانوویەکی بچوکی کڵاوفرۆشێکی بەڵژیکی کە ئافرەتێکی زۆر وریاو ژیر بووەو لەگەڕەکی پرادا دەژییەت»، لەیدی لایارد سەری سوڕما. کاتێ ئەم سەرسووڕمانەی پتربوو کە دیتی خواجە سەراکان ڕێزی ئەم کچە دەگرن و ئەویش زۆر بە ئاسایی گاڵتە لەگەڵ سوڵتاندا دەکات. ئایا ئەو کچە، کچی عەبدولحەمید و فلۆرا کوردییە بوو؟

ئێمە هەرگیز ناتوانین پەی بەم نهێنییە ببەین، چونکە کچە دوای ماوەیەک تووشی هەڵەیەکی گەورەبوو، هەڵە گەورەکەشی ئەوەبوو کە لەگەڵ شازادە سەلیمی تەمەن هەژدە ساڵانی کوڕی سوڵتان عەبدولحەمیددا ژوانێکی عاشقانەی بەست و سوڵتان لەڕێی سیخوڕەکانیەوە پێی زانی. ئەمە بووەهۆی ئەوەی کە سوڵتان بە پەلە کوڕەکەی دووربخاتەوەو کیژۆڵەکەش بەپێی نەریتی کۆن لە بسفۆڕدا نغرۆ کرا.

هەندێ جـار سـوڵتـان مـیـوانداری و شـتـی واشی ڕێک دەخـست و بۆ ئەم میوانداریانەش کە ئێواران ساز دەدران، کۆشکی دۆڵمە باخچەی بەکاردەهێنا. بەڵام کاتێ دیپلۆماتە بیانییەکانی بانگهێشت کردبایە، پتر یەکێ لە تالارەکانی کۆشکی یلدزی بەکاردەهێنا. خواردنەکیان، بەهۆی دووری مەتبەخ لە شوێنی نانخواردن، زۆبەی کات بەساردبۆوەیی لە بێدەنگیدا دەخوران و بەقاوە خواردنەوەش کۆتایی بە میوانداریەکە دەهات.

ئەم کردەوە رۆتینیانە بەڕادەیەک بە وردی جێبەجێ دەکران کە درۆگـــی ـی پەیامنێری رۆژنامەی دەیلی تەلگراف کە بەشداریی یەکێ لەو میوانداریانەی کردووە بەسەختی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەم کردەوانەو نووسیویەتی: «*کاتێ سوڵتان فرمانیدا قاوەی بۆ بێنن، یەکێ لە خزمەتکارەکان لە قتویەک چەند دنکە قاوەیەکی خستەنێو قاوەجۆشێکی زیوین و لەسەر پشکۆی نێو مەقلی ڕایگرت تا بەکوڵ هات، ئێنجا فنجانێکی چینی هێنا کە تەوقێکی ئاڵتونیی بەگەوهەر نەخشێندراوی پێوەبوو، قاوەکەی تێکردو دایەدەست سوڵتان*». بەڵام لە ڕاستیدا شان و شکۆو گەورەیی سوڵتانەکانی پێشوو لەنێو چوو بوو و لاسایی کردنەوەیەکی ڕەق و ڕووت جێی ئەو شـان و شکۆیەی پێشـووی گـرتبـۆوە، تاقـمـێکی زۆر لە کـەئیـزەک و خزمەتکارو...هتد، هێشتا هەر وەکو جاران دەهاتن و دەچوون، بەڵام باق و بریقی جارانیان نەمابوو. ڕێک وەک ئەوە وابوو کە شانۆنامەیەکی کلاسیکی شکسپیر بە جلوبەرگی ئەمڕۆ نمایش بکرێ. سەرۆک وەزیران کە سەردەمێک بەجلی ئەتڵەسی سپی کە لێوارەکانی لە کەوڵە قووز دورابوو و بەشداریی مەراسیمەکانی دەکرد، ئێستا بەجلێک کەشێوەی لە یونیفۆرمی ئەفسەرانی ئەڵمانی دەچوو و بەفینەسوورەکەی سەری پتر بە پیرەمێردێکی ماستاوچی وپان کەرەوە دەچوو تا بە وەزیرێکی بەهێزو دەست ڕۆیشتوو. خواجە ڕەش پێستەکان کەسەردەمێک مرۆڤ بە بینینی هەیبەب و شان و شکۆی ڕۆژهەڵاتییان، سام و ترسی لێ دەنیشت، ئێستا لە سەرداریـیـە ڕەشە ئەستەمبوولییەکانیان زۆر کرێت و دزێو دەهاتنە پێش چاو ولەقەڵەویانیش بەزەحمەت دەیانتوانی قۆپچەکانی یەخەی سەرداریەکەی خۆیان داخەن و، پتر بەتاقمی ناشتنی مەیت و جەنازە بەڕێخەر دەچوون.

ئێستا هەموو شتێکی کۆشکی یڵدز لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتەجارانەی شان وشکۆی سەردەمی پێشوو بوو کە بەتەواوەتی پەیوەندیی خۆی لەگەڵ ڕاستییەکانی سەردەمدا پچڕاندبوو. سیخوڕو جاسوسەکانی سوڵتان بریتی بوون لەخواجە سەرایان و ئافرەتانی حەرەمسەراو خزمەتکارو پاسەوانانی کۆشک کە بە پێی بەرژەوەندی خۆیان هەواڵ و زانیاریی درۆو ناڕاستیان دەدایە سوڵتان.

لە قوستەنتەنییە ژمارەی پۆلیس و سیخوڕو پیاوانی ئاسایش لە سەربازگەکەی نێوشار پتربوو. دوای ماوەیەک عەبدولحەمید ڕێگەی نەدەدا وەزیرەکانیشی مەگەر حاڵەتێکی زۆر نائاسایی بایە، بێنە لای و کاتێ فرمانێکی بەسەرۆک وەزیران بدابایە ئەوا دەبوایە سەرۆک وەزیران بەبێ ئەوەی مافی پرسیارکردنی هەبێ جێبەجێی بکات. زۆربەی کاتیش وەزیرو کاربەدەستانی پایەرزی وڵات فرمان و ڕاسپاردەکانی سوڵتانیان لە خەڵکی بەردەستی سوڵتانەوە پێ دەگەیشت. بۆیە سەیر نیە ئەگەر بڵێین سوڵتان ئاگای لەو هەورە ڕەشانە نەبوو کە ئاسمانی تورکیایان دادەگرت؛ چونکە وەزیرەکان بەشێوەیەکی ڕاستەقینە بارودۆخی وڵاتیان پێڕانەدەگەیاند.

هەر لەم ڕووەوە کاتێ بۆ جاری دووەم وڵاتانی ئەورووپایی بڕیاریاندا چارەسەرێک بۆ گرفتی ڕۆژهەڵات بدۆزنەوە، یان بەواتایەکی دیکە ڕووی خۆیان ڕووەو مەسەلەی بوڵغاریا و دانیشتووە مەسیحییەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی وەرگێڕا، سوڵتان وەک جاری پێشوو بە پشووکورتی و نارەحەتییەوە ئەم کارەی بەدەست تێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی وڵاتەکەی لەقەڵەم داو قەبوڵی نەکرد.

ئەوە هەمان ئەو دەرفەتە بوو کە قەیسەری ڕوسیا چاوەڕێی دەکردو هەمان ئەو ساتەش بوو کە شاژنی بەریتانیا (ڤیکتۆریا) لێی دەترسا؛ چونکە ئەو (شاژنی بەریتانیا) ڕوسیای بە دوژمنی باوەکوشتەی بەریتانیا دەزانی. لەسەردەمی شەڕی کریمەوە ڕوسیا بەبێ دەنگی بە داگیرکردنی خاکی ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاستەوە خەریک بوو و ئێستاکەش ڤیکتۆریا سەبارەت بە پیلانەکانی ڕوسیا بۆ هێرش کردنە سەر هیندستان هۆشداری دەدایە دەوڵەتەکەی خۆی، بەڵام هۆشداری دان لە کوێ و ناچارکردنی کابینەی لەندەن بۆ ئەنجامی کردەوە، یان تەنانەت بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەک لە دژی نیازو مەبەستەکانی ڕوسیا لە کوێ؟

ڤیکتۆریا، لەوەی کە کابینە هۆشدارییەکانی بەهەند نەگرتووەو وەڵامی پێ نەبووە، بەڕادەیەک نارەحەت و زویر بوو کە هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەی خستەڕوو و لەنامەیەکدا بۆ سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا گوتی:*«ئەگەر دەوڵەتی ئینگلیز دەیەوێ قاچی ڕوسیا ماچ بکات، شاژن ئامادەنییە بەشداری لەمەراسیمێکی وا پڕ لەشەرمەزاری بکات و تاجەکەی خۆی دادەنێ.»* لە یاداشتێکیشدا کە سەبارەت بە مەترسییەکانی سەرکەوتنی ڕوسیا بەسەر تورکیادا دابووی بەکابینەی ئینگلیز، نووسیبووی: *«ئێستا قسە لەسەر سەرکەوتنی بەریتانیا یان ڕوسیایە لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێو دەوڵەتیدا.»*

لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا کەس نەیدەتوانی بڕوا بکات کە بەریتانیا لەبەرخاتری

بولغاریا شەڕ بکات.
بولغاریا زۆر لە لەندەنەوە دوور بوو، ئەگەرچی گلادستۆن لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتبوو و بە بلاوکردنەوەی نامیلکەیەک (کە ١٢٠٠٠ لیرەشی لە فرۆشتنەکەی دەست کەوتبوو) لەبارەی ئەو ولاتەوە (بولغاریا) نارەحەتی دەردەبڕی و زگ پێ سووتانی خۆی بۆ دەردەبڕین و دەیگوت: «*ئەو پێنج ملیۆن بولغارییەی کە زولمیان لێکراوە، تەنانەت جورئەتی ئەوەیان نییە داوای یارمەتی لەباوکە ئاسمانییەکەی خۆیان بکەن و ئێستا دەستی پاڕانەوەیان ڕووەو ئێوەدرێژ کردووە.*» لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کەس ئامادەنەبوو جارێکی دیکە لاوانی ئینگلیز بۆ شەڕکردن بنێرێتە ولاتانی دوورە دەست، بەلام لە روسیا هەستی خەڵک بە پێچەوانەوە بوو؛ قەیسەر پتر لە هەموو کاتێ ئارەزووی دەست بەسەراگرتنی قوستەنتەنییەی هەبوو و، خۆیشی بۆ ئامادە دەکرد. قەیسەر بەڵێنی ئەوەی لە ڕۆمانیاییەکان وەرگرتبوو کە لەکاتی پێویستیدا ڕێگەبدەن هێزەکانی روسیا بەخاکی ئەو ولاتەدا تێپەڕبن و هەروەها بەڵێنی بێلایەن بوونی لە شەڕی نێوان تورکیاو روسیا، لە هەردوو ئیمپراتۆرییەتی ئۆتریش و مەجەر وەرگرتبوو لە بارودۆخێکی وەهادا، دژایەتیکردنی سوڵتان لەگەڵ پێشنیازی ولاتانی ئەوروپا بەتایبەت دوابەدوای کوشتاری بولغارییاییەکان، دەرفەت و کایەیەکی لەباری بۆ قەیسەر دەڕەخساند.
لە ٢٤ی شوباتی ١٨٧٧، قەیسەر ئەو ڕستەیەی کە بەدرێژایی مێژوو لەلایەن زۆر کەسەوە گوتراوە، هێنایە سەر زمان و گوتی: «*کاسەی سەبرم لێی دەڕژێ*» و لەدژی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی پێی نایە مەیدانی جەنگەوە. هەروەکو جاران مەبەستە سەرەکییەکان لەژێرناوی جیهاد لە پێناو ڕزگارکردنی مەسیحیەت و شەڕی نێوان خاچی مەسیحییەکان و هیلالی موسڵمانەکاندا، شاردرانەوە.
عەبدولحەمید بە بیانووی مەترسی جەنگ، پەرلەمانی هەڵوەشاندەوەو هەر دوابەدوای ئەمەش دوو سوپای بەهێزی روسیا، هێرشیان کردە سەر خاکی تورکیا. لە ئەوروپاوە (٢٠) هەزار سەرباز لەژێر سەرکردایەتی گراندۆک نیکۆلا، لەڕووباری دانۆب پەڕینەوەو لە ئاسیاوەش (١٥٠) هەزار سەرباز لە ژێر سەرکردایەتی گراندۆک میخائیل لە قەفقازەوە بەرەو تورکیا بەڕێ کەوتن.
قوستەنتەنییە پشێوی تێکەوتبوو، ئەو سیخوڕانەی کە پێشتر سوڵتان بەهۆیانەوە حوکمی دەگێڕا، ئەوکاتە هیچیان لەدەستن نەدەهات. لەڕاستیدا تاکە زانیارییەکی ڕاست کە دەگەیشتە سوڵتان لە ڕێگەی (لایارد)ی بالیۆزی بەریتانیا بوو کە بەربەردەوامی چاوی بە عەبدولحەمید دەکەوت، عەبدولحەمیدێک کە لەبەر بێخەوی بەرەچاوی شین هەڵگەڕابوون و بەسووراو دەیشاردەوە! لەو دیدارانەدا، سوڵتان داوای لە لایارد دەکرد کە داوای یارمەتی لە شاژن ڤیکتۆریا بکات.
هەر کە هێزە ئەوروپاییەکانی روسیا لە ڕووباری دانۆب پەڕینەوە، ئێدی دڵنیابوون لەوەی کەچی وایان پێناچێ دەگەنە بەردەم دەروازەکانی قوستەنتەنییە، بەلام لەمپەرێکی بەنداو ئاسا ڕێی لەبەردەم ئەم لافاوە گرت و ئەو بەنداوەش شارێکی خەواڵو بوو لەنێو دۆڵێکدا کە کەوتبۆ سی کیلۆمەتریی باشوری ڕووباری دانۆب و

یەکێ لە قورسترین شەڕەکان و قارەمانانەترین بەرگرییەکانی مێژووی شەڕەکانی جیهانی بەخۆوەدیت ئەم شارە نێوی پلۆنا بوو.

* * *

## فەسڵی دەیەم

### ئابلۆقەی پلۆنا

شاری بچوک و هێمنی پلۆنا لە بولغاریا، کە ژمارەی دانیشتوانی (١٧٠٠٠) کەس بوو، لە هاوین و زستانی ساڵی ١٨٧٧ (١٢٩٤ی کۆچی)دا، گەورەترین شەڕی مێژوویی نێوان روسیاو تورکیای بەخۆوە بینی. ئەم شارە کەوتۆتە نێو دۆڵێکی قوڵەوەو، تەپۆلکەکانی دەوروبەری بە ڕەزو باخ و کێڵگەی گوڵەبەڕۆژە داپۆشراون. ئەم شارە لەسێ لاوە بە بەرزایی و خەڕندو کوێرەڕێی شاخاویی دەورە دراوەو، ئەمەش وایکردووە کە دەست بەسەراگرتنی کەڵێک ئاستەم بێت. لای چوارەمیشی کردێکی پڕە لەڕەز و، باخی میوەی لێیە. بایەخی ستراتیژیکی پلۆنا لەو جێیەوە سەرچاوە دەگرێ کە کەوتۆتە سەرڕووباری (وید)ەوە.

پلۆنا، لەلای باکورەوە کەوتەبەر هێرشی سوپایەکی (١٨٠) هەزار کەسیی روسیا کە (٨٠٠) تۆپیان پێبوو. روسەکان پێشتر دەستیان بەسەر قەڵای نیکۆپۆلیدا گرتبوو کە سی کیلۆمەتر لە باکوری پلۆناوە دوور بوو و کەوتبۆ سەرکەناری ڕووباری دانۆب. هەروەها گەروی شیپکاشیان داگیرکردبوو، کە ئەویش بە دەروازەی شاخاویی بالکان لەقەڵەم دەدرا. لەم دوو شوێنەدا بەرەوڕووی بەرگرییەکی کەمی تورکەکان ببوونەوەو بەم پێیە بە ئاسانی دەستیان بەسەر ئەم ناوچانە داگرتبوو، بۆیە پێیان وابوو دەتوانن بەو ئاسانییە پلۆناش داگیر بکەن و بەم شێوەیە ڕێگای سۆفیا-قوستەنتەنییە، بەسەریاندا ئاوالا دەبوو. بەلام ئەم جارەیان عەبدولحەمید بە پێچەوانەی جارەکانی پێشوو، کاردانەوەیەکی خێرای لە خۆی نیشانداو بەپەلە تەلگرافێکی بۆ عوسمان پاشا لێدا کەسەرکردایەتی ئەو سوپایەی لە ئەستۆ بوو کە لە (ویدن)ی نزیک دانۆب نیشتەجێ بوون. عەبدولحەمید لەو تەلگرافەدا فرمانی بە عوسمان پاشادا کەبەخێرایی خۆی بگەیەنێتە دانۆب و هەروەها لە تەلگرافەکەیدا نووسیشی:*«ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کەوتۆتە نێوان مان و نەمانەوە.»*

عوسمان پاشا کەتەمەنی (٤٠) ساڵان بوو، پێشتر بەشداریی لەشەڕی کریمەدا کردبوو و، بەسەربازێکی ڕاستەقینە لەقەڵەم دەدرا. عوسمان کابرایەکی کورتیلە، کەمدوێ، خاوەن هێزی سەرکردایەتی و کەسایەتییەکی پۆلایین و بەسام بوو. سوپای ژێر سەرکردایەتیی عوسمان کە ژمارەیان خۆی لە(٥٠)هەزارکەس دەدا، لە بەرەبەیانی ڕۆژی (١٣)ی تەمموزی ئەو ساڵە، بەرەو پلۆنا کە (١٨٠) کیلۆمەتر لێیانەوە دوور بوو، بەڕێ کەوتن. سەربازەکانی ڕیزێکی (١٥) کیلۆمەترییان بەستبوو

و ڕێیان دەکردو ئازوەی یەک هەفتەی خۆیان پێبوو کە بریتی بوو لە نانی وشک، کە بەڕادەیەک ڕەق بوو بەچەکوچ نەبا نەدەشکاو، دەبوایە بۆ خواردن لە ئاوی هەڵێنن و بیخوسێنن.

کاتێ عوسمان پاشا لە ڕۆژی (١٩)ی تەمموز گەیشتە پلۆنا، بەپەلە چاوێکی بە گردو تەپۆلکەو گوندەکانی دەوروبەری پلۆنادا خشاند. عوسمان گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە جگە لە بەکارهێنانی ئەو چەپەرە سرووشتییانەی کە دەورەی پلۆنایان داوە، بەهیچ جۆرێکی دیکە ناکرێ بەرگری لە پلۆنا بکات. هەروەها دەشی زانی کە بەم زووانە قەیسەر فرمانی هێرشکردن بە سوپاکەی خۆی دەدا، بۆیە یەکەم کاری ئەوەبوو کە فرمانیدا، لەدەوروبەری شار خەندەقێک هەڵکەنن و سەنگەرو چەپەری قایم دروست بکەن.

بەشی زۆری هێزەکانی روسیا لە باکووری ڕۆژهەڵاتی پلۆنا مۆڵ درابوون و لەو ڕووە عوسمان دڵنیابوو لەوەی کە یەکەم هێرش لەو لایەوە دەکرێتە سەریان کە لوتکەی کێوێک بوو بە نێوی جانێکبای کە بەرزاییەکەی (١٣٠) مەترو بەسەر دۆڵێکی کاکی بەکاکیدا دەیڕوانی. بۆیە فرمانیدا سەربازەکانی بەشەو و بەڕۆژ و لەبەر ڕووناکایی ئاگردا، بەدرووستکردنی سەنگەری بەکۆمەڵەوە خەریک بن. ئەم کارە ئەنجام دراو تا وایلیهات کۆمەڵێک سەنگەرو شوێنی دانانی تۆپەکان لە هێڵێک بەدرێژایی دوو کیلۆمەترو تا گوندێک بەنێوی گریویتسا ئامادەی بەرگری بوون. لەپشت ئەو سەنگەرانەوەش دوو سەنگەری بە کۆمەڵی مەزن کە دواتر بەسەنگەرەکانی گریویتسا ناوبانگیان دەکردو دیوارەکانیان (٦) مەتر بەرزو (٦) مەتریش پان بوون و هەرچواردەورەیان بە خەندەق دەورە درابوو، دروستکران.ئەمەش بۆئەوە بوو کە ئەگەرهاتوو ڕوسەکان لەولاشەوە هێرشیان کرد، بتوانن لەوێوە پێشیان لێ بگرن و تۆپ بارانیان بکەن.

هەر یەک لەو سەنگەرانە نزیکەی هەزار سەربازی ئامادەی شەڕو بەرگرییان تێدابوو. سەربازەکان بەو کەرستەو کەلوپەلەی کە لە گوندەکانی دەوروبەر بە تاڵانیان هێنابوو، خەوگەو عەمبارێکی ئازوقەی باشیان درووست کردبوو و، لەژێر زەمینی سەنگەرەکانیشیان تەقەمەنی پێویستیان عەمبار کردبوو.

بەر لە کۆتایی هاتنی مانگی تەمموز، پلۆنا وەک قەڵایەکی پۆڵایینی لێهاتبوو و، تورکەکان ئامادەی بەرگریکردن بوون. هەر کام لە سەربازەکان ئازووقەی پێویست و قاوەو (٥٠٠) فیشەکیان درابۆیە. لەنێو سەنگەرەکانیش بەڕادەیەکی باش کەلوپەلی پێویست عەمبار کرابوو. هەروەها لە پشت سەنگەرەکانیشەوە داشقەو بارگین-ی پێویست بۆ گوێزانەوەی بریندارو تۆپخانە بۆ نێو شار دەستەبەرکرابوو.

ئێستا ئیدی عوسمان دەبوو بەس چاوەڕیی هێرشی ڕوسەکان بکات. بارودۆخی پلۆنا ئاسایی دەهاتە پێش چاو، هەرچەندە کەس مافی ئەوەی نەبوو بێتە ناویەوە، یان ئەوەتا لێی دەربچێ. سەرەتا، دوکانداروبازرگانە بولغارییەکان دوکانەکانی خۆیان داخست، بەڵام دوای ئەوەی کە عوسمان چەند سەربازێکی تاڵانچیی تورکی لە سێدارەدا، ئیدی وایلێهات هەستیان بە دڵنیایی کردو سەر لەنوێ دوکانەکانی

خۆیان کردەوە. شار بەڕادەی پێویست ئازوقەو خوردو خۆراکی تێدا دەست دەکەوت و لەماوەی ئەو چەند ڕۆژەیدا کە شەڕی لابەلا لەنێوان هەردوولادا ڕووی دەدا، بازاڕی پلۆنا بارودۆخێکی تایبەتیی هەبوو؛ سەربازە چەرکەسییەکان بە فرۆشتنەوەی یۆنیفۆرم، ڕۆبڵ و خاچی زیوینی بەربازو ئەفسەرە ڕوسەکانەوە خەریک بوون. نەریتی تالآن و بڕۆ، لەدێرزەمانەوە لەنێو سوپای عوسمانیدا باو بوو و، عوسمان نەیدەتوانی ڕێگە لەم کارەی سەربازانی تورک بگرێ.

بەرە ڕۆژئاوای ڕۆژی ٢٩ی تەمموز، ئارچیبالد فۆربس-ی پەیامنێری ڕۆژنامەی دەیلی نیوز، لەکەسانی نزیک لەسەرکردایەتی سوپای روسیا ی بیست کە بڕیاروایە ڕۆژی دواتر، (٣٥) هەزار سەرباز بە (١٧٠) تۆپەوە هێرش بکەنە سەر سەنگەرەکانی گریویتسا.(٨) فرمانی روسیا بە سەربازەکان بەم شێوەیە بوو: «بەهەر نرخێک بێت، سەرکەون.»

کاتژمێر (١١)ی پێش نیوەڕۆی ڕۆژی (٣٠) تەمموز، هێرش دەستی پێکرد. تورکەکان لەنێو سەنگەرەکانیانەوە، دەستیان کرد بە بەرگری کردن و سێ شەپۆلی سەربازە روسەکانیان بەرەو دواوە گەڕاندەو تێکیان شکاندن. هۆی ئەم سەرکەوتنەی تورکەکانیش جگە لەوەی کە لە دۆخی بەرگری دابوون، جیاوازی نێوان چەکەکانی هەردوولابوو کە سەربازە تورکەکان بەچەکی ئەمەریکایی پێشکەوتوو دەجەنگان. ئەم چەکانەی کە تورکەکان پێی دەجەنگان تاپڕی پیبادی ئەمەریکایی بوو کە بەم دواییە عەبدولحەمید نزیکەی نیو ملیۆنی لە ئەمەریکا کڕیبوو. تورکەکان لە شوێنی خۆیان نەجولآن و لەمەودایەکی نزیکەوە تەقەیان لە هێرشبەرە ڕوسەکان دەکرد، بەڵام بەهاتنی هێزێکی یاریدەدەری (١٠) هەزار کەسی، ڕوسەکان تای تەرازووی شەڕیان بەلای خۆیاندا شکاندەوە سەربازە ڕوسەکان گەیشتبوونە بن سەنگەری تورکەکان و فۆربس لە دوورەوە بریسکەی سەرنێزەی تفەنگەکانی دەدی. تورکەکان وردە وردە کشانەوەپاش و چوونە پشت تۆپخانەکەیانەوە. روسەکان دەستیان بەسەر یەکەم سەنگەردا گرت و فۆربس ئەوکاتە پێی وابوو ڕێی پلۆنا بەسەر سوپای ڕوسیادا ئاوالآ بووە. ئەفسەرێکی ڕوسیایی هاواری لێ هەستا:« *نانی ئێوارە لە پلۆنا دەخۆین*»، بەڵام ئەو تورکانەی کە لەنێو سەنگەرەکاندا بوون، بەرگرییان دەکرد.

لەو کاتە عوسمانیش هێزێکی یاریدەدەری خۆی هێنایە مەیدانەوە، فۆربس گوێی لە دەنگی شەپیور بوو کە مانای هێرشی تورکەکانی دەگەیاند. چیوای پێنەچوو کە ڕەزو باخەکانی ئەوناوە پڕبوون لەسەربازی تورک، ئەمجارەیان نۆرەی روسەکان بوو کە بەرگری بکەن، بەڵام ئەم بەرگرییەیان زۆری نەخایاندو تورکەکان تێکیان شکاندن و ڕاویان نان. لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا، دۆخی جەنگ و هەڵوێستی هێزەکانی گۆڕا. هەر کە دنیاش تاریک داهات، عوسمان تێبینی ئەوەی کرد کە ڕوسەکان ترساون، بۆیە بڕیاری دا دژە هێرشێک ئەنجام بدات و سەنگەرەکانی پێشووی خۆی گرتەوە. چیوای نەمابوو ڕۆژبێتەوە کە سەربازە چەرکەسەکان بە هەڵقەندنی سەری بریندارە ڕوسەکانەوە خەریک بوون و تورکەکانیش خەریکی ڕاوەدوونانی سەربازە ڕوسەکان بوون. لەیەکەم ڕۆژی جەنگدا، ڕوسەکان (٧) هەزار سەربازو (١٦٨)

ئەفسەریان لێ کوژرا. فۆربس لەڕاپۆرتێکدا بۆ ڕۆژنامەکەی نووسیبووی: *«بارودۆخی شەڕو وەزعی بەرەکانی شەڕ بەتەواوەتی گۆڕاوە، بەو بەرگرییەی کە تورکەکان دەیکەن پێ ناچێ چیدی ڕوسەکان بتوانن درێژە بە هێرشەکانیان بدەن.»*

لەو کاتەدا دەوڵەتی بەریتانیا بڕیاریدا بۆ بەرگریکردن لە قوستەنتەنییە، گەلەکەشتییەکی جەنگی ڕەوانەی ناوچەکە بکات.

* * *

کەس بەقەدەر سوڵتان لە قوستەنتەنییەو قەیسەر لە پشت بەرەکانی شەڕ، سەری لەو سەرکەوتنەی عوسمان سوڕنەمابوو. عەبدولحەمید بەپەلە شمشێرێکی بە گەوهەر نەخشێندراوی بەدیاری بۆ عوسمان ناردو نازناوی «غازی»ی پێبەخشی. ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کە کەوتبۆ سەر لێواری نەمان و داڕمانەوە، لەماوەی یەک ڕۆژدا ببوو بە وڵاتێک کە توانیبووی ڕوسە کافرەکان تێک بکشێنێ.
سەرەڕای ئەمە، ئەم سەرکەوتنەی عوسمان نەک تەنها ببوەهۆی ئەوەی کە بەریتانیا ناچاربێ یارمەتی بۆ عەبدولحەمید بنێرێ، بگرە ببووەهۆی ئەوەیش کە تورکە نارازییەکان لەنێوخۆی ئیمپراتۆرییەتدا، کارەساتەکانی بولغاریا لەبیرخۆیان ببەنەوە.
کاردانەوەی قەیسەر بەتەواوەتی جیابوو؛ قەیسەر کە لە بارەگای سەرکردایەتیی خۆی و لە پشت بەرەی شەڕ هەواڵەکانی پێدەگەیشت، ترس و سام دایگرت. هەندێ پرووپاگەندەی وا هەبوون گوایە عوسمان پاشا نیازی پەلامارو ڕاوەدوونانی سوپای ڕوسیای هەیە.
بەهەزاران لە سوپای ڕوسیا، ڕایانکردە ڕۆمانیا. گراندۆک نیکۆلا تەلگرافێکی بۆ شارڵـی فرمانڕەوای ڕۆمانیا لێداو، تێیدا نووسیبووی: *«خێرا بە فریامان بکەون، خەریکە تورکەکان لەنێومان دەبەن. مەسیحییەت لە مەترسیدایە.»*
قسە لەسەر ئەوە هەبوو کە سوپای ڕوسیا بەرەو کەنارەی باکوری دانۆب پاشەکشێ بکات، چونکە لەشکری ڕوسیا لە نیوەبازنەیەکی (١٢٠) کیلۆمەتری دا بڵاوببوونەوەو ئەمەش وایکردەکرد بە ئاسانی زەفەریان پێ ببردرێت، بەڵام قەیسەر نەچووە ژێر بارەوەو ڕایگەیاند کە پاشەکشێ بەمانای دەستبەردارییە لە مەسیحییەکانی بولغاریاو ناتوانی بەکارێکی وا حەیاو ئابڕووی خۆی بەرێ.
عوسمان پاشا ئاگای لە ڕاستییەکان هەبوو و بەهیچ شێوەیەکیش خەیاڵی ئەوەی نەبوو پتر لەوەی کە هەیە خۆی نیشان بدات. ئەگەر چی لەشەڕێکدا توانیبووی سەرکەوتن بەدەست بێنێ، بەڵام دڵنیاش بوو لەوەی کە ڕوسەکان دیسان هێرشی دەکەنەوە سەر. بۆیە بە پەلە فرمانی دروستکردنی چەند ئاڵقە سەنگەری لەنێویەکی دا. لەبەرەی باکور تورکەکان دەستیان بە دروستکردنی (٥) سەنگەری بە کۆمەڵـی نوێ کرد کە لەڕێی خەندەقی سەر داپۆشراوەوە دەگەیشتنەوە سەنگەرەکانی پێشوو لە نزیک کابەردەکانی جانیک بایرو ئەم دوو سەنگەرانە لە ڕێی ئەو تونێلانەوە پەیوەندییان بەیەکترییەوە پەیدا دەکرد.
بەسەرنجدان لەو کەرستە بیناسازییە سەرەتاییەی کە لە دروستکردنی ئەم

سەنگەرانەدا سوودیان لێ بیندرابوو، سەنگەرەکان لەڕووی پتەوییەوە بێ هاوتا بوون.
ئەغلەبیان دیواری (٦) مەتر پان و (٢،٥) مەتر بەرزیان تێدا دروست کرابوو و، خەندقێکی (٥) مەتر پان و (٣) مەتر قوڵیان لەدەورە هەڵکەندرابوو.
دیوارەکان کونی وایان تێدا دروست کرابوو کە هەم جێی لولەی تفەنگەکان بوو و، هەمیش دەکرا لێیانەوە تا دووری (٣) کیلۆمەتر جموجۆڵی هێزەکانی دوژمن بخرێتە ژێر چاودێرییەوە. هەروەها هەر یەک لەو سەنگەرانە بەهۆی هێڵێکی تەلگرافەوە پەیوەندییان بە بارەگای سەرکردایەتیەوە هەبوو.
هەریەک لەسەربازە تورکەکان (٦٠٠) فیشەکیان درایەو هەزار فیشەکی زیادەش بۆکاتی پێویست خرایە بەردەستیان. سەربازەکان بەشە خواردنی هەشت ڕۆژی خۆیان کە بریتی بوو لە برنج و کەنمەشامی یان وەرگرت و چەند مێگلە مەڕێکیش لە پشت سەنگەرەکانەوە بۆ دابین کردنی گۆشت و خواردنی سەربازەکان ڕاگیرابوون. هەروەها (١٠٠) گوللە تۆپیش بۆ هەر تۆپێک دیاری کراو ئەسپ و گامێشی پێویستیش بۆ ڕاکێشانی هەر کام لەو تۆپانە دیاری کرا.

* * *

بەرەبەیانی ڕۆژی (١١)ی ئەیلول لەکاتێکدا کە نم نمە باران دەباری و تەم و مژێکی چڕ دۆڵەکانی دەوروبەری پلۆنای داپۆشیبوو، هێرشی مەزنی ڕوسەکان دەستی پێکرد. بەدرێژایی چوار ڕۆژ تۆپخانەی ڕوسەکان، سەنگەری تورکەکانی بۆردومان کردبوو و، لە کۆی گشتیدا (٣٠) هەزار گوللە تۆپی بەسەر تورکەکاندا باراندبوو. هەر چەندە لەو ماوەیەدا (٥٠٠) سەربازی تورک کوژران، بەڵام تورکەکان توانیان ئەو زیانانەی کە بەڕۆژ پێیان دەگەیشت بەشەو نۆژەنیان بکەنەوەو ڕوسەکانیش تێ گەیشتن کە وورەی تورکەکان زۆر بەرزەو، وابە ئاسانی تێک ناشکێندرێن. دکتۆر چاڵز ڕایان کە لە نەخۆشخانەی تورکەکان کاری دەکرد، هەستی کرد ئەو بریندارانەی کە لە مانگی پێشوو، زۆر بێ سۆزو بەزەیی بوون، ئێستا پێشنیازی ئەوەی پێ دەدەن کە یارمەتیی بدەن. ڕوسەکان لەوەی کە بتوانن بە تۆپ باران وورەی تورکەکان دابەزێنن، نائومێدبوون. وەنەبێ تەنیا ڕووسەکان تووشی ئەم هەڵەیە بوو بن؛ لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمیش هەندێ کەس پێیان وابوو بۆردومان کردنی شارەکانی ئەڵمانیا بەهەزاران فرۆکە دەتوانی ماوەی شەڕ کورت بکاتەوە کەچی وادەرنەچوو.
هێرشی ڕوسەکان لەسەر بنەمای خوێندنی کۆلێژو کتێبە وانەییەکان بوو، ئەفسەرەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی کاتێ هێرشەکانیان سەر دەگرێ کە تۆپبارانێکی خەستی سەنگەرەکان کرابێ و ئینجا شەپۆلێک سەرباز هێرش بکات، ڕاستە کە لەوکاتەدا دەستەی یەکەمی سەربازەکان دەکوژرێن، بەڵام لەبەرئەوەی بەرگریکاران ماندووبوونە، دەستەی دووەم و سێیەمی هێرشبەران دەتوانن بەسەر لاشەی سەربازەکانی خۆیانەوە بگەنە سەر سەنگەرەکان و بەسەرنێزە، تورکەکان لە کۆڵ بکەنەوەو لەنێویان ببەن.

ئەوان ئالێرەدا، دوژمنیان بەرامبەرەکەی خۆیان بەهیچ نەزانی بوو و، تورکەکانیان بەهەند نەگرتبوو و ئەوەیان لەیادنەبوو کە تورکەکان لەبەکارهێنانی سەنگەرە بەکۆمەڵەکان و تاکتیکەکانی شەڕو بەرگریکردندا وەستانە.

ئەو ڕۆژە بەرلەوەی نیوەڕۆ دابێ لە پڕێکا تەم و مژەکە نەما و، کاتژمێر (٣)ی دوای نیوەڕۆ رووسەکان لە سێ لاوە هێرشیان هێنا؛ لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە هێرشیان کردە سەر سەنگەرەکانی گریوتیسا، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە کە ڕێک خاڵی بەرامبەری بەرەی یەکەم بوو هێرشیان هێناو لە باشوریشەوە هێرشیان کردە سەر سێ سەنگەری بە کۆمەڵی تازە بنیادنراو کە ڕێگای سەرەکییان دەپاراست.

هیچ پەیامنێرو ڕۆژنامەنووسێک نەیدەتوانی لەیەک کاتدا، لەسێ شوێن بێت، بەڵام مەک گاهان کە ڕاپۆرتە سەرنج ڕاکێشەکانی لە مەسەلەی باتاک دا بەنێو بانگی کردبوو، بڕیاری دا بچێتە بەرەی باشورەوە کە لەوێ سەرکردایەتی هێزەکانی ڕوس لە ئەستۆی یەکێ لە بەناوبانگترین ژەنراڵەکانی ڕوس؛ ئیسکۆبلۆف بوو.

ئیسکۆبلۆف پیاوێکی تەمەن ٣٥ ساڵان، چوارشانەو ڕێکوپێک و پۆشتەبوو کە بەڕەوانی بە (٦) زمان قسەی دەکردو گۆرانی دەچڕی. مەک گاهان خۆی لەگەڵ ئەم کابرایەدا کردبوو بە برادەرو ئیسکۆبلۆف خۆشی دەویست. جارێکیان مەک گاهان لێی پرسی بوو بۆچی هەمیشە یۆنیفۆرمی سپی دەپۆشێ و سواری ئەسپی سپی دەبێ؟

ئیسکۆبلۆف لە وەڵامدا پێی گوتبوو: «*بۆ ئەوەی لەهەر کوێیەک بم سەربازەکانم بتوانن بمبینن و بزانن کە هەمیشە لەگەڵیاندام.*»

ئەو هێرشەی لەلای باکوری ڕۆژهەڵاتەوە دەستی پێ کردبوو، چیوای نەبرد کە بە عاسێ بوونی سەربازانی ڕوس لە نێو قوڕو لیتەدا وەستا، هەرچەندە کە سەربازە ڕوس و ڕۆمانیاییەکان توانییان عەسری ئەو ڕۆژە یەکێ لە سەنگەرەکانی گریویتسا داگیر بکەن، بەڵام (٤٠٠٠) کەسیشیان لێکوژرا.

ئەمە عوسمان پاشای نیگەران نەکرد، چونکە ئەم دوو سەنگەرە بە کۆمەڵەی وا دروست کردبوو کە ئەگەر یەکێکیان کەوتبایە دەست دوژمن، دەکرا پارێزگاری لەوەی دیکەیان بکات و داگیرکرانی یەکێکیان مەترسی بۆ ئەوەی دیکەیان نەبوو. لەمڕووەوە دژە هێرشی نەکردو هەموو هێزی خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیسکۆبلۆف تەرخانکرد کە (١٢) هەزار لەسەربازەکانی گەیشتبوونە بن لووتی تورکەکان و (٣٠٠) مەتریان مابوو بگەنە سەر سەنگەری تورکەکان. ئەم سەنگەرانە لەسەر تەپۆلکەیەکی نزیک لە شار بنیادنرابوون و زۆر لەشارەوە نزیک بوون. ئیسکۆبلۆف نیوەی سەربازەکانی لە قوڵتاییەکی خوار گردەکە کۆکردەوەو دوایی لە پەنای ئاگری تۆپخانە و بەدەنگی مارشی سەربازی و ئەو ئالایانەی کە لە ئاسمان دەشەکانەوە، دەستی بەهێرش کرد. بەڵام هەر کە تورکەکان لێیان هاتنەدەست و دایاننەبەر تەقە، هێزەکانی ئیسکۆبلۆف هەر یەکەی بەلایەکدا ڕۆیشتن، ئیسکۆبلۆف ناچار بوو سێ هەزار سەربازی دیکە بنێرێتە بەرەی جەنگەوە، هەرچەندە هەندێ لە سەربازە ڕوسەکان تا نزیک سەنگەری تورکەکانیش چوونە پێش، بەڵام دیسان خۆیان

پێرانەگیراو پاشەکشەیان کرد.
لەو کاتەدا ئیسکۆبلۆف خۆی هاتە مەیدانەوەو بەدوا سەربازەکانی هێرشی بردەسەر سەنگەری تورکەکان. کاتێ ئیسکۆبلۆف سوار بەسەر ئەسپە سپییەکەیەوە لەبەرامبەر مەک گاهان تێدەپەڕی، هاواری کرد: «*خوا حافیز مەک گاهان، هیوای سەرکەوتنم بۆ بخوازە.*» دواتر مەک گاهان گوێی لە نەڕەی ئیسکۆبلۆف بوو کە ڕووەو سەربازەکانی هاواری دەکرد: «*بەدوای مندا وەرن تا پێتان نیشان بدەم چۆن چۆنی دەبێ تورکەکان وردوخاش بکەن.*» مەک گاهان لە دوورەوە دیتی ئەسپەکەی ئیسکۆبلۆف گوللەی بەرکەوت و ئیسکۆبلۆفیش بەپای پیادە لەگەڵ سەربازەکانیدا دەڕۆیشت، لەو کاتەدا دەنگی تەقەی تفەنگ نەدەهات و هەردوولا بەسەر نێزەکەوتبوونە گیانی یەکتری. تورکەکان بەپەلە دەستیان بە پاشەکشێ کردو بەم پێیە ئیسکۆبلۆف توانی گرنگترین و ستراتیژیترین سەنگەری بە کۆمەڵی تورکەکان کە لە هەمانکاتدا بەدەروازەی پلۆناش لە قەڵەم دەدرا، داگیر بکات.
هێزەکانی ئیسکۆبلۆف زیانێکی یەکجار زۆریان لێکەوتبوو، نزیکەی (٣٠٠٠) کەسیان لێ کوژرابوو، بەڵام ئیدی ئەمجارەیان تورکەکانیان شکست دابوو. عوسمان پاشا دەیتوانی بە دووربینەکەی ئاڵا سپییەکەی ڕوسەکان ببینێ کە داڵێکی دووسەری تێدا نەخشێندرابوو و، بەسەر سەنگەرە داگیرکراوەکاندا دەشەکایەوە. عوسمان دڵنیابوو لەوەی کە ئەگەر ڕوسەکان بۆ ڕۆژی دواتر بتوانن سەنگەرەکانی تەنیشت ئەو شوێنە بگرن ئیدی ناتوانێ بەهیچ شێوەیەک بەرگری بکات و دەبێ شارەکە بدا بەدەستەوە.
بۆیە بروسکەیەکی بۆ سەنگەرەکانی باکور لێداو داوای ئەوەی لێکردن چی هێزی هەیانە بینێرینە باشور. عوسمان دەیویست بۆ بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر هێرش بکاتە سەر ئەو شوێنەی ڕوسەکان داگیریان کردبوو و، لەدژە هێرشێکدا بیانگرێتەوە.
لەکاتێکدا کە عوسمان خۆی بۆ دژە هێرش ئامادە دەکرد، هیچ ئاگای لەوەنەبوو کە ئیسکۆبلۆف بۆ پاراستنی ئەو شوێنانەی داگیری کردبوون تووشی چ گیروگرفتێک بۆتەوەو داواکاریشی بۆناردنی هێزێ یاریدەدەر لەلایەن سەرکردایەتی هێزەکانی ڕوسیاوە ڕەتکراوەتەوە. ئاگری تۆپخانەی تورکەکان کە لە سەنگەرەکانی تەنیشت شوێنی ئیسکۆبلۆفەوە دەبارییە سەر هێزەکانی ئیسکۆبلۆف، بێ ئەندازە نارەحەتی کردبوون. ئیسکۆبلۆف لەوە گەیشتبوو کە بەم حاڵەو بەو هێزە کەمەی کە لەنێو گۆماویلکەی خوێنی کوژراوەکاندا وەستاو، یان ڕاکشابوون، پاراستنی سەنگەرە بەکۆمەڵە دەست بەسەرداگیراوەکە مەحاڵە. دەوروبەرو ناوەوەی سەنگەرەکە بە تەرمی کوژراوەکان داپۆشرابوو و بارانیش زۆربێ بەزەییانە دەباری. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئیسکۆبلۆف دڵنیابوو لەوەی کە ئەگەر هێزێکی یاریدەدەری بۆ بنێردرێت، دەتوانێ بۆ ڕۆژی دواتر لە نێو کۆڵانەکانی پلۆنادا بسوڕێتەوە.
هێشتا دنیا تاریک دانەهاتبوو کە ئیسکۆبلۆف بڕیاریدا بەسواری ئەسپ بچێتە بارەگای سەرکردایەتی هێزەکانی ڕوسیاو بە گوتەی خۆی: «*هەوڵ بدا ژەنراڵە دەبەنگەکانی ڕوسیا کە تەنها وانەی سەربازییان لەبەربوو، ناچار بکا هێزی*

*یاریدەدەری بۆ بنێـــرن.»* بەڵام ئەم کـارەی بێسـوود بوو، چونکە لە وەڵامدا پێیـان ڕاگـەیاند کـە: *«کارێکی وا ناکرێ، چونکە هێزی پێویستیان لەبەردەستدا نییە.»* ئیـسکۆبلۆف توانی تەنها هەندێ فیـشـەکی (کـرنک) بۆ سـەربازەکانی بێنێ، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە سـەربازەکانی تفەنگی (بردان)یان پێ بوو، ئەم فیـشـەکانەیان بە کەڵک نەهات؛ چونکە لولەی تفەنگەکان جیاوازییان هەبوو.

ئـەمـــەش نـەبووە هـۆی ئـەوەی کـــە ئـیـــسکۆبلۆف کـــۆڵ بدات، بۆیە هـەندێ لەسـەربازەکانی خۆی ناچار کرد فیـشـەکـەکان بگۆڕنەوەو بەم پێیە ژمارەیەکی زۆ فیشەکی (بردان)ی گەیاندە هێزەکانی خۆی.

بەرلەوەی ڕۆژ هەڵبێ عوسـمـان دەسـتی بەدژە هێرشێک کرد. عوسـمـان لە بارەگای سەرکردایەتی هێزەکانیەوەکە کەوتبۆ باشوری پلۆناوە، یەکەم شەپۆڵی هێرشبەرانی ڕەوانەی مـەیدانی جەنگ کرد کـە خۆیان لە (٥٠٠٠) سـەرباز دەدا، بەڵام ئەم ژمارە سـەربازە دوای ئەوەی (٥٠٠) کەسـیـان لێکوژرا، پاشـەکشێ یان کرد. لەو کـاتەدا، لەسـەرکردایەتی سوپای روسیاوە پەیامێک بۆ ئیسکۆبلۆف نێردرا کە ئەگەر ئەودەم عـوسـمـان زانیـبـای ئەو پەیامـە چی تێـدایەو دەڵێ چێ، ڕەنگبێ لە خـۆشـیـان وەسـەمـاکەوتبا. ناوەڕۆکی پەیامـەکـە ئەوەبوو: *«ئەگـەر ناتوانن ئەو سـەنگەرە بە کۆمەڵەی کە داگیرتان کردووە، بپارێزن، دەتوانن پاشـەکشێ بکەن، چونکە ئێـمـە بڕیارمانداوە چیدی درێژە بە هێرش نەدەین.»*

ئیسکۆبلۆف گوتبووی ئەمە خەراپترین و تاڵترین فرمانێ بوو کە بەدرێژایی ژیانی سـەربازیی پێی درابوو. بـەڵام ئەو سـەربازبوو و دەبوایە بەبێ سێ و دوو فـرمـانی سـەرووی خـۆی جـێـبـەجێ بکات. بۆیە هەوڵـیـدا تابۆی بکرێ ژمـارەیەکی زۆرتر لەسـەربازەکـانی بە زیندوویەتی لە سـەنگەرەکـە وەدەرنێت. کـاتژمـێـر (٥)ی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، بۆ جارێکی دیکە هێزەکانی عوسمان دەستیان بەسـەر سەنگەرە بەکۆمـەڵەکە داگرتەوەو لەو جـێگەیەی کە چەند کاتژمێر پێشـتر ئاڵای ڕوسـەکـان دەشەکایەوە، ئاڵای هیلالی عوسمـانی هەڵدرا.

هەر لەو کاتەدا کە سەربازە ڕوسەکان بەرەو باشور ڕایاندەکرد، تورکەکان توانییان دووبارە دەست بەسـەر سەنگەرەکانی گریوتیسادا بگرنەوە.

لەهەموو لایەکەوە ڕوسـەکان پاشەکشێ یان دەکردو زیانی گیانیی هێزەکانی ڕوس و ڕۆمـانیـایی لەمـاوەی ئەو دوو ڕۆژەدا خۆی لە (١٥) هەزار سـەربازو (٣٠٠) ئەفسـەر دەدا.

قەیسـەر بەهۆی زۆری ئەم ژمارە کوژراوە، بڕیاریدا چیدی هێرش نەکەنە سـەر تورکەکان و لەبری ئەمە تا ئەوکاتەی تورکەکان لە برسـان خۆیان بەدەستەوە دەدەن، پلۆنا ئابلۆقە بدەن.

* * *

عوسـمـان بەر لەوەی کـابرایەکی ئازاو بەجەرگ بێ، پیاوێکی واقیع بین بوو. ئەو توانیبووی دووجار سوپای دوژمن، کە ژمـارەیان دوو ئەوەندی ژمارەی سـەربازەکانی بوو، تێک بشکێنێ. لەوەش گـرنگتـر ئەوەبوو کـە عـوسـمـان توانیـبووی مـەکینەی

جەنگیی رووسەکان رابگرێ و تووشی شەرێکی قورسی زستانەیان بکات. عوسمان لەوباوەرەدابوو کە بەزیادەوە بە ئەرکی خۆی هەستاوەو ئێستاش واباشە چیدی لە پلۆنا نەمێنێتەوەو، خۆی تووشی برسیەتی و سەرما نەکات و کەسی دیکە بە کوشت نەدا. بەتایبەت کە سەلمانبووی سوپاکەی ژێر سەرکردایەتی ئەو، بەهێزترین بەجەرگترین سوپای نێو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییە، بۆیە بریاریدا بەرەو شاری (ئۆرکانی) کە کەوتبۆ (٨٠) کیلۆمەتریی باشوری پلۆنا، پاشەکشێ بکات و لەوێ پەیوەندی بەو هێزە تورکەکانەوە بکات کە لە باشوری بولغاریا جێگیر ببوون. عوسمان پێی وابوو ئەگەر وا بکات، روسەکان بەهیچ شێوەیەک ناوێرن هێرشی دیکە بێنن و لە جێی خۆین دەچەقن.

عوسمان بەتەلگراف پلانەکەی خۆی بە سولتان راگەیاند، بەلام سولتان بە توورەییەوە وەلامی عوسمانی دایەوە کە بەهیچ شێوەیەک پلۆنا بەجێ نەهێلێ و لەوێ بمێنێتەوە. عوسمان سەری لەم وەلامەی سولتان سورما.

عەبدولحەمید دەیگوت ئابرووی نێو دەولەتیی تورکیاو ئەو رێزو ئیحترامەی تورکیاو عوسمان لای ئەوروپاییەکان بەدەستیان هێناوە، بۆ ئایندەی ئیمپراتۆرییەت بایەخێکی تایبەتی هەیەو بۆیە پێویستە عوسمان لە پلۆنا بمێنێتەوەو ئەو شارە بپارێزێت کە بووە بەهۆی نمونەی خۆراگریی تورکەکان.

ئارادمیەکیش هەق بەلای سولتان دابوو. چونکە لە ئەوروپا و بەتایبەت لە بەریتانیا، خەلک رێزێکی تایبەتییان بۆ عوسمان دادەنا. رۆبرت فۆرنۆ لەو بارەیەوە دەلێ: *«رق و نەفرەتی خەلک لەهەمبەر دڕندایەتیی جارانی تورکەکان، جێی خۆی دابوو بەستایش و رێزگرتن و پیاهەلدان لە ئازایەتی تورکەکان و عوسمان ببوو بە پیاوی رۆژو زۆربەی ئەشراف و تەنانەت خەلکی ئاسایی نێوی (عوسمان)یان لە مندال و پشیلەو توتییەکانیان دەنا.»*

هەرچەند عوسمان بە بیستنی وەلامی سولتان نارەحەت و توورەببوو، بەلام بەلێنی ناردنی هێز لەلایەن سولتانەوە سێبوری دەداو مایەی خۆشحالیی بوو. تاکە کارێک کە دەبوایە عوسمان ئەنجامی بدابایە (و بەرای سولتان کارێکی هێندە زەحمەت نەبوو)، ئەوەبوو کەتا ئەو هێزە یاریدەدەرە دەگات، پلۆنا بپارێزێ.

عوسمان کەسەرانسەری ژیانی خۆی لە مەیدانەکانی جەنگدا بەسەربردبوو و ئاگای لە فرووفێل و بەلێنە فیشالەکانی کۆشکی یلدز نەبوو، ئەوەی بەزەین دانەدەهات کە بابایەکی بەرێزی وەکو سولتان بەدرۆ بەلێن بدات.

سەربازگەی ئابلۆقە دراوی پلۆنا بەرەورووی کۆمەلێ کێروگرفت ببۆوە؛ دەبوایە بەپەلە هەندێ هەنگاو بۆ گەیشتنی ئازوقە لەلای باشوورەوە باوێن، سەنگەرەکان نۆژەن بکەنەوەو لەوانەش گرنگتر ئەوەبوو کە تەرمی کوژراوەکان بنێژن، چونکە مەترسی بلاوبوونەوەی نەخۆشیی کوشندە بەرادەیەک زۆر بوو کە دەبوایە هەر (٢٤) سەعات جارێک سەربازەکانی نێو سەنگەرەکان بگۆرن.

چەند هەفتەیەکی خایاند تا پلۆنا لە تەرمی سەربازە کوژراوەکانی روس پاککرایەوەو عوسمان بەسوود وەرگرتن لەو دەرفەتە برێکی زۆر خواردەمەنی و

بەهەزاران سەرمەڕو مالآت و گاوگۆلکی لە (ئۆرکانی)یەوە گەیاندە پلۆنا. ئەو کەسانەیش کە لە مانگەکانی ئەیلول و تشرینی یەکەمی ئەو ساڵەدا هاوڕێیەتی ئەو کاروانانەیان دەکرد، بۆ بەهێزکردنی سەربازگەی پلۆنا، لەوێ بەجێمان. لەکاتی دەست پێبوونی هێرشی گەورەی ڕوسەکان، ژمارەی هێزەکانی عوسمان پاشا (٥٠) هەزار کەس دەبوو کەتا ئەوکاتە نزیکەی (٤٠٠٠)یان کوژرابوون، بەڵام کە ئێستا ڕوسەکان پلۆنایان ئابڵۆقەدابوو، ژمارەی هێزەکانی عوسمان پاشا گەیشتبۆ (٦٠) هەزار کەس و ئەو کەسانەیش کە هاوڕێیەتی ئەو (١٥٠) عارەبانانەیان دەکرد کە لەسەرەتای مانگی تشرینی یەکەم ئازووقەیان گەیاندە پلۆنا، نەگەڕانەوەو لەوێ مانەوە. بەم پێیە ژمارەی هێزەکانی عوسمان لە (٦٠) هەزاریش تێپەڕی کرد.

لەو کاتەیدا کە تورکەکان خەریکی دابینکردنی ئازوقەو نۆژەنکردنەوەی سەنگەرەکانیان بوون، ڕوسەکان بەبێ ئەوەی هیچ پلانێکیان هەبێ درێژەیان بە ژیانی ئاسایی دەداو لە شوێنی خۆیان جوڵەیان نەدەکرد.

مەک گاهان لەو بارەیەوە نووسیبووی: «*بەدرێژایی مێژوو، هەرگیز کەس سوپایەکی مەزنی وابە نائومێدی نەدیووە.*» ئەڵبەتە کات بە قازانجی رووسەکان تێپەڕدەبوو، بۆیە پەلەیان نەبوو. ئیسکۆبلۆف بۆ ماوەیەکی درێژو بەمەبەستی ڕابواردن و حەسانەوە رووی لە بۆخارێست کردبوو.

سەرەڕای چێژو لەزەتی مۆسیقا، شانۆ، خواردنی بەتام و ئافرەتانی دڵڕفێن کە وەک قارەمانێکی جەنگ لە ئیسکۆبلۆفیان دەڕوانی، ئیسکۆبلۆف بە فۆربسی گوتبوو تەنانەت بۆ تاکە ساتێکیش ناتوانێ دیمەنە سامناکەکانی مەیدانی جەنگ لەبیرخۆی بباتەوە.

لەنێوەڕاستی مانگی تشرینی یەکەم بەفرێکی زۆرباری و پلۆنای ئابڵوقەدراویش تەنها یەک ڕێگای دەرچوونی تێدامابۆوەو ئەویش ئەو سەنگەرانە بوون کە بەسەر ڕێگای ئۆرکانی یاندا دەڕوانی و، لەوێوە ئازووقە دەگەیەندرایە شار.

لەیەکێ لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم، هێزەکانی روسیا کەژمارەیان سێ بەرابەری تورکەکان بوو، هێرشیان هێنایە سەر ئەو سەنگەرانەو دوای شەڕێکی خوێناوی کە (٨) سەعاتی خایاند، ئالآکەی خۆیان لەسەر سەنگەرەکان هەڵداو داگیریان کردن. لەو شەڕەدا نزیکەی چوار هەزار تورک کوژران و دوو هەزاریشیان خۆیان دابەدەستەوە. لەبەرامبەردا، ڕوسەکانیش چوار هەزارکەسیان لێ کوژرا. بەڵام ڕوسەکان توانیان بەیەکجاری شارەکە دەورە بدەن و دووسەری بازنە بیست کیلۆمەترییەکەی ئابڵۆقەکەیان پێکەوە بنووسێنن.

زستانی ساردی بولغاریا بێدادی دەکرد. هەوا لەڕادەبەدەر سارد بوو، بەڵام ورەی تورکەکان بەهیوای گەیشتنی سوپای سوڵتان، هەر لەبەرزی دابوو. کاتێک کە پلەی سەرما گەیشتە دەپلە لەژێر سفرەوە، تورکەکان ناچاربوون. هەریەک سەعات جارێک جێ بە ئێشکچی و قەراوڵەکانی خۆیان بگۆڕن.

تۆپخانەی ڕوسەکان هەموو ڕۆژێ بو ماوەی چەند سەعاتێک پلۆنای دەخستە ژێر ڕەحمەتی گوللە تۆپەکانی. تەواوی مزگەوتەکانی نێوشار ببوونە نەخۆشخانەو،

هەموو کون و قوژبنێک پڕبوو لە بریندارو نەخۆشی تورکەکان کە لەسەر حەسیر ڕاکشابوون و ناڵەناڵیان بوو. هەموو هەوڵی تورکەکان ئەوەبوو خۆیان گەرم ڕاگرن و بۆ ئەو مەبەستە ڕەزو مێوی ئەو ناوەیان هەموو سوتاندبوو، و ئێستا دار بۆ سوتاندن دەست نەدەکەوت. دوای ئەوەی ڕێگە بەرەو دەرەوە نەما، بەشەخواردنی تورکەکان کەم کرایەوە هەر سەربازێکی تورک ڕۆژانە ۲۰۰ غەرام نان و گۆشتی کوتراوی دەدرایەو بریندارەکانیش تەنیا ئاشیان دەدانێ. لەبازاڕی ڕەشدا، جگەرەیەک بە(۱۰)پنس-ی ئەمڕۆ و هێلکەیەکش بە ۲۰پنس بوو. سەرەڕای کەمیی گۆشت، کەس مافی ئەوەی نەبوو مانگاو گامێشە بارهەڵگرەکان بکوژێتەوە، چونکە ئەگەری ئەوە هەبوو کە بۆ شکاندنی بازنەی ئابلۆقە بەکەڵک بێن و سودیان لێوەربگیردرێت. بۆیە سەربازە تورکەکان بەخواردنی گۆشتی سەگ و پشیلەو تەنانەت مشک، زگی خۆیان تێر دەکرد، بەڵام لەبەرامبەردا بارودۆخی ڕوسەکان یەکجار جیاوازبوو و بەقەولی فۆرنۆ:«لە خێوەتگەی ڕوسەکان، سەرمێزی گراندۆک، پرەنس و ژەنراڵەکان، بەخواردنی هەمە جۆر دەرازێندرایەوە».

لە دووەم هەفتەی مانگی تشرینی دووەمدا، ڕوسەکان نزیکەی (٥) هەزار سەربازی بەدیل گیراوی تورکیان ئازاد کردن. تورکەکان گەڕانەوە نێو پلۆناو دوا ژمارەی ڕۆژنامەکانی تایمزو دەیلی نیوز لەندەن-یان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو کە دوا هەواڵی شکستی تورکەکان لە ئەرمینیاو قارس-یان تێدابوو. عوسمان پەیامێکی بۆ گراندۆک نیکۆلا ناردو لەوەی کە ئەو ڕۆژنامانەی بۆ سەرگەرمیی شەوانی درێژی زستان بۆ ناردووە، سوپاسی کرد.

لەکۆتایی مانگی تشرینی دووەم، عەبدولحەمید بیری لە جێبەجێ کردنی ئەو بەڵێنەکردەوە کە بە عوسمانی دابوو. عەبدولحەمید لە ئاکامی بەرگریی سەربازگەکەی پلۆنا، گەیشتبووبە مەبەستی سەرەکی خۆی کە بریتی بوو لەوەی دەرفەتی پێویست بەدەست بێنێ و ڕای ئیجابی و پشتیوانی ئەوروپا بۆخۆی مسۆگەر بکات. ئێستا تازەبەتازە بیری لەوە دەکردەوە کە پێویستە یارمەتییەکی عوسمان بدات، بەڵام ئەم کارە ئاکامێکی زۆر تراژیدی هەبوو، چونکە سوپای تورک کە هەر سەربازەی لەلایەکی تورکیاوە هێندرابوو، هیچ جۆرە ڕێکخستن و مەشقێکیان نەبوو. سوپا لەماوەیەکی کەمداو بەپەلەپەل نێردرایە ئۆرکانی. سوپای نێوبراو هەر کەچاویان بەڕوسەکان کەوت و یەکەم هێرشی ڕوسەکانیان کرایە سەر، سام دایگرتن و پێیان پێ وەناو بۆی دەرچوون. عوسمان بۆی دەرکەوت کە پلۆنا مەحکوم بە تەسلیم بوونە، بۆیە تاکە ڕێگەیەک کە بۆی مابۆوە ئەوەبوو کە بەتێکشکاندنی بازنەی ئابلۆقەکە خۆی و سەربازەکانی قوتار بکات و لەمردن ڕزگاریان بکات.

ئەم کارەو خۆ ئامادەکردن بۆی، دەبوایە زۆر بەنهێنی و بەبێ دەنگی بە ئەنجام گەیشتبایە، چونکە عوسمان دەیزانی سەرکەوتنی بەوەوە بەندە کە بتوانێ ڕوسەکان غافڵگیر بکات. زۆر بەبێدەنگی ولەتاریکایی شەودا، تێکڕای عارەبانەو تۆپەکان کۆکرانەوەو ئامادەی ڕۆیشتن بوون. بریندارەکان بەشێوەیەکی موعجیزەئاسا لە

جێگەکانیان هاتنەدەرو خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد، ئەگەرچی دەیانزانی چ مەترسی و ناخۆشییەک چاوەڕێیانە، بەڵام بەقەولی دکتۆر ڕایان: *«پێیان باشتربوو لەکاتی شەڕو لەمەیدانی جەنگدا بکوژرێن نەک لە و زیندانەی کە تێیدا گرفتار ببوون، بمێننەوە.»*

بەجێهێشتنی خەڵکی سیڤیلی تورکیش مەحاڵ بوو، چونکە هەر کە هێزەکانی عوسمان لە پلۆنا وەدەرکەوتبان، بوڵغارییاییەکان گەورەو بچوکیانیان قەتڵوعام دەکرد.

کەواتا دەبوایە ئەوانیش لەگەڵ خۆیاندا ببەن و تەنها ئەو کەسانەی بەجێ بێڵن کە برینداری سەختن و بە هیچ جۆرێک توانای ڕۆیشتنیان نییە. تاکە ڕێگەیەک کە بەخەیاڵی عوسماندا هات ئەوەبوو کە ڕیش سپی و پیاو ماقوڵ وپیاوانی ئایینی مەسیحی بوڵغارییاییەکان کۆبکاتەوەو بە ئینجیل سوێندیان بدات کە دوای دەرچوونی ئەوان هیچ لەو بریندارانە نەکەن.

هەر کە وادەی شکاندنی گەمارۆکە داهات، تورکەکان کایان لە تایەی عارەبانەکان وەرپێچا و چەوریان کردن بۆ ئەوەی لەکاتی ڕۆیشتندا دەنگیان لێوە نەیەت. هەر سەربازەو خواردنی سێ ڕۆژو جوتێ پێڵاوی سەندەڵی درایە، بەرمیلی ئاو و سندوقە فیشەک و تەقەمەنی و عەلەف و ئالیکی ئەسپەکانیان لەعارەبانەکان بارکردو ئەو داوەڵانەی کەلە شێوەی سەرباز درووستیان کردبوون، لە نێو سەنگەرەکانیان نان و بەم شێوەیە توانیان ڕوسەکان غافڵگیر بکەن و، بەهێواشی لە سەنگەرەکانیان هاتنەدەر.

* * *

شکاندنی ئاڵقەی گەمارۆکە لەسەرەتادا مەحکوم بەشکست بوو، بەڵام عوسمان پاشا چاوەڕێی موعجیزەیەکی دیکەشی دەکرد. تورکەکان هێندە بەڕێکوپێکی و بەنهێنی کارەکانیان ئەنجام دابوو کە ڕوسەکان بەهیچ شێوەیەک ئاگایان لەوە نەبوو کە تورکەکان خەریکی چین، یان ئەوەتا بەتەمای چین.

سەعات چواری بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە، سیخوڕێکی پۆڵۆنیایی ئیسکۆبلۆفی لەخەو ڕاست کردەوەو مەسەلەیەکەی تێگەیاند. هێشتا ڕوسەکان هێزەکانی خۆیان بەتەواوەتی کۆنەکردبۆوە کە یەکە سەربازییەکانی سوپای تورک وەک ڕووبار لە شار هاتنەدەرو بەرەو دەشتە بە بەفر داپۆشراوەکانی ڕۆژئاوای خۆیان کەوتنەڕێ.

عوسمان پاشا بە سواری ئەسپەکەی لەپێش سوپاوە دەڕۆیشت و بەدوای ئەویشدا هەزاران عارەبانە و سەرباز ڕێگەیان دەکرد.

لەو کاتەدا دوو هەزار سەربازی ئازاو بەجەرگی تورک بەدەنگی شەیپورەوە هێرشیان کردە سەر سەنگەرو بنکەکانی ڕوسەکان و تا کاتژمێر ٨،٣٠ ی بەیانی هێزێکی گەورەی ڕوسیایان تێک و پێک شکاندو ئاڵقەی گەمارۆیان شکاند.

عوسمان بە پەلە فرمانی هێرش کردنە سەر سەنگەرو بنکەکانی دیکەی ڕوسەکانی دا، بەڵام لێرەدا بەرگری ڕوسەکان پتر ببوو. پەنجا هەزار سەربازی تورک و ڕوس کەوتبوونە گیانی یەکدی و شەڕی دەستەویەخە دەستی پێکرد.هێندەی نەمابوو

تورکەکان سەرکەون کە لەوکاتەدا عوسمان پاشا گوللەیەکی پێکەوت، فەرماندەی سوپای تورک لە ئەسپ کەوتە خوارەوەو لە ماوەی چەند ساتێکدا دەنگۆی مەرگی بەنێو سەربازەکاندا بڵاوبۆوە، کەچی گوللە بەرپێی عوسمان کەوتبوو و، هێشتا زیندوو بوو. بەبیستنی ئەم هەواڵە سەربازە نیوە برسی و نیوە بریندارەکانی تورک، ئەژنۆیان شل بوو، لەبنکەو سەنگەری ڕوسەکان هاتنەدەرو کاتێ زانیان عوسمان نەمردووەو ماوە، ویستیان بۆ جارێکی دیکە خۆیان ڕێکخەنەوە کە ئەودەم درەنگ داهاتبوو و، ڕوسەکان دەستیان بەسەر هەموو ئەو شوێنانەداگرتەوە کە پێشتر لە دەستیان دابوون. بەم پێیە تورکەکان لەو گۆڕە مانەوەو تەنانەت تاکە چەپەرێک نەبوو لە پشتیەوە بەرگری لە خۆیان بکەن. کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆ، دەنگی دوا گوللە هات و ئابلۆقەی (١٤٣) ڕۆژیی پلۆنا کۆتایی پێهات، ئالایەکی سپی لەسەر ئەو خانووە هەڵدرا کە لە تەنیشت پردەکەی سەر ڕووباری (وید)بوو و عوسمان لەوێ بە بریندار‌ی پاڵ کەوتبوو.

* * *

ڕوسەکان وەک قارەمانێک مامەڵەیان لەگەڵ عوسمان پاشادا کرد.کاتێک گراندۆک نیکۆلا لەگەڵ عوسماندا بەرەوڕوو بوو، تەوقەی لەگەڵدا کردو دەستی گووشی و بەحەماسەتەوە گوتی: «*سەبارەت بە بەرگریی پلۆنا پیرۆزبایتان لێدەکەم. ئەمە یەکێ لەبەرجەستەترین کارەکانی مێژوو بوو.*» هەموو ئەفسەرەکانی سوپای ڕوسی پیرۆزبایان لە عوسمان دەکردو ئافەرینیان بۆ دەنارد. کاتێ عوسمان لەگەڵ ژەنراڵێکی ڕوسی کە یۆنیفۆرمێکی سپی پۆشیبوو بەرەوڕووبۆوەو زانی کە ئیسکۆبلۆفە، توووند دەستی گرت و پێی گوت: «*تۆ ڕۆژێک دەبێ بە فەرماندەی گشتیی سوپای ڕوسیا.*»

قەیسەر، عوسمانی بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ بانگهێشت کردو کاتێک عوسمان شمشێرەکەی خۆی تەسلیمی قەیسەر کرد، قەیسەر شمشێرەکەی وێدایەوەو لە کاتێکیشدا کە خۆی ئامادەی ڕۆیشتن بەرەو ئۆردوگای خارکۆف دەکرد، یەکێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی سەربازیی قەیسەر ڕەژوویەکی دایە دەست کە بەپێی نەریتی کۆنی ڕوسەکان مانای ئەوەیە کە تۆ چیدی بەدوژمنی ئێمە لە قەڵەم نادرێی.

بەڵام چارەنووسی سەربازەکانی عوسمان بەجۆرێکی دیکەبوو؛ سەرەڕای ئەو هەموو بەڵێنەی کە ڕوسەکان سەبارەت بە ڕەفتاری باش و نەرمی نواندن لەگەڵ یەخسیرەکاندا دابوویان، ماوەی دوو هەفتەی ڕەبەق (٤٥) هەزار سەربازی تورکیان بەبێ نان و ئاو لە نێوەڕاستی دەشتە بە بەفر داپۆشراوەکانی پلۆنادا هێشتەوە. تەنانەت ڕێگەیان پێ نەدەدان لە ڕووباری (وید) کە بەهۆی ئەو هەزاران تەرمەی کە تێی کەوتبوو ئاوەکەی پیس ببوو، ئاو بخۆنەوە.

بەرلەوەی ئەو تاقمە بەرەو ئۆردوگایە جۆراوجۆرەکانی ڕوسیا بکەونە ڕێ، (٣٠٠٠) کەسیان گیانیان لەدەستدا و لەوانەی کەمانەوەش بە زەحمەت (١٥٠٠٠) کەسیان گەیشتنە شوێنی دیاریکراو و ئەوانی دیکە لە ڕێگە و لەبەفردا مردن و خنکان. چارەنووسی ئەو سەربازە بریندارانەی کە لە پلۆنا بەجێ مابوون لەوەش

خـراپـتـر بـوو، چونکه هەر کـه تورکـەکـان پلۆنـایان جـێـهـێـشت، دەست بەجێ بولغاریاییەکان سوێندەکەی خۆیان خستە ژێر پێ و بریندارەکانیان سەربڕین.

ئابلۆقـەی قـارەمانانـەی پلۆنا ڕەنگدانەوەیەکی بەرفـراوانی لەنێو ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوادا هـەبوو. دوا ئـامـاژەیەک کـه بەم بابەتە درا ئەوەبوو کـه ڕۆژنامـەیـەکی چاپی بریستۆل لە پەراوێزی گوتارێکدا سەبارەت بەهێنانی پەینی سرووشـتـی بۆ بەریتانیا، نووسـیـبووی :*«نزیکەی سی تۆن ئێسک و پرۆسکی مرۆڤ کە لە پلۆناوە بارکرابوو، ئەمڕۆ گەیشتە بەندەری بریستۆل.»*

**فەسڵی یازدەهەم**

## کوشتنی نیشتمانپەروەرێک

ئێستا ئیدی ڕێگای قوستەنتەنییە بەسەر سوپای روسیادا ئاوالا ببوو و، هۆکارێکی دیکەش کەوتبۆ سەر ترسە هەمیشەییەکەی عەبدولحەمید و ئەویش ئەو بووکە دەترسا سەربازانی روس بەنێو کوچەو کۆڵانەکانی قوستەنتەنییەدا بسوڕێنەوە. لەکاتێکدا کە ترس سەراپای داگرتبوو، لایاردی باڵیۆزی بەریتانیای بانگکردە کۆشک و داوای لێکرد وا لە شاژن ڤیکتۆریا بکات کە یارمەتی تورکیا بدات. دوای چەند دانیشتنێکی دوو قۆڵی کە لەگەڵ لایارددا ئەنجامی دان، ئاخیرەکەی لەلایاردی گەیاند کە بەمەبەستی لەیارمەتی ئەوەیە بەریتانیا لەلای خۆیەوە بۆ کۆتایی پێهێنانی دوژمنایەتیی نێوان تورکیاو روسیا، گوشار بخاتە سەر روسیا.

کاتێکیش ئە م داوایەی عەبدولحەمید بێ وەڵام مایەوە، عەبدولحەمید تەلگرافێکی پڕ لە پاڕانەوەو نزای بۆ شاژن ڤیکتۆریا ناردو داوای یارمەتی لێکرد.

لە کاتێکدا کە ڕوسەکان بەرەو قوستەنتەنییە دەهاتن، سوڵتان ڕۆژبەڕۆژ پتر لە نێو دنیای دوور لە ڕاستییەکان و پڕ لە درۆ ودەلەسەکەی خۆیدا، نغرۆ دەبوو. ئەو هێشتا سێبەرێکی دەرباری ئیمپراپۆرییەتی پاراستبوو؛ هێشتا خولامکارە مێرمنداڵەکان و ڕاسپێردراوەکانی نێو کۆشک بە جل وبەرگە باق وبریقدارەکانیان، لایاردی باڵیۆزی بەریتانیان لە تالارێکەوە دەبردە تالارێکی دیکە تاچاوی بە سوڵتان بکەوێ، هێشتا شاژنی دایک بە وردی نەریتی جارانی کۆشک و دەربارەی ئیمپراتۆرییەتی لە حەرەمسەرەدا پیادە دەکرد، هەرچەند ئەو نەریتە کۆنانە وەک لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتەجاڕیان لێهاتبوو، هێشتا جارناجارێ، کیژۆڵەیەکی دەدوازدە ساڵانیان وەک دیاری پێشکەشی سوڵتان دەکرد، بەهیوای ئەوەی بتوانێ بۆماوەیەک ببێتە مایەی ئارامی و سێبوریی سوڵتان، بەڵام عەبدولحەمید لەبری ئەوەی دەستکاریی بکات، دەینارده قوتابخانە. کاتێک دوای بگرەو بەردەیەکی زۆر ڕێگەدرا پزیشکی پیاو چاوی بە ئافرەتەکانی حەرەمسەرای سوڵتان بکەوێ، دیسان دەبوایە ئافرەتە نەخۆشەکە بخەنە پشت پەردەیەکی ڕەشەوەو پزیشک لەژێر چاودێریی یەکێ لە خواجەسەراکان لە کونێکی بەقەدەر زمانی ئافرەتەکەوە، سەیری زمانی نەخۆشەکە بکات.

ترسی عەبدولحەمید لەوەی کە لەپڕ پەلاماری بدەن، یان بیکوژن، پتر ببوو؛

لەزۆربەی ژوورەکاندا ئاوێنەی ئەندازە باڵایان بەشێوەیەک دانابوو کە کەوتبوونە بەرامبەر دەرگای هاتنە ژوورەوە، دەرگای بۆفیەکانیش بەهۆی تەلی کارەباوە لەو شوێنەی کە عەبدولحەمید لێی دادەنیشت دادەخران و دەکرانەوە. ئەمە بۆ ئەوە بوو کە ئەگەر هاتوو یەکێک نیازی خەراپی هەبێ، عەبدولحەمید لە ئاوێنەکەوە ببینێ و دوایی بە پاڵنان بە دوگمەیەک دەرگەی بۆفیەکان بکرێنەوەو ئەو دەمانچانەیش کە بەرامبەر بەدەرگا دانرابوون، لەگەڵ کرانەوەی دەرگاکاندا، بە ئۆتۆماتیکی دەستیان بەتەقین دەکرد.
سەرەڕای ئەوەی کە عەبدولحەمید. لە هەر تالارێکی کۆشکدا نزیکەی چەند سەد دەمانچەیەکی پڕی شاردبۆوە، هەمیشە دوو دەمانچەی پڕیشی لەولاو ئەولای بانیۆی حەمامەکەی دادەنا.
لەکاتی گەڕان بەنێو باخی کۆشکدا، لانیکەم لە ترسان دووکەسی کوشتبوو. جارێکیان کاتێک یەکێ لە باخەوانەکان بەدیتنی عەبدولحەمید شێواو و بۆ ئەوە سڵاوی لێبکات جوڵەیەکی خێرای کرد، ئەودەم عەبدولحەمید بە گومانی ئەوەی کابرا دەست بۆ دەمانچە دەبات، گوللەیەکی لە نێو چاوانی دا. جارێکی دیکەشیان ئەو کاتە بوو کە یەکێ لە کیژۆڵەکانی کۆشک کە هەندێ لەمێژوونووسان دەڵێن کچی خۆی بووە) بە گاڵتە پاڵی بە عەبدولحەمیدەوە ناو، سوڵتان بەبێ ئەوەی بزانێ ئەوەی پاڵی پێوەناوە کێ بووە، گوللەیەکی لەو کیژۆڵەیەدا. لە کاتێکدا کە ترس وگومان عەبدولحەمیدی تا لێواری شێتیی یەکجارەکی بردبوو، عەبدولحەمید هەندێ کەسی سەیرو سەمەرەی وەک ڕاوێژکار هەڵبژاردبوو.
ڕاوێژکارە نوێیەکانی عەبدولحەمید بریتی بوون لە کۆیلەیەکی ڕەش کە لە بازاڕ کڕیبووی، لاسایی کەرەومیەکی سێرک کە کەیفی بە کردەوەکانی دەهات و لەزەتی لێ دەدیت، شاگردە چێشت لێنەرێکی نەخوێندەوار، پاڵەوانێکی کەچەڵ و بۆیاخچییەکی گەڕۆک.
ئەمە جگە لەوەی کە مەراسیمی نوێژی هەینی کە لە مزگەوتی ئەیا سۆفیا ئەنجام دەدرا، هەروەکو خۆی بوو.

* * *

لە نێوەڕاستی مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٨٧٨(محرم-ی ١٢٩٥ی کۆچی)، ئیدی پێدەچوو شەڕ کۆتایی هاتبێت؛ چونکە دوای خۆبەدەستەوەدانی پلۆنا، بەشێکی زۆری هێزە ئەورووپاییەکەی قەیسەر ئازاد ببوون و سوپایەکیان لەژێر سەرکردایەتی ژەنەڕاڵ گۆرکۆ توانیبووی لەماوەی چەند ڕۆژێکدا سۆفیا داگیر بکات. لەهەوای ساردی زستاندا کە پلەی ساردی لەژێر سفرەبوو، سوپایەکی دیکە لەژێر سەرکردایەتی ئیسکۆبلۆفدا، لە کێوەکانی بالکان گوزەران و دوای تێپەڕبوون لە دوو ڕێگەی خاکی، سەر ئەنجام پێیان نایە دەشتێکەوە کە بە تەرمی پەنابەرە بریندارو مردووەکان داپۆشرابوو.(٩)
لە دوا هەفتەی مانگی کانونی دووەمدا، ئیسکۆبلۆف دەستی بەسەرشاری ئەدیرنەدا گرت کەتەنها (١٠٠) کیلۆمەتر لە قوستەنتەنییەوە دوور بوو.

لە ڕاستیدا ئەم شەڕە بەدوا شەڕی نێوان روسیا و تورکیا لە قەڵەم دەدرا، چونکە هەردوای ئەم سەرکەوتنەی روسیا،پەیمانی ئاگربەس لە (٣١) هەمان مانگدا لەلایەن هەردوولا ئیمزا کرا.

بەڕای ئینگلیزەکان پێشڕەویی خێرای سوپاکەی قەیسەر، هاوسەنگیی هێزەکانی لە ڕۆژهەلاتی ناڤیندا لەباربردبوو و، ئەمە هۆکارێکی دیکەشی هاتبۆ سەرو ئەویش ئەو مەدح و سەنایەی کە ئینگلیزەکان لە عوسمان پاشایان کردبوو، ڕەنگبوو ببێتە هۆی ئەوەی ورچی ڕوسی (قەیسەر) هێرشی دیکەش بکات. ماوەیەکی پێچوو تا ڕا وهەستی گشتی خەڵکی بەریتانیا، کاری لە داونینگ ستریت کرد، بەڵام لەو بەینەدا شاژن ڤیکتۆریاش پشتگیریی لەڕای خەڵک دەکردو وا لە داواو پاڕانەوە یەک بەدوای یەکەکانی سوڵتان عەبدولحەمید بێزار ببوو، کەسەرئەنجام لەلایەن خۆیەوە تەلگرافێکی بۆ قەیسەر لێداو داوای لێکرد بەر بەپێشڕەوی سوپاکەی بگرێ. وەڵامی قەیسەر هێندە بێمنەتانە و بێ باکانەبوو کە ڤیکتۆریا لەنامەیەکدا بۆ دیزرائیلی (سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی بەریتانیا)ی نووسی: *«ئەگەر پیاو بامایە، حەزم دەکرد بچمە مەیدانی جەنگەوەو لێدانێکی جەرگبڕم لەو ڕوسە قێزەونانە بدابایە کە کەس ناتوانێ پشت بە بەڵێنەکانیان ببەستێ.»*
سەر ئەنجام شاژن ڤیکتۆریا توانی بەسەر ڕاڕایی و دوودڵیی کابینەی بەریتانیادا سەربکەوێ و تێیان بگەیەنێ کە سەربازە سەرکەوتووەکانی رووسیا لەبن قوستەنتەنییە خێوەتیان هەڵداوەو، هێندە نزیکن کە لەنێو قوستەنتەنییەوە دەبیندرێن و بۆیە دەبێ پێش بەو ڕوسە بوغرایانە بگیردرێ.

پەرلەمانی بەریتانیا بڕیاری دا (٦) ملیۆن لیرە وەک خەرجی بۆ جەنگ دابین بکرێ و تەواوی هێزە یەدەکەکان بانگکرانەوە ریزەکانی سوپا.
لەگەڵ ئەوەشدا، چەند یەکەیەکی سەربازی لە هیندەوە نێردرانە دورگەی ماڵتا و ئینگلیزەکان بە بیانووی «پاراستنی سەروماڵی مەسیحییەکانی دانیشتووی قوستەنتەنییە» گەلەکەشتییەکی سەربازییان نارده داردانێل کە بەیەکەم جۆری موشەکی ژێر ئاو موجەهەز بوون. ئەم کەشتییانە تا نزیک کەنارەکانی پایتەختی عوسمانی چوونە پێش. سەیر لەوەدا بوو ڕووی لوولەی تۆپەکانی ئەو کەشتییانە لە سوپای روسیا بوو کە ئەوانیش ئیدعای ئەوەیان دەکرد بۆ پاراستنی سەرو ماڵی مەسیحییەکانی دانیشتووی قوستەنتەنییە هاتوون و تا گوندی سان ئێستێفانۆ، کە کەوتبۆ دووری دەکیلۆمەتریی قوستەنتەنییە، هاتبوونە پێش.

پەیماننامەی سان ئێستێفانۆ لە ڕۆژی ٣ی ئازاری ساڵی ١٨٧٧، لەنێوان تورکیا و روسیادا ئیمزا کرا، بەڵام ناوەرۆکەکەی بەڕادەیەک دژی بەرژەوەندی تورکەکان بوو کە بەدنەدانی ئینگلیزەکان تورکەکان نەچوونە ژێر بارییەوەو ئەم مەسەلەیەیان بردە کۆنگرەی بەرلین. کۆنگرەی بەرلین، لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٧٨ لەبەرلین بەستراو لەوێ بەنێوبژیی بسمارکی ڕاوێژکاری ئیمپراتۆرییەتی تازە دامەزراوی ئەڵمانیا، پەیماننامەی نێوبراو چاوی پێداخشێندرایەوەو دەستکاریی کرا.نزیکەی زۆربەی سەرانی ئەوروپا بەشدارییان لە کۆنگرەی نێوبراودا کردبوو کە دوای کۆنگرەی

ڤییەننا(١٨١٥) بەگەورەترین کۆبوونەوەی جیهان لەقەڵەم دەدرا. لەوێدا، میوانداری و شەونشینیی جۆراو جۆر سازدران و گەلێ پەیماننامەی نهێنی مۆر کران.

ولآتانی بالکان بەتووندی دژی بڕیارەکانی کۆنگرەی بەرلین بوون؛ بوڵغارییەکان لەوەی کە ئینگلیزەکان جەختیان لەوەکردبوو کە دەبێ وڵاتەکەیان بەسەر سێ وڵاتی بچوکدا دابەش ببێت، ڕۆمانیاییەکان لەوەی کە ناچار کرابوون ویلایەتی بسارابی بسپێرنە ڕوسەکان، سربەکان لەوەی کە زەوییەکی کەمیان بەرکەوتبوو، دانیشتوانی بۆسنیا و هەرزەگۆڤینیا لەوەی کە کەوتبوو نەژێر فرمانڕەوایەتی ئۆتریشەوە. بەڵام ئینگلیزەکان لەو باوەڕە دابوون کە بەرژەوەندی وادەخوازێ و ئەوە ڕێگە لەبەردەم درووستبوونی کۆمەڵەو وڵاتێکی بچوک لە نیمچە دورگەی بالکان دەگرێ کە لە هەمانکاتدا لەگەڵ یەکتریشدا دوژمنن. کەچی هەر ئەم سیاسەتە هەڵەیەبوو کە بووە هۆی ڕووداوەکەی سەرایڤۆو جەنگی جیهانی یەکەمی لێکەوتەوە.

بەڵام تورکەکان زەوییەکی زۆر کەمیان لەدەستداو هێشتا سنوری ئیمپڕاتۆرییەتەکەی عەبدولحەمید لە هی ئەڵمانیاو فەڕنسا و ئۆتریش فراوانتر بوو. هەرچەندە ڕوسەکان ویلایەتی بسارابی یان بەرکەوتبوو و داوێنی دەست بەسەراگیراوە ئاسیاییەکانی خۆیان پەرە پێ دابوو، بەڵام لێدانێکی جەرگبڕیان بەرکەوت و سەرانسەری بەلکانیان لەکیس چوو. لەوەش گرنگتر ئەوەبوو کە ڕوسەکان نەیانتوانی لە ڕێی بوڵغاریاوە بگەنە دەریای سپی ناوەڕاست و دیزرائیلی لەو بارەیەوە لە نامەیەکدا بۆ ڤیکتۆریای شاژنی بەریتانیا نووسیویەتی: *«لەبیرمان نەچێ کە ئامانجی سەرەکی لەم شەڕەی ئەم دواییە، هەر ئەمەبووە.»* ژەنەڕاڵ گۆرچاکۆفی ڕوسیاییش، زۆر بە دڵساردییەوە گوتبوی: *«ئێمە سەد هەزار سەربازی کارامە و ٥ سەد ملیۆن پارەمان بەفیرۆدا.»* بەڵام ئەو شتەی کە پتر لە هەموو شتێ ڕوسەکان پێی نارەحەت بوون ئەوەبوو کە لەوبەینەدا ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر دوورگەی قوبرسدا گرت و بەقەولی مەعروف لەگۆمی شلوێ ماسییان گرت.(١٠)

ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی بە پێچەوانەی ئەو ئارامییە ڕووکەشەی کە پێوەی دیاربوو، لەجۆش و خرۆش دابوو؛ تورکە لاوەکان لە نێوخۆی وڵات و لەدەرەوەش میدحەت پاشا بە بەردەوامی لە ژنێڤ و پاریس وتاری دەدا و ئەمە ڕادەی ترس و گومانی هەمیشەیی سوڵتانی پتر دەکرد. بەتایبەت کاتێ کە نەهیلیستە ڕوسیاییەکان قەیسەر ئەلیکساندەری دووەمیان کوشت، عەبدولحەمید بەڕادەیەک ترسا کە بۆماوەی چەند ڕۆژی بەردەوام دەبوایە خواردنەکانیان لە پێش چاوی خۆی لێ بنابایە و، بەر لە نووستنی، ڕاسپێردراوانی ئەمنی زۆر بە وردی ژووری نووستن و دەورووبەرو نوێنەکانی بپشکنن. عەبدولحەمید ڕۆژبەڕۆژ پتر دەگەیشتە ئەو قەناعەتەی کە شۆڕشگێڕە تورکەکان نیازی کوشتنیان هەیە و بەهۆی ئەوەی کە ڕۆژنامە بیانیەکان بە بەردەوامی هەواڵی چالاکییەکانی میدحەت پاشایان لەدەرەوە بڵاودەکردەوە، لە مێشکی دەستەوستانی عەبدولحەمیددا ئەم پاشا دوورخراوەیە ببوو بەسەرچاوەی تەواوی مەترسی و نائارامییەکان. ماوەیەک بیری لەوە کردەوە بیکوژێت، بەڵام کاتێ یەکێ لە دەربارییە ماستاوچییەکان کە دوژمنایەتی لەگەڵ

میدحەتدا هەبوو، پێی گوت سوڵتان عەبدولعەزیز خۆی نەکوشتبوو و، بەهۆی برینی شادەمارەکانییەوە نەمردبوو و بگرە بەدەستی پیاوکوژو بەکرێگیراوەکانی میدحەت کوژراوە، عەبدولحەمید بڕوای کردو کەوتە دوای بەڵگە کۆکردنەوە لەسەر ئەم داستانە خەیاڵییە. بەعەبدولحەمیدیان گوت هێشتا شاهیدەکانی ئەو ڕووداوە لە ژیاندان و (پەرتۆی عالی)ی کۆنە شاژنی دایک ، لە کۆشکی کۆن دایە و ئامادەیە لەو بارەیەوە شاهیدی بدات.

لە ڕۆژێکی سارد و باراناوی مانگی ئازاردا، سوڵتان پەستەکەکەی هەڵدایە سەر شان و بەرەو کۆشکی کۆن کەوتەڕێ تا لە نزیکەوە لە مەرگی عەبدولعەزیز بکۆڵێتەوە. ئافرەتانی حەرەمسەرا بەبیستنی هەواڵی هاتنی سوڵتان، جموجۆڵیان تێکەوت. لەو دیوی دەروازەی (بابی سەعارەت)، پاشماوەی حەرەمسەرای سێ سوڵتانی پێشووی لێبووکە سەردەمێک جێی سەرنجی مەحمود، عەبدولمەجیدو عەبدولعەزیز بوون، بەڵام ئێستا هەموویان پیرو داڕزاوبوون و ددانەکانیان وەریبوون و چەندین ساڵ دەبوو جگە لە خواجەسەراکان چاویان بە هیچ پیاوێک نەکەوتبوو. بەڵام لەو ڕۆژە باراناوییەدا، ئەو پیرەژنانە بەخێرایی چوونەوە سەرقتووی خشڵ و سوراوەکانیان و دەموچاوی خۆیان ڕازاندەوە. کەچی نەیاندەزانی هەموو ئەو ماندووبوونەیان بەخۆڕاییە؛ چونکە سوڵتان بەبێ ئەوەی سەیری کەس بکات یەکڕاست چووە ساختومانەکەی پەرتۆ عالی.

شاژنی دایک لە پێشڕا دەیزانی سوڵتان بۆچی دێتە سەردانی؛ چونکە لە کاتی «خۆکوشتنی» عەبدولعەزیزدا، خۆی مقەسکەی دابۆ دەست و، بەتاوانبارو هاوبەشی تاوان لە قەڵەم دەدرا، بۆیە ئێستا حەزی لێبوو چیرۆکێکی دیکە بهۆنێتەوەو بەم شێوەیە پاکانە بۆخۆی بکات. بەم پێیە بەبێ ئەوەی بخرێتە ژێر هیچ گوشارێکەوە، گوتی: میدحەت باخەوانێکی کۆشک و پاڵەوانێکی بەکرێ گرتبوو بۆ ئەوەی کوڕەکەی بکوژن و، تەنانەت گوتی: تەرمی عەبدولعەزیز جێی خەنجەرێکی پێوە دیاربوو و ئەمەشی تازە بەبیرهاتۆتەوەو لەبیری چووبوو کە سێ ساڵ پێش ئێستا بە لێکۆڵەرەوانی بڵێت.

سوڵتان پەرتۆی عالی سوێند دا کە لەو بارەیەوە لای کەس قسە نەکات، چونکە بەتەمابوو بە فێڵێک میدحەت لە سویسراوە بهێنێتەوە قوستەنتەنییەو ئینجا لەوێ بەخزمەتی بگات. بەم پێیە تەلگرافێکی بۆ میدحەت لێداو تێیدا گوتبووی لێت خۆش بوومەو سەردەمی دوورخراوەیش کۆتایی پێ هاتووەو ئێستا وڵاتەکەت پێویستی پێت هەیە، ئینجا لێی پرسیبوو کە ئایا ئامادەیە بۆ خزمەتکردن بە تورکیا کە هێشتا لەژێر باری سەختییەکانی شەڕدا غەرقی خوێنە، بگەڕێتەوەو یارمەتیی بدات؟

عەبدولحەمید باش دەیزانی کە میدحەت کابرایەکی نیشتمانپەروەرە و کاتێک قسە لەسەر بەرژەوەندییەکانی باڵای نیشتمان بێت، ئەوا بەبێ دوودڵی ئامادەی فیداکاری و لەخۆبووردنە. هەر واش بوو؛ میدحەت دوای چەند هەفتەیەک بەپێی خۆی هاتە نێو ئەو داوەوە کە بۆیان نابۆوەو، هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ نێو خاکی تورکیا، بە تۆمەتی کوشتنی سوڵتان عەبدولعەزیز ڕەوانەی زیندان کرا.

دادگایی کردنی میدحەت و دوو هاوەڵەکەی کە ئیدعای ئەوە دەکرا سوڵتانیان کوشتووە، لەژێر چادرێکی سەوزی هێلکەیی کە لەیەکێ لەباخەکانی کۆشکی یلدز هەڵدرابوو، ئەنجام دراو هەموو رۆژێ بەدەیان کەس بۆ شاهیدی دان ئامادە دەبوون. بەڵام پێویستی بە بانگکردنی ئەو هەموو شاهیدە نەدەکرد، چونکە هەر لە یەکەم رۆژی دادگایی کردنەکەدا ئەو دو کەسەی (باخەوان و پاڵەوانەکە)کە بە کوشتنی سوڵتان تاوانبار کرابوون، دانیان بە تاوانەکەی خۆیان دانا و، هەروەها دانیان بەوەش دانا کە میدحەت بەپارە بۆ ئەم کارەی بەکرێ گرتوون، بەڵام دەبوایە ئەم دادگایە نەک هەر تورکەکان بەتەنها و بگرە قەناعەت بە ئەوروپاییەکانیش بێنێ. بۆیە هەموو رۆژێ هەندێ بەڵگەی ساختە و بێ بنەمای نوێ لەدژی سەرکردەی چاکسازیخوازان رەوانەی دادگا دەکران. کاتێکیش نۆرەی ئەوەهات کە میدحەت بەرگری لە خۆی بکات، تێکرای ئەو تۆمەتانەی رەتکردنەوەکە درابوونە پاڵی و، داوای ئەوەی کرد لەگەڵ ئەو کەسانەیدا کە لە دژی ئەو شاهیدییان داوە، بەرەورووبێتەوە. دادگا ئەم داوایەی میدحەتی رەتکردەوەو لەو ساتەوە بەدیارکەوت کە لە کۆتاییدا رای دادگا چی دەبێ. سەرئەنجام دادگا «پیلانگێرانی» بە خنکاندن حوکم دا.

گومان لەوەدانیە کە ئەم دادگایی کردنە هیچ ئەسڵ و ئەساسێکی نەبووە و، باخەوان و پاڵەوانیان هەرگیز لە سێدارەنەداو پاشماوەی ژیانیان بەخۆشی و ئاسودەیی و بەو پارەیەی کە سوڵتان مانگانە بۆی بڕیبوونەوە، بردە سەر.

میدحەتیشیان دەستبەجێ لە سێدارەنەداو عەبدولحەمید ناچار بوو لەبەرامبەر گوشاری رای گشتی دنیا کە بە توندی لە دژی ئەم دادگاییە کارتۆنییەدا ورووژابوو، سزاکەی سوک بکات و لە حوکمی سێدارەوە بۆی بکاتە دوورخستنەوە بۆ تائیف ـی سعودیە کە بە توندی لەژێر چاودێری دابوو. بەڵام هێشتاش هەر لە میدحەت دەترسا، بۆیە دوای دوو ساڵ فرمانیدا ئەم پیاوە نیشتمانپەروەرە بخنکێنن. بەڵام بەوەش دڵی عەبدولحەمید ئاوی نەخواردەوە تا سەری براوەی میدحەتیان بۆ نەهێنا کە پڕیان کردبوو لەکا. دەڵێن سەری براوەی میدحەتیان لە قتوویەک نابوو و لەسەریان نووسیبوو: *«عاجی تێدایە، لەژاپۆنەوە نێردراوە، خاوەنشکۆ خۆی بیکاتەوە.»*

بەهەر حاڵ، بەقەولی سێرهێنری ئەلیۆت، سوڵتان توانی: *«بەشێوەیەکی عەبووسانە حوکمی مەحکومکردنی نیشتمانپەروەرێک بەدەست بێنێ، بەڵام ئەم کارە بەهاکەی ئەوەبوو کە سەڵتەنەتەکەی پەڵەیەکی رەشی پێوە بنووسێت کە هەرگیز لێی پانابێتەوە.»*

* * *

عەبدولحەمید لە جەنگ لەگەڵ روسیادا شکستی خواردبوو، سەرکردەی چاکسازیخوازانی بەشێوەیەکی خائینانە و نامرۆڤانە بە تەڵەوەکردبوو و کوشتبووی، بەڵام ئێستا بەرپرسیاریەتی شکستێکی گەورەتری لە ئەستۆ بوو کە ئەویش دەست لێ بەردانی دەوڵەتی باج و خەراجدەری میسر بوو بۆ بەریتانیا و بەبێ ئەوەی سەربازانی تورک یەک فیشەک بتەقێنن، میسریان تەسلیمی بەریتانیا کردبوو.(١١)

میسر، تەنها بەناو بەیەکێ لە ویلایەتەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە قەڵەم دەدراو خدیوەکەی سەربەخۆبوو. لە ساڵی ١٨٧٩(١٢٩٦ی کۆچی) بەڕادەیەک قەرزەکانی سەری زیادیان کردو کەڵەکە بوون کە خدێو ناچار بوو لەڕووی داراییەوە خۆی بخاتە ژێر ڕکێفی فەرەنساو بەریتانیاوە. لەو کاتەدا بەریتانیا بە بەهایەکی کەم، واتا بە (١٠٠) هەزار لیرە پشکی خدێوی لە کۆمپانیای قەناتی سوێزدا کڕییەوە.

لە ساڵی ١٨٨٢ (١٢٩٩ی کۆچی)، خەڵکی میسر لە دژی «دەسەڵاتی داراییی بیانییەکان» ڕاپەڕین و، لەسەرەتادا ئینگلیزەکان بۆ پاراستنی قەناتی سوێز داوای هاوکارییان لە تورکەکان کرد، بەڵام ئەو داوایەی بەریتانیا لەلایەن عەبدولحەمیدوە ڕەتکرایەوەو باڵیۆزی بەریتانیا چەندی هەوڵی لەگەڵ عەبدولحەمید دا بێهودە بوو. باڵیۆزی بەریتانیا هەوڵی ئەوەیدا سوڵتان ڕازی بکات کە بە قازانجیەتی ئەگەر بەیەکجاری دەستەبەرداری میسر نەبێت و لەبەرامبەر ڕاپەڕیوە میسرییەکاندا کە ئەعرابی پاشا سەرکردایەتی دەکردن، یارمەتی بەریتانیا بدات و هەوڵی سەرکوتکردنی شۆڕشەکە بدات.

عەبدولحەمید سەرزەنیشتنی ئەم کارەی میسرییەکانی کرد، بەڵام نەیوێرا بە ئاشکرا لە دژی عەرەبەکان لەگەڵ بەریتانیادا هاوپەیمانیەتی ببەستێت. پێویستە ئەوەش بڵێین کە عەبدولهادی، تاڵگرەوەی دەربار کە کاریگەرییەتیەکی زۆرری بەسەر سوڵتاندا هەبوو، بە عەبدولحەمدی گوتبوو: هەرگیز ئینگلیزەکان ناوێرن بە تەنهایی لەگەڵ میسرییەکاندا بجەنگن.(١٢)

لە (١٥)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٨٢ (٢٩ی ذیقعدە-١٢٩٩ی کۆچی) قەیرانەکە گەیشتە لوتکە و، باڵیۆزی بەریتانیا بۆ دواجار هەوڵی ئەوەیدا کە سوڵتان وا لێبکات لەم پێناوەدا هەنگاوێک بهاوێ، بەڵام باڵیۆزی بەریتانیایان بۆ ماوەی (٥) کاتژمێر لە کۆشکی یلدزدا ڕاگرت و چەندی باڵیۆز خۆی هێناو برد کە ماوەی کەمەو دەبێ سوڵتان ببینێ، بێ سوود بوو و، لەبری دیتنی سوڵتان پەیتاپەیتا فنجانە قاوەیان بۆ دەهێنا. سەرئەنجام دوای ئەو هەموو چاوەڕوانییە، پیاوێکی باریکەی دیت کە خۆی بە ژووری سوڵتاندا کرد؛ ئەو کابرایە عەبدولهادیی تاڵگرەوە بوو.
دوای نیو سەعات سوڵتان بە خزمەتکارێکیدا، وەڵامی بۆ باڵیۆزی بەریتانیا ناردو پێی ڕاگەیاند کە ئەستێرەکان پێیان باش نییە سوڵتان لەمبارەیەوە هیچ هەنگاوێک بهاوێ!

هەر چەندە کە ئەمە لە ئاست کردەوە سەرشێتانەکانی پێشووی سوڵتان شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بەڵام ڕەنگبێ ئەمە گەورەترین هەڵەیەک بوو کە لەماوەی سەڵتەنەتیدا ئەنجامی دا؛ چونکە بەریتانیا بە تەنها بەرەوڕووی ڕاپەڕیوەکان بۆوەو ڕاپەڕینەکەی سەرکوت کرد. ئینگلیزەکان ڕایانگەیاند بە شێوەیەکی «کاتی» میسریان داگیرکردووە، لەکاتێکدا لەدەست چوونی ئەو وڵاتە بۆ عوسمانییەکان بەیەکجارەکی بوو.

ئەو زنجیرە ڕووداوانەی کە لەگەڵ لەدەست چوونی میسر دەستیان پێکرد، لە

سالانی دواتردا بوونە هۆی نزیکبوونەوەی تورکیا و ئەڵمانیا و سەرئەنجام وایلێهات تورکیا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، بوو بە هاوپەیمانی ئەڵمانیا.
لەو کاتەدا پەیوەندییەکانی نێوان تورکیا و ئەڵمانیا لە چاو سالانی ١٨٧٠ کە بسمارک گوتبووی: *«من تاقەتی ئەوەم نییە سەری ئەو نامانە بکەمەوە کە لە قوستەنتەنییەوە دێن»*، گۆڕانێکی بنەڕەتیی بەسەرداهاتبوو. سەرەڕای ئەو تێبینی یە سیاسییانە، هۆکارێکی شەخسیش بۆ ئەم پەیوەندییە لە ئارادابوو؛ ماوەیەک دەبوو عەبدولحەمید بەڵگەنامەو سەنەدەکانی خەزێنەی وڵاتەکەی ڕەوانەی وڵاتی ئەڵمانیا کردبوو کە ئەوسا بێلایەن بوو. ئەم سەنەدو بەڵگەنامانە لە بانکەکانی ئەڵمانیادا دەپارێزران، لەمڕووەوە ئەڵمانیاییەکان نەک تەنیا داوای ئەوەیان لێدەکرد ئیمتیازی کێشانی هێڵی شەمەندەفەری حیجازیان کە بۆ گواستنەوەی حاجییەکان سودی لێوەردەگیرا، پێببەخشێ، بگرە لەبواری بازرگانی وسیاسیشدا هەندێ ئیمتیازیان دەویست. ئەوە هەمان ئەو سیاسەتە بوو کە پێشتر ئۆتریشییەکان گرتبوویانە بەرو تێیدا شکستیان خواردبوو. ئێستا ئەڵمانیاییەکان چنگیان لەو سیاسەتە گیرکردبوو کە بە سیاسەتی «پێشڕەوی بەرەو ڕۆژهەلات-Drang Nach Osten» بەناویانگە.
لە چوارچێوەی پیادەکردنی ئەم سیاسەتەدا، ویلهۆڵمی دووەمی قەیسەری ئەڵمانیا، لە ٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٨٩ (٧ی ربیع الاول-ی ١٣٠٧ی کۆچی)دا، بەدەنگی زرمەی سەدویەک تۆپ، پێی نایە نێۆ قوستەنتەنییەوەو بەڕەسمی سەردانی سوڵتان عەبدولحەمیدی کرد. لەو کاتەدا عەبدولحەمید (٤٧) سالان بوو، بەلام زۆر لەوە پیرتر دەهاتە پێش چاو.
لاوازو ئێسک دەرپەڕیو، پشتی چەمابۆوەو ڕیشیشی بۆز ببوو، بەلام بڕیاری دابوو لەسەر شێوازی ڕۆژهەلاتی پێشوازییەکی کەم وێنە لە قەیسەری ئەڵمانیا بکات.
لە کۆی گشتیدا پێشوازییەکی بێ وێنە لە قەیسەری ئەڵمانیا کرا، لەماوەی ئەو پێنج ڕۆژەی کە قەیسەر بەسەردانی ڕەسمی لە تورکیابوو، سەردانی مۆزەخانەی ئالتون وخشڵەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی کرد کە لەکۆشکی کۆندا بوو، لەوێ پارچە ئەڵماسێک سەرنجی ڕاکێشا و دەمودەست لەلایەن سوڵتانەوە پێشکەشی کرا.
کاتێکیش ئیمپڕاتریسی ئەڵمانیا مەدحی جوانیی باغەکانی سوڵتانی کرد، عەبدولحەمید بەدەستی خۆی دەسکە گوڵێکی بۆ لێکردەوەو پارچە ئەڵماسێکی گەورەشی لەناو دەسکەگوڵەکە دانا و پێشکەشی کرد.
لەم سەردانەدا، شتێکی پێکەنیناویش ڕوویدا؛ کە ئیمپڕاتریسی ئەڵمانیا سەردانی حەرەمسەرای کرد، لە تەنیشت دەروازەی بابی سەعادەت قزلەر ئاغایان پێ ناساندو بۆیان ڕوونکردەوە کە ئەم کابرایە ڕەش پێستە قەڵەوە، سەرۆکی خواجەسەراکانی کۆشکەو هێزو دەسەڵاتێکی فراوانی هەیە. ئیمپراتریس کە ئاگای لە هیچ نەبوو، لەڕێگەی وەرگێڕەکەیەوە لێی پرسی: *«ئەرێ باوکیشت هەر خواجەبووەو هەر ئەم پۆستەی هەبووە؟»*.

گەڕانەوەی قەیسەری ئەڵمانیا لە قوستەنتەنییە، هاوکات بوو لەگەڵ کوشتنی ئەلیزابێتی ئیمپراتریسی جوانکیلەی ئەوتریش کە بە (سی سی) بەناو بانگ بوو.ئەم خاتوونە ناسکۆڵەیە بەدەستی ئانارشیستێکی ئیتالیایی کوژرا و، بکوژ دوای ئەنجامدانی تاوانەکە هاواری کردبوو «بژی بەرەڵایی» و لەدادگاش گوتبوی تەنها دوژمنایەتیک کە لەگەڵ ئەلیزابێتدا هەیبووە ئەوەبووە کە ئەلیزابێت سەرێکی تاجداری پێوەبووە. ئەم گوتەیەی تاوانبار، مێشکی نوقسانی عەبدولحەمیدی ناڕاحەتترو ترس و گومانیی پتر کرد . (١٣)

لەو رۆژە بەدواوە، ئیلەگێکی زرێی لەژێر جلەکانیەوە دەپۆشی و لەکاتی نوێژی هەنیشدا، پاسەوانیەتییەکی بێ وێنەی لێدەکرا.

کۆشکی یڵدز وەک قەڵایەکی پۆڵایینی لێ هاتبوو. هەموو دەرگاکان رووپۆشێکی پۆڵایان لێدرابوو و تاقمێک کرێکارو بەنناش بە هەڵکەندنی تونێلی نهێنیی پترەوە خەریکبوون.

ئەگەرچی تورکەلاوەکان حزبێکی سیاسی پێکهاتوو لە دوورخراوەکانی دانیشتووی پاریس لەقەڵەم دەدران، بەڵام سیخوڕەکان بەعەبدولحەمیدیان ڕاگەیاند کە بیروباوەڕی ئەو تاقمە رۆژبەڕۆژ پتر لەنێوخۆی تورکیادا پەرەدەستێنێ و لایەنگریان بۆ پەیدا دەبێ.

تورکە لاوەکان و رۆشنبیران لەهەمبەر ئەو شتەی کە لەنێوخۆی وڵاتدا لە ئارادابوو، هەستیان بەشەرمەزاری دەکردو لەوەی کە وڵاتەکەیان لەلایەن بابایەکی شێتی وەکو عەبدولحەمیدەوە بەڕێوەدەچوو و هەر جارناجارێ پارچەیەک لە وڵاتەکەیان دەبۆوە، خوێنی دڵیان دەخواردو جەرگیان لەت لەت دەبوو. ئەوان، کۆمەڵێک هاوبیری بەنرخیان بەتایبەت لەنێو مامۆستای زانکۆکانی فەرەنسادا کەبەهۆی کەمی موچەکەیان حەزی شۆڕشگێڕانەیان هەبوو، دۆزیبۆوە. هەموو ئەوانە بۆ کەسانێکی دەوڵەمەند کە دەیانتوانی لە ساڵی ١٨٨٨ (١٣٠٥ی کۆچی) بەولاوە بە واگۆنە ڕازاوەکانی شەمەندەفەری ئۆریانت ئێکسپرێس لە قوستەنتەنییەوە سەردانی پاریس بکەن و، هەر کاتێ بیانەوێ بەهۆی تەلگرافەوە پەیوەندی بەشارە جیاجیاکانەوە بکەن، زۆر باش و جێی ڕەزامەندی بوو، بەڵام بۆ خەڵکانی نەخوێندەوارو بێنەوای نێوخۆی تورکیا کە هێشتا دەبوایە بە جادە خاکییەکانی سەردەمی بیزانسدا هاتوچۆ بکەن، هێندە دڵگیرو جێی باس نەبوو. هەرکاتێ پردێک ئاو بردبای،زۆر بەدەگمەن ڕوویدەدا نۆژەن بکرێتەوەو ئەمەش گیروگرفتێکی یەکجار زۆری بۆ ئەو وەرزێرانە دەخوڵقاند کە بەسەر ئەم پردانەوە ئازوقەو خۆراکیان دەگوێزایەوە. ئەغڵەب ڕوویدەدا کە دانیشتوانی گوندێک تووشی برسیەتی و گرانی دەهاتن و ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە گوندەکەی دراوسێیان نەیاندەزانی چ لەو دانەوێڵە و خۆراکە بکەن کە لە خۆیان زیاد دەبوو. لەو سەردەمەدا، لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تاکە ڕێگەیەک کە باش بوو و بەکەڵکی هاتوچۆ دەهات، ڕێگای بیروت- دیمەشق بوو کە ئەویش لەلایەن فەرەنساییەکانەوە دروست کرابوو.

ڕۆشنفکرانی نێوخۆی تورکیا، مافی ئەوەیان نەبوو، یان ڕێگەی ئەوەیان پێ

نەدەدرا حزب دابمەزرێنن؛ چونکە سیستەمی سیخوڕیی عەبدولحەمید زۆر بەهێزبوو و، هەندێ جار لە ئەشکەنجەخانەکانی کۆشکی یڵدز دەنگی هاوارو فیغانی ئەو کەسانە دەبیسترا کە چالاکی سیاسییان ئەنجامدابوو.

بەڵام ئەو هەواڵ و پڕوپاگەندانەی کە لەبارەی دوورخراوەکان و چالاکیەکانییان لەدەرەوە بە عەبدولحەمید دەگەیشت، خەوی لە چاوی سوڵتان ڕفاندبوو و ئارام و قەراری لێ بڕیبوو. ئەو دوور خراوانە ژمارەیان دەگەیشتە چەند هەزار کەسێک کە زۆربەیان لە ئەورووپا بوون. عەبدولحەمید وردە وردە هەستی بەوەکرد کە بیروبۆچوونی خەڵکانی نەیاری خۆی نەک تەنها هەر لەنێو مامۆستایان و فەرمانبەراندا پەرە دەستێنێ، بگرە ئەم بۆچوونانە لەنێو ئەفسەرەلاوەکانیشدا کە بە قەولی خۆی: *«لەرووی دەبەنگییەوە بۆ خوێندن ناردبووینە ئەڵمانیا»*، بڵاودەبێتەوە.

ئەو ئەفسەرانە لە ترسنۆکی و بێ غیرەتیی عەبدولحەمید بێزاربوون و فرمانرەوایەکی وەک سوڵتانەکانی پێشوویان دەویست کەبەسواری ئەسپەکەیەوە لە مەیدانی جەنگدا لە پێشی پێشەوە سەرکردایەتی سوپاکەی بکات.

ئینجا ڕەنگبێ هەر ئەم ترسەی عەبدولحەمید لە پیلانگێڕی و تیرۆرکردنی سەر ئەنجام وای لێکرد کە ئاوا بێڕەحمانە ئەرمەنییەکان قەتڵوعام بکات کە ئەمە گەلێ لە کارەساتی ڕەشەکوژیی بوڵغارەکان سامناکتربوو.

* * *

لەنێوان هەموو ئەو نەژادانەی کە لە نێوان ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا تووشی ئازارو ئەشکەنجە دەبوون، ئەو دوو ملیۆن ئەرمەنییەی کە لەنێو ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا دەژیان، بارو گوزەرانیان لە هەموان خەراپتر بوو. هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن ئەوان یەکێ لە (١٠) هۆزە ونبووەکەی بەنی ئیسرائیلن و، لەم ڕووەوە لەگەڵ یەهودییەکاندا هەندێ لێک چوونیان تێدا بەدی دەکرێتو ئەوانیش وەک یەهودییەکانی لەناوچەکانی دەوروبەری نیشتمانەکەیاندا دەژین. نیشتمانیان لەداوێنی کێوی ئاراراتە کە دەڵێن شوێنی نیشتنەوەی کەشتییەکەی نوحەو لەسەدەی دەیەمی زاییني بەر تالان و بڕۆو کوشتنو بڕینی تورکە سەلجوقییەکان کەوتوونەو، بەناچار بڵاوەیان لێکردووەو هەرگیز ئامادەنین جارێکی دیکە بگەڕێنەوە ئەوێ و لە وڵاتی باوباپیرانیان بژییەن.

ئەرمەنییەکان بەهۆی توانا و لێهاتووییان لە بازرگانی و کاروباری داراییدا، لە تورکیای سەدەی نۆزدەهەمدا باروگوزەرانێکی باشیان هەبوو. جا ئەمە هەموو ئەو ئەرمەنییانەی دەگرتەوە کە وەک جوتیارو وەرزێر لە (٦) ویلایەتی باکووری ڕۆژهەڵات دەژیان و، یان ئەوانەی کە وەک بازرگان و کاسبب لە شارەکان دادەنیشتن.

لامارتین ـی دیپلۆمات و نووسەری بەنێوبانگی فەرەنسایی، ئەرمەنییەکان بە سویسراییەکانی ڕۆژهەڵات لە قەڵەم دەدا و لەبارەیانەوە دەڵێ: *«لەرەفتاریاندا ڕێکوپێکن و تەنانەت لە حیسابات و سودخوازیدا لە سویسراییەکان دەچن. کاری دڵخوازیان بازرگانییە و لەژێر هەموو باروودۆخێکدا، ئەم پیشەیە هەڵدەبژێرن و مومارەسەی دەکەن.»*

سوڵتانی نیوەشێت، فرمانیدا لەمەودوا وشەی «ئەرمەنی» لەنێو ڕۆژنامەکاندا نەنووسرێت و ئەم وشەیە لە کتێبە وانەییەکانیش دەربهێندرێت. بۆیە بەناچار زۆربەی کتێبە وانەییەکانیان سەر لەنوێ چاپ کردنەوە. کاتێکیش کە سەیری کرد ئەو پیاوەی چەندین ساڵە خەریکی چاککردنەوەی کاتژمێرە بێشومارەکانی کۆشکی یلدزە، بەڕەچەڵەک ئەرمەنییە، بەپەلە دەمانچەکەی دەست دایە و ئەگەر کابرای قوربەسەر زوو فریای خۆی نەکەوتبایە و ڕای نەکردبایە، دەستبەجێ دەیکوشت.

زۆر لە موسڵمانە ڕاستگۆو خاوەنبڕواکان لەبەرامبەر ئەو ڕەفتارەی کە دەسەڵاتداران لەهەمبەر ئەرمەنییەکاندا دەیانواند، هەستیان بەشەرمەزاری دەکرد. سێرئاڵفرێد بیلیوتی باڵیۆزی بەریتانیا، لە یەکێ لەو موسڵمانانەوە نامەیەکی پێگەیشتبوو کە تێیدا نووسرابوو: *«ناکرێ بە تەواوەتی ئەوەی لەم وڵاتەدا ڕوودەدا ڕوونبکەینەوە. موسڵمانانیش وەک مەسیحییەکان زوڵم و ستەمیان لێدەکرێت و لەلایەن پیاوانی دەوڵەت و ئاغاکانەوە لەسەر زەوی و زاریان دەردەپەڕێندرێن و فرمێسکی خوێن دەبارێنن. بارودۆخی وڵات نائومێدکارە، کەمترین بایەخێک بە پاراستنی دارستانەکان نادرێت، گوندەکان وەک کۆمەڵە خانوویەکی لەقوڕ دروستکراوی نێو بیابانێکی وشک و بێ کۆتاییان لێهاتووە کە دانیشتوانیان بەزەحمەت شتێک بۆ خواردن و ڕەواندنەوەی برسییەتیان پەیدا دەکەن، هیچ ڕێگەوپردێکی بەکەڵک لەو وڵاتەدا نەماوەو هیچ ساختومانێکی میریش نییە کە لە ناوەوە، یان لەدەرەوەڕا نەڕووخابێ. چادرنشینەکان پەیتا پەیتا خۆیان بەنێو شارو شوێنی دانیشتنی خەڵکی شاریدا دەکەن و چی بە بەر دەستیان ڕابگات بە تاڵانی دەبەن.»*

* * *

ڕەنگبێ هۆی ئەوەی کە تورکەکان، ئەرمەنییەکانیان لە یۆنانی و ئەلبانیاییەکان پتر خۆش ویستووە ئەوەبووبێت کە ئەوانیان بە ڕۆژهەڵاتی و لەخۆ بەنزیکتر زانیووە و، هەروەک ژەنراڵ فۆن مۆڵتکە نووسیویەتی:*«ئەرمەنییەکان ئەو تورکانەن کە بوونەتە مەسیحی.»*

لەو کاتەدا ئەو ئەرمەنییانەی کە لە دەوروبەری وڵاتدا دەژیان و زۆربەیان لە ئەمەریکا و روسیا و بەریتانیا بوون و خاوەن دەسەڵات و توانایەکی ئابووری بەهێز بوون، هەندێ داواکارییان سەبارەت بە باشبوونی باری ژیانی براکانیان لەنێوخۆی تورکیادا خستەڕوو. ئەوان (ئەرمەنییەکان) هەرگیز خوازیاری ئۆتۆنۆمی نەبوون و زۆربەیان لەوەی کە دانیشتووی ئیمپڕاتۆرییەتێک بوون کە نیشتمانەکەیانی لەلای باکوری ڕۆژهەڵاتەوە لە ئامێز گرتبوو، خۆشحاڵ بوون. داواکارییەکانی ئەوان تەنها بریتی بوو لەوەی کە تەناهییان هەبێ، ئافرەتەکانیان ڕێزیان لێ بگیردرێت، ماڵ و سامانەکانیان پارێزراوبێت و لەو ناوچانەی کە تێیاندا دەژین هەندێ چاکسازیی ئیداری بکرێت.

بەداخەوە خزم و کەسی ئەرمەنییەکان لەدەرەوە، لە ئەندازەبەدەر کەف وکوڵیان لەخۆیان نیشاندەدا و ئەغڵەبیان ببوونە پیاوی ڕوسەکان و بەفیتی ئەوان ئامادەی

ئاژاوەنانەوە لەنێوخۆی تورکیا بوون. هەرچەندە ناکرێ ئەوە بە بیانوو دابندرێت و ئەو ڕەشەکوژییەی کە لە ساڵانی دواتر ئەنجامدرا شەرعیەتی پێ ببەخشرێت، بەڵام لەهەندێ جێگەدا ئەم کارە نامرۆڤانەی تورکەکان لەهەمبەر ئەرمەنییەکاندا ئەنجامیاندا، دەگەڕێتەوە بۆ دنەدانی ئەرمەنییەکانی نێوخۆی تورکیا لە لایەن ئەرمەنییەکانی دەرەوەو «دۆستە» ڕوسیاییەکانیان.

لە ساڵی ١٨٩٤ (١٣١٢ی کۆچی)دا، دوابەدوای ئەو نائارامییانەی کە لە ناوچە ئەرمەنی نشینەکاندا ڕوویدا، سوڵتان بڕیاریدا تەمبێیان بکات.

سوڵتان لەکاتی خواردنی نانی ئێوارە لەگەڵ پرۆفسیۆر ڤامبری دا، گوتبووی: «*بەم زوانە ئەرمەنییەکان سەرکوت دەکەم و زللەیەکی واش لە بناگوێیان دەدەم کە باش بیان هێشێت و واز لەو فکرە شۆڕشگێڕییانەیان بێنن.*» عەبدولحەمید هەندێ سیخوڕی خۆی ناردە ئەو ناوچانە تا بە موسڵمانەکان ڕابگەیەنن کە مافی ئەوەیان هەیە و ڕێگەیان پێدراوە کە دەست بەسەر سەروەت و سامانی ئەرمەنییەکاندا بگرن و ئەگەر هاتوو بەرگریشیان کرد بیانکوژن. ئەمە سەرەتای دەست پێ بوونی خەباتێکی وردو لێکدراوەبوو کە تێیدا (١٠٠) هەزار لە ئافرەت و پیا و منداڵی ئەرمەنی کوژران.

نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، هەمیشە ڕەشەکوژی بەیەکێ کردەوە مەشروعەکانی سەردەمی جەنگ لە قەڵەم دراوە، بەڵام سامناکترین هۆکارێک کە لە قەتڵوعامی ئەرمەنییەکاندا بەرچاودەکەوێ ئەو شێوازەیەکە قەتڵوعامەکەی پێ جێبەجێ کراوە. ئەم شێوازە بەشێوەی وروژاندنی هەستی خەڵکی ئاسایی نەبوو، بگرە بە پلانی پێشوەختی ڕاسپێردراوانی دەوڵەت و ئەو سیخوڕانەی کە هەمیشە ئامادەی جێبەجێکردنی فرمانەکانی قوستەنتەنییە بوون و ڕێک وەک ئەوەی لە کارگەیەکدا کار بکەن: بەیانیان لەگەڵ بیستنی زەنگدا دەستیان بەکاردەکردو ئێوارانیش لەگەڵ بیستنی زەنگدا دەستیان لەکار هەڵدەگرت و بەرەو ماڵ و شوێنی حەسانەوەی خۆیان دەگەڕانەوەو، بۆ بەیانی بەهەمان شێوە درێژەیان بەکارەکەیان دەدا.

ئەم ڕەشەکوژییانە دوا بزماری لەتابووتی عەبدولحەمید کوتا، چونکە شەخسی خۆی بەداڕێژەری نەخشەو پلانەکە لە قەڵەم دەدراو گۆڕانکاری و ڕووداوەکان و باس و خواسی ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و ڕۆژانە بۆی دەکرایە ڕاپۆرت و پێشکەشی دەکرا. تەنانەت بۆ جارێکیش ڕووی نەدا هەواڵی قەسابی و کوشتاری وەرزێرە ئەرمەنییە قوربەسەرەکان کار لە دڵەڕەقەکەی بکات و، وابکات بەخۆیدا بچێتەوە. سەیر لەوەدایە کە زۆربەی هاووڵاتیانی تورکیا لە مەحکومکردنی ئەم کارەساتە نامرۆڤانەیەدا، لەگەڵ بیانییەکاندا هاودەنگ ببوون. لەماوەی ئەو سێ ساڵەی کە قەتڵوعامی ئەرمەنییەکان بەبێچرپچڕی درێژەی هەبوو، هەزاران کەس لەو موسڵمانانەی کە لەو درندایەتی و نامرۆڤایەتییەی کە سوڵتان دەرهەق بە ئەرمەنییەکان دەیکرد بێزاربوون، دراوسێ ئەرمەنییەکانی خۆیان لەماڵەکانیاندا پەناو حەشار دەدا.

لەو کاتانەدا، کوشت و کوشتاری خەڵک ئامارو ژمارەی لێ دەکەوێتەوەو، ژمارەی قوربانییەکان دەخەمڵێندرێت. سەرەڕای ئەو سانسۆرە توندەی کە لە ئیمپراپۆرییەتدا هەبوو، داستان و بەسەرهاتی کوشتار لە زیندان و بەزیندوویی سوتاندنی ئەرمەنییەکان بەهۆی ئامرازی چاوەڕواننەکراوەوە دەگەیەندرایە دەرەوەی تورکیا. زۆربەی کات موسڵمانەکان نامەو پەیامی ئەرمەنییەکانیان دەبردە دەرەوەی وڵات و، جاری واش هەبوو بەڕێکەوت ئەم هەواڵانە دەگەیشتە دەرەوە. چۆنیەتی قەتڵوعامی ئەرمەنییەکان لە ترابزۆن، کە تێیدا یەک مەسیحیش بە زیندوویی دەرنەچوو، لە ڕێگەی ناخودایەکی ئۆتریشی کە کەشتییەکی بارهەڵگری کۆمپانیای لویدز-ی پێ بوو، گەیێندرایە ئەوروپا. ئەم ناخودایە بەچاوی خۆی بینیبووی کە چۆن ئەرمەنییەکان بۆ ڕزگارکردنی گیانیان، خۆیان هەڵدەدایە دەریاوەوەو مەلەوانە تورکەکان دەیانگرتن و دەیان خنکاندن. یەکێ لە کارمەندانی باڵیۆزخانەی بەریتانیا کەناوی جێراڵد فیتزمۆریس بوو، یەکەم ڕاپۆرتی سەبارەت بە سوتاندنی بە ئانقەستی (۳۰۰۰) کەس لە ئەرمەنییەکانی گەیاندە گوێی دنیا کە لە کەلیسای گەورەی شاری ئورفا «ئەدسا»دا سووتێندران. بەپێی ئەم ڕاپۆرتە خێزانە ئەرمەنییەکان پەنایان بردبۆبەر کەلیسای نێوبراو کە جێی پەنادانی چەند هەزار کەسی هەبوو، بەو هیوایەی کە هیچکەس جورئەتی ئەوە ناکات لە نێو کەلیسا و لەو جێگە پیرۆزەدا پەلاماریان بدات. تا چەند ڕۆژێک ئەم هیوایەیان هاتەدی و لەو ماوەیەدا کەس پەلاماری نەدان، بەڵام دوای ئەم چەند ڕۆژە سەربازە تورکەکان دەورەی کەلیسایان دا.

دوای کۆتایی هاتنی نوێژی جەماعەتی ڕۆژی شەممە، پێشنوێژی ئورفا بەڕاوەشاندنی ئاڵای کەسکی عوسمانی، فرمانی هێرشی گشتیی خەڵکی بۆ سەر ئەرمەنییەکان ڕاگەیاند و بەم شێوەیە کوشتن و تاڵان و بڕۆ دەستی پێکرد. تەواوی ئەو ماڵانەی کە کەوتبوونە گەڕەکی ئەرمەنییەکانەوە تاڵان کران و، دواتریش ڕەشەکوژییەکی سامناک ڕوویدا. ئافرەت و منداڵ و پیاوی ئەرمەنییەکانیان وەک چۆن ئاژەڵ ڕاو دەکەن ئاوا ڕاو دەکردو دوایی لەسەر زەوی درێژیان دەکردن و گۆشاو گۆش بەچەقۆ سەریان دەبڕین و وەک مەڕ دەیانکردنە قوربانی.

بەرلەوەی ڕۆژئاوابێت، دەنگی شەیپور ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەو ڕۆژە قەسابی کۆتایی پێهاتووە. ڕۆژی دواتر کە یەکشەممە و ۲۹ی کانوونی یەکەم بوو، دەنگی شەیپور سەربازەکانی لەسەربازخانەکانەوە هێنایەدەرو، ئەمجارەیان نۆرەی کەلیسای شاربوو. پێدەچوو ئەو گەلە خەڵکەی کە لە نێو کەلیسای نێوبراودا کۆببوونەوە، چاوەڕێی چارەنووسێکی وەهایان کردبێت ؛ چونکە فیتزمۆریس بەچاوی خۆی کاغەزێکی دیتبوو کە بەیەکێ لە ستونەکانی کەلیساوە کرابووەو قەشەیەکی ئەرمەنی ڕایگەیاندبوو کە شەوی شەممە دوایین مەراسیمی ئایینی لە بارەی (۱۸۰۰) کەسدا ئەنجامدراوە.

سەرەتا تورکەکان دەستیان بەتەقەکردن بەرەو کەلیسایەکە کرد، دواتر دەرگا ئاسنینەکەیان شکاند و ئەوەی هاتبایە سەر ڕێیان دەیانکوشت.

ئافرەت و منداڵەکان پەنایان بردە بەر کۆریدۆرەکانی دەوروبەری ساڵۆنی کەلیسا و ئەو شوێنە بەهۆی ئەوەی شەو خەڵکی لێ نووستبوو، کا وپوشێکی زۆری لێ بڵاوکرابۆوەو تورکەکان (٣٠) تەنەکە نەوتیان بەسەرکایەکاندا کردو ئاگریان تێ بەردا. ئەوەی کە نەکوژرابوو بە زیندوویەتی سووتاو بوو بە زوخاڵ. ڕێک لە کاتژمێر سێ و نیوی دوای نیوەڕۆ بەدەنگی شەیپور بەدیارکەوت کە کاری سەربازەکان کۆتایی پێهاتووەو، بەم پێیە سەربازەکان کەلیسایان جێ هێشت.

هەر لەو کاتەدا، ڕووداوێکی دیکە بە قەوارەیەکی بچوکتر لە شوێنێکی دیکە ڕوویدا کە دەنگدانەوەیەکی فراوانی لە دنیادا پەیدا کرد. دوو پرۆفسیۆری ئەرمەنی کە بۆ کۆلیژی ئایینی ئەمەریکاییەکان لە (مارسوان) کاریان دەکرد، بە چاپ و بڵاوکردنەوەی بەیاننامەی ئاشوب خوڵقێن و فیتنەکار تاوانبارکران و، بەکەلەبچەکراوی بردیاننە دادگایەکی ئەنکاراو لەوێش بەسێدارە حوکم دران.

ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی ئەمەریکاییەکان بەقینەدا بچن و، بۆ یەکەمجار عەبدولحەمید ناچاربوو سەرەڕای کاردانەوەی ئەورووپاییەکان لەگەڵ ئەو زریانەدا بەرەو ڕوو بێتەوە کە ڕۆژنامە ئەمەریکاییەکان بەرپایان کردبوو.

لەو سەردەمەدا وەزیر موختاری ئەمەریکا لە قوستەنتەنییە کابرایەک بوو بەنێوی دادوەر تریل کە تەکساسییەکی چەقاوەسووی زارگەورەبوو و، سوڵتان یەکجار ڕقی لێ دەبۆوە؛ چونکە بە بەردەوام توونتنی دەجوو و لەهەر شوێنێ حەزی لێ بایە تفی دەکردەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولحەمید وای بە باش زانی چاوی پێ بکەوێت و هەندێ شتی بۆ ڕوون بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە تریل و خێزانەکەیی بۆ خواردنی نانی ئێوارە بانگهێشتی کۆشکی یلدز کردو، بەسەبرو تەحەمولێکی فراوانەوە گوێی لە گلەیی و گازندەکانی تریل گرت. تریل گوتی: من لادێیەکم کە ئاشنای داب و نەریتی دەربارەی سوڵتان نیم، بەڵام لەو باوەڕەدام کەنایەڵن سوڵتان گوێبیستی ڕاستییەکان ببێت.

ڕۆژی دواتر، تریل باسی ئەم میوانداریەی سوڵتانی لای ئارتور نکلیسۆن-ی کارمەندی باڵیۆزخانەی بەریتانیا (باوکی سێر هارۆڵد نیکلسۆنی ڕۆژهەڵاتناسی بەنێو بانگ) کردبوو. هەروەها گوتبووی واهەست دەکا سوڵتان کەوتۆتە ژێر کاریگەرییەتی قسەکانی؛ چونکە چەندین جار بە بیستنی قسەکانی ئەو ئاخی هەڵکێشاوەو سەری باداوە. لە ڕاستیدا تریل لەو باوەڕەدا بوو کە عەبدولحەمید کابرایەک باشە کە ڕاسپێردراوەکانی بەنێوی ئەو تاوان ئەنجام دەدەن و، عەبدولحەمید بۆ خۆی ئاگای لەو بەزمەنییە و ڕووحی لەو تاوانانە بە ئاگانییە.

دوای ئەم چاوپێکەوتنە نیکلسۆن لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیبووی: *«سوڵتان وەزیر موختاری ئەمەریکاشی فریوە داوە.»*

ڕق و تووڕەیی ئەمەریکاییەکان لەهەمبەر لەسێدارەدانی ئەو دوو پرۆفیسۆرە ئەرمەنییە بەڕادەیەک بوو کە سوڵتان ناچار بوو ڕێگە بدات یەکی لە ڕۆژنامەنووسە بەنێو بانگەکانی ڕۆژنامەی نیویۆرک هێراڵد کە نێوی گوردۆن بینێت بوو، سەردانی بکات.

گۆردۆن سولتانی خستەژێر گوشارەوەو، سولتان ناچاربوو ڕێگە بەیەکێ لە ڕۆژنامەنووسانی ڕۆژنامەی نێوبراو بدات تا بەمەبەستی ئامادەکرنی ڕاپۆرت سەردانی ناوچە ئەرمەنی نشینەکان بکات، بەمەرجێک چاودێرێکی بێلایەنی لەگەڵدا بێت. ڕاپۆرتی ئەم دوو کەسە ئاوا باسیان لە بارودۆخی ئەوسای ئەرمەنییەکان کردووە: «*ئەگەر بڵێین تا ئێستا نزیکەی(٥٠) هەزارکەس گیانیان لەدەستداوە، بەراوردێکی میانڕەوانە و دوور لە موبالەغەمان کردووە؛* چونکە *لەم ژمارەیەدا ئەو کەسانە حیساب نەکراون کە لە سەرمان و لەبرسان گیانیان لە دەستداوە.*» سالانی دواتر، «شۆڕشگێڕە» ئەرمەنییەکان کە ئیدی هیچ نەمابوو لە دەستی بدەن و ترسیان نەمابوو، دەستیان دایە دژەهێرش و لە قوستەنتەنییە و شارە گەورەکانی دیکە دەستیان بە بانک بڕین و شتی لەو بابەتەکرد کە لێک چوونێکی سەیریان لەگەڵ ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەدا هەبوو.

بەرەبەری نیوەڕۆی یەکێ لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی ئابی سالی ١٨٩٦ (ربیع الاخر-ی ١٣١٤ی کۆچی)، تاقمێکی بیست کەسی کە تەقەمەنی و نارنجۆکیان پێبوو، هەڵیان کوتایە سەر بالاخانەی بانکی عوسمانی لە قوستەنتەنییە و دەستیان بەسەرداگرت. ئامانجیان پارە دزین و تالانکردنی بانکەکە نەبوو، بگرە دەیانویست سەرنجی دنیا ڕووەو هاوارو نارەزایەتی ئەرمەنییەکان ڕاکێشن.

ئەو ئەرمەنییانە، ماوەی سێ سەعات بە نارنجۆک و بۆمبە دەستییەکان لە بەرامبەر هێرشی پۆلیس و پیاوانی ئاسایشی عوسمانی کە دەورەی شوێنەکەیان دابوو، بەرگرییان لەخۆیان کردو سەرئەنجام بەنێوبژی بالیۆزخانە بیانییەکان کە لایەنی مامەڵە و مشتەریی بانکەکە بوون، بە وەرگرتنی ئەمان نامە خۆیان تەسلیم کرد. سێر ئێدگار ڕوینسنت-ی سەرۆکی بانکەکە کە ئینگلیزی بوو، ڕۆڵێکی گرنگی لەتێگەیاندن و هێنانی بالیۆزخانە بیانییەکان بۆ نێو مەسەلەکە هەبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی بالیۆزخانەکان بە گوشار خستنەسەر عەبدولحەمید، ئەمانناممە بدەن بە ئەرمەنییەکان. ئەو بیست ئەرمەنییە بە کەشتییە تایبەتییەکەی سێر ئێدگار بە ساغ و سەلامەتی قوستەنتەنییەیان جێ هێشت، بەلام هەر دوای ڕۆیشتنی ئەوان و بۆ هەمان شەو، تورکەکان لە تۆڵەی ئەمە لە نێو شاری قوستەنتەنییە حەوت هەزار ئەرمەنییان سەربڕی.

ئەوە ئەم کارەبوو کە ئەو بیست کەسە مەبەستیان بوو؛ چونکە تا ئەو سەردەمە هەندێ کەس هێشتا نێوی ترابزۆن و ئورفایان بەرگوێ نەکەوتبوو، بەلام هەر کە قەتلوعامی ئەرمەنییەکان لە قوستەنتەنییە دەستی پێکرد، دیپلۆمات، گەڕیدەو بازرگانە بیانییەکان بەچاوی خۆیان ئەم دیمەنەیان بینی و ڕاستی ڕووداوەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیایان بۆ دەرکەوت.

ئارتور نیکلسۆن لەوبارەیەوە نووسیویەتی: «*ڤینیز، لە تاریکترین سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاستدا لەچاوی ئەستەمبۆلی ئەمڕۆکە، بەشارێکی ئازادو ئارام لە قەڵەم دەدرێت.*»

کاردانەوە لەبەرامبەر ئەم کوشتارە زۆر خێرابوو و، هەوالی ئەم قەتلوعامە

بەخێرایی بەسەرانسەری ئەورووپادا بڵاوبۆوە. لەماوەی چەند ڕۆژێکدا سەرانی وڵاتانی ئەورووپایی چەندین تەلگرافی نارەزایەتییان بۆ عەبدولحەمید نارد کە تێیاندا، هۆشداریی ئەوەیان دەدا ئەگەر عەبدولحەمید بەخێرایی بەر بەو قەتڵوعامە نەگرێ ئەوا نەک هەر تاج و تەختەکەی خۆی و بگرە سەڵتەنەتی بەرەبابی عوسمانی دەکەوێتە مەترسییەوە.

لەو کاتەدا لادانی دوا سوڵتانی زاڵم و دیکتاتۆری عوسمانی تەنها پێویستی بەیەک لێدان هەبوو کە ئەویش لەنێوخۆی وڵاتەوە بەری کەوت.

**فەسڵی دوازدەهەم**

**سەربازی نەبەردو سوڵتانی مەلعون**

قەتڵوعامی ئەرمەنییەکان دیاردەیەک نەبوو کە بکرێ لە ڕووداوەکانی دیکە جیا بکرێتەوە، بگرە بە کوشتارێکی بەکۆمەڵ لە قەڵەم دەدرا کە بەشێوەیەکی پچڕپچڕو بە بەرزی و نزمی لە ڕووی ڕادەی توندی، یان لاوازییەوە، بۆ ماوەی سێ ساڵ درێژەی هەبوو. کاریگەرییەتی ئەم ڕووداوە بەسەر خەڵکی تورکیاوە ئەوەبوو کە بە گشتی لە بەرامبەر ئەم کارەی دەسەڵاتداراندا، هەستیان بەشەرمەزاری دەکردو هەر جارێ کە هەواڵی کوشت و کوشتاری ئەرمەنیەکانیان دەبیست، شەرمەزار تر دەبوون و، نازناوی «مەلعون»یان لەسەر ئەنجامدەری ئەم تاوانانە دانابوو.

سەدان و هەزاران لەو تورکانەی کە ئەمەیان پێ تەحەمول نەدەکرا، ملی ڕێگای دەرەوەیان گرت و لە تورکیا چوونە دەرو، پەنایان بردە بەر ئەورووپا و لەوێ چوونە پاڵ تورکە لاوەکانەوە.

تەنانەت مەحمودی زاوا، ژن برای سوڵتان، بەخۆ بە دوو کوڕەکەیەوە چووە پاریس و لەوێ پشتگیری خۆی بۆ دوورخراوەکان ڕاگەیاند. هەروەها نیازی بەگ، کە ئەفسەرێکی لاوی نێو ڕیزەکانی سوپای عوسمانی بوو و لەو گەندەڵیەی نێو دەزگای دەوڵەت و سوپا بێزار ببوو، زۆر بوێرانە ڕەخنەی لە شێوەی بەڕێوەبردنی وڵات دەگرت. سیخوڕەکانی سوڵتان ئەم هەواڵەیان گەیاندە کۆشکی یلدز، بەڵام خۆشبەختانە لەنیو سیخوڕەکانیشدا کەسانێک هەبوون کە باوەڕیان بە عەبدولحەمید نەمابوو و، دڵیان لەگەڵ نەیارانیدا بوو.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی نیازی فریای خۆی بکەوێت وبتوانێ لەکاتی خۆیدا خۆی بگەیەنێتە پاریس، بەڵام نیازی پیاوی ئەوە نەبوو لە پاریس دانیشێ و، درووشم بدات و قسە بکات. بۆیە بڕیاریدا بگەڕێتەوە تورکیا و بەشێوەیەک کە نەناسرێتەوە، لە شکڵی فرۆشیارێکی گەڕیدە خۆی گەیاندە ئەزمیر. دواتر بەناوی دەروێش، مامۆستا و ...هتد، هاتە قوستەنتەنییە و لە هەموو شوێنێک دژ بەدەسەڵات پڕوپاگەندەی بڵاو کردەوەو، لایەنگرێکی زۆرری لە نێو خەڵکدا پەیدا کردو توانی یەکەم خانەکانی شۆڕش لە نێو وڵاتەکەیدا بنیاد بنێت.

لەو کاتەدا سوڵتان پتر لە هەموو کاتێ گۆشەگیر ببوو، ئەغڵەب بەشداری لە مەراسیمی نوێژی هەینیدا نەدەکردو زڕبراکەی عیزەت-ی دەنارد کە زۆرریش لەخۆی دەچوو. ئەوانەی لەو سەردەمەدا عەبدولحەمیدیان دیتووە، باسی ئەوە دەکەن کە

سوڵتان زۆر لاوازتر دەهاتە پێش چاو، تەنانەت فینەکەی لەسەری گەورەتر دەهاتە بەرچاو. لەگەڵ ئەوانەشدا ڕادەی ترس و گومانی عەبدولحەمید ڕۆژ بەڕۆژ پتر دەبوو، بەشێوەیەک کە فرمانی دابوو کەس لە حزووری ئەودا دەست نەکاتە گیرفانییەوە. جارێکیان صادق پاشا کە یەکێ لە وەزیرە بێ شومارەکانی سوڵتان بوو لە حزووری ئەودا بۆ دەرهێنانی بەڵگەنامەیەک دەستی بۆ گیرفانی بردبوو، عەبدولحەمید دەمانچەکەی دەرهێنابوو و، کەم مابوو دەستبەجێ لەوێ بیکوژێت. لەترسی ئەوەی دەرمانخوارد نەکرێ هیچ نامەیەکی نەدەکردەوە.تاکە سەرگەرمیی سوڵتان ئەوەبوو کە لە نێو حەرەمسەراکەیدا چاکسازی ئەنجام بدات.ڕێگەی بە ژنەکانی دەدا دوا مۆدیلەکانی جلوبەرگی فەرەنسایی بپۆشن، مەمکدان ببەستن و لەجیاتی پێڵاوە سەرپێییەکانی ڕۆژهەڵات، پۆتینی چەرمی قەیتانداری ڕۆژئاوایی لەپێ بکەن.

لەگەڵ هاتنی سەدەی بیستەم شکڵ و سیمای قوستەنتەنییەش دەگۆڕاو، یەکەم واگۆن کە ئەسپ ڕایدەکێشا، لە شەقامەکانی قوستەنتەنییەدا کەوتبۆ کار. هەرچەند هێشتا کوچە و شەقامەکانی شار بێ ڕووناکایی بوون و کەس نەیدەوێرا بەشە و بەبێ پارێزەر بێتە دەرەوە، بەڵام لە گۆشە و کەناری شار میوانخانەی گەورە کە گڵۆپەکانیان لە تاریکی شەودا دەدرەوشانەوە دروست کرابوون؛ چونکە سوڵتان پێویستی بە پارەی گەشتیارە بیانییەکان هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بە توندی دژی دانانی تۆڕی تەلەفۆنی نێوشار بوو، چونکە یەکێ لە وەزیرەکانی ئەوەی هێنابۆ پێش چاوی خۆی کە ئەگەر تەلەفۆن لەشاردا بکەوێتە کار، بێگومان عەبدولحەمید ٢٤ سەعات و بەشە و بە ڕۆژ لەبنی هەڵناستێت و ئەوەش واتا دەردەسەری بۆ ئەوان. بەم پێیە وەزیرەکە بە سوڵتانی گوتبوو ئەگەر تەلەفۆن لەشاردا بخرێتە گەڕو سوڵتان ئەم ئامێرە بەکاربێنێ، دوورنییە دوژمنەکانی گوێ لە قسەکانی ڕابگرن. ئەوە وایکردبوو عەبدولحەمید دژی دانانی تۆڕی تەلەفۆن بێت.

عەبدولحەمید ببوو بە ئەفسانەیەکی زیندوو، بەتایبەت کاتێ کە سەرەتای سەدەی بیستەم هاوکات بوو لەگەڵ (٢٥)ەمین ساڵی سەڵتەنەتی. تا ئەو دەمە عەبدولحەمید دوو جار لە هەوڵی کوشتن ڕزگاری ببوو؛ لە ساڵی ١٩٠٤ (١٣٢٢ی کۆچی) ئەفسەرێکی لاو هەوڵیدا لەدەرەوەی شانۆ تایبەتییەکەی کۆشکی یڵدزدا بە چەقۆ بیکوژێت و، ساڵی دواتریش عارەبانەیەکی پڕ لە دینامیت (T.N.T) لەبەردەمی ئەو مزگەوتەی کە سوڵتان تێیدا خەریکی ئەنجامدانی مەراسیمی نوێژی هەینی بوو، تەقییەوە.

دوابەدوای ئەم ڕووداوەی دوایی، بەسەدان کەس لە خەڵکی بێ گوناه کەوتنە بەر پەلامارو ئازار و ئەشکەنجەدان. سوڵتان دەیویست بزانێ چۆن ئەو عارەبانە پڕ لە (T.N.T)یە بە بەردەمی ئەو هەموو پاسەوانە دا تێپەڕیووە کە سوڵتان زۆر متمانەی پێ هەبوون. ڕاستی مەسەلەکە ئەوەبوو کە ئەم کردەوەیە لەلایەن یەکێ لە تۆڕە شۆڕشگێڕەکانی نێوخۆی تورکیاوە ئەنجام درابوو کە باوەڕێکی پتەویان بە تورکەلاوەکان هەبوو، ئەو تورکە لاوانەی کە ئێستا نێویان لە خۆیان نابوو *«کۆمیتەی ئیتیحاد و تەرەقی»*.

لە ساڵی ١٩٠٦ (١٣٢٤ی کۆچی)دا، کۆمیتەی نێوبراو هەستی کرد زۆر بەهێز بووە، بۆیە شاری سالۆنێکی ویلایەتی مەقدۆنیای کردە نێوەندی خۆی. ئەم شارە هەر لە کۆنەوە ناوەندی دژایەتیکردن لەگەڵ عەبدولحەمید بوو؛ چونکە دانیشتوانەکەی لە ڕەگەز و نەژادی جۆراوجۆری وەک تورک، یۆنانی، سرب، بولغار، ئەلبانی، بۆسنی و گەورەترین کەمینەی یەهودیی نێو ئیمپراتۆرییەت پێک هاتوو. بەکورتی، بۆ دەستپێکی کاری شۆڕشگێڕانە مەقدۆنیا شوێنێکی زۆرر شیاو بوو. نیازی بەگ کارەکانی خۆی بە هەماهەنگی لەگەڵ ئەفسەرێکی لاوی سوپا بەنێوی ئەنوەر بەگ دا ئەنجام دەدا.

لەو کاتەدا، نیازی لەلایەن سوڵتانەوە بەر لێبوردن کەوتبوو و، بە پلەی موقەدەم هاتبۆوە نێو سوپاوە کە ئەمە خۆی لە خۆیدا پشتیوانییەکی باش بوو بۆ ئەنجامدانی چالاکییە شۆڕشگێڕانەکانی.

جار ناجارێ لە گۆشەو کەناری ئیمپرتۆرییەتدا، هەندێ کردەوەی توندوتیژ و شۆڕشگێڕانە ئەنجام دەدرا، بەڵام هەماهەنگ نەبوون و بچوکیی کردەوەکان، نیشانەی ئەوەبوون کە هێشتا پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان خانە شۆڕشگێڕەکاندا بەرقەرار نەبووە. عەبدولحەمید لەلایەن خۆیەوە ئەم بارودۆخەی پێ قەبوڵ بوو و دەنگی نەدەکرد. تەنانەت وای لێهاتبوو چیدی بایەخی بە ڕاپۆرت و هەواڵی سیخوڕەکانیشی نەدەدا. ڕەنگبێ هۆی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پێشتر ئەو سیخوڕانە هێندەیان درۆکردبێ کە عەبدولحەمید ئێستا بڕوای بە قسە ڕاستەکانیشیان نەدەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا عەبدولحەمید لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٠٨ (ربیع الاخر-ی١٣٢٦ی کۆچی) بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەو بەزمەی لە سالۆنێک لە ئارادابوو، کۆمیسیۆنێکی ناردە ئەوێ و ئەم کارەی بووە هۆی ئەوەی کە کردەوە شۆڕشگێڕانەکان خێراییەکی پتر بەخۆیانەوە ببینن؛ چونکە ئەو ئەفسەرەی کە سەرۆکی کۆمیسیۆنەکەبوو و دەیویست ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش عەبدولحەمید بکات، لە (١١)ی حوزەیران و لەکاتی گەڕانەوەدا کوژرا.

سوڵتان، بەپەلە ئەفسەرێکی دیکەی ناردە ئەوێ و کۆمیتەی ئیتیحاد وتەرەقی هەستیان بەوەکرد کە سوڵتان گرنگییەکی تایبەتیان پێدەدا و پێویستە بەرلەوەی بەرزەبری سوڵتان بکەون، دەستبەکار بن. شەش ڕۆژ دواتر کۆمیسەرێکی پۆلیسیان کوشت و ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرەکانی سوپایان دەستگیر کردن.

نیازی و ئەنوەر لە ٢ی تەمموزی ١٩٠٨ (٢ی جمادی الاخر-ی١٣٢٦ی کۆچی)، زەبری خۆیان وەشاند. نیازی دەرگای قاسەی سەربازگەکەی خۆی کردەوەو تەواوی پارەکانیی دەست دایە و، لەگەڵ چەند کەسێک لە برادەرەکانی پەنای بردە بەر کێوەکانی دەوروبەری گۆلی ئەخریدا.

هەر لەو کاتەدا ئەنوەریش لەگەڵ (١٥٠) کەس سەربازگەی (ڕەسنا)ی جێ هێشت.

دوای (٥) سەدە، بۆ یەکەمجار موسڵمانەکانی نێو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ئاڵای

شۆڕشیان بەرز کردبۆوە. پێدەچوو هێشتا عەبدولحەمید لەبایەخی مەسەلەکە نەگەیشتبێ. بەڕای ئەو مەقدۆنیا هەمیشە ناوەندی نائارامی و شۆڕش بوو و، ڕەنگبێ پێیوابوو بەناردنی لەشکرێک دەتوانێ شۆڕشەکە سەرکوت بکات و ئارامی بگەڕێنێتەوە ناوچەکە. نیازی، وەک خائین و ڕاکردوو لە خزمەتی سەربازی، بڕیاری گرتنی دەرچوو. بەڵام سوڵتان دەیویست ئەنوەر بە شێوە تایبەتییەکەی خۆی بخاتە تەڵەوەو بۆ ئەم مەبەستەش بەڵێنی بەرزکردنەوەی پلەو پایەی پێداو بانگی کردە قوستەنتەنییە. ئەنوەر لە مەسەلەکە تێ گەیشتبوو و، تەنانەت وەڵامی بانگهێشتە شەخسییەکەی سوڵتانی نەدایەوە.

عەبدولحەمید کە هەستی کرد تیرەکەی نیشانی نەپێکاوە، بەپەلە (٨٠٠) سەربازی ناردە شاری مۆناستیر-ی مەقدۆنیای باکور، بەڵام ئەم سەربازانەش لولەی تفەنگەکانی خۆیان لە براکانیان نەکردو لەبری ئەوە دوو لە ئەفسەرەکانی خۆیانیان کوشت کە یەکێ لەوانیان بە ئاشکراو لەسەر شەقام کوشت. هەواڵی ڕاپەڕینی سەربازگەکەی مۆناستیر وەک بڵێسەی ئاگر بەخێرایی پەرەی سەندو لە هەموو گۆشەیەکی مەقدۆنیاوە پەیتاپەیتا سەربازگەکان پشتیوانی خۆیان بۆ ئەنوەر بەگ ڕادەگەیاند. سوپای سێیەمی تورکیا کە لە بالکان جێگیربوو، ڕاپەڕی. لەنێو ئەفسەرانی ئەم سوپایە ڕاپەڕیوەدا، ئەفسەرێکی لاوی شۆڕشگێڕو بەکەف وکوڵ هەبوو کە نێوی مستەفا کەمال بوو. چیوای پێ نەچوو کە سوپای دووەمیش ڕاپەڕی و چووە پاڵ شۆڕشگێڕانەوە.

ئێستاکە ئیدی ڕووداوەکان بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەرو یەک بەدوای یەکدا دەهاتن. لە ٢٣ی تەمموز، تورکەلاوەکان ئۆڵتیماتۆمێکی ڕەسمییان لە مۆناستیرەوە بۆ سوڵتان نارد و تێیدا ئاماژەیان بەوەکرد کە ئەگەر سوڵتان لەماوەی ٢٤ سەعاتدا دەستورەکەی سەردەمی میدحەت پاشا نەهێنێتەوە گۆڕێ و کاری پێ نەکات، سوپای دووەم و سێیەم بەرەو قوستەنتەنییە دەکەونە ڕێ. قەبوڵ کردنی ئەم ئۆڵتیماتۆمە لەلایەن سوڵتانەوە بەمانای کۆتایی هاتن و شکستی سیاسەتی سەرکوتکردن و کوشتن بوو کە لەدوای دوورخستنەوەی میدحەت پاشاوە بەوردی لەلایەن سوڵتانەوە پیادە دەکرا و، سوڵتان بەقەدەر سەرە دەرزییەک لێی لانەدابوو. بەڵام ئەگەر ڕەتی بکردبایەوە، ئەوا ئەگەری شەڕی نێوخۆیی هەبوو کە بەهیچ شێوەیەک ئاکامەکەی دیارنەبوو. عەبدولحەمید، دوای چەندین ساڵ بۆ یەکەمجار داوای لە شورای وەزیران کرد لەو بارەیەوە گفتوگۆ بکەن. نزیکەی تەواوی وەزیرەکان لەگەڵ داواکارییەکەی تورکەلاوەکاندا بوون، بەڵام لەبەرئەوەی شارەزای سروشت و میزاجی سوڵتان بوون، گرفت ئەوەبوو کە کێ ئەم بڕیارەی ئەوان بە سوڵتان ڕابگەیەنێ؛ چونکە هەر هەموویان دەیانزانی کە ئەگەر عەبدولحەمید تووڕەبێ، دوور نییە دەستبەجێ ئەو کەسە بکوژێت کە بڕیارەکەی پێ ڕادەگەیەنێت.

سەر ئەنجام گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە واباشە بڕیارەکەیان بە عەبدولهادیی تالگرەوەی دەربار بڵێن کە سوڵتان زۆر کەیفی پێدەهات و متمانەی پێ هەبوو. هەرچەندە نێوبراو چەند ساڵ پێشتر ببووە هۆی ئەوەی میسر لە ئیمپڕاتۆرییەتی

عوسمانی جیابێتەوە، بەڵام هێشتا سوڵتان بەهۆی باوەڕیی بەخوڕافات و شتی لەو بابەتە، ڕێزی لێ دەگرت. عەبدولهادی کابرایەکی ژیرو وریا بوو کە لە هەمانکاتدا لە هیچکەس نەدەترسا، لەمڕووەوە وەزیرەکان وایان پێ باش بوو کە عەبدولهادی بەشێوازی خۆی باش بوونی قەبوڵکردنی ئوڵتیماتۆمەکەی تورکەلاوەکان بە سوڵتان ڕابگەیەنێ و بەشێوەیەک پێی بڵێ وەک ئەوەی لە غەیبەوە باش بوونی ئەم مەسەلەیە ڕاگەیەندرابێت. وەزیرەکان بۆ هاندانی عەبدولهادی و تەئکیدکردنەوە لەوەی کە مەترسیی هەڵایسانی شەڕی ناوخۆ چەند نزیکە، ئەو گەلە تەلگرافەیان نیشاندا کە لەچوارلای ئیمپڕاتۆرییەتەوە گەیشتبوون. تالگرەوە، یان ئەستێرەناسی دەربار، هەمان شەو خۆی گەیاندە سوڵتان و پێی ڕاگەیاند کە ئەستێرەکان لەگەڵ ئەوەدان سوڵتان لەگەڵ تورکە لاوەکاندا ڕێک بکەوێ. عەبدولحەمید بەبێ دوودڵی و گومان نەسیحەتی ڕاوێژکارە جێی متمانەکەی خۆی لە گوێ گرت و، هەر هەمان شە و تەلگرافێکی بۆ مەقدۆنیا لێدا و بۆ ڕۆژی دوایی واتا ٢٤ی تەممووز، خەڵکی قوستەنتەنییە بە خوێندەوەی ناوەڕۆکی تەلگرافەکەی سوڵتان کە لە ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژەدا بەچاپ گەیشتبوو، توشی سەرسوڕمان هاتن. عەبدولحەمید ڕایگەیاندبوو کە دەستورەکەی سەردەمی میدحەت کار پێدەکاتەوەو بنەماکانی مەشروطیەت قەبوڵ دەکات.

ئەو ڕۆژە، خەڵکی پایتەخت نەیاندەزانی لەخۆشیان چی بکەن. بەشێوەیەک کە خاتوو جۆن هازلیپ لە کتێبی «ژیانی سوڵتان عەبدولحەمید» دا نووسیویەتی:
*«ئەوانەی ئەو کاتە لە قوستەنتەنییە بوونەو بەچاوی خۆیان ئەو ڕۆژەیان دیتووە، باس لە دیمەنی سەرسوڕهێنەری گۆڕەپانی ئەیاسۆفیا و پردی گالاتا دەکەن کە تێیاندا یۆنانی، بولغاری، ئەرمەنی و کوردەکان وەک برا دەستیان لەملی یەکدی کردبوو و یەکتریان ماچ دەکرد. ئەفسەرانی سەر بە تورکەلاوەکان وتاریان دەدا و دەیانگوت ئیدی هیچ جیاوازییەک لە نێوان مەسیحی و موسڵمان و یەهودیدا نییە و، لەمەودوا دەبێ هەر هەموو دەست لەنێو دەستی یەکدی بنێین و بۆخۆشبەختی و سەرفیرازیی گەلی عوسمانی تێبکۆشین. لەنێو ئەو خەڵکە زۆرەدا، پیاوانی ئایینیش دەبینەدران.تەنانەت دوکاندارەکان، دوکانەکانی خۆیان بەجێهێشتبوو و، هاتبوونە نێو ئاپۆرای جەماوەر. قەسابەکان کە ڕووپۆشی سپییان پۆشیبوو، لەنێو ئەو خەڵکە بەباشی دەبیندران. سەرئەنجام لەکاتێکدا کەبە قازانجی دەستور و سوڵتان هوتافیان دەکێشا، بەرەو بابی عالی کەوتنەڕێ.»*
شادی گشتیی خەڵک، چوار ڕۆژ درێژەی هەبوو و لەو ماوەیەدا حەشاماتێکی (٧٠) هەزار کەسی هاتنە نێو کۆشکی یلدزەوە تا لەبەرامبەر ئەو بڕیارە مێژوویی و گرنگەی کە سوڵتان بەهۆیەوە داهاتوویەکی گەشی پێ بەخشیبوون، سوپاس و پێزانینیخۆیانبەسو ڵتانزرابگەیەننتائەوڕۆژهیچکاتلەوخەڵکە سوڵتانیان نەدیتبوو، بەڵام هەرکە هەیکەلی بچوکی عەبدولحەمید بەخەمبارییەوە لە بەلەکۆنی کۆشکرا بەدیار کەوت، هاواری شادیی خەڵک بەرزبۆوە.
پێدەچوو ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی لە کابوسێکی ترسناک بەخەبەرهاتبێ و،

لەمرووەوە خەڵک لەڕادەبەدەر گەشبین ببوون. لەشاری (دراما)، لەسەر ئەوەی کە تورکێک سوکایەتی بە مەسیحییەک کردبوو، تورکەکەیان خستە زیندانەوە. لەشاری (سرس) سەرۆکی کۆمەڵگای بولغارییەکان، لاچاوی ئۆسقۆفە یۆنانییەکەی شاری ماچ کرد. لە چەند شارێکی دیکەش تورکەکان بەڕێزو ئەدەبەوە سەردانی گۆڕستانیان کردو فاتیحیان لەسەرمەزاری ئەرمەنییە بە ناهەق کوژراوەکاندا خوێند. خەڵک لەوپەڕی شادی و خۆشحاڵیدا بوون و، عەبدولحەمیدیان بەئازادی بەخش لە قەڵەم دەداو لەو باوەڕەدابوون کە تاقمێک لەدەربارەییە ماستاوچی و گەندەڵەکان نەیانهێشتووە سوڵتان ئاگاداری ڕاستییەکان ببێت.

هەر ئەم هەستەی خەڵک بوو کە بووە هۆی ئەوەی کە تورکە لاوەکان نەتوانن بەپەلە عەبدولحەمید لەسەرکار لابدەن. بەقەولی دکتۆر ئێرنسێت ڕامسور لە کتێبی « تورکەلاوەکان» دا: *« لە ساڵی ١٩٠٨ کۆمیتەی ئیتیحاد و تەرەقی خۆی هێندە بەهێز نەدەدیت کە بتوانێ سوڵتان لەسەر کار لابدات. سوڵتان بەبەڵێنی بەکارگرتنەوەی دەستورو مەشروطیەت وای نیشاندابوو کە ئەمە بڕیاری خۆی بووەو کەس ناچاری نەکردووە ئەم بڕیارانە بدات. شان و شکۆی پلەو پایەی سوڵتان و خەلیفە، وایکردبوو کە خەڵک نەتوانن بە باشی کەسایەتی ڕاستەقینەی عەبدولحەمید ببینن.»*

لەڕاستیدا ئەنوەر بەوەڕازی بوو کە عەبدولحەمید وەک سوڵتانێکی مەشروطەی لێ بێت کەئەمە خۆی لە خۆیدا کۆمەڵێ لەتوانا و دەسەڵاتەکانی لێ دادەماڵی.

لەمەقدۆنیا، هەموو ڕۆژێ ئەنوەر بەسوپاکەیەوە بەنێو شەقامەکاندا تێدەپەڕی و شار بەدەست ئەنوەر ولایەنگرانییەوە بوو و، عەبدولحەمید لەوێ هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو.

کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی، هەوڵیدا مادامەکی عەبدولحەمید بۆ ئاستی سوڵتانێکی مەشروطە دابەزیبووە، ژمارەی بێ شوماری دەرباری و پیاوانی دەوروبەری کەم بکاتەوە. شانۆ تایبەتیەکەی عەبدولحەمید داخرا، ٢٠٠ مۆسیقاژەنەکە دەرکران، بەردەستە سەربازییەکانی کە ژمارەیان (٣٠٠) کەس بوو، کران بە ٣٠ کەس و، تەویلە و ئەسپەکانی سوڵتان بوون بە موڵکی دەوڵەت. تورکە لاوەکان بە سوڵتانیان ڕاگەیاند کە بە فرمانێکی ڕەسمی سیخوڕی یاساغ بکات. لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا کە چەند مانگ دواتر ئەنجام دران، خەڵکانێک لە تەواوی مەزهەب و نەژادە جۆراوجۆرەکان ،بەشدارییان لە هەڵبژاردن داکردو نوێنەرانی خۆیان ناردە پەرلەمانی نوێ کە لە ١٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ کرایەوە.

ڕۆژی کردنەوەی پەرلەمان، دیمەنێکی لەیادنەکرابوو؛ بەفر شارە جوانەکەی قوستەنتەنییەی وەک تارایەکی سپی داپۆشیبوو، بەڵام خۆری زستانە، تیشکی خۆی لە منارەو گومەزی مزگەوتەکانی شار دەدا.

خەڵکی شار بە ئەرمەنی و یەهودی و موسڵمانەوە بەڕیزو لەژێر ئاڵای عوسمانیدا بەجل و بەرگی تایبەتیەوە، ڕێزی خۆیان بۆ عەبدولحەمید کە بۆ کردنەوەی پەرلەمان دەچوو، دەردەبڕی. لەنێو نوێنەرانی ئەو پەرلەمانەدا، سێ کەس هەبوون کە قەدەر وایدانابوو چارەنووسی تورکیای نوێ کە بە هەنگاوی لەرزۆکەوە بەرەو دیموکراتییەت

هەنگاوی دەنا، بەدەستەوە بگرن.
یەکەمیان ئەنوەری نەبەردو قارەمان بوو کە خەڵک وێنەکانییان بە هەزار دەکڕی و بەڕیشی تراشاو و سمێڵە بادراوەکانی، هەیبەت و شکۆیەکی تایبەتیی هەبوو.
دووەمیان تەلعەت بوو کە زۆر بە قەرەجەکان دەچوو، شل و شۆق و سەروپرچی ئاڵۆز بوو و، دەیانگوت سەرچاوەو داینەمۆی فکریی حزب بوو. سێیەمیان جەمال بەگ بوو کە بەمنداڵی خولامکاری یەکێ لە پاشاکان بوو و، وای پێی باشتر بوو لەگەڵ کوڕێکی جوانکیلەدا ڕابوێری تا لەگەڵ ئافرەتێکدا، بەلام ئازایەتییەکەی لە ڕاپەڕینی سالۆنیکدا، وەک ئەفسانەی لێ هاتبوو. سێ پیاوی نارێک و نەگونجاو بوون و، بەویەڕی داخەوە لە کۆتایی کاردا دەرکەوت هیچیان لەباراندا نەبووە.

* * *

گوێزانەوەی گەلێک لە دیکتاتۆرییەتەوە بۆ دیموکراتییەت کارێکی ئاسان نییە، بەتایبەت کە ولاتانی بیانی بە پەلە هاتبنە گۆڕەپانەوە. پرەنس فێردنیاند دۆکۆبۆرگ، بەلێکدانی ویلایەتی ڕۆملیی ڕۆژهەلات و بولغاریا، ڕایگەیاند کە قەیسەری بولغاریای سەربەخۆیە. ئیمپراتۆری ئۆتریش و مەجەر کەلە ساڵی ١٨٧٨ (١٢٩٥ی کۆچی)وە ویلایەتەکانی بۆسنا و هەرزەگۆڤینیای بەنێوی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بەڕێوە دەبرد، بەڕەسمی ڕایگەیاند کە لەمەودوا ئەم دوو ویلایەتە موڵکی ئیمپراتۆرییەتەکەی ئەون و خستنیە سەر سنوری خۆی. هەروەها دورگەی کێرت ڕایگەیاند کە لەگەڵ یۆناندا یەکی گرتووە.
لەکاتێکدا، کە ئەو پارچانە لە خاکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی جیا دەکرانەوەو ئیمپراتۆرییەت پارچەپارچە دەبوو، کۆمیتەی ئیتیحاد و تەرەقی جگە لە نارەزایەتی دەربڕین چیدیکەی لەدەست نەدەهات. ڕەنگبێ هۆی ئەوەی کە هیچی ئەنجام نەدەدا ئەوە بووبێت کە ئەمانەیان وەک باجێک لە پێناو بەڕەسمی ناسین لەلایەن ئەوروپاوە بەخشیبێتە ئەو ولاتانە. بەلام خەڵک دەنگی نارەزایەتییان بەرزکردەوەو دەنگی ئەم نارەزایەتییەی خەڵک گەیشتە گوێی سوڵتانیش.
ناکرێ باوەڕ بەوەبکەین کە عەبدولحەمید دەستی لەو نائارامییانەدا نەبووە کە دوابەدوای ئەم مەسەلەیە ڕوویاندا. پێدەچێ عەبدولحەمید بەرتیلی دابێتە ئەلبانیاییەکان تا لە دژی کۆمیتەی ئیتیحاد و تەرقی ڕاپەڕن و، دیارە لەمەشدا ئەو هەزاران سیخوڕەی کە ئێستا بێکار ببوون و سالانە ملیۆنێک و دوو سەد هەزار لیرەیان لە خەزێنەی دەوڵەتەوە دەدرایەوە، ڕۆڵێکی باشیان لە هاندانی خەڵک و خوڵقاندنی نائارامییەکاندا هەبووە. ئەڵبەتە زۆربەی خەڵک پێیان وابوو تاکە چارەسەر ئەوەیە کە سوڵتان تواناو دەسەلاتەکانی پێشووی پێببەخشرێتەوە و پیاوانی ئایینیش پشتیوانیان لەم ڕایە دەکرد.
بەسەدان درۆ پیاوکوژ کە بەر لێبووردنی گشتی کەوتبوون و لە زیندان ئازادکرابوون، خەڵکی لادێیەکانیان هەراسان کردبوو.
لە ٣١ی نیسانی ساڵی ١٩٠٩ (٢١ی ربیع الأول–ی ١٣٢٧ی کۆچی)، سەربازگەی

قوستەنتەنییە ڕاپەڕی و ڕایگەیاند کە دژی شۆڕشە و خوازیاری ئەوەیە کە سوڵتان تواناو دەسەلاتی پێشوی بۆ بگەڕێندرێتەوە.

دیارنەبوو سەرکردەی ئەم ڕاپەڕینە کێیە؛ چونکە عەبدولحەمید خۆی لە مەسەلەکە بێ بەری کردبوو. تەواوی ئەندامانی ئیتیحادو تەرەقی بۆی دەرچوون و ئەگەر عەبدولحەمید تۆزێک بوێری تێدابایە وێراباى بە ئاشکرا قۆڵیان لێ هەڵماڵێ، ئەوا ڕەنگبێ توانیبای بۆ ماوەیەی درێژتر تاج و تەختەکەی خۆی بپارێزێ. بەلام عەبدولحەمید ئەو بوێرییەی تێدا نەبوو و بۆیە هەموو شتێکی لە دەست دا.

لەماوەی دوو هەفتەدا هێزەکانی نیشتەجێی سالۆنیک کە هەواداری ئەنوەر بەگ بوون، ڕووەو قوستەنتەنییە کەوتنەڕێ و لە ۲۳ی نیسان کە ڕۆژێکی ساردی وەرزی بەهاربوو، لەکاتێکدا کە عەبدوحەمید خۆی بۆ بەشداری لە نوێژی هەینیدا ئامادە کردو خەرکی جل و بەرگ پۆشین بوو، گوێبیستی دەنگی تۆپ بوو.

ئەنوەر گەیشتبۆ کەنداوی داردانێل و بەرەو سەربازگەی تەقسیم کە لە ناوەندی شاردا بوو، دەهاتە پێش، بەلام سەربازگەی تەقسیم خۆی بۆ بەرگریکردن ئامادە کردبوو. دوای چوار سەعات شەڕی دەستەویەخە، ئەنوەر توانی سەربازگەکە داگیربکات و سەربازە دژ بە شۆڕشەکانی گوللەباران کرد. بەرەبەری ڕۆژئاوا، بەشێکی زۆری شارکەوتبۆ ژێر دەستی هێزەکانی ئەنوەرەوە و، سەربازەکانی تەنها یەک کیلۆمەتر لەولای کۆشکی یلدز مۆڵیان خواردبوو و چادریان هەڵدابوو.

سوڵتان ئاگای لەوەنەبوو لە شاردا چ باسە و، تەنانەت کاتێ کە دەنگی زرمەی تۆپەکان نەما، کەس نەوێرا ڕاستیی مەسەلەکەی پێ بڵێی و تەنها ئەوەندەی دەزانی کە هێشتا پاسەوانەکانی خۆی کە لە کۆشکی یلدزدا بوون، لە شەڕەوە نەگلاون. لەڕاستیدا عەبدولحەمید پەیوەندی بە دنیای دەرەوەوە نەمابوو و، ئەوشەوە زۆربەی کاتی خۆی بە دانیشتوویی لەسەر تەختێکدا بردبۆ سەرو لەو ماوەیەدا یەکێ لە خولامە منداڵکارەکان کتێبی بۆ خوێندبۆوەو ئەو کتێبەش بەسەرهاتەکانی شێرلووک هۆڵمز ببوو!

کاتێ ڕۆژهەلات و ڕۆژی شەممە دەستی پێ کرد، هێشتا کۆشکی یلدز هەروەکو خۆی بوو و، ژیانی ئاسایی تێدا بەرقەراربوو تا ئەو دەمەی کە دەنگی زرمەی تۆپەکان کە لە دوێنێ نزیکتربببۆوە، عەبدولحەمیدیان لەخەو ڕاست کردەوە. سوڵتان بەپەلە جلەکانی پۆشی و لەیەکێ لە خواجە سەراکانی پرسی: چی بووە؟ خواجە سەراکە لە وەلامدا گوتی: سەربازانی وەفادار بەخاوەنشکۆ بە لەنێوبردنی سەرهەڵداوانەوە خەریکن. بەلام ڕاستی مەسەلەکە ئەوەبوو کە ئەنوەر هێرشی هێنابۆ سەر کۆشکی یلدز.

کاتێ دەرکەوت کەوا خەریکە وردە وردە پاسەوانەکانی کۆشکی یلدز شەپرێو دەبن و بەرگرییان پێ ناکرێ، ماستاوچی و خەڵکە بێ کەڵکەکەی دەوروبەری سوڵتان دەستە دەستەو کەهەر دەستەیەکیان سەد کەس دەبوو، بۆی دەرچوون و وایلێهات تا پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە تەنها چەند خزمەتکارو فەڕاشێک مابوونەوە. مەتبەخ داخرابوو، کارەبانەبوو و، لەسەرانسەری خانووە جۆربەجۆر و باخەبەرینەکانی

کۆشکی یلدزدا، تاکە مۆمێکیش دەست نەدەکەوت. ئەو شەوە دوای سێ و سێ ساڵ و بۆیەکەمجار، عەبدولحەمید خواردنێکی ساردبۆوەی خوارد کە نەک تەنها هەر لە مەتبەخە تایبەتییەکەی خۆیدا لێ نەنرابوو، بگرە بەرماوەی نانی نیوەڕۆی خزمەتکارەکانی کۆشک بوو و، چەند خواجەیەک کە هێشتا هەر لە کۆشکدا بوون لە مەنجەڵێکدا دۆزیبوویانەوە.

ئێستاکە کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا ڕووبەڕوو ببۆوە کە چی لەگەڵ سوڵتاندا بکات؟ ئەو دژە شۆڕشەی ئەو دواییە بەباشی ئەوەی دەرخستبوو کە پێویستە شۆڕشگێڕەکان بە وریاییەوە هەنگاوبنێن.

بەهیچ شێوەیەک نەدەبوو بیر لە کوشتنی سوڵتان بکەنەوەو دەبوایە بە پێی یاسا مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، لەمڕووەوە پەنایان بردە بەر شێوازە باوەکەی نێو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و داوایان لە شێخولئیسلام کرد بەم ناوەرۆکەی خوارەوە فتوایەکیان بۆ بدات:

*«کەسێک کە لە پلەی ئەمیری موئمینان و خەلیفەی موسڵماناندا بووەو، یاسا و دەستورەکانی شەرعی ژێر پێ ناوەو ڕێگەی نەداوە خەڵکیش پێرەوییان لێ بکەن، پارەی بەیت ولمالی بەفیرۆداوە، بەبێ سوچ خەڵکی ژێردەستەی خۆی زیندانی کردووەو ئەشکەنجەی داون و تەنانەت کوشتوونی، بەدەیان زوڵم و ستەمی ئەنجامداوەو دوای ئەوەی کە سوێندی خواردووە هەڵەکانی دووبارە نەکاتەوە دیسانیش لەسەر ڕێچکەی جارانی بەردەوام بووەو جەختی لەسەر تێکدانی ئاسایشی گشتی و دووبەرەکی نانەوە لەنێو خەڵکدا کردووەو ئەم کارەشی بۆتە هۆی ڕژانی خوێنی خەڵک، دەبی چی لێ بکرێت؟»*

*«لەویلایەتە جۆربەجۆرەکانەوە هەواڵی ئەوە دەگات کە خەڵک پەیمانی خۆیان لەگەڵ ئەم کابرایەدا پوچەڵ کردۆتەوەو لەلایەن خۆیانەوە بە خەلیفەی نازانن. لەگەڵ ئەوەشدا، دەرکەوتووە کە مانەوەی ئەم کابرایە لە پلەی خەلافەت و سەڵتەنەتدا زۆر مەترسیدارەو، لادانی لە قازانجی کۆمەڵگای موسڵمانانە. لەبارودۆخێکی وەهادا، ئایا حکومەتی هەنوکە ڕێگەی هەیە لەسەر کارلای بدات؟»*

شێخولئیسلام، تەنها بەیەک وشە وەڵامی دایەوە کە ئەویش ئەوەبوو:«بەڵێ» و، ئەم تاکە وشەیەش بەس بوو بۆ ئەوەی کە پەرلەمان بڕیار لەسەرلادانی عەبدولحەمید دەربکات.

پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٧ی نیسان، شاندێک کەپێک هاتبوو لە چوار نوێنەری پەرلەمان

-ئەلبانیاییەک، یۆنانییەک، یەهودییەک و ئەرمەنییەک-بە مەبەستی ڕاگەیاندنی بڕیارەکەی پەرلەمان، سەردانی عەبدولحەمیدیان کرد.

یەکێ لەو چوار کەسە کە نێوی ژەنەڕاڵ ئەسەدبوو، دواتر گێڕابوویەوە کە کاتێ پێیان ناوەتە نێو کۆشکەوە، ئەوانیان بردۆتە کۆشکی چیتلی کەساختومانێکی یەک قات و لە نێوەڕاستی باخەکانی کۆشکی یلدز بووەو بە تونێلێکەوە بە حەرەمسەراوە بەستراوەتەوە. ئەوان لەکاتێکدا کە چاوەڕێی کەسێک بوون کە بەدرێژایی چەندین

ساڵی بەردەوام حوکمی بەسەر گیان و ماڵی خەڵکی تورکیادا کردبوو، سی کەس لە خواجەسەرایانەی کە لە ترسان دەلەرزین، دەورەیاندابوون. لەهەموو سوچ و قوژبنێکی ئەو ژوورەدا هەست بە بوونی عەبدولحەمید دەکرا، کڵاشەکانی لە گۆشەکی ژوورەکە و لەپشت سۆپاکەوە بوون، دەرمانەکانی لەسەر مێزبوون و لە گۆشەیەکی دیکەش کۆمەڵێ کاغەز دەبیندران کە پێدەچوو کۆنە ڕاپۆرتی سیخوڕەکانی بن.

لەوکاتەدا بەبێ ئەوەی پێشتر هاتنی سوڵتان ڕابگەیەنن، سوڵتان خۆی کرد بە ژوورەکەدا. سوڵتان، یۆنیفۆرمێکی سەربازیی پۆشیبوو کە وەک ئەوەوابوو بەلەشییەوە هەڵواسرابێ. لەنێو ئەم شاندەدا، ژەنەڕاڵ ئەسەد تاکە کەس بوو کە پێشتر لەکاتی مەراسیمە سەربازییەکاندا سوڵتانی لەنزیکەوە دیتبوو. عەبدولحەمید دەستبەجێ لێی پرسین: «*چیتان دەوێ؟*» ئەسەد لە وەڵامدا گوتی: «*گەل، ئێوەی لەسەڵتەنەت وەلاوەناوە و، ئێمە ڕاسپێردراوین کە ئەمنییەت و ئاسایشی ئێوەو بنەماڵەکەتان دابین بکەین.*» هەروەها چونکە ئەم سەربازە پیرە نەیدەتوانی بێ حورمەتی بەسەرکردەی پێشووی خۆی بکات، درێژەی دایەو گوتی: «*نابێ خاوەنشکۆ لە هیچ شتێ بترسێت.*»

بێدەنگیەکی قوڵ باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا، دەنگی هەناسەش نەدەبیسترا. بەشان و شکۆیەکی فراوانەوە هەمان ئەو قسانەی کردن کە مامی (عەبدولعەزیز) لە دۆخێکی وەهادا کردبوونی و گوتی: «*قسمەت وابووە، من هیچ گوناهێکم نییە، ئایا ژیانم پارێزراودەبێ؟.*»

لەو بارەیەوە، بەڵێنی شەرەفیان پێداو براکەی (ڕەشاد) کە دوو ساڵ لەخۆی بچوکتربوو، بەنێوی محەمەدی پێنجەم کرا بە سوڵتان و، لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشت. بۆ تورکەلاوەکان کەنەیاندەویست خۆیان تووشی هەراو هۆریای پتر لە بارەی مانەوەی خەلافەت و سەڵتەنەت بکەن، سوڵتانی نوێ تایبەتمەندییەکی تێدابوو کە بێگومان تورکەلاوەکان پێی دڵخۆش دەبوون؛ سوڵتانی نوێ گوتبووی بیست ساڵە ڕۆژنامەم نەخوێندۆتەوە!

عەبدولحەمیدیان لەگەڵ سێ ژن و دوو منداڵە کەمتەمەنەکانی و چوار ژنی قەمپاتمە و چوار خواجەو حەقدە خزمەتکاردا، بۆ ساڵۆنیک دوورخستەوە. نیوەشەو هەندێ گالیسکە بۆ بردنیان هاتن، لەو کاتەدا عەبدولحەمید لە ترسان وەک دارەبی دەلەرزی و خۆی پێ لەسەر پێ ڕانەدەگیر. خواحافیزەی لە ئافرەتەکانی حەرەمسەرا کرد، سەربازەکان سڵاوی سەربازییان بۆ کرد و بۆ دواجار خواجەسەراکان شاقەلی کراسەکەییان ماچ کرد. دوای ئەمانە، لە کاتێکدا لە تاقمە سوارێک دەیانپاراست و لەدواوەی دەڕۆیشتن، بەرەو شەمەندەفەری سەڵتەنەتی کەوتەڕێ؛ ئەو شەمەندەفەرەی کە بیست ساڵ دەبوو بەدیاری دابوویانێ.

عەبدولحەمید بەسەرسوڕمانەوە دیتی لە ساڵۆنیک شوێنێکی خۆش و پڕشکۆیان بۆ تەرخان کردووەو، پاسەوانەکانیشی کە دوو ئەفسەری لاوبوون لەسەریانبوو داواکارییە ماقوڵەکانی سوڵتان جێبەجێ بکەن. کاتێک عەبدولحەمید گلەیی ئەوەی

کرد کە ئەو شیرو هێلکەیەی کە بۆی دێن کۆنەو تازەنییە، دەستبەجێ پەنجا مریشکی ڕەسەن و دوو مانگای شیردەریان لە کێڵگەکانی کۆشکی یڵدزەوە ناردە ئەوێ. دواتر چەند کەنیزەکێکی لاوی گورجیش بەمەبەستی خزمەتکردن نێردرانە لای عەبدولحەمید.

کۆمیتەی ئیتیحادو تەرقی هەندێ بیانووی بۆ ئەم ڕەفتارە نەرم و نیانە هەبوو کە لەگەڵ عەبدولحەمید دا دەیاننواند؛ کۆمیتە مەبەستی بوو هەندێ شت بزانێ و یەکێ لەوانە ئەوەبوو کە بەدرێژایی چەند دەیەی ڕابردوو، سوڵتان خەزێنەی دەوڵەتی دۆشیبوو و، دیارنەبوو ئەو پارانە لەکوێن؟ بەشێک لەو پارەیەیان لەیەکێ لەژێر زەمینەکانی کۆشکی یڵدزو لەشێوەی یازدە گونییەی پڕلە دراوی زێڕ و چەند قوتویەکی پڕ لە ئەڵماس و بەردی گرانبەهادا دۆزییەوە، بەڵام پاشماوەکەی دیارنەبوو. لەکۆتاییدا دەفتەرچەی یاداشتی عەبدولحەمیدیان دۆزییەوە کە لەکاتی ڕۆیشتن لەبیری چوو بوو لەگەڵ خۆیدا بیبات و لەو دەفتەرچەیەدا چەندو چۆنی داراییەکانی بەتیپ و ژمارەی نهێنی نووسرابوون. ئەو داراییە بریتی بوو لەو پارانەی کە لەکاتی دەست بەسەراگرتنی بیرە نەوتەکانی بین النهرین دەستی کەوتبوو، هەروەها پارەیەکی زۆری بودجە نهێنییەکەی دەوڵەت بوو کەلای یەکێ لە بانکە ئەڵمانیاییەکان و هەندێ کۆمپانیای نەوتیی ئەمەریکا دانرابوو.

جگە لە سوڵتانی پێشوو، عیزەتی زڕبرای سوڵتانیش شارەزای نهێنییەکانی ئەم دەرفتەرچەیە بوو کە ئەویش لەکاتی شۆڕشدا ڕایکردبوو. بۆیە بە ئەفسەرە لاوەکانی خزمەت سوڵتانیان گوت لە سوڵتانی ٦٧ ساڵە بگەیەنن کە ئەگەر ئەم پارانە بداتەوە دەوڵەت، ئەگەری ئەوە هەیە سەردەمی دوورخراوەییەکەی هەتاهەتایە نەبێ و کۆتایی پێ بێت.(١٥)

لەکاتێکدا کە شێرەکانی باخچەی ئاژەڵانی کۆشکی یڵدز لە برسان دەیاننەڕاند، کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی بڕیاریدا کۆشک پاکسازی بکات کە لە هەموو ڕوویەکەوە پتر بە دوکانی وردەواڵە فرۆشی دەچوو تا کۆشکی پاشایەتی. خاتو *ئەلما ویتلین* لە کتێبی «*عەبدولحەمیدی سێبەری خوا*»دا، بەم شێوەیە باسی لە کۆشکی یڵدز کردووە:

*«هیچکام لەعەمبارە گشتییەکانی شارەگەورەکان و لە پێۆانەیەکی بچوکتردا، عەمباری هیچکام لە دەربارەکانی جیهان، لە ڕووی بێ سەروبەری و ئاڵۆزییەوە لەگەڵ کەلوپەلە سەیرو سەمەرەکانی کۆشکی یەڵدزدا بەراورد ناکرێن. ڕەفتەیەکی گەورە هەبوو کە تەنها کراسی پیاوانی تێدا داندرابوو. چەندین هەزار کراس لەوێ کۆکرابۆوەو نەدەکرا بەجارێک بیانهێننە دەرەوە؛ چونکە گیرفانی هەریەک لەو کراسانە شتێکی تێدابووو: گیرفانی یەکێک لە کراسەکان، بەنکێکی مرواریی کەبایی چەندین هەزار لیرەبوو، تێدابوو، گیرفانی یەکێکی دیکەیان کیسەیەکی تێدابوو کە ئەویش پڕبوو لەبەردی گرانبەها. لەچکمەجەی یەکی لە لەمێزەکان دووسەد مەدالیاو، لەسندوقێکیشدا کە تایبەت بوو بەکتێب، کۆمەڵی دراوی (٥) لیرەیی ئینگلیزییان دۆزییەوە.»*

دەبوایە ئەو کەسانەی کە وەک مێش و مەگەس ئەو ناومیان ئاڵودەکردبوو، لە

کۆشک فڕێ بدرێنە دەرەوە. ئەوانەی کە ڕایاننەکردبوو، لە خزمەتکارو سیخوڕو تاڵگرەوە، لەڕیزێکی (١) کیلۆمەتری و لەژێر باراندا و بەخەمبارییەوە لە کۆشک وەدەرنران. زۆربەیان بەنەرمی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کرا، بەڵام ئەوانەی کە بە (تاوانبار) زانران، لەسەرپردی گالاتا و بەدەستی جەللادە قەرەجەکان لە سێدارەدران و، لەبری لە سێدارەدانی هەر کام لەو تاوانبارانە (١٠)شلینگ (نیولیرەی ئینگلیزی)یان درایێ. قزلەرئاغاو محەمەد پاشای سەرۆکی جەللادەکانی سولّتان، لەنێو ئەوانەدابوون کە بە تاوانی ئەنجامدانی گەلێ کاری دڕندانە، لەسێدارەدران.

کۆمیتە، بەرەورووی گرفتێکی دیکەش ببۆوەو ئەویش ئەوەبوو کە نەیدەزانی چی لە حەرەمسەراکەی سولّتان بکات. جگە لەو هەزاران کەسەی کە ڕایانکردبوو، هێشتا حەرەمسەرای سولّتان (٩٠٠) ئافرەتی تێدا مابوو کە ژمارەیەکیان ئەوانەبوون کە سولّتان قەمپاتمەی کردبوون و ئەوانی دیکە خزمەتکارو بەردەستی کوڕان و کچانی سولّتان بوون. نەدەکرا ئەو تاقمە فڕێدەنە سەرشەقام؛ چونکە زۆربەیان باشترین ساڵەکانی تەمەنی خۆیان لەژێر چەتری چاکەو پارێزگاریی سولّتاندا بەسەربردوو و، ژمارەیەکی زۆریشیان کەنیزەک و کۆیلە بوون کە ئازادی لای ئەوان هیچ واتایەکی نەبوو و تەنانەت بە بیستنی وشەی ئازادی لەرز دایدەگرتن.

بەم پێیە، تورکە لاوەکان وەک هەنگاوێکی نوێخوازانە، لە ڕۆژنامەکاندا ڕایانگەیاند کە هەر کەسێ کچ، یان خوشکی ڕفێندراوەو هێندراوەتە کۆشکی سولّتان، با لەسەر خەرجیی دەوڵەت بێتە قوستەنتەنییە و لەنێو حەرەمسەرای سولّتاندا بیدۆزێتەوەو لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە. ئەم ئاگادارییەیان بەتایبەتی لە گوندە چەرکەس نشینەکاندا بڵاوکردەوە؛ چونکە ساڵانێکی دوورو درێژ بوو کە ئەو شوێنانە وەک ناوەندی کڕین و فرۆشتنی کچانی جوانکیلە بوو.

ئەم ئاگادارییە وەڵامێکی سەرنجڕاکێشی هەبوو؛ ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک سەردانی کۆشکیان کردو بۆ یەکەمجار ئافرەتانی حەرەمسەرا لەدەرەوەو لەبەرامبەر خەڵکدا بەچەو عەبایان لەخۆ دەکردەوە تا بەڵکو خزم و کەسیان بیانناسنەوە. ئیدی ژمارەیەک لەوانە بە خزم و کەسی خۆیان شادبوونەوەو بەرەو ماڵ و حاڵی خۆیان کەوتنەڕێ. کەس نازانێ خۆشحاڵ بوون یان خەمگین؟

ژمارەیەکی زۆریش لە ئافرەتانی حەرەمسەرا هەبوون کە خزم و کەسیان نەهاتن و کەس نەبوو بە خاوەنیان. ئەوانەیان بردە کۆشکی کۆن بۆ ئەوەی تا دواساتەکانی ژیانیان بە ئارامی و ئاسودەیی بژین.

ئێرە کۆتایی ژیانی حەرەمسەرابوو و، بەوشێوە سەردەمێکی نوێ دەستی پێدەکرد.

## پەراوێزەکان

١- بە پێی یاساکانی عوسمانی هەمیشە لە بری ئەوەی کوڕی سوڵتان بە جێگری سوڵتان دەستنیشان بکەن، بە تەمەنترین نێرینەی نێو بنەماڵەکە بە جێگر دیاری دەکرا.

Le Moniteur de l Orient-٢

٣- چەند ساڵێک دواتر ئەم ئەستەموڵییە لە ئێرانیشدا برەوی پەیدا کرد و لەوێ بە« سەرداری» نێوبانگی دەرکرد.

٤- هەرچەندە کە بەریتانیا نکۆڵی لەوە دەکرد کە چاوی لە زەوییەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانییە، بەڵام هێندەی نەبرد کە دەستی بە سەر میسر و سودان و قوبرس داگرت.

٥-ئەگەر لە جیاتی وەزیری جەنگ، میدحەت لە گەڵ سوڵتاندا بەرەوڕوو بووبایەوە، ئەوا دوور نەبوو سوڵتان عەبدولعەزیز بە دەستی خۆی بیکوشتبایە. سوڵتان لە ڕادەبەدەر ڕقی لە میدحەت دەبۆوە و هۆی ئەم ڕق لێبوونەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوی کە میدحەت بەبێ ئەوەی چاویلکەکەی لە چاو بکاتەوە، چوبووە لای سوڵتان و ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی کە سوڵتان لە ڕادەبەدەر تووڕە ببێ.

٦-دایکی عەبدولحەمید نێوی « تیر موژگان» بوو و بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشی سیل لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا مردبوو.

٧- کاتێ کە سوڵتان محەمەدی دووەم قوستەنتەنییەی گەمارۆ دابوو، ئاغا شەمسەدینی مورشید بۆ دڵگەرمی و ورە بەخشین بە سەربازەکان، پێیدەگوتن ئەبووئەیوبی بەیداخداری پێغەمبەری خوا، لەو جەنگەیدا کە سوپای معاویە بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئەم شارە کردبوویان شەهید بووە و لە پشت حەساری ئەو شارە نێژراوە.

٨- فۆربس لە کاتی شەڕی نێوان فەرەنسا و پروسیا کە لە ساڵی ١٨٧٠ دا ڕوویدا، نێوبانگێکی زۆری پەیدا کردبوو. لەو کاتەدا ڕۆژنامەی تایمزی لەندەن شەمەندەفەرێکی تایبەتیی بۆ بەکرێ گرتبوو و فۆربس خۆی وەک کرێکاری ئاگرکوژێنەوە لێکردبوو، بۆیەتازەترین هەواڵی سەبارەت بە هاتنی ئەڵمانییەکان بۆ نێو پاریس گەیاندبووە ڕۆژنامەکەی.

٩- ئیسکۆبلۆف چەندین هزار ڕۆبڵی لە باوکی خۆی قەرز کرد و بەو پارەیە قاپوتی بۆ سەربازەکانی پێکڕی.

١٠- بەپێی پەیماننامە نهێنییەکەی ٤ ی حوزەیرانی ساڵی١٨٧٨ ، تورکیا دورگەی قوبرس-ی دایە بەریتانیا و لە بەرامبەر ئەمەدا بەریتانیا بەڵێنی بە تورکیادا کە بەرەنگاری هەموو ئەو هەڕەشانە ببێتەوە کە لەلایەن ڕووسیاوە دەکرێنە سەر ویلایەتە ئاسیاییەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا.

١١- هاوکات لە گەڵ ئەمەدا، فەرەنساش بە ڕەزامەندیی بەریتانیا بە پێی پەیمانی «برادۆ» کە لە ١٢ ی ئایاری ساڵی ١٨٨١ بەسترا،تونس-ی کە بەیەکێک لە ویلایەتەکانی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی لە قەڵەم دەدرا، خستە ژێر پارێزگاری خۆیەوە.

١٢- عەبدولهادی سەرۆکی یەکێ لە تەریقەتەکانی رەفاعیيەی حەلەب بوو کە لە ئەستەمبوڵ خانەقای هەبوو.
١٣- بکوژ دانی بەوە دانابوو کە بەنیاز بووە ئۆمبێرتۆی پاشای ئیتالیا بکوژێ، بەڵام لەبەر ئەوەی نەیتوانی بوو (٥٠) لیرەی پێویست بۆ کرینی بلیتی شەمەندەفەری تارم دابین بکات، ناچار ئەلیزابێتی کوشتبوو.
١٤-سەیر لەوەدایە کە سێ مانگ بەر لەو رووداوە، لە ئێرانیش محەمەد عەلی شای قاجارو لە ١٦ ی تەمموزی ساڵی١٩٠٩لە سەڵتەنەت وەلاوەنرا و رەوانەی رووسیا کرا.
١٥-بەشێکی گرنگ لەو پارانە بەر لەوەی کە عەبدولحەمید لە ٢ی شوباتی ساڵی١٩١٨ دا کۆچی دوایی بکات، گەرێندرانەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام هەرگیز بە تەواوەتی نهێنی داراییەکانی خۆی ئاشکرا نەکرد؛ چونکە دەیزانی پاراستنی ئەم نهێنییە دەبێتە هۆی پاراستنی گیانی.

## فەسلی سێزدەهەم

### سێیانەی ناپیرۆز

لەکاتێکدا کە تورکە لاوەکان کوێرکوێرانە هەنگاوی لەرزۆکیان بەرەو دیموکراتیەتێک دەنا کە بۆ خەڵکی تورکیا نامۆ بوو، سێ کەس چارەنووسی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییان گرتبۆ دەست کەشیاوە بە «سێیانەی ناپیرۆز» نێویان بهێنین. ئەو سێ کەسە، تەلعەت و جەمال و ئەنوەر بوون کە بوونەهۆی ئەوەی ئەو خەونە خۆشەی کە دەستی پێکردبوو لەمیللەت ببێ بە مۆتەکەو بۆخۆشیان لە غەریبی و لە وڵاتی دوورە دەستدا، سەربنێنەوە.
تەلعەت ئەو پیاوەبوو کە لەنێوان ساڵانی ١٩٠٨ تا ١٩١٨ جڵەوی دەسەڵاتی کۆمیتەی ئیتیحادوتەرەقی بەدەستەوەبوو و، لە هەموو ڕوویەکەوە سەرۆکی حزبەکەبوو. تەلعەت پیاوێکی کەتەی نارێک بوو کە کاتێ هێنری مۆرگنتاو-ی باڵیۆزی ئەمەریکا بۆ یەکەمجار چاوی پێکەوت، بەبینینی بەژن و باڵاو قۆڵ و مەچەکی کە دوو بەرابەری قۆڵ و مەچەکی خەڵکی ئاسایی بوون، تووشی سەرسوڕمان بوو.
تەلعەت حەزی لێبوو بە هەموو کەس بڵێ لە نێو خەڵکەوە هەڵقوڵاوەو کوڕی خەڵکە، لەتەمەنی لاویەتی دا تەلگرافچی بووەو ئێستاش لە پۆستی وەزارەتی نێوخۆدا دەتوانێ زۆربەباشی کاروباری وڵات بەڕێوەبەرێت.
ژیانێکی ساکارو تەنانەت هەژارانەشی هەبوو و، لەخانوویەکی بچوکدا دەژیا. خانووی دەسەڵاتدارترین پیاوی نێو ئیمپراتۆرییەت لە کۆتایی کۆڵانێکی تەنگەبەردابوو کە کەمێک لە خانووی هەژارەکان گەورەتربوو. لەمڕووەوە کاتێ باڵیۆزی ئەمەریکا لەپڕو بەبێ ئەوەی پێشتر ڕایگەیاندبێ کەسەردانی دەکات، چووە ماڵی تەلعەت، بردیانە ژوورێک کە کەلوپەلێکی کەم و هەزاران بەهای تێدابوو و داوی فەرشە ڕاخراوەکان بەدەرەوەبوو. ئینجا تەلعەت بەگاڵەگاڵەوەو لەکاتێکدا کە شمکی لە پێدابوو و بێجامەیەکی خۆڵەمێشی ڕەنگی پۆشیبوو و فینەیەکی سووری لەسەربوو، هاتە پێشوازیی میوانەکەی.
تەڵعەت کابرایەکی دڵڕەق بوو، بەڵام دەیتوانی ئەم دڵڕەقییەی خۆی لەژێر دەمامکی سادەیی و ڕووخۆشیدا حەشار بدات، وەکو ورچێکی گەورە کە لە مرۆڤ نزیک دەبێتەوەو ڕەفتارێکی دۆستانەی هەیە، بەڵام لە هەمانکاتدا دەبێ ئاگاداری خۆت بی نەوەکا پەلامارت بدات.
بەڵام جەمال بەگی فەرماندەی سەربازیی قوستەنتەنییەو وەزیری دەریاوانی، بەهیچ شێوەیەک هەوڵی شاردنەوەی هەستەکانی خۆی نەدەدا؛ مەشرووبی زۆر

دەخواردەوە، قەت لە قومار بێزارنەدەبوو و زۆربەی کاتەکانی پشووی خۆی لەسەر مێزی قومارکردن و لە «یانەی ڕۆژهەلات-Le Cerele dorient » دا، دەربردە سەر.

چاوەڕەش و تیژەکانی وەک چاوی شاهین وابوون و مووەڕەش و درێژەکانی ریشی، کاریان لەبینەر دەکرد. جارێکیان کە لەگەڵ هارۆڵد نیکلسۆن-ی باڵیۆزی بەریتانیا لە باڵیۆزخانەی بەریتانیادا نانی ئێوارەی دەخوارد، سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانە کە لە لاوێکی ئینگلیزی بوو، سەبارەت بە ڕووخسارو شێوەی جەمال نووسیویەتی: *«کەوتمە ژێر کاریگەرییەتی ددانە سپییەکانی کە وەک ددانی بەور وابوون و لەنێو ڕیشەکەیدا زۆر شاهیک بوون.»*

ئەنوەر بەگ، جیاوازییەکی تەواوی لەگەڵ ئەم دوو کەسەی پێشوودا هەبوو. کاتێ کە بۆ لادانی عەبدولحەمید هێرشی کردە سەر سەربازگەی قوستەنتەنییە تەنیا ٢٧ ساڵی تەمەن بوو و خەڵک زۆریان خۆش دەویست.

هەموان وەکو سەربازێکی ئازاو نەبەردی نێو بەرەکانی جەنگ دەیانناسی. چاوەجوانەکانی و ئەو جلە وتووکراوانەی کە دەیپۆشین و تەنانەت گنجێکیان تێیاندانەبوو، وایکردبوو هەندێ کەس بەپیاوێکی ژنانیلەی بزانن. بەدەستە ناسک و سپییەکانی کەمانچەی لێدەداو دوای سەردانی ئەڵمانیا و ماوەیەک ڕابواردن لەوناوە، سمێڵەکانی خۆی وەک سمێڵەکانی ویلهۆڵمی دووەم، بەرەو سەربادەدا.

کاتێ ئەنوەر بوو بە وەزیری جەنگ، وێنەیەکی فرێدریکی مەزن و ێنەیەکی ناپلیۆنی بەدیواری ژوورەکەیەوە هەڵواسی و لەناوەڕاستی ئەوانیشەوە وینەیەکی خۆی هەڵواسی. لەمڕووەوە برادەرەکانی پێیان دەگوت: *«ناپلیۆن لیک»* کە بەمانای ناپلیۆنی بچووک بوو. زۆر زەحمەتە مرۆڤ بڕوا بەوە بکات کە ئەنوەر قۆناغی منداڵیی خۆی بەسەختی گوزەراندووەو دایکی مردوو شۆڕبووە، بەلام لە نێو ئەو سێ سەرکردەیەدا، ئەنوەر خاوەنی ئاڵۆزترین و پڕ لە نهێنی ترین کەسایەتی بوو. پیاوێکی لەخۆبایی و بۆش بوو و ئەو دوو خەسڵەتەی خۆیشی لەژێر دەمامکی شەرمنیدا حەشار دابوو. پڕ جموجۆڵ بوو، بەلام لە هیچ کارێکدا پەلەی نەدەکردو هەمیشە بەهێوری هەنگاوی دەنا. جۆرە فریودەراتییەکی شەرمنانەی هەبوو، بەشێوەیەک کە ئالێن مۆرهد، لە کتێبی *«گالیپۆلی»* دا نووسیویەتی: *«خۆشەویستیی لەنێو ئافرەتاندا جێی سەرسوڕمان نییە؛ چونکە قارەمانێکی ئازاو لاوێکی بەژن و زراف و ڕێک بوو، بەلام هەموو ئەوانە پەردەیەک بوون بۆ دڵڕەقی و خۆپەرستییەکەی.»*

لەسەرەتادا ئەنوەر وەک «قارەمانی شۆڕش» هەراو هۆریای زۆ لەدووو بوو، بەلام پێ دەچوو ئەم پیاوە پڕ جموجۆڵە، هەستێکی دەروونی شاراوەی تێدایە کە وایلێدەکات لەکاتی پێویستیدا لە شوێنی پێویست بێت، بەتایبەتی کاتێک کە پلانی تورکە لاوەکان شکستی دەهێنا و خەونەکانیان نەدەهاتە دی.(١)

لەساڵی ١٩١١ (١٣٢٩ی کۆچی) کە ئیتالیاییەکان لە هیچ و خۆڕایی هێرشیان کردە سەر تەرابلۆسی ڕۆژئاوا (لیبیای ئێستا) کە یەکێک بوو لە ویلایەتەکانی

ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی  لە باکووری ئەفەریقا، ئەنوەریەکەم کەس بوو کە بەپەلە کارەکانی خۆی لەبەرلین بەنیوەچڵی بەجێ هێشت و بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا خۆی گەیاندە (بەنغازی) و لەوێشەوە چووە بەرەی جەنگی بالکان. لەجەنگی بالکاندا، کۆنەدوژمنەکانی تورکیا کە تا ئەودەمە بەهۆی ناکۆکییەوە لێک دابڕابوون، لەدژی تورکیا کە دوژمنی هاوبەشیان بوو، دەستیان خستە نێو دەستی یەکدی و تورکەلاوەکان ناچاربوون لەیەککاتدا بەرەوڕووی سرب، بولغار، یۆنانی و مۆنتنیگرۆییەکان ببنەوە. هاوپەیمانانی نێوبراو هێرشیان کردە سەر خاکی عوسمانی و ئەدیرنەیان داگیر کردو تەنانەت ڕەتڵێکی سوپاکەیان گەیشتە سەنگەرەکانی چاتالیا کە لە نزیک قوستەنتەنییە بوو.

کاتێک کە وڵاتانی ئەوروپایی لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٣ (صفر-ی ١٣٢١ی کۆچی) پێشنیازی کۆتایی هاتنی شەڕیان پێشکەشی تورکیا کرد، کە بە پێی ئەو پێشنیازە ئەدیرنە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی جیا دەکرایەوە، بۆ جارێکی ئەنوەر هاتەوە مەیدان و هەندێ کاری سەیرو سەمەرەی ئەنجامدا. بەڕای تورکەکان کە سەریان لە شکستە یەک بەدوای یەکەکانی سوپاکەیان سوڕمابوو، هەموو شتێک لە دەست چوو بوو و، تەنانەت نازم پاشای وەزیری ناحزبیی جەنگیان بۆ دانوستان ڕاسپاردبوو، بەڵام ئەنوەر لەگەڵ ئەم بڕیارەدا نەبوو.

لەکاتێکدا کە لەکۆشکی وەزارەتی دەرەوەدا نوێنەرانی هەردوولا لە تورک و ئەوروپاییەکان خەریکی دانوستان و چۆنیەتی کۆتایی پێ هێنانی شەڕبوون، ئەنوەر بەرتیلی دایە ئەو ئەفسەرەی کە ئەرکی پارێزگاری کردنی شوێنی کۆنفرانسەکەی لە ئەستۆبوو و، بەم پێیە ئەفسەرەکە بەمەبەستی پشووودان، بۆماوەی ڕۆژێک مۆڵەتی وەرگرت. دارودەستەکەی ئەنوەر لە قاوەخانەکانی دەوروبەری شوێنی کۆنفرانسەکە بە چاخواردن و قاوەخواردنەوەوە خەریک بوون و بڕیاریان وابوو هەر کە ئەنوەر ئیشارەتی دانێ، ئەوان ئاڵاکانیان کە لە ژێر جلەکانیان حەشاریان دابوون دەرهێنن و، هێرش ببەنە سەر وەزارەتی دەرەوە.

دەوڵەتی تورکیا بە هیچ شێوەیەک ئاگای لەو بەزمە نەبوو تا ئەو دەمەی کە ئەنوەر لە پڕێکا خۆی بە کۆشکی وەزارتی دەرەوەدا کردو بەیەک ئیشارەتی ئەو، دەیانکەس کە خەریکی قاوەخواردنەوەبوون، دەمانچەکانیان دەرهێناو بەئاڵای سوورەوە کە ئایەتی قورئانیان لەسەر نووسرابوو، هاودەنگ لەگەڵ ئەنوەر هاواریان دەکرد:«*بمرێ دەوڵەت*» و «*ئێمە ئەدیرنە لەدەست نادەین*» و، لە قاڵدرمەکانی کۆشک سەرکەوتن. لەدەرەوەی کۆشکیش نزیکەی ٥ سەد کەسێک لە لایەنگرانی ئەنوەر درووشمیان دەداو بەیاننامەیان بڵاو دەکردەوە.

هێشتا نوێنەرانی ئامادەبووی دانوستانەکان ئاگایان لە ڕووداوەکان نەبوو. ئەنوەر داوای لە پارێزەرانی هۆڵی کۆنفرانسەکە کرد کە ڕێگەی چوونە ژوورەوەیان پێ بدرێ، بەڵام یەکێ لە ئەفسەرەکان زۆر بێ عەقڵانە دەمانچەی ڕاکێشا و تەقەیەکی لە خۆپیشاندەران کرد و بەم کارەی فرمانی مەرگی خۆی ئیمزا کرد؛ چونکە دەستبەجێ ئەنوەر کابرای ئەفسەری کوشت.

لەو کاتەدا، دەنگی خۆپێشاندەران و درووشمەکانیان بەرگوێی ئامادەبووانی کۆنفرانسەکە کەوتبوو، بەڵام دیارنەبوو ئاخۆ دەنگی گوللەکەشیان گوێ لێ ببوو یان نا؟ نازم پاشا لە کاتێکدا کە جگەرەیەکی بەلالێوەوە بوو، لەهۆڵی کۆنفرانسەکە هاتەدەرو بە خۆشحاڵییەوە گوتی: «*کوڕینە بێدەنگ بن، ئەم هەراو هۆریایەتان لە چیە؟ بۆ نازانن بەم کارەتان دانوستانەکانی ئێمە تێک دەدەن؟*»

ئەمە دوا رستەبوو کە لە دەمی وەزیری جەنگ دەردەچوو؛ چونکە دەستبەجێ ئەنوەر، یان یەکێ لە داروەدستەکەی کوشتیان. ئینجا ئەنوەر چووە ژووری کۆنفرانسەکەو بەچەک هەڕەشەی لە سەرۆک وەزیر کرد و سەرۆک وەزیری ناچارکرد دەست لەکاربکێشێتەوە.

ئەنوەر لە کاتێکدا کە لوولەی دەمانچەکەی خۆی لەسەر کەلەکەی سەرۆک وەزیران دانابوو، بەسەریدا قیژاند: «*ئێمە بۆ ڕزگاریی ئەدیرنە، بەبێ دوودڵی وەزیری جەنگمان کوشت، کەواتا بۆچی لە کوشتنی ئێوە نارەحەت ببین؟*»

بەبیستنی ئەم قسانە چیدی پیرەمێرد نارەزایەتی دەرنەبڕی و ئەنوەر کۆنفرانسەکەی هەڵوەشاندەوەو سودی لەو دەرفەتە وەرگرت تا سوپا پاکسازی بکات.

ئەنوەر وەک جاران و بەشێوەیەکی نمایشی دەستی دایە ئەم کارەو لەماوەی یەکرۆژدا، (١٢٠٠) ئەفسەری لە سوپا وەدەرنا. هەرچەند بەکردەوە ئەنوەر وەزارەتی جەنگی بەدەستەوەبوو، بەڵام ئەو تینووی کاروکردەوە بوو و نەیدەتوانی لە پشت دەرگای داخراوی ژوورەکاندا دانیشێت. بۆیە بەپەلە گەڕایەوە بەرەی شەڕو توانی پاشەکشێ بە دوژمن بکات و شاری ئەدیرنەش ئازاد بکات.

کاتێ بەسەرکەوتوویی دەگەڕایەوە قوستەنتەنییە، خەڵک ڕێگەی گەڕانەوەییان بەگوڵ داپۆشیبوو و بەسەدان هەزار کەس لە دانیشتوانی قوستەنتەنییە بۆ دیتنی ئەم قارەمانەلاوە، لەسەربانی ماڵەکانیان وەستابوون. ئەنوەر کچی سوڵتان ڕەشادی خواست و نازناوی پاشای درایێ و لە کۆشکێکی پڕشکۆدا جێگیربوو کە بەدەیان خزمەتکارو دەرگەوان و پاسەوانی هەبوو. یەکێ لە برادەرەکانی دەیگوت: «*خـوا ئەنوەر پاشا بگرێ کە ئەنوەرە نازدارەکەی ئێمەی لەنێو برد.*»

* * *

دەردەسەریی تورکەلاوەکان لەسەرەتای دەستبەکاربوونیان ئەوەبوو کە ئارەزوو و ئامانجە سەرەکییەکانیان کە ساڵانێکی درێژبوو خەباتیان بۆ دەکردن و لە پێناویاندا دەجەنگان، لە گێژووڵەکەی ئەو ڕووداوە نەخوازراوانەیدا کە دواتر هاتنە ئاراوە، ون بوون و مەیلی نەتەوە پەرستیی خەڵک بووە هۆی ئەوەی کە ئارەزووی ئەوان بۆ یەکسانیی تەواوی ڕەگەزو نەژادو کەمایەتیەکانی نێو ئیمپڕاتۆرییەت، وەک بڵقی سەرئاوی لێ بێت. تەلعەت ناچاربوو پاش ماوەیەک ئەو ڕاستییە قەبوڵ بکات و بڵێ: «*مادام نەمانتوانی ئەرکی بە عوسمانی کردنی ئیمپڕاتۆرییەت جێبەجێ بکەین، نابێ باس لە یەکسانیی نەژادەکانیش بکەین.*» باڵیۆزی بەریتانیا سەبارەت بەو قسانەی تەلعەت، لەڕاپۆرتێکی نهێنیدا نووسیویەتی: «*لە ڕوانگە ئەوانەوە عوسمانی واتا*

*تورک و، سیاسەتی عوسمانی کردنیش مانای ئەوەیە کە نەژادە غەیرە تورکەکان لەنێو ئاونگی تورکەکاندا بکوتن و لەنێویان ببەن.»*

سیاسەتی نێوبراو سەرەتا بە بڵاوکردنەوە زنجیرەیەک بەیاننامە، فرمانی بێ مانا و گومڕاکار دەستی پێکرد. لەشەو و ڕۆژێکدا هەموو ئەو هێماو نووسینانەی کە چەندین ساڵ بوو بەزمانی فەرەنسایی لەژێر نووسینە تورکییەکان و لە کوچەو شەقامەکاندا نوسرابوون، سڕانەوەو ئەو بیانییانەی کە ئەودەم ژمارەیان لە تورکیا زیادی کردبوو، بەرەوڕووی کۆمەڵێ نووسین و هێمای ئەوتۆ بوونەوە کە هیچیان لێ تێ نەدەگەیشتن. بەڵام هەر لەو کاتەیدا کە بەڕێوەبەرایەتییە دەوڵەتییەکان بە سڕینەوەی نووسینی *«بێگانە کافرەکان»*ەوە خەریکبوون، نووسەرانی وەک عەبدوڵڵا چردەت، سوودیان لە ئازادیی ساوای ڕۆژنامەوانی وەردەگرت و دەیاننووسی: *«شارستانیەت، شارستانیەتی ئەوروپاییە و، دەبێ کاتێ وەریدەگرین گوڵ و دڕکەکەی بەیەکەوە وەرگرین و بیهێنینە نێو وڵاتەوە.»*

جاری وا هەیە *«هێنانی شارستانیەتی ئەوروپایی»* بۆ نێو وڵاتێک، هەندێ شتی گاڵتەجاڕی لێدەکەوێتەوە. هەروەک ئیسماعیل حامی-ی نووسەری تورک دەنووسێ: *«لەیەک کاتدا، بەهێنانی یۆنیفۆرمە سەربازییە ڕووسیاییەکان، تفەنگە بەلژیکاییەکان، شاڵە یۆنانیەکان، ئەسپە مەجەرییەکان، شمشێرە ئینگلیزییەکان و ڕاهێنانە سەربازییە فەرەنساییەکان، سوپایەکمان پێکهێناوە کە لاسایی کردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەی تێکڕای سوپا ئەوروپاییەکانە.»*

مارک سایکس-ی دیپلۆماتی ئینگلیزی کە لە ساڵی ١٩١٣(١٣٣١ی کۆچی) سەردانی قوستەنتەنییەی کردووە، ئەم گۆڕانکارییانەی هیچ بەدڵ نەبووە، بۆیە لەو بارەیەوە نووسیویەتی: *«لەوەتەی مەشروطییەت ڕاگەیاندراوە، چەندین جار سەردانی قوستەنتەنییەم کردووەو ئێستا لەو بارودۆخەی کە دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ بەسەر پێشکەوتنە دەبەنگانەکان، پیلانگێڕییە گلاوەکان، بیروبۆچوونی توندڕەوانەی توندوتیژ، خەراپەکاریی بێ مانا، کاردی دزێو، ناسەقامگیری، شەڕو ئاگرکەوتنەوە لەم شارەدا هاتۆتە ئاراوە، تووشی سەرسوڕمان بوومە. هەندێ گۆڕانی ڕووکەش ڕوویداوە؛ کوچەکان خاوێنترو شەقام و جادەکان باشتر بوونە، ژمارەی سەگە بەرەڵلایەکان کەمتربۆتەوەو بڵاوبوونەوەی نەخۆشی وەستاوە، بەڵام بەرلەوەی لە تورکیا مەشروطییەت بکەوێتە کار، کەس نانی لە جیرانەکەی خۆی قەرز نەدەکرد. لەکاتێکدا کە ئێستا ژمارەی هەزاران بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر زیادی کردووە.»*

لەساڵی ١٩١٣ (١٣٣١ی کۆچی)، دوای پێنج ساڵ گیروگرفتی ڕوو لەزیادبوون، شەڕو نائارامیی نێو خۆیی، ئامانجە سەرەتاییەکانی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی هەر ناویشیان نەمابوو. دەوڵەت کە لە بارودۆخی ئاساییشدا، لەرزۆک و بێ هێز بوو، ئێستاکە وەک ناوێکی گەورەو شارێکی وێرانی لێهاتبوو و ئەنوەرو تەلعەت لەپێناو بوون و ئایندەی سیاسییان دەستیان دابووە خەباتێکی بێ وچان و لەم پێناوەشدا لەبری دەزگا سیخوڕییەکەی عەبدولحەمید، دەزگای بێڕەحم و دڵڕەقی حزبیان بە قازانجی خۆیان بەکاردێنا.

لەو ساڵانەداو تا ئەو کاتەی کە سەڵتەنەت و پاشایەتی پوچەڵ کرایەوە، بە کردەوە سوڵتان هیچ ڕۆڵێکی لەبەڕێوەبردنی وڵاتدا نەبوو و هەر بەنێو سوڵتان بوو. ڕەنگبێ ئەگەر سوڵتان کەمێک لێهاتوویی و ئیرادەو توانای تێدابایە، بیتوانیایە تاڕادەیەک جڵەوی دەسەڵات بگرێتە دەست، بەڵام محەمەدی پێنجەم کەسێک بوو کە ٣٥ ساڵی تەمەنی خۆی لە ژێر چاودێریی عەبدولحەمیددا بردبۆ سەرو، لەو ماوەیەدا مافی ئەوەی نەبوو تاقە برادەرێکی هەبێ و ڕۆژنامەیەکیشی نەخوێندبۆوە.

تەنانەت خزمەتکارەکانیشی سیخوڕییەتیان لەسەردەکردو ئەمەش وایکرد کە محەمەد زۆربەی کاتی خۆی لەحەرەمسەرادا بەسەر بەرێت و بەڕابواردن لەگەڵ ئافرەتانەدا خەریک بێت. ئەگەرچی دوای دانیشتنی لەسەر تەختی سەڵتەنەت بەڕووخسار گۆڕابوو و شێوەی ژیانی گۆڕانی بەسەرداهاتبوو، بەڵام لەڕاستیدا تاکە شتێک کە گۆڕابوو ئەوەبوو کە لەبری ئەوەی زینداني عەبدولحەمید بێت، ببووە زیندانیی تورکە لاوەکان. لەکتێبی *«دیوی ناوەوەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست»* دا، بەم شێوەیە باس لەو پیرەمێردە بەستەزمانە کراوە:

*«سەرو شکڵی محەمەد پێنجەم ئەوە دەردەخات کە خاوەن کەسایەتییەکی بێ بایەخە، کابرایەکی وردیلەی چەماوەیە کە چاوی لە قوڵایی دانە و بێگومان گنج و لۆچی دەموچاوی قەڵەوی و زەردیی پێستی لەشی، نیشانەی ئەوەن کە نەخۆشە. لە کۆی گشتیدا بەهیچ شێوەیەک کار ناکاتە سەر مرۆڤ. دەموچاوی بچوکترین هێمای ئەوەی تێدابەدی ناکرێت کە کابرایەکی ژیرو زیرەک بێت. بەردەوام هەست بە نیگرانی دەکات و دەڵێی وا هەست دەکا یەکێک خۆی لێ لەمەتەرێزناوە تا هێرشی بکاتە سەرو بیکوژێت.»*

محەمەد ڕەشاد بەهیچ جۆرێک بەشداریی لەو پیلانەدا نەبوو کە بووەهۆی لادان و دوورخستنەوەی براکەی، بەڵام ترسی مردن و کوژران ژیانی لێ تاڵ کردبوو و، بەهیچ شێوەیەک نەیدەتوانی خۆی لەدەست ئەم ترسە ڕزگار بکات.

بەقەولی ئۆرسلی: *«سیمای ئەم سوڵتانە دارزاوە، باشتر لە هەموو قسەو گوتارێک ئەوەی دەردەخست کە تا چ ڕادەیەک نەژادی بوغرای عوسمانی کەوتوونەتە سەراولێژیی نەمان و لەنێوچوونەوە. ڕەنگبێ ئەو کەسە ژیرانەی کە سەرکردایەتیی شۆڕشیان دەکرد، زانیبوویان کە ئەگەر کەسێکی وەکو محەمەد ڕەشاد وەک سوڵتانێکی بۆش و بەتاڵ بخەنە لوتکەی ئیمپراتۆرییەتەوە، زۆرباشتر لە کەسێکی بە ئیرادە و بە توانا، بۆ گەیشتن بە مەرامەکانیان یارمەتیدەریان دەبێت.»*

گرفتێکی دیکەش هەبوو کە چارەسەر نەدەکرا، دزەکردنی هێمن و ئارامی ئەڵمانییەکان کە لە چەندین ساڵ پێشترەوە دەستی پێکردبوو، ئێستاکە وابەروبوومی دەداو ئەویش پتر لە شێوەی سەربازیدابوو.

ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا، سەرمایەیەکی باشی لە بوارەکانی دروستکردنی هێڵی شەمەندەفەری بەغدا، گواستنەوەی نێوان شارەکان، کارەبا، کانەکان و کشتوکاڵدا بەگەڕخستبوو. کۆمپانیا زەبەلاحەکانی کروپ و ماوزەر، هەندێ لقیان لە قوستەنتەنییە کردبۆوە. سێ بانکی گەورەی ئەڵمانیایی، لە پایتەختی عوسمانیدا

خەریکی ئاڵووێر بوون و کاروباریان لە چاو ڕکابەرە ئەوروپاییەکانیان پڕ ڕەونەقتربوو. وردە وردە کە جەنگی جیهانی یەکەم نزیک دەبۆوە، ئەنوەر بەتەواوەتی توشی مەکینە جەنگییەکەی ئەڵمانیا و بەتایبەتیش گیرۆدەی مەراییە بەردەوامەکانی قەیسەر ویلهۆلم دەبوو. بەهەزاران ئەڵمانیایی لە شەقام و کۆڵانەکانی قوستەنتەنییەدا دەبیندران کە هەموو شەوێ بارو یانەکانی ئەوێیان پڕ دەکردو، ڕۆژانی یەکشەممەش بە بەلەمەوانی لەنێو بسفۆردا خەریک دەبوون. ئەو خەڵکانە گەڕیدەنەبوون، بگرە کۆمەڵێک پسپۆڕی ئەڵمانیایی بوون کە لەگەڵ نزیکبوونەوەی هاوینی گەرمی ساڵی ١٩١٤ (١٣٣٢ی کۆچی) دا، بە پەلە مەشقیان بە سوپای تورکیا دەکردو سەر لەنوێ ڕێکیان دەخستەوە.

ئەڵبەتە تەواوی ئەندامانی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی لەگەڵ ئەوەدا نەبوون کە ئەڵمانیاییەکان بەوشێوەیە لە تورکیا کاربکەن و بگرە دژی هاتنی ئەڵمانیاییەکان بوون، بەتایبەت تەلعەت کە زۆر لە هاتنیان بە گومان بوو. هەروەها هەندێ لە کۆنە سیاسەتمەدارەکان لەو باوەڕەدابوون کە ئەگەر هاتوو شەڕ ڕوویدا ئەوا ئەڵمانیاییەکان دەرەقەتی روسیا و فەرەنسا و ئینگلیزەکان نایەن و لەمڕووەوە پێیان وابوو کە دەبێ بەپارێزەوە هەنگاو بنێردرێت و دەیانگوت باشتر وایە سیاسەتی سەبرو چاوەڕوانی بگرینە بەر بۆئەوەی ئەگەر هاتوو شەڕ دەستی پێکرد، بتوانین خزمەت و پشتگیریی خۆمان بخەینە مەزایەدەوە و وەک چۆن لە بازاڕەکان زیاد کردن لەسەر نرخ هەیە ئاواش ئێمە کێ نرخێکی پتری پێدایین، ڕوو لەو بکەین.

بەڵام ئەنوەر کە زمانی ئەڵمانی دەزانی و ئێستا وەزیری جەنگ بوو، دەیتوانی بەنهێنی لە ژێرەوە بە قازانجی ئەڵمانیاییەکان کار بکات، هەرچەندە کە هەوڵی ئەوەی دەدا بۆچوون و ویستەکانی خۆی لە دیپلۆماتە بیانییەکان بشارێتەوە، هەروەک چۆن بە باڵیۆزی ئەمەریکای گوتبوو: «*تورک و ئەڵمانەکان ئێندە کەیفیان بەیەکدی نایەت. ئێمە بۆیە لەگەڵیاندایین*، چونکە بەرژەوەندییەکانمان *وا دەخوازێ و ئەوانیش تا ئەو ڕۆژە پشتیوانمانن کە بەرژەوەندییان بخوازێ. ئەڵمانیا تا ئەو جێگەیەی کە بزانێ تورکیا یارمەتیی دەدا، پشتیوانی لێ دەکات و تورکیاش تا ئەو کاتە پشتیوانی لە ئەڵمانیا دەکات کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا بگونجێت.*»

مەیلی ئەنوەر بەلای ئەڵمانیادا، فاکتۆرێکی کاریگەربوو بۆ نزیک کردنەوەی ئەڵمانیا و تورکیا لە یەکتری. بەڵام ئەگەر بهاتایە و دیپلۆماسییەتی هاوپەیمانان بایی ئەوەندە لێوەشاوەیی تێدابوایە کە بیتوانیبا بەرگەی هێرشەکانی بارۆن فۆن وانگهایمی باڵیۆزی ئەڵمانیا لە قوستەنتەنییە بگرێ و بەرپەرچیان بداتەوە، ئەوا ڕەنگبێ بیتوانیبایە کاریگەرییەتی ئەم نزیکییە کەم بکاتەوە. باڵیۆزی ئەڵمانیا دۆستی دێرینی قەیسەری ئەڵمانیابوو و بە بەردەوام هاتوچۆی ڤێلا هاوینییەکەی قەیسەری دەکرد.

فۆن وانگهایم، کابرایەکی کەتەی چوار شانەبوو کە بوغرایی لێدەباری و، پتر لە کاریکاتێری ئەو ئەرستۆکراتە پرووسییانە دەچوو کە چاویلکەیەکی یەک چاویان لەچاو دەکرد.

ئەو کە ئاگای لەوە بوو کە ئەڵمانیا خۆی بۆ جەنگ ئامادە دەکات، ئەمەش لە دانوستانەکاندا بۆی بەخاڵێک لە قەڵەم دەدرا لەبەرامبەر باڵیۆزەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و روسیادا کە پێیان وابوو ڕوودانی شەڕێکی ئەوروپایی مەحاڵە. هەروەها باڵیۆزی وڵاتانی هاوپەیمان بە چاوێکی بچوکەوە سەیری ئەو تورکە لاوانایەیان دەکردو پێیان وابوو بەزۆر دەسەڵاتی سوڵتانیان داگیرکردووە، بەشێوەیەک کە مۆرگنتاو-ی باڵیۆزی ئەمەریکا نووسیویەتی: *«زۆر بە باشی دیارە کە باڵیۆزی هاوپەیمانان، ڕژێمەکەی ئەنوەرو تەلعەتیان پێ هەمیشەیی و هەتاسەر نییەو پێیان وایە بایی ئەوەندە نین کە دانووستانیان لەگەڵدا بکەن.»*

بوغرایی و خۆبەزل زانینی کۆنە دیپلۆماتەکان لەبەرامبەر ئەو لاوانەی تازەهاتبوونە گۆڕەپانی سیاسەت و بەڕێوەبردنی وڵاتەوە، لەژێر کاریگەرییەتی شومی یەکێ لە ئەندامانی باڵیۆزخانەی بەریتانیا کە پۆستێکی گرنگی هەبوو و لەڕادەبەدەر دژایەتی تورکە لاوەکانی دەکرد، ڕۆژبەڕۆژ پتر بەدیار دەکەوت. ئەو کابرایە نێوی فیتزمۆریس بوو کە بەر لەدەست پێ بوونی شەڕ، تامس لاورنس کە ئەویش بە لاورنس-ی عەرەبستان بەنێوبانگ بوو، لە قوستەنتەنییە دیبووی و دواتر ئاوای لەبارەوە نووسیبوو: *«من ئۆباڵی بەشێک لە بێ توانایی سیاسەتی خۆم دەخەمە ئەستۆی فیتزمۆریسەوە کە سکرتێری بەشی ڕۆژهەڵاتی باڵیۆزخانەی بەریتانیاو لە هەمانکاتدا کابرایەکی مێشک چکۆلەی، لاسارو بە ئیرادەبوو. نیوەی تەمەنی خۆی لە تورکیا بەسەربردبوو و ئەرکی پەیوەندیی باڵیۆزخانە لەگەڵ کاربەدەستانی ناوچەیی لە ئەستۆی ئەوبوو. زانیارییەکی زۆری لە بارەی تورکیا هەبوو و، هەروەها بە بەردەوام لە تورکەکان دەترسا و لەڕادەبەدەر ڕقی لە یەهودی و فەرمەسۆنەکان دەبۆوەو ئەوەش لەکاتێکدابوو کە نیوەی ئەندامانی جوڵانەوەی تورکە لاوەکان لەژێر کاریگەرییەتی یەهودییەکاندا بوون و ٩٠٪یشیان فەرمەسۆن بوون. لەمرووەوە فیتزمۆریس بەشەیتانی سەر زەوی لە قەڵەم دەدان و لە هەوڵی ئەوەدابوو کە دەوڵەتی بەریتانیا ناچار بکات پشتیوانی لە سوڵتانی بێ دەسەڵات و تاقم و دەستەی دەربار بکات، بەڵام کاریگەرییەتی و نفوزی ئەم کابرایە بەڕادەیەک بوو کە باڵیۆزو ئەندامانی وەزارەتی دەرەوە فرمانەکانیان جێبەجێ دەکردو سەر ئەنجام بەهۆی ئەم کاریگەرییەتییەوە، ئێمە هەموو جۆرە نزیکی و دۆستایەتییەکی تورکە لاوەکانمان ڕەت کردەوە و وەڵاممان نەدانەوە.»*

بەهەبوونی ڕاوێژکارێکی وەها دەبێ لەوە تێبگەین کەبۆچی کاتێ باڵیۆزی بەریتانیا هەواڵی کوژرانی ئارشیدۆک فرانتس فردینادی وەلیعادی ئۆتریش لەسەرایفۆ دەبیستێ، بایەخی پێ نادات و بەمۆڵەت دەگەڕێتەوە بەریتانیا.

لە دوایین ڕۆژکانی ئاشتی و ئارامیدا کە باڵیۆزی بەریتانیا لە قوستەنتەنییە نەبوو، فۆن وانگهایم ئەنوەری ناچارکرد پەیماننامەیەکی نهێنی لەگەڵدا مۆر بکات. ئەو داوای لە تورکیا نەکرد کە بێتە نێو شەڕەوەو بگرە بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ ڕووسەکاندا، پرۆژەیەکی ژیرانەتری خستەڕوو کە ئەویش بریتی بوو لەوەی کە تورکیا وەک وڵاتێکی بێلایەن ڕایبگەیەنێ کە بۆ دڵنیایی و خۆ بەدوورگرتن

تێوه‌نه‌گلانی له‌شه‌ڕ، له‌کاتی گونجاودا گه‌رووه‌کانی بسفۆرو داردانێل به‌سه‌ر هاتووچۆی ولاتانی شه‌ڕکه‌ردا داده‌خات و، له‌م کاره‌شیدا جیاوازی ناخاته نێوان هیچ کامیان.

ئه‌ڵمانیاییه‌کان له‌سه‌ره‌تادا پێیان وانه‌بوو که بتوانن به‌به‌ستنی ڕێگایه‌کی ئاوی که‌پانییه‌که‌ی سێ چوار کیلۆمه‌ترو درێژییه‌که‌ی سی کیلۆمه‌تر بوو، روسیا له هاوپه‌یمانانی دابڕن، به‌لام فۆن وانگهایم به‌بێ ئه‌وه‌ی ته‌نانه‌ت یه‌ک فیشه‌کیش بته‌قێنێ، توانی وابکات ڕێگای سه‌ره‌کی هاتوچۆی سه‌ربازو چه‌که ڕوسیاییه‌کان به‌ره‌و ڕۆژئاوا بپچڕێت و، ئه‌مه‌ش خۆی له خۆیدا سه‌رکه‌وتنێکی تاکتیکیی پله‌یه‌ک بوو.

ئه‌نوەر ڕه‌زامه‌ندی له‌سه‌ر ئه‌م پرۆژه‌یه دا، به‌لام ده‌بوو چۆنیه‌تی و ورده‌کارییه‌کانی له کۆبوونه‌وه‌ی کۆمیته‌ی ئیتیحادو ته‌ره‌قیدا بخاته‌ڕوو. بۆجارێکی دیکه‌ش ئه‌نوەر توانی به‌شێوازه تایبه‌تییه‌که‌ی خۆی ڕه‌زامه‌ندیی کۆمیته‌ی ئیتیحاد و ته‌ره‌قی به‌ده‌ست بێنێ، ئه‌ویش به‌وه‌ی که له کۆبوونه‌وه‌که‌دا، ده‌مانچه‌که‌ی به‌ر پشتی خۆی هه‌ڵکێشاو له‌به‌رده‌می خۆی دانا، ئینجا ڕووی قسه‌ی له هاوکارانی کردو گوتی: کێ قسه‌ی هه‌یه با بیکات!

ئاشکرایه که که‌س نه‌یوێرا دژایه‌تی ئه‌م بڕیاره بکات و، به‌م پێیه په‌یماننامه نهێنییه‌که‌ی نێوان ئه‌ڵمانیاو تورکیا به‌دوو ڕۆژ به‌ر له جه‌نگی جیهانی یه‌که‌م، ئیمزا کرا. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌گه‌ر ڕووداوێکی شووم ڕووی نه‌دابایه ئه‌وا دیسان تورکیا ده‌یتوانی خۆی له‌م شه‌ڕه کاولکاره به‌دوور بگرێ و بێلایه‌ن بمێنێ. ئالێن مۆرهێد له کتێبه به‌نێو بانگه‌که‌ی؛ گالیپۆلی دا نووسیویه‌تی: «*هێشتا ئه‌م په‌یمانه نهێنییه وای نه‌ده‌کرد که تورکیا بێته نێو شه‌ڕه‌و هه‌ستی گشتی خه‌ڵک دژی شه‌ڕو خوێنڕێژی بوو، به‌لام له‌و بارودۆخه پڕ له گرژییه‌ی دوا ساته‌کانی ئاشتی له ئه‌وروپادا، ڕووداوێک ڕوویدا که هه‌رچه‌نده هێنده‌ش پڕبایه‌خ نه‌بوو، به‌لام گۆڕانێکی وای درووست کرد که بووه هۆی ئه‌وه‌ی کاتێ گه‌ل و خه‌ڵکی ولاتێک کاردانه‌وه‌ی له‌به‌رامبه‌ردا له خۆ نیشان ده‌ده‌ن، بیر له داهاتوو نه‌که‌نه‌وه. ئه‌م ڕووداوه‌ش په‌یوه‌ست بوو به‌و دوو که‌شتییه جه‌نگییه‌ی که به‌ریتانیا بۆ تورکیای درووست ده‌کردن.*»

تورکیا، پێش چه‌ند مانگێک داوای له به‌ریتانیا کردبوو دوو که‌شتی سه‌ربازیی بۆ درووست بکات و بودجه‌ی ئه‌م کاره‌ش له ڕێگه‌ی هه‌ره‌وه‌زیی نیشتمانییه‌وه دابین کرابوو.

له ته‌نیشت هه‌موو مزگه‌وتێک و له‌سوچی هه‌موو شه‌قامێک، ته‌نانه‌ت له‌سه‌ر پردی گالاتا و له‌به‌رده‌می هه‌موو دوکانێکی لادێ و شاره‌کاندا، سندوقێک بۆ کۆکردنه‌وه‌ی پاره دانرابوو. خه‌ڵک ئه‌وه‌ی له‌ده‌ستی بهاتبایه ده‌یداو ته‌نانه‌ت ئافره‌تانی تورکیا که‌زییه‌کانی خۆیان بۆ یارمه‌تیدانی ئه‌م ئامانجه نیشتمانییه فرۆشت. ئه‌م دوو که‌شتییه جه‌نگییه‌ی که ناویان لێندرابوو سوڵتان عوسمان و ڕه‌شادییه، هی خه‌ڵکی تورکیا بوون، به پاره‌ی ئه‌وان دروستکرابوون و مه‌له‌وانه تورکه‌کان چووبوونه

بەریتانیا تا بیانهێننەوە بسفۆڕ. لە مانگی ئابی ساڵی ١٩١٤ (ذیقعدە–ی ١٣٣٢ی کۆچی)، کەشتی سوڵتان عوسمان ئامادەی ڕۆیشتن کرابوو و، بڕیار وابوو ڕەشادییەش تا چەند هەفتەیەکی دیکە ئامادە بکرێت.

لەو کاتە ڕووداوێک ڕوویدا کە چیوای لە تەقینەوەی بۆمبێک کەمتر نەبوو. ڕۆژی بەر لە ڕاگەیاندنی جەنگ، وینستۆن چێرچیڵ–ی لۆڕدی یەکەمی دەریاوانی بەریتانیا ڕایگەیاند: «*هێزی دەریایی بەریتانیا بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی نیشتمانی خۆی، دەستی بەسەر ئەو دوو کەشتییە جەنگییەدا گرتووە.*»

ڕەنگبێ چێرچیڵ هەستی بەوەکردبوو کە ئەنوەر لە پەیماننامە نهێنییەکەدا بەڵێنی ئەوەی بە فۆن وانگهایم دابوو کەوا لەکاتی ڕوودانی شەڕدا کەشتی جەنگیی سوڵتان عوسمان بنێرێتە یەکێک لە بەندەرەکانی ئەڵمانیا. (٢)

بەڵام ئەم کارەی چێرچیڵ هەستی نیشتمانیی تورکەکانی وروژاندو قین و نەفرەتیانی لەهەمبەر بەریتانیا پترکرد، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەلێکی زێڕینی خستەبەردەم فۆن وانگهایم.

لەکاتێکدا کە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە خەڵک لەسەر شەقامەکانی قوستەنتەنییە لەدژی ئەم کارەی بەریتانیا خۆپیشاندانیان سازدابوو و دەرگاو پەنجەرەی کۆمپانیا ئینگلیزییەکانیان دەشکاند، باڵیۆزی ئەڵمانیا چووە لای ئەنوەرو بەنێوی قەیسەری ئەڵمانیاوە پێشنیازێکی سەرسوڕهێنەری پێشکەشی بە ئەنوەر کرد؛ باڵیۆزی ئەڵمانیا پێشنیازی ئەوەی کرد کە لە بری ئەو دوو کەشتییە «ڕفێندراوە» ئینگلیزییە، دوو کەشتی جەنگیی ئەڵمانیا کە نێویان گۆبن و بریسلاف بوو و لەسەر دەریای سپی نێوەڕاست بوون، بدرێنە تورکیا.

بەلای تورکە لاوەکانەوە کە بەهۆی ئەو کارەساتەی لەلایەن بەریتانیاوە بەسەریان هاتبوو کەوتبوونە بەر تیر وتوانج و نارەزایەتی خەڵکەوە، ئەم پێشنیازە وەک موعجیزەوابوو. بۆیە ئەنوەر دەستبەجێ قەبوڵی کرد. تەلعەت لە قەبوڵکردنی دوودڵ بوو و گوتی: «*ئەی بێلایەنیی تورکیا چی لێ دێت؟*»، بەڵام دیسان وەک جاران ئەنوەر قسەی خۆی گەیاندە جێ و ئێستا بەس ئەوە مابوو دوو کەشتییە جەنگییەکە بگەنە کەنداوی داردانێل.

ئەم دەریاوانییە، وەک پێشبڕکێیەکی لێهات؛ چونکە بەدرێژایی ئەو هەفتەیەی کە ماوە بۆ دەست پێ بوونی شەڕ مابوو، کەشتییە جەنگییەکانی بەریتانیا چاودێریی گۆبن یان دەکردو لە ڕۆژی چواری ئاب کە لە نیوە شەودا ئۆڵتیماتۆمەکەی ئەڵمانیا کۆتایی پێ دەهات، بەنیازبوون نغرۆی بکەن، بەڵام چێرچیڵ داوای لێکردن تا نیوەشەو دانەیەت هیچ کارێک نەکەن. تەنانەت سەعات (٥)ی دوای نیوەڕۆ کە ئیدی ڕوودانی شەڕ هیچ گومانێکی لێ نەدەکرا، پرەنس لوئی دووباتێنبێرگ–ی فەرماندەی هێزی دەریایی بەریتانیا، سەردانی چێرچیڵی کردو پێی ڕاگەیاند کە هێشتا دەرفەتی ئەوەیان هەیە بەر لەوەی ڕۆژ ئاوابێت، کەشتییەکە نغرۆ بکەن. کەچی دیسان چێرچیڵ نەچۆ ژێر بارەو هەر کە دنیاتاریک داهات، کەشتییە جەنگییە ئەڵمانیاییەکە بەپەلە بۆی دەرچوو. شەشی ئاب هەواڵی ئەوە گەیشت کە ئەو دوو

کەشتییە جەنگییە ئەڵمانیاییەیان لەبەندەری (مسینا)ی باشووری ئیتاڵیا دیووە کە گازیان تێ کردووە و بەخێرایی دوورکەوتوونەتەوە.
خەڵک و کاربەدەستانی دەوڵەت لە قوستەنتەنییە بە تاسوقەوە چاوەڕێی گەیشتنی ئەو دوو کەشتییەبوون. ئێستا ئیدی ئەڵمانیاو بەریتانیا ملیان لەبەرملی یەکدی نابوو و، لەشەڕدابوون ، هەوەک چۆن تەلعەت پەیتا پەیتا دووپاتی دەکردەوە کە هەر لەگەڵ تێپەڕبوونی ئەو دوو کەشتییە بە ئاوەکانی بسفۆڕدا، تورکیا بێلایەنی خۆی لەدەست دەداو ئەم کارە لە ڕوانگەی ئینگلیزەکانەوە بەکارێکی دووژمنکارانە لە قەڵەم دەدرا.
تەلعەتیش کە وەکو ملیۆنەها هاوولاتی تورکیا لەشەڕ بێزاربوو، بە ئەنوەری گوت: *«ئێمە هیچمان ناوێ جگە لەوەی کە تووشی شەڕ نەبین و ماوەیەک بە ئاشتی و ئارامی بژین و بتوانین ئاییندەی وڵاتەکەمان بنەخشێنین.»*
ئەمجارەیان تەلعەت هەڵیکوتایە سەر ئەنوەر و ناچاریکرد بڕیاری ئەوە بدا فێڵێک لە فۆن وانگهایم بکات. بۆ ئەم مەبەستەش وابەستەی سەربازیی ڕوسیای بانگکردو پێشنیازی ئەوەی کرد کە پەیمانێکی دۆستی لە نێوان تورکیا و ڕوسیادا ئیمزا بکەن کە ئەم خۆی لە خۆیداو بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی، پەیماننامە نهێنیەکەی نێوان تورکیاو ئەڵمانیای پوچەڵ دەکردەوە و بێ بایەخی دەکرد.
ئەنوەری بەستەزمان وایدەزانی ئەڵمانیاییەکان هەواڵی ئەم دانوستانانەیان پێناگات، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە کە تەلعەت بەهۆی ترسی لە ئاییندەی هاتنی کەشتییە جەنگییەکانی ئەڵمانیا بۆ قوستەنتەنییە، ئەم بابەتەی بە فۆن وانگهایم ڕاگەیاندبێت. بەتایبەتی کە عادەتی وابوو هەموو ئەو تەلگرافانەی کەلەلایەن دیپلۆماتکارەکانەوە لێدەدران، یان ئەوەتا بۆیان دەهاتن، بخوێنێتەوەو دوورنییە بە ئانقەست ئەم هەواڵەی ئاشکرا کردبێت. (٣)
بەڵام هێشتا فۆن وانگهایم کارتیکی دیکەی بەدەستەوەبوو و، بەهۆی لێوەشاوەیی لە کاروباری سیاسیدا، بەهیچ شێوەیەک ئەنوەری بە بەدقەولی و فێڵبازی تاوانبار نەکردو بگرە لەبری ئەمە پێشنیازێکی دیکەی خستە بەردەم تورکیا.
تورکیا مەسەلەی بێلایەن بوونی لێ ببووە مایەی نیگەرانی و ئەم پێشنیازە ئەم نیگەرانییەی نەدەهێشت، باڵیۆزی ئەڵمانیا گوتی: *«بۆچی وەک چۆن بەریتانیا کەشتییەکانی بەئێوە فرۆشت ئێمەش پێتان نەفرۆشین؟بۆ دانی پارەکەشی دەکرێ لێتان ڕاوەستین.»*
ڕۆژی دواتر کەشتییەکانی گۆبن و بریسلاف گەیشتنە زارکی گەرووی داردانێل و، ڕاوێژکاری باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا داوای لە ئەنوەر کرد کە ڕێگە بدات کەشتییەکان بپەڕنەوە. ئەنوەر لە وەڵامدا گوتی دەبێ لەو بارەیەوە پرس بەهاوکارەکانی بکات، بەڵام ڕاوێژکاری باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا زۆر بێ شەرمانە ڕایگەیاند مەجالی تێدانییەو دەبێ هەر ئێستا وەڵام بداتەوە ئەگینا ئەو دوو کەشتییە ئاوەکانی تورکیا بەجێ دێڵن. ئەنوەر ماوەیەک بیری کردەوەو دوایی لە وەڵامدا گوتی: *«زۆر باشە، پێیان بڵێن بێن.»* دوو کەشتییە جەنگییەکە، بەرەو کەنداوی داردانێل کەوتنەڕێ و پرۆژەی ئاشتی لەگەڵ ڕوسیا لەبیرکرا.

چەند ڕۆژێک دواتر، مەلەوانە ئەڵمانیاییەکان بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانە فینەی سووریان لەسەرنابوو بۆ ئەوەی بڵێن سەربازی هێزی دەریایی تورکیان و بە شەقامەکانی قوستەنتەنییە و یانەکانی گەڕەکی «پرا» دا بڵاوبوونەوە. ئۆتۆمبێلە ئەڵمانیاییەکان بە ئاڵای داڵی قەیسەری بە کوچەو کۆڵانە تەنگە بەرەکانی پایتەختدا دەسووڕانەوەو درووشمێکی نوێ کەوتبۆ سەرزاری خەڵکی تورکیا کە دەیانگوت: «ئەڵمانیا لەسەرووی خواوەیە- *Deutschland uber Alles*» ئەم ڕووداوانە بەخاڵی وەرچەرخان لە چارەنووسی تورکە لاوەکان لەقەڵەم دەدران؛ هەر وەک ئەوەی کاتێ جاوید بەگ-ی وەزیری دارایی بە ڕۆژنامەنووسێکی بەلژیکی گوت :«*هەواڵێکی ناخۆشت دەدەمێ، ئەڵمانیاییەکان برۆکسل یان گرت*»، ڕۆژنامەنووسە بەلژیکیاییەکە هیچ خۆی تێک نەداو پەنجەی بۆ کەشتییە جەنگیەکانی گۆبن و بریسلاف درێژکرد کە لە بسفۆڕدا لەنگەریان هاویشتبوو و، لە پەنجەرەی ژوورەکەوە دەدیتران، ئینجا لە وەڵامدا گوتی: «*بامنیش هەواڵێکی ناخۆشترت بدەمێ، ئەڵمانیاییەکان دەستیان بەسەر تورکیادا گرت.*»

کار گەیشتە قۆناغی کۆتایی. لەکۆتاییەکانی مانگی تشرینی یەکەم، گۆبن و بریسلاف چوونە نێو دەریای ڕەشەوو بەبێ ئەوەی پێشتر هیچ جۆرە ئاگاداری، یان وشیارکەرەوەیەک بدەن، بەندەرەکانی ئۆدساو سواستۆپۆل یان دایە بەر تۆپ و چی کەشتی ڕوسیا هەبوو نغرۆیان کردن. هەرچەند ئەو دوو کەشتییە بەناو هی تورکیا بوون، بەڵام جەمال بەگ-ی وەزیری دەریاوانی بەهیچ شێوەیەک ئاگای لەو مەسەلەیە نەبوو. ئیدی باڵیۆزەکانی بەریتانیا، ڕوسیا و فەڕەنسا خۆیان پێ لە قوستەنتەنییە ڕانەگیراو لە (٣٠) تشرینی یەکەم داوای چوونە دەرەوە لە تورکیایان کردو ڕۆژی پاشتریش تورکیا بەڕەسمی هاتە نێو شەڕەکەوە.

* * *

ئەو کاتە مستەفا کەمال، لە سۆفیا وابەستەی سەربازیی تورکیا بوو. مستەفا کەمال دوابەدوای ئەو نامە توندەی کە سەبارەت بە بوونی هێزەکانی ئەڵمانیا لە تورکیادا بۆ ئەنوەری ناردبوو و نارەزایەتی دەربڕیبوو، زۆر بەڕێزەوە بۆ بولغاریا دوور خرابۆوە. کەمال لەنامەکەیدا نووسیبووی: «*تورکەکان تەنهاو تەنها بەدەستی خۆیان دەتوانن ڕێگای ڕزگاریی خۆیان بدۆزنەوە. شێتایەتییە ئەگەر سوپا، کەبەهێزێکی چارەنووسسازو گرنگی کەلەکەمان لە قەڵەم دەدرێ، بخرێتە ژێر ڕکێفی ئەڵمانیاییەکانەوە.*»

کەمال، بەدڵ برینداری و زویرییەوە ئەم پۆستەی وەک دوورخرانەوەیە قەبوڵ کردبوو و، هەوڵی دەدا وەک دیپلۆماتێک سوودی لێ وەرگرێت. زۆر حەزی لە ئافرەت و ڕابواردن لەگەڵ ئافرەتان بوو، بەڵام ئێستاکە بە دڵتەنگییەوە بۆی دەردەکەوت کە لەم بوارەشدا نەیتوانیوە سەربکەوێ. بۆیە ڕوویکردە فێربوونی سەماو ئەمەش بووە یارمەتیدەرێک بۆ ئەوەی تێکەڵ بە ژیانی کۆمەڵایەتیی سۆفیا بێت.

لەمیانەی یەکێ لە میوانداریەکاندا شەیدای کیژێکی جوانکیلەی بولغاری بوو، بەڵام چیوای پێ نەچوو هەواڵی ئەوەی پێ گەیشت کە باوکی کچە گووتوویەتی:

کچەکەی خۆیم بەدەستی خۆیم دەکوژم، بەڵام *نایدەمە* تورک. کاردانەوەی کەمال لەبەرامبەر ئەمەدا ئەوەبوو کە وازی لە کچەکە هێنا و پەنای بردەبەر ئامێزی فاحیشەکان. چەندین مانگ تێپەڕی بەبێ ئەوەی تەنانەت یەک شەویش لەسەر جێگەکەی خۆی بخەوێ و لەبەرئەوەی کارە ئیدارییەکەشی بێ بایەخ بوو و ڕقی لێ دەبۆوە، هەوڵی دەدا زۆربەی کاتی خۆی بە ڕابواردن بەسەربەرێت و لەم ڕێگەیەوە تۆڵەی ڕابردوو بکاتەوە.لە ئاکامی ئەم زێدەڕۆییەدا تووشی نەخۆشی بوو.

ئێستا کەمال بە تەنهایی و بەنەخۆشی مابۆوەو لە ئافرەتانیش بێزاربببوو. کاتێ شەڕ دەستی پێ کرد، داوایکرد بنێردرێتە بەرەی جەنگ. بەڵام ئەنوەر چارەی کەمالی نەدەویست و حەزی نەدەکرد هەر بشی بینێ. هۆی ئەمەش ئەوەبوو کە کەمال ڕقی لە ئەڵمانیاییەکان دەبۆوە. لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩١٥ (ربیع الثانی-ی ١٣٣٣ی کۆچی)، بڕیاریدا بەهەر شێوەیەک بێت سۆفیا بەجێ بێڵێت و بگەڕێتەوە تورکیاو لەوێ وەکو سەربازێکی ئاسایی خۆی ناونوس بکات.

خۆی کۆکردبۆوەو خەریکی ڕۆیشتن بوو کە تەلگرافێکی پێ گەیشت. بەپێی فرمانی نێو تەلگرافەکە کەمال گوێزرابۆوە بۆ سەربازگەی ڕۆدۆستۆ کە کەوتبۆ نیمچە دوورگەی گالیپۆلی. لەو سەردەمەدا، هیچکەس بایەخی بەم ڕووداوە بچوکە نەدا کە چارەنووسی شەڕەکانی ئایندەی گۆڕی.

ئەم ڕووداوە چارەنووسی مستەفا کەمالیشیی گۆڕی؛ چونکە لەبەر ئازایەتی و لێهاتوویی لە لەشکرکێشیدا، بوو بە گەورەترین قارەمانی سەرکەوتنە جەنگییەکانی تورکیا. ئەگەر مستەفا کەمال نەنێردرابایە گالیپۆلی، ئەوا بەبێگومان پلانەکەی چێرچیڵ سەبارەت بەهێرش بردنە سەرو داگیرکردنی گەرووی بسفۆر، سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا. هەرچەندە ئەو هەزاران سەربازەی هاوپەیمانان کە لە کەنارەکانی ئەم نیمچە دوورگەیە پیادەببوون، پێیان وابوو بەئاسانی سەردەکەون، بەڵام سەرئەنجام بەهۆی کەللەڕەقی و بەرگری پۆڵاینی مستەفا کەمال کەوەک عوسمان پاشە لە شەڕی پلۆنادا دەیزانی چۆن شەڕ بەسەربازە تورکەکان بکات، تووشی شکست و ناکامی هاتن.

لەکۆتایی ساڵی ١٩١٥ ئینگلیزەکان لەکاتێکدا کە (١١٢٠٠٠) کەسیان لێ کوژرابوو، دوورگەکەیان بەجێ هێشت. ئەگەرچی ژمارەی کوژراوەکانی مستەفا کەمال پتربوون، بەڵام بەو شێوەیە توانیبووی خەونەکەی چێرچیڵ بەبابدا کە پێی وابوو بە داگیرکردنی ئەو نیمچە دوورگەیە دەتواندرێ بەدوو ساڵ زووتر شەڕەکە لە قازانجی هاوپەیماناندا کۆتایی پێ بهێندرێت.

کاتێ کە مستەفا کەمال پێینایە قوستەنتەنییەوە، ڕۆژنامەکان بەمانشێتی *«ڕزگارکەری داردانێل»* پێشوازییان لێکرد، بەڵام ئەنوەری داخ لە دڵ بەهیچ شێوەیەک لە بابەت سەرکەوتنەکانی کەمال خۆشحاڵ نەبوو و، دەستبەجێ بەرەو دیاربەکری بەڕێ کردو گواستیەوە ئەوێ.

* * *

لە کاتێکدا کەڕۆژنامەکانی تورکیا باسیان لە قارەمانیەتی و ئازایەتی سەربازانی

تورک لە شەڕی گالیپۆلیدا دەکرد، شەڕێکی دیکە لەبەرەی ڕۆژهەڵاتدا لە ئارادابوو کە بەتەواوەتی لەگەڵ شەڕەکەی گالیپۆلیدا جیاوازبوو. ئەم شەڕە یەک لایەنە وتاکە کەسی بوو و، وابەدڵڕەقی و بێ ڕەحمیەوە لەلایەن ئەنوەرەوە سەرکردایەتی دەکرا کە ئەنوەری دەخستە ڕیزی ئەو سوڵتانە بێ ڕەحمانەی کە ئەو تورکیای لە چەنگ دەرهێنابوون.

ئەنوەر بڕیاری دابوو تەواوی ئەرمەنییەکانی تورکیا لەنێو بەرێت و بۆ ئەم مەبەستەش کوشتارێکی بەکۆمەڵی سازدا، کوشتارێک کە هەوڵەکانی عەبدولحەمید لەو بارەیەوە لەچاو کارەکەی ئەو زۆر بچوک و کەم بایەخ دەهاتنە پێش چاو و بەواتایەکی دیکە *«سەد ڕەحمەت لە کفن دز!»*

ئەرمەنییەکان کە لە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای بچوک و لەناوچەکانی سەر سنوری روسیا دەژییەن، ١٥٠٠ ساڵە وەک دوورگەیەکی مەسیحیەت کەوتوونەتە نێو ئۆقیانووسی ئیسلامەتییەوە. بەدرێژایی ئەو ماوەیە، عەرەبەکان لەسەردەمی شەڕی خاچ پەرستەکاندا، مغۆلەکان، تاتارەکان، کوردەکان و سەرئەنجام تورکەکان، وڵاتەکەیانیان کە بە *«بەلژیکای ڕۆژهەڵات»* بەنێو بانگەو بەرێگای پەیوەندیی ئاسیا و ئەوروپا لە قەڵەم دەدرێ، پێخوست کردووە. لەسەرەتای ساڵی ١٩١٥ (١٣٣٣ی کۆچی)، زنجیرە شەڕێکی خوێناوی لەنێوان روسیاو تورکیادا لەو ناوچە ڕوویانداو ئەنوەر بەبیانووی ئەوەی کە ئەرمەنییەکان لەو بەینەدا یارمەتیی روسەکانیان داوە، سودی لەو دەرفەتە وەرگرت تابەقەولی خۆی *«بۆ هەتا هەتایە مەسەلەی ئەرمەنییەکان لە تورکیادا* چارەسەرو ئە کێشەیە بن بڕ بکات، *تا دوای کۆتایی هاتنی شەڕ، تورکیا لەم ڕووەوە* هیچ گرفتێکی نەبێت.» شێوازی ئەنوەر بۆ بن برکردنی کێشەی ئەرمەنییەکان، بریتی بوو لە ڕەشەکوژیی ئەرمەنییەکان بەشێوەیەک کە هیچ ئاسەوارێکیان لێ بەجێ نەمێنێ. تەنانەت بۆ حکومەتی «پێشکەوتوو خواز»ی تورکەلاوەکانیش، لەبیرکردنی نەریتە دێرینەکانی عوسمانی ئەستەم بوو.

ئەنوەر، پلانەکەی خۆی بەلادانی پارێزگارە موسڵمان و میانەڕۆیەکەی ویلایەتی وان و بەدەست نیشانکردنی زاوا هۆقەبازەکەی خۆی وەک پارێزگاری ئەو ناوچەیە کە نێوی جەواد بەگ بوو لە ١٥ی شوباتدا، دەست پێکرد. جەواد بەگ، دەستی بە هەر ئەرمەنییەک ڕاگەیشتبایە دەیکوشت. سەرەتا لە گوندی ئارکانتس، ٥٠٠ پیاوی ئەرمەنیی گوللەباران کردو دواتر لە گوندێکی دیکە هەمان کاری دووپات کردەوە. بەسەدان ئافرەتی ئەرمەنی پەلاماری ناموسیان دراو بەمەبەستی دەست بەسەرداگرتنی چەکی ئەرمەنییەکان بەهەزاران پیاوی ئەرمەنی خرانەژێر ئازارو ئەشکەنجەوە.

جیوای پێنەچوو لەسەرانسەری ڕۆژهەڵاتی تورکیا نازناوی «ناڵبەند»یان بەسەر جەواد بەگ دادا؛ چونکە لەکاتی ئەشکەنجەداندا، ناڵی لەبەری پێی ئەرمەنییەکان دەدا. ئەشکەنجەکانی دیکەش لە ڕادەبەدەر دڕندانەو بێ بەزەییانە بوون، چونکە بەدری بەگی سەرۆکی پۆلیسی قوستەنتەنییە بە ئاشکرا بە باڵیۆزی ئەمەریکای کوتبوو، لە بارەی ئەشکەنجەو شێوازەکانی، لێکۆڵینەوەی ئەنجامداوەو لەو بەینەدا

زۆربەی ئەو شێوازانەی هەڵبژاردووە کە لە دیوانی پشکنینی بیروڕای ئیسپانیادا بۆ ئەشکەنجەدانی خەڵک بەکارهێندراون. بەپێی قسەی دکتۆر ئاشێر-ی پزیشکی نەخۆشخانەی ئایینیی وان، کاتێ کوشتارەکە کۆتایی پێهات، ناچاربوون ئەو (٥٥) هەزار تەرمەی کەبۆگەنیان کردبوو، بسوتێنن.

ئەمە تەنها دەستپێکی کارەکەبوو؛ چونکە ئەنوەر پلانی ڕەشکوژیی ڕێک و پێک و بەرنامە بۆ داڕێژراوی ئەرمەنییەکان و دوورخستنەوەی کەس و کاری کوژراوەکانی بۆ بیابانەکانی سوریاو حەلەب لەسەردابوو.

دانانی ئەم پلانە، وەک کردەوەکانی دیوانی پشکنینی بیروڕای ئیسپانیا، لە دەمارگیریی ئایینیەوە سەرچاوەی نەگرتبوو و، بگرە بەهۆی ئەو نەفرەت و قینە لە ڕادەبەدەرە بوو کە ئەنوەر لەهەمبەر ئەرمەنییەکان هەیبوو؛ ڕێک وەکو ئەو هەستەی کە چەند ساڵ دواتر هیتلەر لەبەرامبەر یەهودییەکان دەری بڕی. لە ڕاپۆرتێکی ڕەسمیدا واهاتبوو: *«هەموو ئەو کردەوە سامناکانە بەهاوکاری نزیکی کاربەدەستانی سەربازی و ئیداری ناوچەکەو لەژێر چاودێریی ڕاستەوخۆی ئەنوەرو تەلعەتدا ئەنجام دراون و فرمانەکان بە پێی پلانێکی لە پێشترەوە داڕێژراو، لە قوستەنتەنییەوە دراون.»*

بە پێی ئەو ڕاپۆرتەی کە دەوڵەتی ئینگلیز لە تشرینی یەکەمی ١٩١٦ دا ناردییە پەرلەمانی ئەو وڵاتە، لە دوو ملیۆن ئەرمەنیی دانیشتووی تورکیا، سێ یەکان کوژراون، سێ یەکیان ڕایانکردۆتەوە روسیاو بەشەکەی دیکەشیان بەشارە گەورەکانی وەک قوستەنتەنییەو ئەزمیردا بڵاوبوونەتەوەو لە بارودۆخێکی مەینەتباردا دەژین. هەر بەپێ ئەم ڕاپۆرتە، ئەو شێوازە کە بۆ لە نێوبردنی ئەرمەنییەکان بەکاردەهێندرا بریتی بوو لەوەی کە تێکڕای نێرینەکانیان کۆ دەکردەوەو بە گوریس لێکیان دەبەستن و، دواتر بەرەو شوێنێکی دوورەدەست بەڕێیان دەکردن و لە ڕێگادا چەتە کوردەکات سەریان دەبڕین. ئینجا بە ژن و منداڵەکانیان دەگوت خۆتان بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکەن و لە شێوەی کاروانی گەورە گەوردەدا بەرەو حەلەب بەڕێیان دەکردن . ئەو کاروانانە هەندێ سەربازیشیان وەکو پاسەوان لەگەڵدابوون، بەڵام پاسەوانی چی، هەر ئەو پاسەوانانە لەنێوەڕاستی بیابان ڕووتیان دەکردنەوەو پەلاماریان دەدان و بەتەمای خوا وێڵ و سەرگەردانیان دەکردن. لەمبارەیەوە ڕاپۆرتێک سەبارەت بەسەفەری یەکێک لەو کاروانانە گەیشتۆتە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کە ئەمەی خواردەوە دەقەکەیەتی: *« لەڕۆژی یەکی حوزەیران، کاروانێکی سێ هەزار کەسیی ئەرمەنی کە زۆربەیان ژن و کچ و منداڵ بوون، گوندی خارپوت یان بەجێ هێشت. لەسەرانسەری ئەم ڕێگایە تا (رأس العین) کە یەکەم وێستگەی هێڵی شەمەندەفەری بەغدایە، دیتنی ئەم ڕێبوارە بەدبەختانە ترس و نارەحەتی دەخستە دڵی مرۆڤەوە.*

*جندرمەکان لە پێشیانەوە دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی هەواڵی نزیکبوونەوەی ئەم چەند هەزار ئافرەت و کچە ئەرمەنییە بەهۆزە نیمچە وەحشیەکانی سەرشاخەکان ڕابگەیەنن. ئینجا عەرەب و کوردەکان دەگەیشتنە سەریان و کچە لاوەکانیان لەڕیز*

دەردەهێناو لەگەڵ خۆیانیان دەبردن، بەڵام هەندێ لە چەتەکان هەر لەوێ و دەستبەجێ پەلاماری ناموسی ئافرەتەکانیان دەداو جەندرمەکانیش کە بەم کارە دەورووژان، بەشدارییان لە پەلاماردانی ئافرەتەکاندا دەکرد. ئەو پیاوە ئەرمەنیانەیش کە لەگەڵ کاروانەکەدابوون، یەک بەدوای یەکدا کوژران. هەندێ لە ئافرەتەکان توانیبوویان کەمێک لە پارەو خشڵەکانیان لەژێر جل و بەرگ و لەنێو بسکەکانیاندا حەشار بدەن، بەڵام کوردەکان زۆربەی ئەو پارانەیان دۆزییەوەو دەستیان بەسەردا گرت. سەرئەنجام دوای (١٣) ڕۆژ کە بەبەرچاوی جەندرمەکانەوە ئەندامانی کاروانەکە دەکوژران، ڕووت دەکران و پەلامار دەدران، جەندرمەکان کاروانەکەیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە. دوو ڕۆژ دواتر کوردەکان دوا نێرینەکانی نێو ئەم کاروانەیان کە ژمارەیان دەگەیشتە (١٥٠) کەس، کۆ کردەوەو کوشتیانن. لەو ڕۆژەدا کاروانێکی دیکە لە ئەرمەنییەکانی سیواس گەیشتە کاروانەکەی خارپوت و بەم پێیە ژمارە ئەرمەنییە قوربەسەرەکان گەیشتە (١٨) هەزار کەس. ئەم جارەیان یەکێ لە ئاغا کوردەکان سەرکردایەتیی هێرشەکەی بەئەستۆ گرت و تێکڕای هۆزە شاخ نشینەکانی بانگ کرد.

هەموو شەو و ڕۆژێ، جوانترین کچە ئەرمەنیەکانیان جوێ دەکردەوەو لەگەڵ خۆیانیان دەبردن و پەلاماری ناموسیان دەدان. بەوەش نەدەوەستان کچە بەدبەختەکانیان دەخستە بەردەم پیاوەکانی گوندەکانی خۆیان بۆ ئەوەی بەکەیفی خۆیان لەگەڵیاندا ڕابوێرن و پەلاماریان بدەن. کاتێ کاروانی ئەرمەنییەکان کە ژمارەیان یەکجار کەم ببۆوە گەیشتە سەر ڕووباری فورات، هێندەیان تاڵان کردبوون کە جگەلەو جلە دادڕدادڕ کراوەی لەبەریان بوو، هیچی دیکەیان پێ نەمابوو. ئەم جلانەشیان پێ ڕەوا نەدیتن و کوردەکان ئەوانەشیان لەبەرداکەندن و ئەرمەنییە قوربەسەرەکانیان بەڕووتی و پێخواسی لە نێوەڕاستی بیاباندا بەرەڵلا کرد. ماوەی پێنج ڕۆژی ڕەبەق بەبێ نان و ئاو لەژێر گەرمای سووتێنەری خۆر ڕێگەیان دەبڕی. بەسەدان کەسیان لە برسان و لەماندویەتیان گیانیان لەدەستداو ئەوانی دیکەش لە کاتێکدا کە زمانیان بستێک لەدەمیان هاتبوّدەر، دوای پێنج ڕۆژ گەیشتنە سەرکانیاوێک. بەدیتنی کانیاوەکە هەموویان بەڕاکردن لێی چوونە پێش، بەڵام ڕاسپێردراوانی پۆلیس ڕێگەیان نەدان تەنانەت دڵۆپە ئاوێکیش بخۆنەوە؛ چونکە دەیانویست هەر پەرداخە ئاوێکیان بە دوو سێ لیرە پێ بفرۆشن و، جاریواش هەبوو سەرەڕای ئەوی کە پارەشیان وەردەگرت، دیسان نەیاندەهێشت ئاوەکە بخۆنەوە.»

سەر ئەنجام دوای حەفتا ڕۆژ ڕێگەبڕینی زۆرە ملێیی لەبیاباندا، پاشماوەکانی ئەم دوو کاروانە گەیشتنە حەلەب و لەو (١٨)هەزار کەسەی کەلەسەرەتادا بە ڕێکەوتبوون، تەنها (١٥٠) ژن و منداڵی ڕووت و قووت و برسی گەیشتنەجێ.

لە سۆنگەی ئەوەی کە لەودەمەدا ئەمەریکا لە شەڕدا بێلایەن بوو و، شابەندەرەکانی (کۆنسوڵ) لەسەرانسەری ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانیدا کاریان دەکرد، تورکە لاوەکان نەیانتوانی پێشگیری لە بڵاوبوونەوەی هەواڵی ئەم کارەساتانە بکەن. تەنانەت لەبەریتانیاش کە خۆی دەرگیری شەڕی مان و نەمان بوو، لەبری

ئەوەی هەواڵەکانی شەڕ بکرێنە مانشێتی ڕۆژنامەکان، هەواڵی کارەساتی قەتڵوعامی ئەرمەنییەکان دەکرانە مانشێت و لەسەرووی هەواڵەکانی دیکە دادەندران. لە ئەمەریکا ڕای گشتی کاردانەوەی لەخۆی نیشانداو دەوڵەتی ئەمەریکا باڵیۆزەکەی خۆی ڕاسپارد تا لەگەڵ ئەنوەردا بکەوێتە دانوستان. لەو دانوستانەدا، باڵیۆزی ئەمەریکا پێی وابوو کە واباشە ڕاستەوخۆ ئەنوەر لە ئەنجامی ئەم تاوانانە بە بەرپرسیار لە قەڵەم نەدا؛ بۆیە بە ئەنوەری گوت: *«من دڵنیانم لەوەی کە هەرگیز دەوڵەت فرمانی نەداوە ئەم کردەوە توندوتیژانە ئەنجام بدرێن و ناکرێ بەرێزتان و تەلعەت پاشا لەم کارە بە بەرپرسیار بزانین. بێگومان ڕاسپێردراوە ناوچەییەکان پێیان لەبەرەی خۆیان پتر ڕاکێشاوەو ئەم کردەوانەیان ئەنجام داوە. باش دەزانم کە ناکرێ بەتەواوەتی هەڵسوکەوتی ئەو فەرمانبەرانەی لەژێر دەستان کاردەکەن، کۆنترۆڵ بکرێت.»*

ئەنوەر وەک ئەوەی سووکایەتییەکی پێ کرابێت، لە وەڵامی باڵیۆزدا گوتی: *«ئێوە خەراپ بەهەڵەداچوونە، من ئامادەنیم ئەو فەرمانبەرانە تاوانبار بکرێن کە لەژێر دەستی مندا کاردەکەن، من ئامادەم بەرپرسیارییەتی تەواوی ئەو کردەوانە لە ئەستۆ بگرم. فرمانی دوورخستنەوەی ئەرمەنییەکان لەلایەن دەوڵەتەوە دراوە.»*

تەلعەتیش بۆچوونەکانی لەهی ئەنوەر نزیک بوون؛ چونکە بە برادەرەکانی خۆی گوتبوو: *«من لەماوەی سێ مانگدا توانیم گرفتی ئەرمەنییەکان چارەسەر بکەم، ئەو گرفتەی کە عەبدولحەمید نەیتوانیبوو لە سێ ساڵدا چارەسەری بکات.»* هەروەها بۆ شەرعیەت بەخشین بەکردەوەکەی، ئاوا وەڵامی پەیامنێری ڕۆژنامەی بەرلینێر تاگبلات-ی دابۆوەو گوتبووی: *«لەسەر ئەوە سەرزەنیشتمان دەکەن کەبۆچی جیاوازیمان نەخستۆتە نێوان ئەرمەنییە گوناهکارو بێ گوناهەکانەوە، بەڵام ئەمە مەحاڵە؛ چونکە ئەو کەسانەی کە ئەمڕۆکە بێ گوناهن دوورنییە لە داهاتوودا گوناهکار دەرچن!»* هەروەها دیسان زۆر بە ڕووقایمییەوە بە باڵیۆزی ئەمەریکای گوتبوو: *«بیستومە گوایە هەندێ لە ئەرمەنییەکان لای کۆمپانیای ئەمەریکاییەکان خۆیان بیمەی ژیان کردووە. بەو کۆمپانیایانە بڵێن لیستی ئەو ناوانەمان بۆ بنێرن؛ چونکە هەموویان مردوون و کەسیشیان لە پاش بەجێ نەماوە، بۆیە دەبێ ئەو پارانە بدرێتە دەوڵەتی عوسمانی.»*

* * *

بەسەرکەوتنی سوپای عوسمانی لە گالیپۆلی و ئەرمینیا و، پاشەکشێی هاوپەیمانەکان لەبەرەی ئەورووپا، تورکە لاوەکان لەوەی کە ببوونە هاوپەیمانی ئەڵمانیا، زۆر خۆشحاڵ ببوون. بەڵام هەر لەو کاتەدا بارودۆخ گۆڕاو هێڵە بەرگرییەکانی تورکیا لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا یەکەم قەڵشتی تێ کەوت. لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩١٦ (١٣٣٤ی کۆچی)، ئەنوەر ویستی بەو (٢٠٠) فەوجە سەربازەی کە لە شەڕی گالیپۆلی ڕزگاریان ببوو، لەقەوقازەوە هێرشێکی تازە بکاتە سەر ڕوسەکان، بەڵام لەبەرئەوەی ڕوسەکان دەیانتوانی لەساردترین هەوادا شەڕ بکەن، توانییان دەست بەسەر ئەرزڕۆم و بەندەری ترابزۆندا بگرن کە لەڕووی

سەربازییەوە بۆ تورکەکان زۆر پڕ بایەخ بوون.
سوپایەکی دیکەی روسیاش، تورکەکانی لە ویلایەتەکانی رۆژهەلاتی ئێران وەدەرنا، هەرچەند کە روسەکان نەیانتوانی بگەنە ئامانجی سەرەکیان کە مەبەستیان بوو دەست بەسەر بەغدادا بگرن، بەلام توانیان لەم شەڕانەدا سەدها هەزار سەربازی تورک لەنێو بەرن.
لەو کاتەدا ئەنوەر لێدانێکی کوشندەتریشی لێدرا و ئەو لێدانەش بەیاننامەکەی شەریفی مەککە بوو کە لە پیرۆزترین شاری دنیای ئیسلامەوە بانگەشەی ڕاپەڕین لە دژی دەسەلاتی تورکەکان و بەدەست هێنانی سەربەخۆیی دەکرا بۆ عەرەبەکان.
لەسەرانسەری جیهانی عەرەبەوە بەدەنگ ئەم بانگەشەیەی شەریفی مەککەوە چوون و شەڕ لەنێوان عەرەب و تورکەکان دەستی پێکرد. عەرەبەکان دەستیان بەسەرتەواوی بنکەو بارەگا سەربازییەکانی تورکەکان داگرت و لەکانوونی یەکەمی سالی ١٩١٦ (ربیع الأول-ی١٣٣٥ی کۆچی)، دەولەتی بەریتانیا دانی بە پاشایەتی شەریفی مەککە داناو بەرەسمی بە پاشای حیجازی ناسی. ئەم کردەوەیە بە لێدانێکی کوشندە لەدەسەلاتی مەعنەویی سولتانی قەلەم دەدرا؛ چونکە سولتان کە خەلیفەی موسلمانان بوو، چیدی بەخزمەتکاری حرمین شریفین (مەککەومەدینە) لەقەلەم نەدەدرا.
بەلای زۆربەی تورکەکانەوە، ئەم کارە کارەساتێک بوو کە هەرگیز نەیانتوانی تۆلەی بکەنەوە.
پاشای نوێی حیجاز دەستبەجێ کوڕە گەورەکەی فەیسەلی کردە سەرکردەی هێزە عەرەبەکان و بە یارمەتی و ڕێنوێنیی لاورنس-ی عەرەبستان بەرەو فەلەستین و سوریا کەوتنەڕێ. لە مانگی ئازاری سالی ١٩١٧ (جمادی الأخر-ی١٣٣٥ی کۆچی)، هێزەکانی بەریتانیا پێیان نایە نێو بەغداوەو لەلایەن خەلکەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێکرا.
چیوای پێنەچوو کە سەربازگەکانی قودس و دیمەشق و حەلەب -یش خۆیان بەدەستەوەدا و تەسلیم بوون.
ئەلمانیا و تورکیا ڕۆژ بەرۆژ پتر بەیەکدی بێ متمانەتر دەبوون و ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئەلمانیا حەوت سوپای خۆی ناردبۆ هانای عوسمانییەکان و، زۆربەی سەربازەکانی ئەو حەوت سوپایە لە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستدا گیانیان لەدەست دابوو.
بسمارک، کە ڕۆژێک گوتبووی: « *بەلای منەوە تەواوی نیمچە دوورگەی بالکان بەقەدەر ئێسک و پرۆسکی ڕزیوی سەربازێکی پرووس بایەخی نییە*»، دەبوایە ئەوسا لە گۆڕەکەی خۆیدا بلەرزێ. جاری واهەبوو ئەفسەرە تورک و ئەلمانیاییەکان دەکەوتنە گیانی یەکدی، بەشێوەیەک کە ئینگلیزەکان ناچاربوون یەخسیرە جەنگییەکانی تورکیا و ئەلمانیا هەریەکەو بەجیا لە ئۆردووگایەکدا جێ بکەنەوە.
ئەنوەر و تەلعەت لە کۆتایی نزیک دەبوونەوەو دوای چوار سال جەنگ و پێکدادانی بێ ئامان کە تورکیا تێیدا چوار سەدو بیست و حەوت هەزار کەسی لێ کوژرابوو،

ناکۆکی نێوان تورکە لاوەکان ڕۆژبەڕۆژ گەورەترەوە پتر دەبوو. لەو ڕۆژانەیدا کە برسیەتی و نەخۆشی سەرانسەری تورکیای داگرتبوو، ئەنوەر بە ئاشکرا بەوە تاوانبار دەکرا کە ئیمتازاتی ئابووری بە ئەڵمانیا بەخشیووەو خۆراک و داودەرمانی دزیووە.

ئیدی گەمەکە لە کۆتایی خۆی نزیک دەبوەو پاشاکانی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی کەسەردەمێک غەرقی شانازی و جێی ڕێزوستایشی جەماوەر بوون، خۆیان بۆ ڕاکردن و ڕزگارکرنی گیانیان ئامادە دەکرد. ئەنوەرو تەلعەت و جەمال، لە شەوی دووەمی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ لە ماڵی بەردەستەکەی ئەنوەردا بەنهێنی چاویان بەیەکتری کەوت و، هەر لەوێوە پەنایان بردەبەر کەشتییەکی ئەژدەرهاوێژی ئەڵمانیا و لە قوستەنتەنییە ڕایانکرد. (٤)

ئەمە کۆتایی کاری تورکە لاوەکان و دەرفەتێکی لەباربوو بۆ کەسایەتییەکی نوێ تا بێتە مەیدانەوەو جڵەوی دەسەڵات بگرێتە دەست. ئەو، پیاوێک بوو کە لە چارەنووسی نووسرابوو دەبێ مەرگی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ڕابگەیەنێ و موژدەبەخشی لە دایکبوونی تورکیای نوێ بێت.

## فەسڵی چواردەهەم

### یاخی

لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩١٩دا، مستەفا کەمال لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا بوو. تا ئەوکاتە سەرانسەری ژیانی وەک قوتابی زانکۆ، پیلانگێڕو سەرباز بەسەر بردبوو و، بەقەولی یەکێ لە نووسەران، ژیاننامەکەی ئەوەی دەردەخست کە *«پیاوێکە کە لەکات و سەردەمی خۆیدا لە دایک نەبووەو، هەموو ئاکارو ڕەفتارێکی لە خەڵکی ئاسایی سەردەمی خۆی جیاوازە، کەمتر لە تورکەکانی ئەم سەردەمە دەچێ و پتر بە باوباپیرانی واتا ئەو تاتارانەی کە لە ستێپەکانی ڕوسیاوە بەرەو ئاسیای نێوەڕاست هاتن دەچێ و، خووی دڕندایەتیی مرۆڤە سەرەتاییەکانی تێدایە.»* ئەگەر مستەفا کەمال لە سەردەمێکی دیکەدا لەدایک ببوایە، ڕەنگبێ توانیبای ببێ بە کەسایەتییەکی وەکو چەنگیزخان و، بەتاڵان و بڕۆی ئیمپڕاتۆرییەتەکانی جیهانەوە خەریک بێت و لەماوەی نێوان شەڕەکانیشیدا، لەگەڵ ئافرەتاندا ڕابوێرێ. بەڵام ئەو میراتگری ئیمپڕاتۆرییەتێکی تێکشکاو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بایی ئەوەندە دوورئەندێشی تێدابوو کە بزانێ ئەگەرچی ئیمپراتۆرییەت مردووە، بەڵام دەکرێ لەسەر خۆڵەمێشی ئەو ئیمپڕاتۆرییەتە مردووە وڵاتێکی نوێ بنیاد بندرێت.

باوکی مستەفا کەمال، کارمەندی گومرگ بوو کە دواتر ڕووی لە بازرگانی ناو لە ساڵی ١٨٨٨ یشدا کۆچی دوایی کرد. کوڕێکی تەمەن حەوت ساڵانی لە دوای خۆی بەجێ هێشت کە تەنها بیری لەیەک شت دەکردەوەو ئەویش ئەوەبوو کە ببێ بەسەرباز، پیشەیەک کە دایکە بێوەژنەکەی ڕەقی لێ دەبۆوە.

لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا، بەبێ ئەوەی دایکی ئاگاداربێت، بەشداریی لە ئەزموونەکانی وەرگیران لە ئامادەیی سەربازیدا کرد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. شەش ساڵ دواتر لە کۆلێژی سەربازی قوستەنتەنییە خوێندی و لە ساڵی ١٩٠٣ بە پلەی مولازمی دەرچوو. لەرادەبەدەر ڕقی لە عەبدولحەمید دەبۆوەو زۆر کەیفی بە تورکەلاوەکان دەهات. ئەگەرچی بەشداریی لەو ڕووداوانەدا کردبوو کە لە ئاکامدا لادانی عەبدولحەمیدیان بەدواوەبوو، بەڵام هەرگیز تورکە لاوەکان ڕێگەیان پێنەدا لێیان نزیک بێتەوەو پێ بنێتە نێو کۆڕو کۆمەڵە تایبەتییەکانیانەوە. هۆی سەرەکی ئەمەش ئەوەبوو کە مستەفا کەمال ڕقی لە ئەڵمانیاییەکان دەبۆوەو ئەوەش لە کاتێکدابوو کە ئەنوەرو دەست و پێوەندەکانی ڕۆژبەڕۆژ پتر دەچوونە ژێرباری ئەڵمانیاییەکانەوەو پتر پێیانەوە وابەستە دەبوون.

لەمڕووەوە مستەفا کەمال بەئاشکرا ڕەخنەی لە سیاسەتەکانی ئەنوەر دەگرت، بەڵام ئێستا هەموو شتێک گۆڕابوو. بەشێوەیەکی کتوپڕ، قوستەنتەنییە لەلایەن سەربازە سەرکەوتووەکانی فەرەنسا و بەریتانیاوە داگیرکرابوو و جێی چۆڵی ئەڵمانیاییەکانیان لە یانەکانی پڕادا، پڕکردبۆوەو ئەفسەرەکانیان بەشەو چێژیان لە مۆسیقا و سەمای تورکی دەبینی و بەڕۆژیش بەو قایەغانەی کەدەستیان بەسەردا گرتبوون، بەنێو گوندە قەشەنگ و سپیکارەکانی دوورگەکانی بسفۆڕدا دەگەڕان.

ژیانی سەربازە داگیرکەرەکان پڕبوو لە خۆشی و شادی و کیژە چاوڕەشە یۆنانی و ئەرمەنییەکان، پتر لە ئەڵمانیاییەکان کەیفیان پێ دەهاتن. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا قوستەنتەنییە بەشارێکی داگیراو نەدەچوو، هۆیەکەشی ئەوەبوو کە سەربازەکانی هاوپەیمانان بەڕەسمی شارەکەیان داگیرنەکردبوو و بگرە تەنها لەسەریان بوو تا ئەو کاتەی دانوستانەکانی ئاشتی کۆتاییان پێ دێت، ئاسایش و تەناهی شارەکە بپارێزن.

لەمڕووەوە هیچ سەربازێک چاوەڕێی ئەوەنەبوو کە لە چەند مانگێک پتر لەوێ بمێنێتەوە.

چیوای پێ نەچوو کە نێوانی سەربازە ئینگلیزی و فەرەنساییەکان تێکچوو و گرژییان لەنێواندا دروست بوو. ڕەنگبێ هۆی ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەفسەرەکانیان بەوردی ئەرکی سەربازەکانیان دیاری نەکردبوو.

هێشتا مانگێک بەسەر ئاگربەسدا تێنەپەڕی بوو کە مستەفا کەمال دوای چەندین مانگ شەڕ لەگەڵ عەرەبەکاندا پێی نایەوە قوستەنتەنییەوەو دیتی هەموو لایەکی شارتەژێی دوژمنە. گەلەکەشتی جەنگیی بەریتانیا لە بسفۆڕدا لەنگەری هاویشتووەو سەربازە فەرەنساییەکان ئاسایشی نێوخۆی پایتەخت و سەربازە ئیتالیاییەکانیش بە پارێزگاریی هێڵی شەمەندەفەرەوە خەریکن.

ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی تێک شکابوو، تەواوی ڕێبەرانی تورکەلاوەکان ڕایانکردبۆ دەرەوەو، ئەوەی ڕاشی نەکردبوو خۆی حەشاردابوو . جڵەوی دەسەڵات کەوتبۆ دەست سیاسەتمەدارێکی پیرو پەککەوتەی سەردەمی عەبدولحەمید بەنێوی تۆفیق پاشا کە لایەنگری بەریتانیا بوو.

مستەفا کەمال کەتبۆ نێو دۆخێکی تایبەتی و نایابەوە؛ چونکە دوای ڕاکردنی ئەنوەر ئیدی هیچ ڕکابەرێک لەبەرامبەر ئەم ژەنەڕاڵە سەرکەوتوو و خۆشەویستەدا بەدی نەدەکرا. لەنێو خەڵکدا بەوە بەنێوبانگ بوو کە هەر لەسەرەتاوە دژی ئەوە بووە کە تورکیا ببێ بە هاوپەیمانی ئەڵمانیاییەکان و خۆی دەرگیری شەڕ بکات. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بەهۆی نەشارەزایی لە سیاسەتدا، نەیتوانی ببێ بە خاوەنی دەسەڵاتی سیاسی. لە وتار خوێندنەوەکانیدا، زۆر بە گەرمی داکۆکی لە دروشمی «*تورکیا بۆ تورکەکان*» دەکردو خوازیاری ئاشتییەکی عادیلانەو شەرافەتمەندانە بوو. بە ئاشکرا هێرشی دەکردە سەر هێزە داگیرکەرەکان و حکومەتەکەی تۆفیق پاشا و، هەوڵی ئەوەی دەدا کە تورکیا بەبێ مەرج تەسلیم نەبێ و بەیەکجارەکی تێک نەشکێ. لەهەوڵی ئەوەدابوو حزبێکی سیاسی نوێ دامەزرێنێ، بەڵام ئەم کارەی درێژەی

کێشاو وایلێهات تورکیا لێدانێکی کوشنندەتر لەوەی پێکەوت کە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا پێی کەوتبوو.

* * *

لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩١٩دا، ڤنیزلوئیس-ی سەرۆک وەزیرانی یۆنان، بەڕەسمی داوای لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس کرد کە خاوەندارییەتی شاری ئەزمیرو ناوچە یۆنانی نشینەکانی دەوروبەری، بە یۆنان ببەخشرێت و ئەمەش ئەو پاداشتەبوو کە پێشتر لەلایەن هاوپەیمانانەوە لەبەرامبەر هاتنی یۆنان بۆ نێو شەڕ، بەڵێنی درابوو. لەسەرەتادا ئەم داوایەی ڤنیزلوئیس زۆر ئاسایی دەهاتە پێش چاو؛ چونکە ژمارەیەکی زۆر یۆنانی لە کەنارەکانی دەریای ئێژەدا دەژیان.
لەمڕووە ئینگلیزەکان وەک پیشەی هەمیشەییان و لە سۆنگەی نیگەرانیان لە پاراستنی ڕێگای پەیوەندی کردنیان بەهیندو بەرژەوەندییەکانی ولاتەکەیان لەرۆژهەلاتی نێوەڕاستدا، ڕەزامەندی خۆیان بۆ ئەم داوایەی یۆنان نیشاندا. بەڕای سەرۆک ویلسۆنی سەرۆکی ئەمەریکاش، دەست بەسەراگرتنی ئەزمیر لەلایەن یۆنانییەکانەوە دەبووە هۆی دەمکوت کردنی ئیتالیاییەکان کە بەردەوام درووشمی ئەوەیان بەرز دەکردەوە کە: «*دەریای ناوەڕاست، دەریایەکی ئیتالیاییە.*» بە پێی قسەی ئێدوارد *هیل بیرستات*-ی نووسەری ئەمەریکایی: «*بەپێشنیازی سەرۆک ویلسۆن، بەمەبەستی پێشگیری لە هەر جۆرە کردەوەیەکی ئیتالیاییەکان لە ناوچەکەدا*، ڕێگە بە *یۆنان درا تا ئەزمیر داگیر بکات.*»
سێ مانگ دواتر، واتا لە ١٥ی ئایاری ساڵی ١٩١٩دا، بیست هەزار سەربازی یۆنانی بە پشتیوانیی گەلەکەشتی سەربازیی ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنسا لە ئەزمیر دابەزین تا بەقەولی چێرچیل: «*ئاڵای هێرش کردنە سەر ئاسیای نێوەڕاست و داگیرکردنیی هەڵکەن.*» یۆنانییەکانی دانیشتووی ئەزمیر کە چەندین سەدەبوو لە ژێر باڵی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا دەژیان، بە خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لە «*هێزی ئازادیبەخش*» کردو لەگەڵ ئەوەشدا بەدەرفەتیان زانی و دەستیان کرد بە تۆڵەستاندنەوە لە تورکەکان و تا توانیان تورکەکانی ئەزمیرو ناوچەکانی دەوروبەرییان کوشتن.
لەسەرەتادا تورکەکان بڕوایان نەدەکرد یۆنانییەکان توانیبێتیان ئەزمیر داگیر بکەن. تورکەکان زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی ئەوە قەبوڵ بکەن کە لە جەنگدا شکستیان خواردوەو هێزە داگیرکەرەکان لە قوستەنتەنییەدا بسوڕێنەوە، بەڵام قەت ئەوەیان پێ قەبوڵ نەدەکرا هێزەکانی ولاتێک کەتا دوێنێ لە ژێر دەستی خۆیاندابووە دەست بەسەر یەکێ لە گرنگترین شارەکانی ئەنادۆڵ دابگرێ. لەمڕووەوە حەشاماتێکی پەنجا هەزار کەسی لەبەرامبەر مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد لە قوستەنتەنییە کۆبوونەوەو دەنگی ناڕەزایەتیی خۆیان هەڵبڕی. ئەوان لەبەرامبەر لوولەی ڕەشاشی سەربازە داگیرکەرەکاندا، ئاڵای ڕەشیان بەدەستەوە گرتبوو و ماتەمینی نیشتمانییان ڕاگەیاند.
مستەفا کەمالیش لەنێو ئەو حەشاماتەدا بوو، دواتر لەباسی گێڕانەوەی ئەو

ســـاتەدا دەڵێ:« *ئەو دەم تەنها بیرم لەیەک شت دەکردەوە؛ چۆن دەستبەجێ خۆم بگەیەنمە ئەنادۆڵ و لەدژی یۆنانییەکان و دەوڵەتە دەستەمۆیەکەی هاوپەیمانانداکە هیچ کاردانەوەیەکی لەخۆی نیشان نەدابوو، بەرەیەکی مقاوەمەتی نیشتمانی درووست بکەم؟*.»
بەڵام ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو؛ چونکە نەدەوڵەتی تورکیاو نەکاربەدەستانی داگیرکەران، کەیفیان بە مستەفا کەمال نەدەهات. هاوپەیمانان بە کابرایەکی کەللەڕەق و خاوەن بیروبۆچوونی مەترسیداری چەپگەرایانەیان لەقەڵەم دەدا. هەرچەندە کە مستەفا کەمال بەهۆی قارەمانییەتییەکانی لەشەڕدا جێی ڕێزو ستایش بوو، بەڵام لەو سەردەمەدا نەیدەتوانی جێی متمانەیان بێت. مستەفا کەمالیش بەهۆی ئەوەی کە نەیتوانیبوو بگا بە ئامانجەکانی، نارەحەت ببوو و لەبەر بێ پارەیی لە هوتێلێکی بچوک بەنێوی *«پراپالاس»*دا، دەژیا کە دەیڕوانینە سەر کەنداوی داردانێل. دەموچاوی گنج و لۆچی تێکەوتبوو و لەبەر لێهەڵدانەوەی نەخۆشییە کۆنەکەی، ڕەنگی مردووانی گرتبوو.
بەرلەوەی هێزەکانی یۆنان لە ئەزمیر دابەزن، دەوڵەتی بەریتانیا پێشنیازی ئەوەی کردبوو کە سوڵتان ئەفسەرێکی پایەبەرز بۆ بەرەوڕووبوونەوە لەگەڵ تووندوتیژیی ڕوو لەزیادبوون لە ئەنادۆڵدا، ڕەوانەی ئەو ناوچەیە بکات. ئەم پێشنیازە کە مستەفا کەمال لێی بێ ئاگا بوو، لەڕاستیدا هەڕەشەیەک بوو کە هاوپەیمانان لە سوڵتانیان دەکرد؛ بەومانایەی کە ئەگەر سوڵتان ناتوانی ئاسایش و ڕێکوپێکی ناوچەکە بپارێزێ، ئەوا هاوپەیمانان خۆیان دەستبەکار دەبن و هێزەکانی خۆیان دەنێرنە ئەو ناوچەیە.
مستەفا کەمال دوا کەس بوو کە مەزندە دەکرا بۆ ئەم کارە ڕابسپێردرێت، بەڵام لە کۆتاییدا هەروا دەرچوو ئەویان هەڵبژارد؛ چونکە مستەفا کەمال تاکە ژەنراڵێک بوو کە لەبەردەستدابوو و هیچ کارێکی پێ نەسپێردرابوو.
لەو کاتەدا سوڵتان محەمەدی پێنجەم (ڕەشاد) لە ١٩١٨/٧/٢دا، واتا چەند مانگێک بەر لە کۆتایی هاتنی شەڕ، کۆچی دوایی کردبوو و برا بچووکەکەی وەحیدەدین کە تەمەنی ٥٧ ساڵان بوو، بەنێوی محەمەدی شەشەم لە جێی دانیشتبوو. (٥)
فکرو زکری وەحیدەدین کە (٣٦)ەمین و دوا سوڵتانی عوسمانی بوو ئەوەبوو کەسەرو ماڵ و پلەوپایەکەی خۆی بپارێزێ و بەهۆی ئەوەی کەسەری لەو مەسەلانە دەرنەدەچوو، بەڕاوێژی داماد فەرید-ی سەرۆک وەزیران، مستەفا کەمالیان بۆ بەرەوڕووبوونەوەی نائارامییەکانی ئەنادۆڵ هەڵبژارد. ئینگلیزەکان دژی دەستنیشانکرانی مستەفا کەمال بوون و بۆ ئەمەش بەڵگەی ئەوەیان بەدەستەوە بوو کە مستەفا کەمال حەزی لە پێکهێنانی بەرەی مقاوەمەتەو نێوی لەناو لیستی ئەو کەسانەدایە کە ئینگلیزەکان دەیانەوێ بۆ دوورگەی ماڵتا دووریان بخەنەوە. بەڵام سەرۆک وەزیران قەناعەتی بەکاربەدەستانی ئینگلیزی هێنا کە ئەوانەی لە ئەنادۆڵ نائارامییان ناوەتەوە ئەو گروپە یاخییانەن کە هێشتا بە ئەنوەر وەفادارن و دەیانەوێ سەر لەنوێ کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی بژێیننەوە.

ئەگەرچی مستەفا کەمال خۆشیی ئەندامی کۆمیتەی ئیتحیادو تەرەقی بوو، بەڵام سەرۆک وەزیران بە باڵیۆزی بەریتانیای گوت: *«کەس بەقەدەر مستەفا کەمال دژی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی نییە و خاوەنی شۆرەت و ئیحتوبارێکی زۆرە لەسەرانسەری وڵاتداو، دەکرێ متمانەی پێ بکەین. لەڕاستیدا ئەوە هەمان ئەو کەسەیە کە ئێمە پێویستیمان پێیەتی.»*

بەو شێوەیە مستەفا کەمال کرا بە پارێزگاری گشتی و بڕیاربەدەستی تەواوی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیاو بەرلەوەی کە بەرەو ئەنادۆڵ بکەوێتەڕێ، نهێنیەکی تایبەتی لە نێوان خۆی و هەوادارانی لەوەزارەتی جەنگدا دانا؛ بۆ ئەوەی بتوانی لەکاتی پێویستیدا پەیوەندییان پێوە بکات. دوو لە هاوڕێیە وەفادارەکانی خۆیشی لەگەڵ خۆیدا برد. ئەم دوو کەسە بریتی بوون لە کۆڵۆنێل ڕەفعەت کە بڕیار وابوو سەرکردایەتی سوپای سێیەم وەئەستۆ بگرێ و کۆڵۆنێل محەمەد عارف کە زۆر بە مستەفا کەمال دەچوو و لەشەڕی گالیپۆلیدا لە ژێر سەرکردایەتی مستەفا کەمال جەنگابوو. خوو ورەوشت و سەلیقەی ئەم دووکەسە زۆر لێک دەچوو و، عارف تاکە کەس بوو کە مستەفا کەمال لەبەرچاوی خەڵک سۆزو خۆشەویستی خۆی بۆ دەردەبڕی و دەستی لەسەر شانی دادەناو بەنێوی خۆشەویستانە بانگی دەکرد. زۆربەی دوژمنەکانی مستەفا کەمال ئیدعای ئەوەیان دەکرد کە ئەم دوو کەسە پەیوەندی تایبەتییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە.

مستەفا کەمال بەتەمابوو سواری کەشتییەکی هەڵمی بێت کە لە بسفۆڕەوە دەچووە دەریای ڕەش و لە هەموو بەندەرەکانی سەر ڕێگادا دەوەستا، بەڵام لەدواساتدا، باڵیۆزی بەریتانیا بیری لەو مەترسییانە کردەوە کە ڕەنگبێ بەچوونی مستەفا کەمال لەناوچەکەدا بەرۆکی هاوپەیمانانی بگرتبایە، بۆیە بەنیوەشەو کۆڵۆنێل ونیدهام دیدز-ی وابەستەی سەربازیی بەریتانیای ناردەلای سەرۆک وەزیران. کۆڵۆنێلە بەریتانیاییەکە سەرۆک وەزیرانی لەخەوڕاست کردەوەو هۆشداریی ئەوەی دایە کەمەبەستی سەرەکی مستەفا کەمال لەچوونی بۆ ئەنادۆڵ کۆکردنەوەی هێزو پێکهێنانی بەرەی مقاوەمەتە لەدژی ئەوان. ئیدی کار لەکار ترازابوو و سەرۆک وەزیران هیچی لەدەست نەدەهات و تەنها ئەوەندەی پێکرا بڵێ: *«تازە هیچمانم لەدەست نایەت، باڵندەکە قەفەزی شکاندووەو بۆی دەرچووە.»*

مستەفا کەمال، یەک کاتژمێر بەرلەوەی دەستگیر بکرێت لە قوستەنتەنییە ڕایکرد. بەپەلە فرمانی ڕاگرتنی ئەو کەشتییە درا کە ئەو لێی سوار ببوو، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەی کە هەریەک لە هاوپەیمانانی ئینگلیزی و فەرەنسایی و ئیتالیایی لە پشکنینی کەشتییە نەفەرهەڵگرەکاندا ڕۆڵێکی جیاوازیان هەبوو و هیچ کامیشیان متمانەیان بەیەکتری نەبوو، مستەفا کەمال توانی لەدەستیان ڕزگار بێ.

مستەفا کەمال لە ١٩ی ئایاری ١٩١٩دا، واتا چوار ڕۆژ دوای داگیرکردنی ئەزمیر لەلایەن هێزە یۆنانیەکانەوە، لەبەندری *سامسۆن*-ی باکووری تورکیا لە کەشتی دابەزی و سەرەڕای ئەوەی کە فرمانی پێدرابوو تەواوی هێزە تورکە یاخییەکان لەنێوبەرێت، دەست بەجێ دەستی کرد بە ڕێکخستنی بەرەی مقاوەمەتی

نیشتمانی و بە کۆکردنەوەی سوپاوە خەریک بوو.
ئێستا مستەفا کەمال بڕوای پتەوی بەوە هەبوو کە دەتوانی دەوڵەت و سوپایەک دروست بکات کە نەک تەنها لەبەرامبەر دەوڵەتە لاواز و کارتۆنییەکەی قوستەنتەنییەدا، بگرە دەتوانێ لەبەرامبەر هێزە داگیرکەرە فەرەنسایی و ئیتالیایی و بەریتانیاییەکانیش بوەستێ و ئەمە زۆرانبازییەکی سەرسوڕهێنەربوو.
مستەفا کەمال، هەفتەیەک دوای گەیشتنی بۆ سامسۆن، چووەنێو سەرزەمینی ئەنادۆڵ و گەیشتە شاری (ئاماسیا) کە کەوتۆتە نێوەڕاستی شارێی ڕۆژهەڵات بەرەو ڕۆژئاوای تورکیاوە. لەوێ چەند دانیشتنێکی نهێنی لەگەڵ سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتییەکان و فەرماندە سەربازییەکاندا سازداو، پلان و بەرنامەکانی خۆی بۆ خستنەڕوو. ئەو بەباشی دەیزانی کە بەبێ پشتیوانی سوپا ناتوانێ هیچ کارێک بکات، بەڵام لە هەمانکاتدا دەهەزار گەریلای چەکدار لە پشت ئەو کێوانەی کە دەیانڕوانیە سەر ئەزمیر، لەگەڵ یۆنانییەکاندا دەجەنگان و مستەفا کەمال دەیتوانی وا بکات سوپا- واتا ئەوەی لە سوپا بەجێ مابوو کە پاشماوەی چەند لەشکرێک بوو- پشتگیری لێ بکات.
ماوەی چەند هەفتەیەک لە گوندو دێهاتەکانی دەوروبەردا گەڕاو، لە قسەکردنەکانیدا باسی لە زەرووڕەتی مقاوەمەت لەبەرامبەر هێزە داگیرکەرەکاندا دەکرد، بەڵام هەمیشە تێبینی ئەوەی دەکرد بەخەراپە نێوی سوڵتان نەهێنێ و خەڵک لەخۆی نە وروژێنێت؛ چونکە هێشتا خەڵکی ئەو ناوە بڕوایان بە پیرۆزیی سوڵتان هەبوو. مستەفا کەمال دەیگوت سوڵتان لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بەندکراوەو دەسەڵاتی لێ سەندراوەتەوە و، پەیتاپەیتا ئەو درووشمەی دەگوتەوە: *«خەڵکی تورکیا، بەر لەوەی هێزی هاوپەیمانان لەنێوتان بەرن، خۆتان ڕزگار کەن.»* مستەفا کەمال وتاربێژێکی لێوەشاوەو کارامەبوو و، قسەکانی دەکەوتنە بەردڵان و لەبەرئەوەی کە هێشتا خەڵک بەنوێنەری سوڵتانیان دەزانی، بڕوایان بە قسەکانی دەکرد. مستەفا کەمال دەیگوت: *«سوڵتان منی بۆ یارمەتیدانی ئێوە ناردووە.»* بۆیە خەڵک فرمانەکانییان جێبەجێ دەکردو کاربەدەستانی دەوڵەت باج و خەراجیان نەدەنارده قوستەنتەنییەو سەرکردە سەربازییەکانیش بەڕێنوێنی مستەفا کەمال، چەکەکانی خۆیان تەسلیمی هاوپەیمانان نەدەکرد.
لە ٢٢ی حوزەیران کە مانگێک و چەند ڕۆژێک بەسەر هاتنی مستەفا کەمال بۆ ئەنادۆڵ تێپەڕدەبوو، مستەفا کەمال ب برووسکە بڕیارنامەیەکی نهێنی بۆ تێکڕای کاربەدەستانی سوپایی و ئیداریی جێی متمانەی خۆی نارد کە سێ ڕستەی یەکەمی بڕیارنامەکە بە باشی بۆچوونە سیاسییەکانی مستەفا کەمال دەردەخەن:

*١- سەرووی نیشتمانی و سەربەخۆیی وڵات لە مەترسی دایە.*

*٢- حکومەتی ناوەندی توانای ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆی نییە و بەم پێیە ناتوانی خواست و ویستەکانی خەڵک بەدی بێنێ.*

*٣- تەنها هێزی ئیرادەو سووربوونی گەل دەتوانێ سەربەخۆیی وڵات لە مەترسی لەنێوچوون ڕزگار بکات.*

ئینجا پێشنیازی ئەوەی کرد کە کۆنگرەیەکی نهێنی لە سیواس کە قایمترین شاری ئەنادۆڵ بوو، پێک بهێندرێت بۆ ئەوەی لەوێ نوێنەرانی گەل خواستەکانی گەلی تورک بۆ دنیا بخەنەڕوو. دەستبەجێ دەوڵەتی قوستەنتەنییە هەواڵی ناردنی ئەم بڕیارنامەیە و پێک هێنانی ئەم کۆنگرەیەی پێ گەیشت و بۆ پوچەڵکردنەوەی هەوڵەکانی مستەفا کەمال، وەزارەتی نێوخۆ بڕیارنامەیەکی بۆ تەواوی ویلایەتەکان نارد کە تێیدا هاتبوو، «*هەرچەندە مستەفا کەمال بە سەربازێکی گەورە لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام بینینە سیاسییەکەی لە ئاستی زانیارییە سەربازییەکانیدا نییە. ئەو سەرەڕای هەڵەو لادانە ئیدارییەکانی، بەناردنی تەلگراف لەلایەن ڕێکخراوە نایاساییەکانەوە کە مەبەستیان پارە کۆکردنەوەیە، تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە. گێڕاندنەوەی بۆ قوستەنتەنییە لە ئەستۆی وەزارەتی جەنگە، بەڵام وەزارەتی نێوخۆ بەڕەسمی ئەوە ڕادەگەیەنی کەلەمەودوا ئەو کابرایە هیچ پۆستێکی لە دەوڵەتدا نییە و فرمانتان پێ دەدەین بە هیچ شێوەیەک و لەژێر هیچ ناوێکدا گفتوگۆی لەگەڵدا نەکەن و هیچ یەک لە داواکانی لە بواری کاروباری دەوڵەتدا، جێ بەجێ مەکەن.*»

* * *

لەسەرەتای تەمموز، دوای گۆڕینەوەی کۆمەڵێ تەلگراف کە تێیاندا، دەوڵەت بەڕەسمی مستەفا کەمالی بانگ دەکردەوە قوستەنتەنییە و ئەویش بە توندی لاساری دەنواند، دەوڵەت مستەفا کەمالی لەسەرجەم پۆست و پلەو پایەکانی بێبەش کردو لە کار وەلاوەی نا.

مستەفا کەمال دەستبەجێ دەست لەکارکێشانەوەی خۆی لە سوپادا ڕاگەیاندو جلی سیڤیلی پۆشی و تەلگرافێکی بۆ سوڵتان لێداکە تێیدا هاتبوو: «*تا ئەوکاتەی گەلی تورک بەسەربەخۆیی خۆی شاد دەبێتەوە لە ئەنادۆڵ دەمێنمەوەو ناگەڕێمەوە.*»

بەناردنی ئەم تەلگرافە، مستەفا کەمال بەگەری ئەوەی لەنێوبرد کە جارێکی دیکە بگەڕێتەوە قوستەنتەنییە. چێرچیڵ دەنووسێ: «*گەلی تورک بە پێچەوانەی شێتایەتییەکانی پێشووی، تاوانە پڕ لە شەرمەزارییەکان، حکوومەتی گەندەڵ، شەڕە نێوخۆییەکان، تێشکان لەجەنگی گەورەداو لەبەریەک هەڵوەشانی ئیمپراتۆرییەتەکەی، هێشتا زیندووبوو و لەنێو سینەیدا دڵی نەژادێک لێیدەدا کە ڕۆژێک ملی لەبەر ملی هەموو جیهان نابوو. لە قوستەنتەنییە دەوڵەتێکی فیشاڵ و کارتۆنی لەژێر سێبەری گەلە کەشتیی هاوپەیمانانیدا حوکمی دەکرد، بەڵام لە نێو شاخ و دۆڵە وشکەکانی ئەنادۆڵ کە نیشتمانی ڕاستەقینەی تورکەکان بوو، تاقمێک خەڵکی هەژارو دەست کورت نیشتەجێ بوون کە دژی ئەو حکومەتە بوون و قەبوڵیان نەبوو.*»

* * *

هەرکەس کە خوازیاری بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی بێت، پێویستی بەوە هەیە کە تاڕادەیەکیش بەخت و شانس یارمەتی بدەن. لە کاتێکدا کە نوێنەرانی کۆنگرەی سیواس بەشەو و، بە نهێنی بەکوێرە ڕێیە شاخاوییەکاندا بەرەو مەنزڵ بەڕێ کەوتبوون، دەوڵەتی قوستەنتەنییە فرمانی دەسگیرکردنی مستەفا کەمالی دا.

کەمتر لە شەش کیلۆمەتر مابوو بۆ ئەو شوێنەی کە پۆلیسەکان خۆیان لە مەتەرێز نابوو و چاوەڕێی فەرماندەی یاخی بوون کە سوارێک بەغار خۆی گەیاندە مستەفا کەمال و ئاگاداری کردەوە. مستەفا کەمالیش ڕێگەی خۆی گۆڕی و بەلاڕێدا گەیشتە سیواس. لەوێ هێزە چەکدارە وەفادارەکانی هەموو هێرش و مەترسییەکیان پوچەڵ دەکردەوە.

لەمیانەی دانوستانەکانی نێو کۆنگرەدا، جارێکی دیکە بەخت بەهانایەوە هات. لەسەرەتادا زۆربەی نوێنەرانی بەشداری بووی کۆنگرە، دژی ئەو دەسەلآت و توانایە بوون کە مستەفا کەمال بۆخۆیی دەویست، بەلآم ڕۆژی سێیەمی کۆنگرەکەو لەنێو هەراو هۆریای بەشداربووانDA، مستەفا کەمال تەلگرافێکی دەست کەوت کە لە قوستەنتەنییەوە بۆ پارێزگاری مەلآتیا کە پارێزگایەکی کوردنشین بوو لێدرابوو، تێیدا دەوڵەت داوای لە پارێزگاری مەلآتیا کردبوو هۆزە کوردەکان کۆ بکاتەوەو چەکداریان بکات و هێرش ببەنە سەر سیواس. مستەفا کەمال ناوەرۆکی تەلگرافەکەی بۆ نوێنەرانی کۆنگرە خوێندەوەو بەگاڵتە پێ کردنەوە گوتی: «چۆن دەوێرن *هۆزە چادرنشینەکان بۆ دەستگیریی تورکە نیشتمانپەروەرەکان بنێرن؟*» ئەم قسانە هەستی نیشتمانپەروەریی نوێنەرانی وروژاندو سەرئەنجام مستەفا کەمال توانی قسەی خۆی بباتە سەرو بەسەر فەزای کۆنگرەکەدا زاڵ بێت. لە سیواس، بەرەی مقاوەمەت لە شێوەی ناوچەیی دەرچوو و گەیشتە ئاستی جوڵانەوەیەکی نیشتمانی فراوان و، دەوڵەتێکی کاتی بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمال دامەزرێندرا.

ئێستاکە مستەفا کەمال لەسەری بوو لە ڕێگەی ئەو بەڵگەنامانەی کە دەستی کەتبوون، بیسەلمێنێ کە فرمانی خۆ ئامادەکردن و هێرشی کوردەکان لەلایەن داماد فەرید-ی سەرۆک وەزیرانەوە- واتا هەمان ئەو کەسەی کە ئەوی ناردبۆ ئەناردۆڵ- دراوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەنامەکان ئەوەیان دەردەخست کە ئینگلیزەکان یەکێ لە ڕاسپێردراوانی دەزگای سیخوڕیی خۆیان بەنێوی کاپتن نۆئێل یان، ناردۆتە نێو کوردەکانەوەو ئەم سیخوڕە کارامەیە هەڵەیەکی گەورەی کردبوو و، ڕاپۆرتێکی لەبارەی چالاکییەکانی خۆی بەتەلگرافێکی ئاشکرا ناردبۆ قوستەنتەنییە کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا هاودەستیی ئینگلیزەکانی دەسەلماند.

مستەفا کەمال ئۆلتیماتۆمێکی دابە قوستەنتەنییەو داوای ئەوەی کرد کە دەبێ داماد فەرید لەکار وەلاوە بنرێت، بەلآم هیچ وەلآمێکی نەدرایەوە، بۆیە بڕیاریدا پەنا بۆ کردەوەی توندترو کاریگەرتر ببات. لەمڕووەوە فرمانیدا سەربازەکانی دەست بەسەر ناوەندەکانی پۆستەو تەلگرافدا بگرن و بەم کارەی پەیوەندیی نێوان پایتەخت و ناوچەکانی دیکەی تورکیای پچڕاندو، ئەو کیسە پۆستییانەی کە دارایی دەوڵەتیان لێدابوو، دەستیان بەسەرداگیراو نێردرانە بارەگای کۆنگرە نیشتمانی لە ئەنقەرە.

لەو کاتەدا ئەنقەرە شارێکی زۆر بچوک بوو کە مستەفا کەمال لەبەر خاتری ئەوەی کە لە ڕووی جوگرافیاییەوە کەوتبۆ ناوەندی تورکیاوە و لە ڕووی بەرگرییەوە پێگەیەکی گرنگ بوو و بەهێڵی شەمەندەفەریش بە قوستەنتەنیەوە بەسترابۆوە، بەناوەند هەڵیبژاردبوو . دواتر ناوەکەی گۆڕاو بوو بە ئانکارا.

دوای چەند ڕۆژێک سوڵتان ملی بۆ ئەم داوایەی مستەفا کەمال کەچ کردو داماد فەریدی لەسەر کار لاداو هەڵبژاردنی گشتی سازدرا کە تێیدا هێزە نیشتمانییەکان، واتا هەوادارانی مستەفا کەمال، زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمانیان بەدەست هێنا.

لەو کاتە مستەفا کەمال بەیەکێ لە برادەرەکانی خۆی گوتبوو: *«ئێستا قۆناغی یەکەمی خەباتمان کۆتایی پێ هاتووە.»*

ئەم سەرکەوتنەی مستەفا کەمال بەهەر پێوەرێک کە بپێودرێت، سەرسوڕهێنەربوو؛ چونکە تەنها لەماوەی چوار مانگدا توانیبووی ئەو حکومەتەی کە ئەوی لەسەر کارلادابوو، لێبخات و سەرۆک وەزیرانیش کە دەستەمۆی ئینگلیزەکان بوو، لەسەر ڕێگای خۆی هەڵگرێ.

مستەفا کەمال لەشاری ئەرزڕۆمەوە بۆ نوێنەرایەتی ئەنجوومەنی نیشتمانی هەڵبژاردرا، بەڵام لە هەمانکاتدا کە نوێنەرانی دیکە بە خۆشحاڵییەوە لە شارە دوورەکانی تورکیاوە بەرەو قوستەنتەنیە بەڕێ کەوتبوون، ئەو نەچووە قوستەنتەنیە؛ چونکە بڕوای وابوو هەر دانیشتنێکی پەرلەمانی کە لە قوستەنتەنییەی داگیرکراودا ئەنجام بدرێت، مەحکوم بە تێشکانە.لەمەشدا مستەفا کەمال ناهەقی نەبوو؛ یەک هەفتە دوای مەراسیمی کردنەوەی پەرلەمان لە کانوونی دووەمی ١٩٢٠دا، هێزی هاوپەیمانان گوشاریان خستە سەر سوڵتان کە بە تۆمەتی دەست تێداهەبوونی وەزیری جەنگ و سەرۆکی ستادی سوپا لەو زنجیرە دزییانەی کە لە عەمباری چەک و جبەخانەکانی هاوپەیمان کراون، ئەم دوو کەسە لەسەرکار لابدات، بەڵام لادانی ئەم دووەش کۆتایی بە گرفتەکە نەهێناو چەند ڕۆژ دواتر دیسان هێزە نیشتمانییەکان هەڵیان کوتایە سەر عەمباری چەکی فەڕەنساییەکان و هەشت هەزار تفەنگ و چل ڕەشاش و بیست هەزار پاکەتە فیشەکیان دزی.

هاوپەیمانان بەهۆی کەمی ژمارەی سەربازەکانیان نەیاندەتوانی بەر بە چالاکیی هێزە نیشتمانییەکان لە ئەنادۆڵدا بگرن، بەڵام دوای ئەو ڕووداوانە بڕیاریاندا بوونی سەربازیی خۆیان لە تورکیادا پەرەپێ بدەن و، تەنها بە قوستەنتەنییە نەوەستن و بگرەپەل بۆ ناوچەکانی دیکەش بهاوێن.

لە ١٦ی ئازاردا گەلەکەشتی جەنگیی بەریتانیا لە تەنیشت پردی گالاتا لەنگەری هاویشت و ئۆتۆمبیلە زرێپۆشەکانیان لە شەقامەکانی شاردا دابەزاند، کە دوای تێپەڕبوون بەشەقامە تەنگ و کۆڵانە لێژەکانی قوستەنتەنیەدا، وەزارەتی جەنگ و وەزارەتی دەریاوانی و ناوەندی رادیۆیان داگیرکرد. لەو ڕۆژە بەدواوە بەڕەسمی پایتەخت لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە داگیرکرا. هاوپەیمانان هێرشیان کردەسەر بالاخانەی ئەنجوومەنی نیشتمانی و سەرۆک وەزیرانیان لەگەڵ ١٣٦ کەس لە نوێنەرانی ئەنجومەن کەسەربە هێزە نیشتمانییەکان بوون نەیانتوانیبوو ڕابکەن، بەرەو دوورگەی ماڵتا دوورخستەوەو ئەنجوومەنی نیشتمانی هەڵوەشێندرایەوە.

کاتێ مستەفا کەمال لە ئەنقەرە ئەم هەواڵەی بیست، گوتی: *«ئەمڕۆ بەم داگیرکردنە سەربازییە، تەمەنی حەوت سەد ساڵەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی*

كۆتایی پێ هێندرا.» ئینجا فرمانیدا هه‌ر ئه‌فسه‌رێكی ئینگلیز كه له ئه‌نادۆڵ به‌رچاو هات، ده‌ستگیر بكرێ. (٦) ئه‌و نوێنه‌رانه‌ی كه توانیبوویان ڕابكه‌ن و خۆیان ڕزگار بكه‌ن، گه‌ڕانه‌وه ئه‌نقه‌ره‌و له‌وێ ئه‌نجومه‌نی مه‌زنی نیشتمانیی توركیایان له ٢٣ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠دا، دامه‌زراند.
مسته‌فا كه‌مال به‌سه‌رۆكی ئه‌نجومه‌ن هه‌ڵبژێردراو به‌یاننامه‌یه‌كی بۆ ڕای گشتی توركیا ده‌ركرد كه تێیدا هاتبوو: «*به‌بێ هیچ مه‌رجێك، ده‌سه‌ڵاتدارییه‌تی موڵكی گه‌له. ئه‌نجومه‌نی مه‌زنی نیشتمانی تاكه نوێنه‌ری ڕاسته‌قینه‌ی خه‌ڵك و به‌رزترین ده‌سه‌ڵاتی وڵاته كه هێزی یاسادانان و ڕاپه‌ڕاندنی له خۆدا كۆكردۆته‌وه.*»
به‌ڵام ئه‌م وشه جوان و ڕازاوانه ڕاستییه‌كی تاڵیان له‌خۆدا حه‌شاردابوو؛ مسته‌فا كه‌مال سه‌رۆكی ده‌وڵه‌تێكی كاتیی بێ پاره‌و پول و بێ ده‌سه‌ڵات بوو، كه هیچ جۆره ڕێكخستنێكیشی تێدا به‌دی نه‌ده‌كرا. چیوای پێ نه‌چوو كه فڕۆكه‌كانی هاوپه‌یمانان به ئاسمانی ئه‌نادۆڵه‌وه فڕین و له‌و به‌یاننامانه‌یدا كه‌له ئاسمانه‌وه بۆ خه‌ڵكیان فڕێ ده‌دایه خواره‌، داوایان له یاخییه‌كان ده‌كرد خۆیان به‌ده‌سته‌وه بده‌ن. له قوسته‌نته‌نییه‌ش به‌بێ ئاماده‌بوونی مسته‌فا كه‌مال، دادگا نێوبراوی دادگایی كردبوو و بڕیاری له‌سێداره‌دانی به‌سه‌رداد‌ابوو.
هاوپه‌یمانان ڕێگه‌یاندا سوڵتان سوپایه‌ك به‌نێوی «*سوپای خه‌لیفه*» پێك بێنێ و و بینێرێته ئه‌نادۆڵ؛ چونكه به‌پێی ڕێككه‌وتننامه‌ی ئاگربه‌س، سوڵتان مافی ئه‌وه‌ی نه‌بوو خاوه‌نی سوپا بێت.
ئه‌و سوپایه‌ی كه پێكهێندرا، ژماره‌یه‌ك موفتی و پیاوی ئایینیشی له‌گه‌ڵ درا كه ئه‌ركیان ئه‌وه‌بوو خه‌ڵك ئاگاداربكه‌نه‌وه‌و هۆشیاریی ئه‌وه‌یان بده‌نێ كه ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ مسته‌فا كه‌مالدا بن ئه‌وا نكۆڵییان له‌بوونی خواوه‌ندو خه‌لیفه‌كه‌ی كردووه. ئه‌م پڕوپاگه‌نده ئایینیانه بوونه هۆی ئه‌وه‌ی كه له سه‌رانسه‌ری ئه‌نادۆڵ ژماره‌یه‌ك خه‌ڵك له دژی مسته‌فا كه‌مال ڕاست بنه‌وه. چی وای پێنه‌چوو كه لایه‌نگرانی مسته‌فا كه‌مال ناچاربوون بۆ مانه‌وه‌ی خۆیان په‌نا بۆ شه‌ڕكردن له‌گه‌ڵ ئه‌و جۆره‌كه‌سانه‌دا ببه‌ن. وڵاته له ئاستانه‌ی شه‌ڕی نێوخۆییدا بوو و، داوێنی ئه‌و گرژی و نائارامییه گه‌یشتبۆ ده‌وروبه‌ری ئه‌نقه‌ره‌ش.
دیار نییه ئاخۆ ئه‌گه‌ر ئه‌و هێرشانه‌ی كه ده‌كرانه سه‌ر یاخییه‌كان، به‌سه‌ركه‌وتوویی كۆتاییان پێ هاتبایه، ڕێڕه‌وی ڕووداوه‌كان به كوێ ده‌گه‌یشت.
بێگومان مسته‌فا كه‌مال نه‌یده‌توانی تاهه‌تا هه‌یه به‌رگری بكات؛ چونكه زۆربه‌ی ئه‌و سه‌ركرده سه‌ربازییانه‌ی كه ئه‌ویان گه‌یاندبۆ ده‌سه‌ڵات، ورده ورده تووشی دوو دڵی و نارِه‌زایی ببوون. هه‌روه‌ها لادێ نشینه‌كانی ئه‌نادۆڵیش له شه‌ڕ بێزاربببوون و، تاكه ئاواتیان ئه‌وه‌بوو به ئاشتی و ئارامی بژییه‌ن.
ئه‌نقه‌ره‌ش به كه‌ڵكی ئه‌وه نه‌ده‌هات بكرێته نێوه‌ندی سه‌ركردایه‌تی؛ چونكه چیوا له گوندێك گه‌وره‌تر نه‌بوو، هه‌مووی له‌سه‌ر دووگرد بنیادنرا بوو، له هاویندا زۆر گه‌رم و له زستانیشدا یه‌كجار ساردبوو.
له‌میانه‌ی شه‌ڕدا جارێك ئاگری تێبه‌ربوو و ئاسه‌واری سووتانه‌كه‌ی پێوه‌دیاربوو.

پەیامنێرێکی مەیدانیی تورک بەنێوی عەلائەدین حەیدەر، کە بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێک سەردانی ئەو شارەی کردبوو، کاتێ لەرووی سادەییەوە داوای ژوورێکی کرد بۆ ئەوەی شەوی تێدا بکاتە رۆژ، لەوەلامدا پێیانگوت: شارەکە میوانخانە و ژووری تێدانییە، بەلام ئەگەر بەختی هەبێ دەتوانێ لەسەر ئەو قالدرمەیەی کە ژمارەکراوە، شوێنێک بۆ نووستن بدۆزێتەوە. سەرئەنجام پەیامنێری نێوبراو ئەوشەوە لەنێو تاقەیەکدا نووست!

ئەو شوێنە، ناوەندی سەکردایەتیی تورکیای نوێ بوو کە تێیدا مستەفا کەمال لەسەر بنەمای «رۆژ» بۆ «رۆژێ» دەژیا. شەوانە لەگەڵ برادەرە وەفادارەکەی کۆلۆنێل عارف بەجلەوە دەنووست و ئەسپەکانیشیان بەزین و بەرگ کراوی لە حەوشەکەی خوارەوەدا چاوەڕێیان بوون تا ئەگەر لە پرێکەوە هێرشیان کرایە سەر، بەپەلە بۆی دەرچن. ئەگەر بهاتایەو سەرکەوتوانی جەنگی جیهانی یەکەم لە شارێکی دوورەدەستدا تووشی دووهەڵەی گەورەی مێژوویی- لەو هەڵانەی کە خەڵکی ئاسایی هەستیان پێ ناکەن- نەبووبانایە، ئەوا بەدڵنیاییەوە مستەفا کەمال و هێزە لایەنگرەکانی کە دەنگی نارەزایەتییان بەرزببۆوە، نەیاندەتوانی چیدی درێژە بەو بارودۆخە بدەن کە تێیدا دەژیان.

* * *

لەبەهاری ساڵی ١٩٢٠دا، لوید جۆرج-ی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا، سەرۆک ویلسۆن-ی سەرۆکی ئەمەریکا و کلمانسۆ-ی سەرۆک وەزیرانی فەرەنسا، لە پاریس بەدابەشکردنی میراتی «*پیاوە نەخۆشەکەی ئەورووپا*»وە خەریک بوون. ئەم دابەشکردنە لەشێوەی رێککەوتنێک بوو کە لە شاری سیڤەری نزیک پاریس ئیمزا کرا، بەلام هەرگیز ناوەرۆکەکەی جێبەجێ نەکرا. کاتێ لە کۆتاییەکانی مانگی ئایار ناوەرۆکی رێککەوتننامەی نێوبراو بلاوکرایەوە، دەوڵەتی عوسمانی ماتەمینیی نیشتمانی راگەیاند؛ چونکە ناوەرۆکی رێککوتننامەکە زۆر توندو خەشن بوو و، تەنانەت لە پەیماننامەی ئاشتی ڤێرسای کە بەسەر ئەڵمانیای تێکشکاودا سەپێندرابوو، توندتر دەهاتە پێش چاو.

ئەم رێککەوتننامەیە بەشێوەیەکی یەکجار فراوان لە نێوخۆی تورکیادا دەنگی دایەوەو خەڵک لەو باوەڕەدابوون کە ئەگەر بەرەی مقاوەمەتی نیشتمانی پێک نەهێندرێت، ولات لەنێو دەچێت و لەبەرئەوەی سوڵتان ملکەچی داواکانی هاوپەیمانانە، کەواتا تەنها یەک کەس دەتوانی تورکیا رزگار بکات. ئەگەر بهاتبایەو هاوپەیمانان لە پاریس پشتیوانی خۆیان بۆ مستەفا کەمال راگەیاندبایە، ئەوا ئەودەم باشترین رێگایان هەڵبژاردبوو.

دەستبەجێ شەڕی نێوخۆیی نەماو بەهەزاران کەس پاڵیان دایە مستەفا کەمال و تەنانەت ژمارەیەک چەکداربۆ ماوەی دوو رۆژی تەواو ساختومانی بنکەی کۆمیسەری بالای بەریتانیایان دایە بەر دەسرێژی گوللە.

دووەم هەڵەیەک کە هاوپەیمانان تووشی بوون و زۆر لە هەڵەی یەکەمیان گەورەتر بوو، ئەوەبوو کە رێگەیان بە یۆناندا تا بەکەیفی خۆی لە ئەنادۆڵدا پێشرەوی بکات.

لەو کاتەدا هاوپەیمانان لەوەی کە لەگەڵ کێدا دانوستان بکەن توشی دوو دڵی و ڕاڕایی ببوون؛لەگەڵ ڕێبەری گەریلاکاندا دانوستان بکەن کە خاوەن هێز بوو، بەڵام دەسەڵاتەکەی یاسای نەبوو، یان لەگەڵ سوڵتاندا کە فیشۆڵ و بێدەسەڵات بوو؟
هاوپەیمانان پێیانوابوو کە دەبێ سەرەتا نائارامییە نێوخۆییەکانی تورکیا کۆتایی پێ بهێندرێت، ئینجا بکرێ پەیماننامەیەکی ئاشتیی عادیلانەو شەرافەتمەندانە ئیمزا بکرێت.
کابرایەکی پیری چاویلکە لەچاو ئامادەی کۆنفرانسەکەی پاریس ببوو کە ئەویش ڤنیز لوئیسی سەرۆک وەزیرانی یۆنان بوو.
ئێستاکە، وڵاتەکەی ئەزمیری داگیرکردبوو لە بیست ساڵ بەر لەو مێژووەوە خەونی بە دامەزراندنی ئیمپڕاتۆرییەتی یۆنانی لەسەر کەنارەکانی دەریای ناوەڕاستی ئەنادۆڵدا دەدیت.
لوید جۆرج دەیزانی کە یۆنان باشترین و تۆکمەترین هێزەکانی خۆی لە ئەزمیر مۆڵ داوەو بەکڕینی چەک و تەقەمەنیی زیادەی بەریتانیاو فەرەنسا بەنرخێکی هەرزان، ئامادەی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی سەربازییە. لەڕاستیدا، ئەوکاتە یۆنان لەڕووی سەربازییەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، خاوەنی باشترین سوپابوو و ئامادەی هێرش بردنە سەر وڵاتانی دەوروبەربوو. ئەمەش لە کاتێکدابوو کە هەریەک لە هاوپەیمانان بەرەوڕووی گرفتەکانی دوای جەنگ ببوونەوەو توانای ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی سەربازیی نوێیان لە خۆیاندا بەدی نەدەکرد؛ ئیتالیا لە ئاستانەی شۆڕشی کۆمەنیستی دابوو، فەڕەنسا لە سوریا گرفتار ببووو بەریتانیاش لەگەڵ شەڕی نێوخۆیی لە ئیرلەندا و ڕاپەڕینی هیندییەکاندا بەرەوڕوو ببۆوە. ئەمەریکاش لەبەر نەخۆشیی سەرۆک ویلسۆن و دژایەتیی کۆنگریس، نەیدەویست خۆی لەکاروباری نێودەوڵەتی وەربدات.
کەواتا ڤنیز لوئیس-ی سەرۆک وەزیرانی یۆنان، پێشنیازی ئەوەی بەهاوپەیمانان کرد کە بۆ سەرکوتکردن و بنبڕکردنی نائارامییە نێوخۆییەکانی تورکیا، سوپای یۆنان بخاتە ژێر دەستیانەوە. هاوپەیمانان بەبێ گوێدانە ئەوەی کە ئایندەو ئەنجامی ئەم کارەیان چۆن و چی دەبێت، بەسوپاسەوە پێشنیازەکەییان پەسند کرد.
لەسەرەتای مانگی حوزەیران، کەلەکەشتی جەنگیی بەریتانیالە دەریای سپی ناوەڕاست و کەنداوی داردانێلدا مۆڵ دران و، لە ٢٢ی حوزەیرانیشدا، دوو سوپای یۆنانی لە ئەزمیرەوە بەرەو نێوخاکی ئەنادۆڵ کەوتنەڕێ.
دوژمنایەتی و نەفرەتی نێوان تورک و یۆنانییەکان زۆر بەناوبانگەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بیزانس و، وائێستاکە سیاسیەتمەدارانی وڵاتانی هاوپەیمان بەبێ گوێدانە ئەم پێشینە مێژووییە، فاکتۆری سەرەکیی یەکێتی و یەکگرتنی تورکەکانیان هێنایە کایەوەو بارودۆخێکیان خوڵقاند کە تێیدا تەواوی ئەو گروپانەی کە لە ئاکامی شەڕی نێوخۆیی دا لێک دابڕابوون و پارچەپارچە ببوون، لەبەرامبەر یۆنانییەکاندا لەیەک ڕیزدا بوەستن.

* * *

لە قۆناغی یەکەمدا تەنها یەککگرتوویی بەس نەبوو؛ ڕەنگبێ تورکەکان بیانتوانیبا لە قوستەنتەنییەو بە غافڵگیری چەند گوللەیەک بە بنکەی کۆمیسەری باڵاوە بنێن، بەڵام نەیاندەتوانی بەو گروپە نارێک و پێخواسانەی کە چەکی دەستیان تاپڕو چەخماخی سەرپڕبوو، خۆیان لەبەرامبەر ئەو سوپا بە هێزەی یۆناندا ڕابگرن کە سەربازەکانی بە مۆدێرنترین چەکی سەردەم چەکدارکرابوون و، لەژێر چاودێریی ڕاوێژکارە ئینگلیزییەکاندا دەجولانەوە.

شەڕی نێوان تورک و یۆنانییەکان لە سێ قۆناغدا و لەساڵانی ١٩٢٠، ١٩٢١، ١٩٢٢ دا ، ڕوویدا. لە قۆناغی یەکەمدا هێزە ڕەنگاوڕەنگە نیشمانییەکان کە بەپەلە پەل لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات کۆکرابوونەوەو ڕەوانەی بەرەی شەڕی ڕۆژئاوای تورکیا کرابوون، بەسەختی تێکشکان و تارومار کران. لە قۆناغی دووەمدا سوپای یۆنان، پێی نایە ویلایەتی (تراس)، واتا تورکیای ئەوروپاوە و، هێزەکانی سوپای یۆنان دوا سەربازی هێزە نیشتمانییەکانیان لەو ویلایەتە وەدرناو گەیشتنە نزیک قوستەنتەنییە.

لوید جۆرج نەیدەزانی لە خۆشیان چی بکات و، وەک ئەوەی ئاگای لە نەخشەی جوگرافیایی نەبێ، لە کۆنفرانسی هاوپەیمانان کە لە شاری (ئیسپا)ی بەلژیکا سازدرابوو گوتی: «*تورکەکان تێکشکاون و بەپەلە بەرەو مەککە لە پاشەکشێ دان.*»

لۆرد کۆرزن-ی وەزیری دەرەوە قسەکەی بۆ ڕاست کردەوەو گوتی: «*بەرەو ئەنقەرە.*»

لوید جۆرج وەڵامی دایەوەو گوتی: «*سوپاسی لۆرد کۆرزن دەکەم کە وردەکارییەکانم بۆ ڕاست دەکاتەوە، بەهەرحاڵ تورکەکان تێکشکاون.*»

لەکاتێکدا کە قۆناغی یەکەمی شەڕ لە هاوینی ساڵی ١٩٢٠دا کۆتایی پێ دەهات، بارودۆخی قوستەنتەنییە سەیرو دیدەنی بوو.

سوڵتان سەر لەنوێ داماد فەریدی کردبۆوە سەرۆک وەزیران و ئەویش حکومەتێکی پێک هێنابوو کە چێرچیل پێی دەگوت: «*دەوڵەتی بووکەکانی بووکەڵەبازی.*»

سەرۆک وەزیران، شەو ڕۆژ لە دژی یاخییەکان قسەی دەکردو وتاری بۆ خەڵک دەخوێندەوە، بەڵام هیچی لەدەست نەدەهات و سەرنێزەی سەربازە یۆنانییەکان تەنها شتێک بوو کە کەوتبۆ نێوان ئەو و مستەفا کەمالەوە و لێکی جیا دەکردنەوە.

تێشکانە سەرەتاییەکان لێدانێکی کوشندەی لە ئابڕو و ئیحتوباری مستەفا کەمال دا؛ چونکە لەزۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵات تێشکان و سەرکەوتن بەنێوی ڕێبەرەکانەوە دەنوسرێ و ئەگەر بهاتایە لە جەنگەکانی ساڵی ١٩٢١یشدا شکستی خواردبایە، ئەوا ڕەنگبوو هەر بەدەستی ئەو نوێنەرانەی ئەنجومەن بکوژرابایە کە بەخوێنی سەری تێنبوو بوون. بەڵام لەو ساڵەدا بارودۆخ بە قازانجی مستەفا کەمال گۆڕا و لە کاتێکدا کە هەموان چاوەڕێی هێرشی سەر لە نوێی یۆنانییەکان بوون، مستەفا کەمال بە دانوستانی سیاسی لەگەڵ وڵاتانی بیانیدا خەریک بوو. روسیا پارەو چەکی بۆ نارد، ئیتالیاش بەڕادەیەکی کەمتر لە ڕوسیا یارمەتی دا و فەڕەنساش دوای کۆمەڵێ تەماسی نهێنی، بەڵێنی ئەوەیدا کە یارمەتیی ئەنقەرە بدات. جگە لە سوڵتان و دارودەستەکەی، تەواوی تورکەکان یەکیان گرتبوو و لەیەک ڕیزدا دەجەنگان و

ئه‌وه‌ش له كاتێكدا بوو كه یۆنانییه‌كان دوابه‌دوای كه‌وتنی كابینه‌كه‌ی ڤنیز لوئیس، تووشی دووبه‌ره‌كی ده‌هاتن.

مسته‌فا كه‌مال، به‌بێ ئه‌وه‌ی هه‌ست به ماندوویه‌تی بكات و كات به فیڕۆ بدات، ده‌ستی كرد به‌وه‌ی كه هێزه پارتیزانه‌كانی بكات به سوپایه‌كی ڕێكخراو و له‌هه‌ندێ جێگه‌دا شێوازی سه‌یرو سه‌ره‌تایی به‌كارهێنا. بۆنمونه فرمانیدا به‌بێ جیاوازی، هه‌موو ماڵێك به بوخچه‌یه‌ك كه ده‌ستێك جلی ژێره‌وه، جوتێك گۆره‌وی و جوتێك پێلاوی تێدابێت، یارمه‌تی سوپا بدات. فرمانی به ئافره‌ت و كچانی لادێی دا كه له جیاتی گامێش و وشتر كه ژماره‌یان كه‌م بوو، عاره‌بانه سه‌ربازییه‌كان ڕاكێشن و به‌م پێیه دوای ماوه‌یه‌كی كورت، بیابان پڕبوو له‌و عاره‌بانانه‌ی كه به‌هۆی ئافره‌تانه‌وه ڕاده‌كێشران.

سه‌ره‌ڕای سه‌فه‌ر به‌ركردنی گشتیی پیاوان، ئافره‌تانیشی سه‌فه‌ر به‌ركرد تا له‌گه‌ڵ مێرده‌كانیاندا فێری مه‌شق و هونه‌ره سه‌ربازییه‌كان بن و له پشت به‌ره‌كانی شه‌ڕدا خزمه‌ت بكه‌ن. به‌م شێوه‌یه له پشتی به‌ره‌كانی جه‌نگدا، ئه‌و ئافره‌تانه‌ی كه منداڵه‌كانی خۆیان له كۆڵی كردبوو، شان به‌شانی پیاوه‌كان چالاكییان ده‌نواندو سه‌ره‌ڕای ڕاكێشانی عاره‌بانه‌كان، گولله تۆپیان له‌سه‌ر شان داده‌ناو تا نزیك تۆپه‌كانیان ده‌بردن.

مسته‌فا كه‌مال، باره‌گاكه‌ی خۆی گواستبۆوه گوندی چانكایا كه‌(٦)كیلۆمه‌تر له ئه‌نقه‌ره دوور بوو. ئه‌و سه‌رده‌مه باری ده‌روونیی زۆر ته‌واو نه‌بوو و زۆربه‌ی كات توڕه ده‌هاته پێش چاو.

ئه‌م بارودۆخه‌ی تا گه‌یشتنی یه‌كێ له خزمه جوان و لاوه‌كانی به‌نێوی خاتو فكرییه، درێژه‌ی هه‌بوو. فكرییه كچێكی باریكه‌ی، قژ ڕه‌شی، ناسك و هێمن بوو. ئه‌و كچه جوان و چاوگه‌وره‌یه، ئامۆزای مسته‌فا كه‌مال بوو كه له كۆنه‌وه یه‌كترییان ده‌ناسی. به‌ڵام ساڵێك پێشتر له ساڵۆنیك چاویان به‌یه‌كدی كه‌وتبۆوه‌و هۆگری یه‌كتری ببوون. فكرییه جارێك شووی كردبوو، به‌ڵام له مێرده‌كه‌ی جیاببۆوه‌و كه‌یفی به گاڵته‌و پێكه‌نین و غه‌یبه‌ت كردنی خه‌ڵكی ده‌هات، حه‌زی له عه‌شقبازی بوو و بۆ پیاوێكی وه‌كو مسته‌فا كه‌مال كه قه‌ت له جنس تێرنه‌ده‌بوو، زۆر گونجاو و له‌بار ده‌هاته پێش چاو. بۆیه ده‌ستبه‌جێ مسته‌فا كه‌مال لای خۆی گلی دایه‌وه.

فكرییه سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه ڕۆح سووك و به‌گفت و لفت بوو، زۆر وریاو ژیریش بوو و هه‌رگیز ده‌خاله‌تی له‌كاره‌كانی مسته‌فا كه‌مالدا نه‌ده‌كردو كاتێ مسته‌فا كه‌مال له ماڵه‌وه له‌گه‌ڵ براده‌ره‌كانیدا لێك كۆده‌بوونه‌وه، له‌ده‌ست و پێی مسته‌فا كه‌مال نه‌ده‌ئاڵاو له‌به‌رئه‌وه‌ی كه كچه مامیشی بوو، وه‌ك خانمی ماڵه‌وه خزمه‌تی میوانه‌كانی ده‌كرد.

فكرییه چێژی ژیانی هاوسه‌رێتی به مسته‌فا كه‌مال به‌خشی كه تائه‌و ده‌مه لێی بێ به‌ش بوو و ئه‌مه‌ش بۆ پیاوێك كه ته‌نها لایه‌نی سێكس و ڕابواردنی له ئافره‌تدا ده‌دۆزییه‌وه، شتێكی یه‌كجار به‌له‌زه‌ت بوو.

له‌و كاته‌دا توركیا دوو سوڵتانی هه‌بوو: یه‌كیان له ئه‌نقه‌ره له‌گه‌ڵ ئامۆزاكه‌یدا

خەریک بوو و ئەوەی دیکەشیان لە قوستەنتەنیە گرفتاری گوشارو دەست تێوەردانەکانی هاوپەیمانان ببوو.
سوڵتان وەحیدەدین کە لەتەمەنی (٦٠) ساڵیدا بوو، عاشقی کچە باخەوانێکی (١٧) ساڵان بەنێوی نوساد ببوو و لەیەکێ لە ڤێللاکانی کۆشکی یلدزدا نیشتەجێی کردبوو کە بێگومان زۆر لە ماڵەکەی فکرییە پرشکۆتر بوو، بەڵام خەزێنەی سوڵتان بە تاڵ بوو و مانگانە لەلایەن بەریتانیاوە برە پارەیەکی گونجاوی دەدرایە.
لە مانگی تەمموزی ساڵی١٩٢١دا، بۆ جارێکی دیکە یۆنانییەکان لە ئەنادۆڵدا دەستیان بەهێرشێکی گەورەکردو هەرچیەک کەهاتە سەر ڕێگەیان و بەر دەستیان هات، لەنێویان بردو تێکوپێکیان شکاند. وە سەرئەنجام گەیشتنە (ئێسکی شەهیر) کە شوێنی یەکتربڕی هێڵی شەمەندەفەری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای تورکیایە. سوپای یۆنان لەم پێشڕەوییانەیدا زەرەروزیانێکی زۆریشیان لێ کەوت. ئێرنێست هێمینگوای کە ئەو کاتە پەیامنێری ڕۆژنامەی تۆرێنتۆ ئیستار بوو، لە تەلگرافێکدا بۆ ڕۆژنامەکەی ئاوا باسی شەڕەکەی کردووە: «*بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا، سەربازی کوژراوی دیون کە دامێنی سەمای باڵەو پێڵاوی نوک هەڵگەڕاوەی بە گوڵینگەیان لە پێ بووە*.» کە ئەڵبەتە مەبەستی لە سەربازانی گاردی تایبەتیی یۆنان بووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زەرەرو زیانە نەیدەتوانی ئەو مەترسییە گەورەیە بڕەوێنێتەوە کە هەڕەشەی لە مستەفا کەمال و دراودەستەکەی دەکرد. پلانی یۆنانییەکان ئەوەبوو کە دوای دەست بەسەراگرتنی یەکتربڕی هێڵی شەمەندەفەری ئێسکی شەهیر، بەشی هەرەزۆری سوپای تورکەکان گەمارۆ بدەن. لەو کاتەدا مستەفا کەمال لێهاتوویی سەربازیی خۆی بەدیار خست. مستەفا کەمال دەیزانی ئەگەر دژە هێرش بکاتە سەر یۆنانییەکان، ئەوا بە دڵنیاییەوە تێک دەشکێ و ئەگەر ئەو ناوچەیەش بەجێ بێڵێ ئەوا خەڵکی بێدیفاع و سیڤیلی دانیشتووی ئەوێ دەکەونە بەر هەڵمەتی دڕندانەی هێزە یۆنانییەکانەوە. بۆیە بڕیاریدا ناوچەکە بە گشتی چۆڵ بکرێ و سەربازو خەڵکەکە بەدرێژایی (٣٠٠) کیلۆمەتر پاشەکشێ بکەن و هیچ کەسێک و تەنانەت پیرو پەککەوتەکانیش بەجێ نەمێنن. تورکەکان (٣٠٠) کیلۆمەترو تاسەر لێواری ڕووباری ساکاریا پاشەکشێ یان کرد و، بەم کارەیان هەم دەرفەتی خۆ ڕێکخستنەوەیان بۆ دەرەخسا و هەمیش دەیانتوانی بە پاراستنی ئەنقەرە، بەرەی جەنگ و مەیدانی بەبەرەو ڕووبوونەوەکان پەرە پێبدەن، کە ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی پەیوەندی هێڵی پێشەوەی سوپای یۆنان لەگەڵ پشت خۆیدا لاواز ببێ.
لە ٢٤ی ئابی ساڵی ١٩٢١دا، تورک و یۆنانییەکان لەسەر لێوارەکانی ڕووباری ساکاریا کەوتنە بەرامبەری یەکدی و شەڕ دەستی پێکرد.
لەو شەڕەدا کە مستەفا کەمال بۆخۆی سەرکردایەتی تورکەکانی دەکرد، ماوەی سێ هەفتەی تەواو لە جەبهەیەکی (١٠٠) کیلۆمەتریدا شەڕێکی بێ ئامان و خوێناوی لە ئارادابوو و، هیچکام لەلایەنە شەڕکەرەکان ئامادەنەبوون پاشەکشێ لە پێگەکانی خۆیان بکەن. جاری واهەبوو یەک، یان چەند یەکەیەکی سەربازی لەسوپاکەیان جیادەبوونەوەو ناچار دەبوون بۆ پاراستنی گیانی خۆیان بەسە نێزە

لەگەڵ سەربازەکانی دوژمندا بجەنگن. سەنگەرەکانی هەردوولا زۆر لێک نزیک بوون و مستەفا کەمال دەیتوانی لە جێی خۆیەوە بەبێ بەکارهێنانی دووربین سەربازە یۆنانییەکان ببینێ.

لەیەکێ لەو شەڕانەدا، لەشکرێکی تورک ٧٥٪ی سەربازەکانی کوژران و (٧) سەرلەشکریش لەهەردوولا کوژران کە ئەغڵەبیان بەسەر نێزەکوژرابوون. سەرئەنجام هەمان ئەو فاکتۆرەی کە مستەفا کەمال پێش بینی کردبوو، بووە هۆی تێکشکانی یۆنانییەکان. هێڵی پەیوەندیی یۆنانییەکان بە پشتەوەی بەرەکانی جەنگەوە پچڕا و لەژێر خۆری سووتێنەری ئەنادۆڵدا، بێ نان و ئاو مانەوە. لەکۆتایی هەفتەی سێیەمدا، هێڵی بەرگریی یۆنانییەکان تێک و پێک شکاو لە پڕێکا دەنگ و سەدای شەڕ کپ بوو. یۆنانییەکان بەبێ دەنگی سێ سەد کیلۆمەتر پاشەکشێ یان کردبوو و مستەفا کەمال وەک گوللە بەدوایانەوە بوو.

یەک ساڵی پێچوو تا تورکەکان خۆیان بۆ هێرشێکی دیکە ئامادە کردەوە، بەڵام سەرکەوتنەکەی مستەفا کەمال لە شەڕی ساکاریادا، لە وڵاتانی دەوروبەردا، دەنگدانەوەیەکی یەکجار گەورەی هەبوو.

چەند مانگێک دوای سەرکەوتنەکەی ساکاریا، مستەفا کەمال خۆی غەرقی کاروباری سیاسی کردو ژەنراڵەکانیشی بە ڕێکخستنەوەو ئامادەکردنی سوپاوە خەریک بوون کە نیازیان وابوو هێرشی کۆتایی پێ بکەنە سەر یۆنانییەکان. پێنج هەفتەی دوای ئەم سەرکەوتنە، هێزە نیشتمانییەکانی تورکیا ڕێککەوتنێکیان لەگەڵ فەرەنسایەکاندا مۆر کرد کە بە پێی ڕێککەوتنەکە، فەرەنسا، مستەفا کەمال-ی بەڕێبەری ڕاستەقینەی تورکیا دەناسی و بەڵێنی ناردنی بڕێکی زۆر چەک و تەقەمەنیی پێ دەدان.

مستەفا کەمال، ڕێککەوتنی لەو چەشنەی لەگەڵ هەریەک لە ئیتالیاو ڕوسیاشدا مۆر کرد.

دەوڵەتی بەریتانیا لەو ڕێککەوتنە نیمچە نهێنیانە ناڕەحەت بوو و ناڕەزایەتی خۆشی بەناردنی سیخوڕێک بۆ ئەنقەرە کە بۆ کوشتنی مستەفا کەمال ڕاسپێردرابوو، نیشاندا. سیخوڕی نێوبراو کابرایەکی هیندی بوو کە بەڵێنی ئەوەی پێدرابوو دوای کوشتنی مستەفا کەمال سەد هەزار لیرەی بدرێتی و ناویشی *(مستەفا سەغیر)* بوو. مستەفا سەغیر، وەک نوێنەری *«کۆمیتەی لایەنگرانی خەلافەتی موسڵمانانی هیند»* بە ئاشکرا هاتە ئەنقەرەو پروپاگەندەی ئەوەی بڵاوکردەوە کە گوایە هاتووە ئەو یەک ملیۆن لیرەیەی کە لە هیند بۆ هێزە نیشتمانییەکانی تورکیا کۆیان کردۆتەوە، تەسلیم بە مستەفا کەمال بکات. لەسەرەتادا لە ئەنقەرە پێشوازییەکی گەرمی لێکرا، بەڵام ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی و یەک ملیۆن لیرەکە هیچ سەرو سۆراغی نەبوو.

ئینجا دوای ئەوە، لێی بەشک کەوتوون و دەستیان کرد بە پشکنینی و دەرکەوت کە بەمەرەکەبێکی نادیار نامە لەگەڵ ئینتیلی جێنت سرویس (دەزگای سیخوڕی بەریتانیا-وە) دا، دەگۆڕێتەوە.

مستەفا سەغیر گیراو، لەمیانەی لێکۆڵینەوەکاندا دانی بەوەدانا کە موچە لە دەوڵەتی بەریتانیا وەردەگرێ و، لەسەردەمی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، لە ئێران وسویسرا سیخوڕیی بۆ بەریتانیا کردووە. کاتێ دادوەری لێکۆڵینەوە لێی پرسی بۆچی کارێکی وا مەترسیدار و ناهەمواری لە ئەستۆ گرتووە؟ (مەبەست کوشتنی مستەفا کەماله-وە)، لە وەڵامدا گوتی: «*چونکە ماوەیەک بەر لە ئێستا کارێکی لەو چەشنەم بەسەرکەوتوویی ئەنجام داوەو ئەویش کوشتنی پاشای ئەفغانستان بووە!*»

ئەو سیخوڕە سەیرە کە بەدرێژایی دادگایی کردنەکەی زۆ پشوو درێژو بەئەدەب دەهاتە پێش چاو، بەسێدارە حوکم درا و زۆر بە ئاسایی گوێبیستی بڕیارەکەی دادگا بوو. بەپێی نووسینی ڕۆژنامەکانی تورکیا، کاتی دەیانویست پەتی سێدارەکە بخەنە ملیەوە، مستەفا سەغیر لەسەر زەوی دانیشت، جەللاد لە ڕێگەی وەرگێڕەوە پێی گوت کە دەبێ لەوکاتەدا بەپێوە بوەستێ. سەغیر بە ئەدەبەوە لە وەڵامدا گوتی: «*دەبێ بمبوورن؛ چونکە ئەوە یەکەم جارمە کە لە سێدارە دەدرێم!*»

* * *

لە ماوەی ئەو یەکساڵەی کەبەسەر سەرکەوتنەکەی ساکاریادا تێپەڕدەبوو، تورکیا زۆر دیمەنی سەیرو سەمەری بەخۆوە دیت.

ئەگەرچی مستەفا کەمال وەکو سەرۆکی وڵاتێک و لەسەر ئاستی هاوتای خۆیدا لەگەڵ سەرۆکی وڵاتە گەورەکانی جیهاندا گفتوگۆو دانوستانی ئەنجام دەدا، بەڵام بارودۆخی حکومەتە کاتییەکەی ئەنقەرە، پتر بە فلیمە وێستێرنەکان دەچوو. تالارێکی بچوکیان لەسەر شێوەی وێستگەی شەمەندەفەر لەدەوروبەری شاردا درووست کردبوو کە ئەنجوومەنی نیشتمانی دانیشتنەکانی خۆی تێدا گرێ دەدا.

نوێنەرەکان لەسەر رەحلەی قوتابخانەکان دادەنیشتن و ئەوانەیش کە لە ڕێگەی دوورەوە هاتبوون، ئەسپەکانی خۆیان لە نەردەکانی دەوروبەری ساختومانەکە دەبەستەوە.

لەکاتەدا بەلێشاو چەک و تەقەمەنی لە فەڕەنساو ڕوسیاوە دەگەیشتە دەست هێزە نیشتمانییەکان و، ئەمەش وایکرد کە مستەفا کەمال بتوانێ لە هاوینی ساڵی ١٩٢٢دا، دوالێدان لەجەستەی سوپای یۆنان بدات کە لە ئاکامی ناکۆکیی نێوخۆییدا زۆر لاوازببوو. لە سەعات چواری بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٦ی ئابی ١٩٢٢دا، فرمانی هێرش بردنە سەر سوپای دوژمنی بەم شێوەیە دەرکرد: «*سەربازەکان بۆ پێشەوە، ئامانجی ئێوە گەیشتن بە دەریای سپی ناوەڕاستە.*»

یۆنانییەکان بە تەواوەتی غافڵگیربوون. مستەفا کەمال تا بەرەبەری ڕۆژئاوای ڕۆژی یەکەمی هێرشەکەی، توانی بەشی هەرەزۆری سوپای یۆنان دووڵەت بکات و ناچاریان بکات سەراسیمەو سەرگەردان پاشەکشێ بکەن. لە کۆتایی مانگی ئابدا، پاشماوەی ئەو هێزانە بەجلوبەرگی دڕاو کون کونەوە، بەڕاکردن سواری ئەو کەشتییانە بوون کە چاوەڕێیان دەکردن. بەڵام هێشتا کاربەدەستە یۆنانییەکانی ئەزمیر لە باوەڕەدابوون کە ئەو کۆنفرانسەی کە لەلەندەن گرێ دراوە، بەرلەوەی تورکەکان بگەنە ئەزمیر، بیرێک لە چارەنووسیان دەکاتەوە. سەرەڕای ئەمەش گەلە

کەشتی جەنگیی بەریتانیاو ئەمەریکا لەسەر کەنارەکانی ئەزمیر لەنگەریان هاویشتبوو و ئەمە بۆ کاربەدەستە سەربازییەکانی یۆنان مایەی دڵگەرمی و پشت ئەستوری بوو. لە دوا ڕۆژەکاندا گەشبینییەکی درۆیین باڵی بەسەر زەین و هۆشی دانیشتوانی ئەزمیردا کێشابوو و، یۆنانییەکان پێیانوابوو کە هیچ شتێک ڕوو نادات. وەک جاران شەونشینیی جیاجیا لەسەربانی هوتێل نەعیم بەرپا دەکران و گروپێکی ئۆپەرێتی ئیتالیایی لە یانەی وەرزشیی شاردا، ئۆپەرێتی دیگۆڵتۆی پێشکەش دەکرد.ئەم گەشبینییە

تا ئەوکاتەی کە لە پڕێکا وردە وردە یەکەم دەستەی بریندارەکانی جەنگ هاتنە نێو شارەوەو لەکاتێکدا کە بۆ پارچە نانێک سواڵیان دەکردو دەپاڕانەوە، داستانی سامناکیان لە دڵڕەقی و بێ بەزەییەتی تورکەکان دەگێڕایەوە، درێژەی کێشا. دەستبەجێ بازاڕی شار داخراو ترس دایگرتن. لە هەفتەی یەکەمی مانگی ئەیلول، واتا تەنها دە ڕۆژ دوای دەست پێ بوونی هێرشی تورکەکان، سوپای تورکیا توانیبووی ٣٠٠ کیلۆمەتر پێشڕەوی بکات و پێشقەراوڵەکانی گەیشتبوونە دەوروبەری شاری ئەزمیر.

مستەفا کەمال بە ئەنقەست لە پشت بەرەی شەڕمابۆوە؛ چونکە ئیدی دڵنیابوو لەوەی کە سەردەکەوێ و حەزی لەوەنەبوو تا بەر لە کۆتایی هاتنی کارەکە، پێبنێتە گۆڕەپانەوە. دەست بەسەراگرتن و ڕزگارکردنی ئەزمیر بۆ مستەفا کەمال و سوپای تورکیا تەنیا سەرکەوتنێکی سەربازی نەبوو و، بگرە بەرەمزی سەرکەوتن بەسەر هەموو سوپا بێگانەکاندا لە قەڵەم دەدرا.

لە ڕۆژی نۆی ئەیلول کە ئاگری شەڕ دامرکا، مستەفا کەمال سەرکەوتوانەو لە پێشەوەی کاروانێک لەو ئۆتۆمبێلانەی کە بەچڵە زەیتون ڕازێندرابوونەوەو لەنێو هاواری شادی و پرمەی گریان و دوعای خێری تورکەکاندا، پێی نایە ئەزمیرەوە.

ئەو ڕۆژە ڕەنگبێ پڕشانازیترین ڕۆژی ژیانی مستەفا کەمال بووبێ، بەڵام بەهۆی کردەوەیەکی شێتانە لەکەدار کرا.

* * *

## فەسڵی پازدەهەم

## ئاگر کەوتنەوەکەی ئەزمیر

ئەزمیر کە لەو سەردەمەدا هێشتا بە گوتنی یۆنانییەکان بە «ئیسمیرنا» نێودەبرا، هیچ بە شارەکانی دیکەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی نەدەچوو. ئاو وهەوایە فێنک و زەوییە بە پیتەکانی، بارودۆخێکیان هێنابۆوەکایەوە کە تەنانەت هەژارترین لادێییەکانی ئەو ناوچەیە بۆ تێرکردنی زگیان بە ئەندازەی پێویست نان و پەنیرو میوەیان دەست دەکەوت.

ئەزمیر کەوتبۆ نێو جەرگەی ئەو ناوچەیەی کە پڕبوو لە بۆن و بەرامی شکۆفەکانی بادام و گوڵە ئاوریشمەکان و، دانیشتوانی ئەم بەندەرە کە هەناردە بازرگانییەکەی تەنانەت لەهی قوستەنتەنییەش پتر بوو، تورک، یۆنانی، ئەرمەنی، یەهودی و ئەوروپاییەکان بوون کە هەرکامیان لە گەڕەکی تایبەت بەخۆیاندا دەژیان، بەڵام لەشەقامە نێوەندییەکانی شاردا، ئاوێتەی یەکتری دەبوون و جلوبەرگە جۆراوجۆرو ڕەنگاوڕەنگە ناوچەییەکانیان، شێوەی کەرنەڤاڵێکی هەمیشەیان هەبوو. خێزانی دەوڵەمەندەکانی شار، لە دەوروبەری بەندەردا کە شێوەکەی لە هیلالەکەی نێو ئاڵای تورکیا دەچوو، لە ڤێللای جوانی دووقاتدا دەژیان کە گەلێک لە خانووەکانی قوستەنتەنییە جوانتر بوون.

عەمبارەکانی بەندەر پڕبوون لە سندوقی هەنجیر، قەیسی، ترێ و هەنار و، کەشتییە بارهەڵگرەکان بە ئاڵای وڵاتانی جۆراوجۆر چاوەڕێی بارکردن و گوێزانەوەیان بوون بەرەو چارگۆشەی جیهان.

خەڵکی ئەزمیر بەوە بەنێو بانگ بوون کە حەزیان لە قومار و سەمایەو ئافرەتەکانیشیان لەڕادەبەدەر جوانن. زۆربەیان سێ چوار زمانیان دەزانی و یانەکان، چێشتخانەکان، قاوەخانەکە‌شت و گوزارییەکان، کۆڕەکانی سەما، یاری گۆڵف و پێشبڕکێیەکانی ئەسپ تاودان، بە بەردەوام هەبوون و پڕیش بوون لە مشتەری.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئەزمیر بە تێکەڵەیەکی سەیری دنیای دوێنێ و دنیای داهاتوو لە قەڵەم دەدرا. لە گۆشەیەکی ئەم شارە گەڕەکێک هەبوو کە پێی دەگوترا «*پارا دیزۆ*» واتا بەهەشت، کە جالییەی ئەمەریکایی تێدا نیشتەجێ بوون و، پڕبوو لە باخی جوان و ڕازاوە، قوتابخانەی ئەمەریکایی و یانەی وەرزشیی کچان و کوڕان و وەک پارچەیەک لەخاکی ئەمەریکا دەهاتە پێش چاو. بەڵام لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەو

کاروانانەی کە هەموو ڕۆژێ بە ڕێگایە کۆن و خۆڵاوییەکاندا دەهاتنە نێو شارەوە، ئەم ژیانە ئارام و ئاسوودەیەیان تێک دەدا.
ئەزمیر شارێکە ڕابردوویەکی پڕ لە مەینەتیی هەیە؛ لەیەکەم ڕۆژەوە کە بنیادنراوە، بووە بەلانکی ئەفسانە یۆنانییەکان و هۆمێری شاعیری نابیناو بەنێو بانگ کە خەڵکی ئەم شارە بووە، بۆ خەڵقاندنی «ئۆدیسە» ئیلهامی لەو شارە وەرگرتووە.
دواتر ڕۆمییەکان داگیریان کردو ناویان لێ نا «*جوانترین شاری ئاسیا.*» ماوە ماوە ئەم شارە تووشی بوومەلەرزەو هێرشی بێگانەکان بووە. سەرەتا ئێرانییەکان و دواتر لەسەدەی پازدەهەمدا تەیموری لەنگ، وێرانیان کردو لە ساڵی ١٤٢٤ (٨١٩ی کۆچی)، یۆنانی و ئەرمەنییەکان کە بابو باپیرانیان بۆ ماوەی ١٥٠٠ ساڵ لەو ناوچەیەدا ژیابوون، بەشێوەیەکی نەخوازراو بوونە کۆیلەو ڕەعیەتی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی.

* * *

بەرەبەیانی ڕۆژی شەممە ١٩٢٢/٩/٩، بەندەرە پان و بەرینەکەی ئەزمیر، هێندەی کەشتی تێدا ڕاگیرابوو کە ئەگەر یەکێک مەبەستی بوایە دەیتوانی بەبازدان لەو کەشتییەوە بۆ ئەو کەشتی، لەوسەری بەندەرەکەوە بچێتە ئەو سەری بەندەرەکە. لە پشت سەری ئەو کەشتییانەوە، واتا لەزارکی کەنداوەکە، گەلەکەشتی جەنگیی بەهێزی چوار وڵات بەرچاو دەکەوتن. لەم گەلەکەشتییە جەنگییانە، پێنجیان ئینگلیزی، سێیان ئەمەریکایی، سێی دیکەش فەڕەنسایی و یکیان ئیتالیایی بوون کە کۆی گشتییان دەیکردە دوازدەکەشتی.
گەلەکەشتی نێوبراو بەمەبەستی پاراستن و داکۆکیکردن لە هاووڵاتیانی خۆیان هاتبوونە بەندەری ئەزمێر و، فرمانی ئەوەیان پێدرابوو کە بەتەواوەتی بێلایەن بن؛ چونکە هاوپەیمانان نەیاندەویست تا ئەوکاتەی پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ تورکیادا مۆرنەکردووە، بەهیچ شێوەیەک خۆ لە کاروباری نێوخۆیی ئەزمیر وەربدەن. ڕۆژی ١٩٢٢/٩/١٠، مستەفا کەمال لە کاتێکدا کە جلێکی سەربازیی ئاسایی پۆشیبوو و هیچ کام لەڕووتبەو نیشانەکانی خۆی بەجلەکانییەوە نەکردبوو، هاتە نێو شارەوەو یەکسەر بەرەو ئەو ساختومانەچوو کە بارەگای حکومەتی یۆنانییەکان بوو و کەوتبۆ سەر کەناری دەریاو ئاڵای یۆنانیان وەک فەرش لەسەر قالدرمەکانی ڕاخستبوو. بەڵام مستەفا کەمال نەچووە نێو ساختومانەوەکەوەو گوتی: «*ئێرە، بەڕەمزی سەربەخۆیی وڵاتەکەمان دەژمێردرێت.*»
لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەوە شەڕوپێکدادانی پەراگەندەی سەر شەقامەکان و خەراپەکاری لە گۆشەو کەناری شاردا بەرچاو دەکەوت و، تاڵان و بڕۆی ماڵەکان دەستی پێکردبوو.
هاتنی هەزاران پەنابەری تۆقیوی یۆنانی لە شاروگوندەکانی دەوروبەر، ناڕەحەتی و گرژیی فەزای شاری پتر دەکرد.
ئەو پەنابەرانە هیچ شوێنێکیان بۆ حەوانەوە نەبوو و ئەغلەب برسی بوون.

بەهەزاران ئافرەت و منداڵ وپیاو، لە کاتێکدا کە تەواوی دارونەداریان لە بوخچەیەکدا گرێ دابوو و بە کۆڵیان دادابوو، لەسەر شەقامەکان دەنووستن و لەترسی ئەوەی تورکەکان تۆڵەیان لێ بکەنەوە، دەلەرزین. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا توونڈو تیژییەکی ئەوتۆ بەرچاو نەدەکەوت. ئەوشەوە مستەفا کەمال بەنەناسراوی بە شەقام و کۆڵانەکانی شاردا گەڕاو، چووە یەکێک لەو هۆتێلانەی کە شوێنی مانەوەی بیانییەکان بوو و خزمەتکارەکە پێی گوت مێزی بە تاڵیان نییە، بەڵام لەو کاتەدا یەکێ لە تورکەکان مستەفا کەمالی ناسییەوەو کەوتە سەر پێی و مێزەکەی خۆی بۆچۆڵ کرد. هەر کە مستەفا کەمال یەکەم پێکی هەڵدا، ڕووی لە ژمارەیەک لەو یۆنانییانە کرد کە لە مێزەکەی تەنیشتییەوە دانیشتبوون و گوتی: «*ئایا کۆنستانتین-ی پاشای یۆنانیش وەک من بۆ مەشروب خواردنەوە دەهاتە ئێرە؟*.» یۆنانیەکان سەریان باداو مستەفا کەمال گوتی: «*کەواتا* بۆچی زەحمەتی *داگیرکردنی ئەزمیری دایە بەرخۆی؟*.» ڕۆژی دواتر کە یەکشەممە بوو، مستەفا کەمال بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە کە تێیدا هاتبوو نابێ بەهیچ شێوەیەک سەربازانی تورک پەلاماری کەس بدەن و ئەگەر هاتوو شتێکی وا ڕوویدا، ئەوا دەستبەجێ سەربازەکە لە سێدارە دەدرێت، بەڵام ئەم بەیاننامەیە تەنها قسەبوو و بەس؛ چونکە هەر ئەو ڕۆژە یەکێ لە فەرماندە تورکەکان کە نێوی ژەنەڕاڵ نورەدین بوو و بەدڵڕەقی بەنێو بانگ بوو، ناردی بەدوای عالیجەناب کریسۆ ستۆمووس-ی ئۆسقۆفی یۆنانییەکان لە ئەزمیر. کاتێ ئۆسقۆفی پیرهاتە ژوورەکەی، نورەدین تفێکی لە دەموچاوی کردو ئاماژەی بەو دۆسیەیە دا کە لەسەر مێزەکەی دانرابوو و گوتی: «*دادگای ئەنقەرە بڕیاری لە سێدارەدانی تۆی داوەو ئێستاش دەبێ خەڵک عەدالەت بەجێ بێنن.*» ئینجا هاواری کرد: «*ئێستا بڕۆ لەبەرچاوم ون بە!*»

لە کاتێکدا کە ئۆسقۆفی پیر لە قاڵدرمەکانی ساختومانەکە دەهاتە خوار، ژەنڕاڵە تورکەکە هاتە سەر بەلەکۆنەی ژوورەکەی و ڕوو لە خەڵک هاواری کرد: «*شایستەی* چییە، *ئاوا* ڕەفتاری *لەگەڵدا* بکەن.» گروپێک لە مەلەوانە فەڕەنسایییەکان ئۆسقۆفیان تا بەردەگا کە هێنابوو، بەڵام فرمانی ئەوەیان پێدرابوو بە هیچ شێوەیەک دەخالەت نەکەن و ئێستا بەبەرچاوی ئەوانەوە خەڵک ئۆسقۆفیان پارچەپارچە دەکرد. خەڵک چاوەکانی ئۆسقۆفیان دەرهێناو گوێ و لووت و دەستەکانییان بڕی.

کوشتنی ئۆسقۆف مانای ئەوەبوو کە ڕێگە بە تورکەکان درا یۆنانیەکان بکوژن و تاڵانیان بکەن. خاتوو ئاننا بیرج کە هاوسەری میسیۆنێرێکی ئەمەریکایی بوو و لە دوا ساتدا توانیبووی لە ئەزمیر ڕابکات، بەچاوی خۆی دیتبووی کە چۆن سەربازە تورکەکان هەڵیان کوتابۆ سەر ماڵەکەی و دواتر گێڕایەوە کە: «*ئەوان بە سامناکترین شێوە پەلاماری خەڵکیان دا و ماڵەکانیان بەتاڵان بردن و کوشتیان. تاقمە سەربازێک دەچوونە نێو دوکانێکەوەو چی بەردەستیان هاتبایە، تاڵانیان دەکرد. مامۆستای قوتابخانەی کچان لە پشت پەنجەرەی پۆلەکانەوە بەچاوی خۆیان دیتیان کە چۆن سەربازانی تورک خەڵکی سیڤیلیان لەسەر شەقامەکەی بەرامبەری قوتابخانەدا دەکوشت، دەچوونە نێو ماڵی خەڵکەوەو تەواوی ئەندامانی خێزانەکەیان*

*دەکوشت و دواتریش تەرمەکانیان هەڵدەدانە سەر شەقام. ئەو ڕۆژە کاتێ ڕۆژئاوابوو، سەرڕووی شەقامەکانی ئەزمیر بە تەرمی کوژراوەکان داپۆشرابوو.»*

لەماوەی چەند سەعاتێکدا، بیست ئافرەتی یۆنانی کە پەنایان برد بۆ بەر ماڵە بەریتانیاییەک، دۆزرانەوەو پەلاماری ناموسیان درا. تورکەکان بەوەش نەوەستان و هێرشیان کردە سەر گۆڕستانی مەسیحییەکان و تەرمی مردووەکانیشیان لە گۆڕ دەرهێنایەوەو فڕییان دان. یۆنانی و ئەرمەنییەکان بەرەو کەناری دەریا ڕایان دەکرد، بەڵام تورکەکان پێشیان پێ دەگرتن و بەتایبەتی کچە لاوەکانیان دەگێڕانەوەو، بەرچاوی خەڵکەوە پەلاماری ناموسیان دەدان و ئەگەر بهاتایە باوک، یان برای ئەو کچانە نارازیەتیان دەربڕیبا، هەر لەوێ دەیانکوشتن. بەهەزاران یۆنانی و ئەرمەنی لەکەنار دەریا کۆببوونەوە. ژمارەیەکی زۆریان خۆیان هەڵدایە ئاوەوە و، بە مەلە بەرەو کەشتییەکان ڕۆیشتن ، بەڵام گەلە کەشتی جەنگیی هاوپەیمانان بۆ ئەوەی بێلایەنی خۆی پاراستبێ، مافی ئەوەیان نەبوو ڕێگەیان پێبدەن بێنە نێو کەشتییەکانیانەوە.

ڕۆژی چوارشەممە ١٣ی ئەیلول ،ئاگرکەوتنەوە گەورەکەی ئەزمیر دەستی پێکرد، واتا لەیەک کاتدا چەند شوێنێکی شار ئاگری تێبەربوو. یەکێ لەو کەسانەی کە بەر لە هەموان چاویان بە بڵێسەکانی ئاگرەکە کەوت، خاتوو مینی میلز-ی بەڕێوەبەری قوتابخانەی کچانەی ئەمەریکاییەکانە لە ئەزمیر، کە بەو شێوەیە ڕووداوەکەی گێڕاوەتەوە: *«دەستبەجێ دوای نیوەڕۆ، یەکەم ئاگر لەیەکێ لە خانووەکانی تەنیشت قوتابخانە کەوتەوەو بەخێرایش پەرەی سەند. من بەچاوی خۆم دیتم کە ئەفسەرێکی تورک بەدەبە بەنزینێکەوە خۆی کرد بەو ماڵەداو دوایش ماڵەکە ئاگری لێ هەستا. مامۆستایان و قوتابیانی قوتابخانەکان بەچاوی خۆیان دیتیان کە چۆن ئەفسەرو سەربازە تورکەکان شاپڵیتەیان هەڵدەدایە نێو ماڵەکان. ئاگر کەوتنەوەکە لە گەڕەکێکی ئەرمەنی نشین کە کەوتبۆ بەرامبەر قوتابخانەکەی ئێمەوە دەستی پێکرد و، دوای چەند سەعاتێک سێ لەسەر پێنجی ماڵەکانی ئەو گەڕەکە ئاگریان تێبەدببوو.*

*هەرچەندە بایەکی ئەوتۆی نەدەهات، بەڵام ئەو کزە بایەی کە دەهات بووەهۆی ئەوە ئاگرەکە خێراتر پەرەبستێنێ.»*

تاقمێک لە سەربازە تورکەکان، بە دەبە نەوت و بەنزییان بە ساختومانەکانی کەنار دەریاو شوێنی بارکردنی کەشتییاندا دەکرد. یەکێ لە نوێنەرانی خاچی سوری نێو دەوڵەتی کە نێوی کۆڵۆنێل دێویس بوو، بەچاوی خۆی دیتبووی کە چۆن تورکەکان ڤێللا و خانووەکانی ئەو ناوەیان بەنەوت دەکردو دواتر ئاگریان تێ بەردەدان.

بازرگانێکی خەڵکی ئەزمیر کە نێوی سوقرات ئوناسیس بوو لەنێو ئەو یۆنانیانە دابوو کە ئەو ڕۆژە کەوتنە زیندانەوەو، لەبەر ئەوەی کە لەسەردەمی داگیرکردنی ئەزمیر لەلایەن یۆنانییەکانەوە یارمەتیی یۆنانییەکانی دابوو، نێوی کەوتبۆ نێو لیستی ڕەشی تورکەکانەوە. هەر ئەو ڕۆژە برایەکەیان لە سێدارەدا و، خوشکەکەشیان لەگەڵ ٥٠٠ کەسی دیکەدا لە کەلسیایەکدا سووتاند، بەڵام خۆی لە

مردن ڕزگاری بوو، ئەویش بەوەی کە کوڕەکەی چند سندوقێک وێسکی بە بەرتیل و لەبەرامبەر ئازادکردن و بەڕێکردنی باوکی بەرەو ئەمەریکا، دابووە ژەنڕاڵێکی تورک و یاریدەدەرێکی باڵیۆزی ئەمەریکا.

تا دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، پتر لە بیست هەزار خانوو شەواتە بوون و بوونە خۆڵەمێش. ئاگر کە، بەرەو کەنار دەریا دەڕۆیشت و دەتگوت سەری لە دووی ئەو خەڵکە بەدبەختەناوە. شار، بۆن کرووز و بۆنی گۆشتی برژاوی لێدەهات. بەرەبەری نیوەشەو، تەواوی ئەو ڤیللایانەی کە لەسەرکەناری دەریابوون، لەیەک کاتدا ئاگریان تێبەربوو. دانیشتوانی ئەو خانوانە وەک شێتان خۆیان هەڵدەدایە نێو ئاوی دەریاو بە پێی قسەی بێرتڕام تسایجری فەرماندەی کەشتی جەنگیی جۆرجی پێنجەم-ی سەر بە بەریتانیا، *«ئەو شەوە، سامناکترین ڤیژەییەکی بیستووە کە ڕەنگبێ لە قورگی مرۆڤ دەربچێت.»*

ئێرنێست هێمینگوای لە ڕاپۆرتەکەیدا کە بۆ ڕۆژنامەی تۆرێنتۆ ئێستاری ناردووە، نووسیویەتی: *«ئێمە لەبەندەربوون و بەرەبەری نیوەشەو دیتمان بەهەزاران کەس لەوێ کۆببوونەوەو لێکرا هاواریان دەکرد.»* وارد پریسی پەیامنێری ڕۆژنامەی (دەیلی میل)یش کە لەگەڵ کەشتی جەنگیی ئایرۆن دیوک چووبووە ئەزمیر، لەو بارەیەوە نووسیویەتی: *«سەر ڕووی دەریا وەک مسی تواوەی لێ هاتبوو. بلێسەی ئاگر، لە بیست گڕەکانی تورەوە نزیک بە سی مەتر بەرەو ئاسمان بەرز دەبۆوە. دەکرا لەبەر ڕووناکیی ئاگرەکە بە باشی سەیری بورجی کەلسیای یۆنانییەکان و گومەزی مزگەوتی موسڵمانان و سەربانی خانووەکان بکەی.»*

هەزاران کەس لەو یۆنانی و ئەرمەنییانەی کە لەبەندەر کۆببوونەوە، بەڕادەیەک جێگەیان تەسک بوو کە کاتێ یەکێکیان گیانی لە دەستدا، تاماوەیەکی درێژ بەهۆی گوشاری ئەوانەی لەو بەرو ئەوبەری وەستابوون، بەسەر پێوە مابوو. لەنێو ئەو جەهەننەمەدا، لە دوورەوە دەنگی مۆسیقا دەهات و ئەو دەنگەش لە کەشتی جەنگیی جۆرجی پێنجەمەوە دەهات کە گەمیەوانەکە وەک نەبای هاتبێ و نەباران، وەک ڕۆژان لەسەر ڕووی کەشتییەکە فرمانی بە جوقی مۆسیقای سەربازی دابوو، مۆسیقا لێدەن. بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر، گەلە کەشتی جەنگیی هاوپەیمانان، چیدی نەیانتوانی بێلایەن بمێننەوە، تەواوی قایەغ و بەلەمەکانی خۆیان بۆ ڕزگارکردنی ئافرەت و منداڵەکان ڕەوانەی کەنار دەریا کرد.

کەشتی جەنگیی ئایرۆن دیوک، دوو هەزار پەنابەری لەخۆدا جێکردەوەو کەشتییەکانی دیکەش بەو شێوەیە چەند هەزار کەسێکی دیکەیان سوار کرد. بەڵام ئەو ژمارە لە چاو ئەو هەموو خەڵکەی کە چاوەڕێی ڕزگاربوونیان دەکرد، زۆرکەم دەهاتە پێش چاو. ئێستاکە ئێدی سەرانسەری ئەزمیر جگە لەو گەڕەکە تورک نشینەی کە کەوتبۆ داوێنی کێوی پاگۆس و لەبەرزایی دابوو، لە ئاگردا دەسوتا و، ئەوێ تاکە شوێنی شاربوو کە بەدەست لێنەدراوی مابۆوە.

* * *

لە نێو ئەوشارەی کە لە ئاگردا دەسووتا، دوورگەیەکی هێمن و خامۆشی دیکەش

هەبوو کە ئەویش نێوەندی سەرکردایەتی مستەفا کەمال بوو کە لەو کاتە شوم و پڕ لە مەینەتییەدا، جارێکی دیکە کەوتبۆ داوی عەشقەوە. مستەفا کەمال تازە هاتبۆ ئەو شوێنەوە کە ئافرەتێکی لاو داوای کرد ببینێ، بەڵام دەرگەوانەکەی ڕێگەی نەدەدا ئافرەتەکە بچێتە ژوورەوە. ئیدی وای لێهات ئافرەتەکە ملی لەبەر ملی کابرای دەرکەوان ناو بە زۆر خۆی کرد بە ژووری مستەفا کەمالدا. مستەفا کەمال کە گوێی لە کێشمەکێشی دەرکەوان و ئافرەتەکە و دواتر هاتنە ژوورەوەی ئافرەتەکە بوو، زۆر تووڕەبوو و دەیویست بەسەر ئافرەتەکەدا بقیژێنێ و دەستبەجێ دەریکاتە دەرەوە. کەچی کە ئافرەتەکەی دیت، واقی وڕما؛ چونکە ئەوەی هاتبۆ ژوورەوە ئافرەتێکی لادێی نەبوو، بگرە بە پێچەوانەوە ئافرەتێکی شۆخ و شەنگی سەر ڕووتی دامێن لەبەربوو.

ئەو ئافرەتە نێوی لەتیفە بوو، لەتەمەنی ٢٤ ساڵیدا بوو، باوکی یەکێک بوو لەبازرگانە دەوڵەمەندو بە نێو بانگەکانی ئەزمیر و خاوەنی چەندین کەشتی بوو. کچێکی کورتە باڵای ناسک و چاوگەورەو ژیر بوو. دایک و باوکی بەمەبەستی پشوودان چووبوونە فەرەنسا و بە قەولی خۆی ئەو لە فەرەنساوە بۆ «*پیرۆزبایی کردن لە قارەمانی تورکیای نوێ*» کە وێنەکەیی لە مەدالیایەکی بچوک هاویشتبوو و بەملی خۆیدا کردبوو، گەڕابۆوە ئەزمیر.

لەتیفە سەبارەت بەو وێنەیەی مستەفا کەمال کە خستبوویە نێو مەدالیاوە، لە مستەفا کەمالی پرسی: «*خۆ پێتان ناخۆش نییە وێنەی ئێوەم وا لێکردووە؟.*» مستەفا کەمال لە وەڵامدا گوتی: «*پێناخۆش بوونی چی؟ زۆریشم پێ خۆشە.*»

لەتیفە پێشنیازی ئەوەی کرد ماڵی باوکی کە ڤیلایەکی خۆش و ئارامە، کەوتۆتە دەوروبەری ئەزمیرەوە، چۆڵەو کەسی تێدانیەو وا باشە مستەفا کەمال بارەگای سەرکردایەتیی خۆی بگوازێتەوە ئەوێ. هەروەها گوتی خۆشی چەند زمانێکی بیانی دەزانی و خۆشحاڵ دەبێ ئەگەر بتوانێ یارمەتی مستەفا کەمال بدات.

مستەفا کەمال، بەبێ ئەوەی دڵ لە دڵ بدات ئەم پێشنیازەی پەسند کردو خانووەکە بەکەیفی ئەو دەرچوو. بەتایبەتیش کە کچێکی زۆر جوان میوانداری لێ دەکرد کە دەستبەجێ عاشقی ببوو.

هەر لەو شەوەیدا کە ئاگر کەوتنەوەکە لە ئاردابوو، مستەفا کەمال میوانداریەکی سازداو ژمارەیەکی زۆر میوان و ڕۆژنامەنووسی بانگهێشت کرد. لەو شەوەدا لەتیفە سەرنجڕاکێشانە لەسەر ئەو قالدرمەیەی کە بەسەر باخەکەدا دەیڕوانی، وەستابوو و بەخێرهاتنی میوانەکانی دەکرد. لەکاتەدا، ئەزمیر وەک کورەی ئاگر دەسوتاو لە هەموو لایەکییەوە بڵێسەی ئاگر بەرزدەبۆوەو، لە ولاتر تارمایی خۆڵەمێشی گەلەکەشتی جەنگیی وڵاتانی هاوپەیمان دەدیترا.

مستەفا کەمال ئاماژەی بەم دیمەنە کردو بەمیوانەکانی خۆی گوت: «*ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە تورکیا لە بوونی هەموو جۆرە خائین و بێگانەپەرستێک پاک دەبێتەوەو لەمەودوا تورکیا هی تورکەکانە.*»

کاتێ کە میوانەکان ماڵئاواییان کردو ڤێلاکەیان جێ هێشت، مستەفا کەمال

مەبەستی سەرەکی خۆی ئاشکرا کرد. بۆ پیاوێک کە تەنها وەکو کاڵایەک سەیری ئافرەتی دەکردو ئەغڵەبی ئافرەتانیش لەبەرامبەریدا خۆیان بەدەستەوە دەدا، ڕەفتاری خۆبەدوورگرانەو خاتوونانەی لەتیفە، مایەی نارەحەتی و دڵتەنگی بوو. لە کاتی ماڵئاواییدا، لەتیفەڕێگەیدا مستەفا کەمال ڕوومەتی ماچ بکات و پێی گوت ئامادەیە ببێتە هاوسەری، بەڵام ئافرەتێکی ئازادەو بەهیچ شێوەیەک ئامادەنییە ببێ بە ماشقەی و ئەو لەگەڵیدا ڕابوێرێ.

بەبیستی ئەم قسەیە مستەفا کەمال تووڕەبوو و دەستی کرد بە هات و هاوارو هەڕەشەکردن، بەڵام ئەمانە هەمووی بێ سوود بوو و لەتیفە خۆی بەدەستەوەنەدا. کاتێ مستەفا کەمال لە کۆتایی مانگی ئەیلول ئەزمیری بەجێ دەهێشت، هێشتا دەستی بەلەشی لەتیفە نەکەوتبوو و لەتیفە وەکو جاران هەر کچ بوو.

* * *

ڕۆژی هەینیش ئەم کوشتن و بڕین و تاڵانکارییە درێژەی کێشاو پەیامنێری ڕۆژنامەی دەیلی تەلگراف لە ڕاپۆرتیکیدا بۆ لەندەن، لەو بارەیەوە نووسیویەتی: *«سێ لەسەر پێنجی شاری ئەزمیر بووە بە خۆڵەمیش. ئەمڕۆ بەیانی کە دوا بڵێسەی ئاگر دامرکا، دەرکەوت کە پتر لە (٣٠٠) هەزار کەس بێ جێ و ڕێ بوونە. تەواوی گەڕەکە یۆنانی و ئەرمەنی نشینەکان کاول بوونە. ژمارەی کوژراو و بریندارەکان و ئەو زەرەروزیانانەی کە کەوتۆتەوە، مەزندە ناکرێ. تەواوی کەشتییەکانی هاوپەیمانان، بە ڕزگارکردنی پەنابەران و تیمارکردنی بریندارەکانەوە خەریکن. شەقامەکانی شار بە تەرمی مردووەکان داپۆشراوەو سەرەڕای ئەو هەموو بەڵێنانەی کە کەمال پاشا دەیدان، پێدەچێ تورکیا قەرزەکۆن و نوێیەکانی پاکردبێتەوە.»*

* * *

ئێستاکە، ڕەوتی ڕووداوەکان ڕووەو ئاقارێکی دیکەدەچوو؛ لە ١٦ی ئەیلول، مستەفا کەمال بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە کە تێیدا هاتبوو کەوا دەبێ تەواوی ئەو نێرینە ئەرمەنی و یۆنانییانەی تەمەنیان لە نێوان ١٥ تا ٥٠ ساڵە، تا ٣٠ ئەیلول ڕەوانەی ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێیی نێو تورکیا بکرێن.

ئەوانی دیکەش، واتا پەنابەرە ئافرەت و منداڵ و بەساڵاچووەکان، دەبوایە تا هەمان ڕۆژ ئەزمیر بەجێ بێڵن، ئەگینا ئەوانیش بەهەمان شێوە دەستگیر دەکرێن و ڕەوانە ئۆردوگاکانی کاری زۆرە ملێیی دەکرێن. بەقەولی دکتۆر *لاوجوی*، تاکە پزیشکی ئەمەریکایی دانیشتووی ئەزمیر: *«ئەم فرمانە لە بڕیاری مەرگیش خەراپتربوو، چونکە چارەنووسی پیاوەکان ئەوەبوو کە بەرلەوەی بمرن وەک کۆیلەیان لێ بێت، بەڵام چارەنووسی ئافرەتەکان لەهی پیاوەکانیش سامناکتربوو.»*

لە ٢٦ی ئەیلول، واتا چوار ڕۆژ بەر لە کۆتایی هاتنی ماوە دیاریکراوەکە، نۆزدە کەشتیی نەفرهەڵگر، بەمەبەستی گوێزانەوەی دانیشتوانی ئەزمیر، گەیشتنە سەر بەندەرەکانی ئەزمیر.

سەربازە تورکەکان خەڵکەیان ڕیزکردبوو و یەک بەیەک دەیانپشکنین و ئەوەی پێیان بایە لێیان دەستاندن.

به‌هۆی پاڵه‌په‌ستۆو زۆری حه‌شاماته‌كه‌، هه‌ندێ له‌و ئافره‌تانه‌ی كه‌ به‌ته‌مه‌ن داچووبوون یان ئه‌وه‌تا دووگیان بوون، كه‌وتنه‌ ده‌ریاوه‌و خنكان. توركه‌كان هه‌ر ئافره‌تێكی پۆشته‌و په‌رداخیان بدیبایه‌ له‌ ڕیزده‌ریان ده‌هێناو جوان جوان نێو پێلاو گۆره‌وییه‌كانیان ده‌پشكنی و ئه‌وه‌ی پێی بایه‌ لێیان ده‌ستاند، ئه‌زمیر له‌ دوا ساتی چۆڵ كردنی له‌ دانیشتوان، دیمه‌نی دژبه‌یه‌كی سه‌یرو سه‌مه‌ره‌ی تێدا ده‌بیندرا.
خاتو مارجۆری هوسپیان، له‌و باره‌یه‌وه‌ نووسیویه‌تی: *«له‌ شه‌قامی سه‌ره‌كیی شاردا، پیاوێك (٥) تابوتی به‌په‌تێكه‌وه‌ به‌ستبوو و به‌دوای خۆیدا ڕایده‌كێشان. كابرایه‌كی دیكه‌ ته‌باغێكی گه‌رمی له‌ باوه‌ش كردبوو و به‌ره‌و كه‌نار ده‌ریای ده‌برد. سه‌ماكه‌ره‌ توركه‌كان له‌وه‌ی كه‌ له‌ مۆسیقاژه‌نه‌ یۆنانییه‌كان دوورخرانه‌وه‌و بازاڕیان نه‌ده‌ما، ده‌گریان و له‌خۆیان ده‌دا. به‌ڵام سه‌رتاشه‌ توركه‌كان خۆشحاڵ بوون؛ چونكه‌ توانیبوویان به‌ خێرایی ببن به‌خاوه‌نی كورسیی ده‌لانسازه‌ یۆنانیه‌كان.»*
له‌ یه‌كی تشرینی یه‌كه‌مدا، گه‌له‌كه‌شتی هاوپه‌یمانان توانی ١٨٠,٠٠٠ ژن و منداڵ بگوازرێته‌وه‌. تا له‌و كاته‌دا ماوه‌ دیاریكراوه‌كه‌ كۆتایی پێ هات، به‌ڵام مسته‌فا كه‌مال (٦) ڕۆژی دیكه‌شی خسته‌ سه‌ر ماوه‌كه‌ی بۆ ئه‌وه‌ی (٦٠) هه‌زار كه‌سی دیكه‌ش كه‌ مابوونه‌وه‌ بگوێزدرێنه‌وه‌. دوای تێپه‌ڕبوونی چه‌ندین ساڵ به‌سه‌ر ئه‌م ڕووداوه‌دا هێشتا ژماره‌ی ته‌واوی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ گیانیان له‌ ده‌سته‌داوه‌ دیار نییه‌، به‌ڵام ڕه‌نگبێ ڕاپۆرته‌كه‌ی جۆرج هۆرتۆن-ی باڵیۆزی ئه‌مه‌ریكا له‌ ڕاستییه‌وه‌ نزیك بێت كه‌ تێیدا ئاماژه‌ی به‌وه‌داوه‌ كه‌ له‌م ڕووداوه‌ی ئه‌زمیردا، (١٠٠) هه‌زار كه‌س گیانیان له‌ده‌ستداوه‌.
ئێستا ته‌نیا یه‌ك پرسیار ماوه‌ بیكه‌ین ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌ ئاخۆ توركه‌كان به‌ده‌ستی ئه‌نقه‌ست ئه‌زمیریان ئاگر تێبه‌ردا، یان ئه‌وه‌تا وه‌كو مسته‌فا كه‌مال ده‌ڵێ یۆنانییه‌كان سیاسه‌تی زه‌وی سووتاویان پیاده‌كردو شاره‌كه‌یان كاول كرد بۆ ئه‌وه‌ی كه‌س خێری لێ نه‌بینێ؟
هه‌ندێ كه‌س بڕوا به‌ مسته‌فا كه‌مال ده‌كه‌ن و هه‌ندێكیش له‌وانه‌ی كه‌ سۆزیان به‌لای یۆنانی و ئه‌رمه‌نییه‌كاندایه‌، پێیان وایه‌ توركه‌كان به‌ ئه‌نقه‌ست ئه‌م كاره‌یان كرد بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌سه‌واری یۆنانی و ئه‌رمه‌نییه‌كان له‌و شاره‌دا بسڕنه‌وه‌. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا گێڕانه‌وه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه‌ له‌ ئه‌زمیر بوونه‌وه‌و به‌چاوی خۆیان ئاگر كه‌وتنه‌وه‌و ڕووداوه‌كانی دوای ئاگركه‌وتنه‌وه‌كه‌یان دیووه‌، له‌م كاره‌دا توركه‌كان به‌ به‌رپرسیار ده‌زانن. به‌ڵام وڵاتانی ئه‌وروپایی و ئه‌مه‌ریكا كه‌ به‌رژه‌وه‌ندییه‌كی زۆریان له‌ توركیادا هه‌بوو، ئه‌مه‌یان به‌هه‌ند وه‌رنه‌گرت و چیدی به‌ دووی باسه‌كه‌ نه‌كه‌وتن و دوای ئه‌م ڕووداوه‌ هه‌ریه‌كه‌و به‌جۆرێ خۆیان له‌ مسته‌فا كه‌مال و ڕژێمه‌ نوێیه‌كه‌ی نزیك كرده‌وه‌.

* * *

## فەسڵی شانزدەهەم

### دیکتاتۆر

سەرکەوتنەکەی مستەفا کەمال لە ساکاریا، گەلێ دەرئەنجامی گرنگی هەبوون کە هێشتا ولاتە ئەوروپییەکان هەستیان پێ نەکردبوون. لە کاتێکدا کە ئاگرکەوتنەوەکەی ئەزمیر بەرەمزی تۆڵەستاندنەوەی تورکەکان لە قەڵەمدەدرا، بەڵام مستەفا کەمال هێشتا ڕێگەیەکی سەخت و پڕ پێچ و پەنای بۆ گرتنەدەستی یەکجارەکی دەسەڵات لە پێشدابوو. ئەگەرچی لە هەموو شوێنێک وەک ڕێبەری تورکیای نوێ پێشوازیی لێدەکراو لە ئەنقەرەشدا زۆر دەسەڵاتدار بوو، بەڵام هێشتا سێ کۆسپی لەسەر ڕێ بوو: یەکەمیان، سوپای یۆنان دوای ئەوەی ڕایان کردبوو، لە ڕێگەی دەریاوە چوبوونە ویلایەتی تراس و لەوێ مۆڵیان خواردبوو و لەلای باکورەوە هەڕەشەیان لە قوستەنتەنیە دەکرد. دووەمیان، هێزی داگیرکەری هاوپەیمانان کەوتبوونە نێوان هێزەکانی ئەو و یۆنانییەکانەوە و سێیەمیان، مەسەلەی سوڵتانی پیرو پەککەوتە بوو کە هێشتا چنگی لە پاشماوەی دەسەڵاتەکەی قوستەنتەنییە گیرکردبوو.

تەنها ڕێگەیەک کە مستەفا کەمال دەیتوانی بەهۆیەوە بەرەورووی یۆنانییەکان بێتەوە ئەوەبوو کە بە گەرووی داردانێلدا تێپەڕببێ، بەڵام (چاناک کالێ) کە کەوتبۆ سەرکەنارەی ئاسیایی گەرووەکەو حەوت ساڵ پێشتر مستەفا کەمال و عارف لەو شوێنەدا لەگەڵ ئینگلیزەکاندا جەنگابوون، ئێستا بەدەست هێزی هاوپەیمانانەوە بوو. تاکە شوێن، پارچە زەوییەک بوو کە لەهەردوولای بسفۆڕەوە وەک ناوچەیەکی بێلایەن، یان لە چەک داماڵدراو لە قەڵەم دەدراو پەلاماردانی بەمانای دووژمنکاری لەگەڵ هێزە هاوپەیمانەکان لێک دەدرایەوە.

لەگەڵ هموو ئەوانەشدا، مستەفا کەمال بڕیاریدا بە داگیرکردنی ئەو ناوچەیە، مەسەلەکە بکا بە کێشەیەکی نێو دەوڵەتی. هەرچەندە دواتر دانی بەوەدانا کە هەمیشە هیوای ئەوەی هەبووە کە ئەم مەسەلەیە لە ڕێگەی دیپلۆماسییەوە چارەسەر بکات و هەروەها لەو بڕوایەشدا بووە کە ئینگلیزەکان سەرەڕای هێزو باڵادەستییان لە ناوچەکەدا بەرەو ڕووی نابنەوە؛ چونکە مەبەستی تەنها دەرکردنی هێزە یۆنانییەکان بووە. بەڵام ئینگلیزەکان بەوچاوە لە مەسەلەکەیان نەدەڕوانی و بەدیتنی یەکەم جموجۆڵی سوپای تورک، بەڵێنیان لەوڵاتانی فەڕەنساو ئیتالیا وەرگرت تا لەکاتی پێویستدا شان بەشانیان بەشداری لە جەنگی دژ بە تورکەکاندا بکەن. وردە

ورده که هەڕەشەکانی مستەفا کەمال توندتر بوون، چێرچیڵ که ئەو کاتە وەزیری کۆلۆنییەکانی بەریتانیابوو، بەیاننامەیەکی توندی لە دژی تورکەکان دەرکرد.

بڵاوکردنەوەی ئەو بەیاننامەیە لەلایەن کەسێکەوە کەتا دوێنێ و بەدرێژایی سێ ساڵی رابردوو لە بەرامبەر لوید جۆرجدا داکۆکی لەتورکەکان کردبوو، سەیر دەهاتە پێش چاو. ڕەنگبێ دیمەنی هێزەکانی تورک لە گۆشەی کیشوەری ئەوروپا و کۆنترۆڵکردنی گەرووەکان لەلایەن تورکیاوە، بەو شێوەیە ڕقی چێرچیلی هەستاندبێ و وای لێکردبێ بەبێ ئەوەی پرس بە وەزارەتی دەرەوە بکات، بەیاننامەیەکی لەو بابەتە دەربکات. بەڵام ڕای گشتی لە بەریتانیا دژی شەڕبوو و ڕۆژنامەی دەیلی میل ئەم ڕستەیەی کردەمانشێت: «*پێش بەو شەڕە نوێیە بگرن.*» وڵاتانی ژێر فەرمانڕەوایی (*Dominion*) بەریتانیا؛ واتا کەنەدا، ئوسترالیا، نیوزلەندا و ئەفەریقای باشور که لە سەرەتادا بەڵێنی پشتیوانییان بە بەریتانیا دابوو، ئێستاکە پاشەکشێ یان لە هەڵوێستی خۆیان کردبوو و باسیان لە سیاسەتی کۆلۆنیالیستیانەی لەندەن دەکرد.

لە هەموو ئەوانەش گرنگتر ئەوەبوو کە بەیاننامەکەی چێرچیڵ بیانووی ئەوەی دایە دەست وڵاتانی ئیتالیا و فەرەنسا تا لەو بەڵێنەی لە سەرەتادا بەنابەدڵییەوە سەبارەت بە پشتیوانی و هاوکاری بە بەریتانیایان دابوو، پاشگەز دەبنەوە.

ئێستاکە چاناک کالێ، تەنها هێزی ئینگلیزەکانی لێ بوو، فەرماندەی ئەو هێزانەش بەدەست ژەنراڵ سێرچارلز هرینگتۆن- ەوەبوو و لەحاڵەتی ئامادباشیدا بوون.

ورده ورده مەوای نێوان هێزەکانی ئینگلیزو تورک کەم دەبۆوەو تا وایلێهات تورکەکان تەنها بیست مەتر لە ئینگلیزەکان دوور بوون و هیچ کامیشیان ئامادەنەبوون لەبەرامبەر ئەوەی دیکەدا بکشێنەوە. کاربەدەستانی لەندەن فرمانیان بەهرینگتۆن دا کە خۆی بۆ شەڕ لەو ناوچە بێلایەنەدا ئامادە بکات. مستەفا کەمالیش بە تەلگراف بە هرینگتۆنی ڕاگەیاند کەوا ناوچەی بێلایەن بە ڕەسمی ناناسێت و بۆ ئەوەی قسەکەی خۆشی بسەلمێنێت، نزیکەی سەد هەزار سەربازی تورکی ناردە بن تەلدڕووی ئۆردوگای ئینگلیزەکان، بەڵام فرمانی بە هێزەکانی دابوو لولەی تفەنگەکانیان ڕووەو زەوی بێت و بەهیچ شێوەیەک تەقە نەکەن.

هرینگتۆنیش فرمانی بەسەربازە ئینگلیزەکان دابوو تا ئەوکاتەی تورکەکان تەقەیان نەکردووە ئەوانیش تەقە نەکەن. بەقەولی مولازم پەتریک کە فەرماندەی بەشێکی هێزە ئینگلیزەکان بوو: «*بەتەواوەتی دیاربوو کە ئەم نیشاندانی هێزە تەنها گەمەیەکی جەنگییەو هەریەک لەلایەنەکان دەیەوێ هێزو توانا و وورەی خۆی بە ئەوی دیکە نیشان بدات. تا سەر ئەنجام سەربازانی هەردوولا دۆستانە بەرولای یەکتری هاتن و دەستیان لە نێو دەستی یەکدی ناو، تەنانەت لاچاوی یەکتریشیان ماچ کردو مستەفا کەمال و هرینگتۆن پەیامی دۆستانەیان ئاڵو وگۆڕ کرد.*» هرینگتۆن ئەو کەسە بوو کە نەیهێشت ئەم شەڕە بکرێ و بە پێچەوانەی قسەی سیاسەتمەدارانی لەندەن کە بەنیازی ئەوەبوون ئۆڵتیماتۆمێک بدەنە تورکەکان، دەجولایەوە.

سیاسەتمەداران لە لەندەن بەنیازی ئەوەبوون لە ڕێگەی خودی ژەنەڕاڵەوە بە تورکەکان ڕابگەیەنن کە یان شەڕ، یان کشانەوە. بەڵام هرینگتۆن ئاگاداربیبوو کە فەرەنسایییەکان پەیوەندییان بە مستەفا کەماڵەوە کردووەو بەدوای ڕێگەیەکی ئاشتییانەدا دەگەڕێن. بۆیە گوێی بە فرمان و ڕاسپاردەکانی لەندەن نەداو، بڕیاریدا دان بەخۆیدا بگرێ و چاوەڕێ بێت. لەولاشەوە مستەفا کەمالیش وەکو ئەو دانی بەخۆیدا گرتبوو و بەکلۆر شریدان-ی پەیامنێری مەیدانیی بەریتانیای گوتبوو: «*من هێندە دان بە خۆم دادەگرم تا ئەوان دەرفەتی پێویست بۆ پاشەکشێیەکی ئابڕومەندانەیان هەبێ.*»
هەڵسوکەوتی ژیرانەی هەردوو فەرماندەکەو ئەو سەبرو لەخۆبووردوویییەی کە بۆ دەست پێ نەکردنی کردەوەی سەربازی لە خۆیانیان نیشاندا، بووەهۆی ئەوەی شەڕ دەست پێ نەکات.

لە کاتێکدا کە هێزە یاریدەدەرەکان لە ماڵتاو میسرەوە دەگەیشتنە ناوچەکەو گەلەکەشی سەربازیی بەریتانیا لە دەریای ناوەڕاستەوە بەرەو داردانێل کەوتبۆ ڕێ، نوێنەری فەرەنسا بەڵێنی بە مستەفا کەمالدا کە هاوپەیمانان یۆنانیییەکان ناچار دەکەن خاکی تورکیا بەجێ بێڵن. بەریتانیا لە ڕازی بوون پتر چیدیکەی لەدەست نەدەهات و مستەفا کەماڵ بەبێ ئەوەی یەک گوللەی تەقاندبێ، سوپای یۆنانی لە خاکی نیشتمانەکەی دەرپەڕاند.

کێشەی ئاڵۆزی ناوچەی بێلایەنیش بۆ ئەو کۆنفڕانسە هێشترایەوە کە لە شاری مودانیا بەسترا. تاکە شوێنی شیاو بۆ ئەنجامدانی دانیشتنەکانی کۆنفڕانسەکە، بینایەی کۆنسوڵگەریی پێشووی روسیا بوو کە بەپەلەپەل خاوێن کرابۆوە و ڕازێندرابۆوە.

دانوستانەکان لە ڕۆژێکی بارانیدا دەستیان پێ کراو، ئەگەر چی لە بنەڕتدا هرینگتۆن دەسەڵاتی ئەوەی پێدرابوو کە قۆناغ بە قۆناغ ناوچەکە لە هێزەکانی بەریتانیا چۆڵ بکات، بەڵام جاری وا هەبوو نوێنەرانی هەردوولا چەندین سەعات لە مەسەلەیەکی لاوەکی و کەم بایەخ دەدوان. هرینگتۆن دواتر گێڕایەوە: «دیمەنی ئەو ژوورە بچوکەو ئەو لامپایەم هێشتا لە پێش چاوە. من لەنێوەڕاستی ژوورەکەدا پیاسەم دەکردو کۆلۆنێل عیسمەت-ی نوێنەری تورکەکانیش بە پێچەوانەی من پیاسەی دەکردو پەیتا پەیتا دەیگوت ناچمە ژێرباری مەرجەکانی ئێوەوە، بەڵام لە پڕێکا وەستا و بەزمانی فەرەنسی گوتی: «*زۆر باشە، قەبوڵمە. من لە ژیانمدا بەقەدەر ئەکاتە شاگەشکە نەببووم.*»

هرینگتۆن لە ترسی ئەوە نەبادا جارێکی دیکە تورکەکان پاشگەزببنەوە، پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێ دەستبەجێ ڕێککەوتننامەکە ئیمزا بکەن، بەڵام ۱٥ سەعاتی پێچوو تا ناوەرۆکی ڕێککەوتننامەکە نووسراو لە ڕێگەی ئەو نووسینگە بچوکەی کە لە مودانیا هەبوو، وەرگێڕدرایە سەر (٥) زمان و تایپ کرا.
ئێستا، مستەفا کەماڵ بۆ گرتنە دەستی دەسەڵاتی ڕەها، تەنها یەک لەمپەری لەسەرڕێگا مابوو.

* * *

هەستی لێکدانەوەو خۆگونجاندن، یەکێ لەسەرنجڕاکێشترینی ئەو تایبەتمەندییانە بوون کە مستەفا کەمالیان پێیان دەناسرایەوە.

کاتێ باسی لە بابەتێک دەکرد کەڕەنگبوو خەڵک کەیفیان پێ نەیەت، یان دژی بوەستن، هیچ خۆی تێک نەدەداو، بەلێزانی و شارەزاییەوە سنووری بۆ قسەکەی خۆی دادەناو هەوڵی دەدا خۆی لەگەڵ بارودۆخەدا بگونجێنێ و ڕەوتی ڕووداوەکان بەرەو ئەو شوێنە بەرێت کە مەبەستی بوو.

ئێستا، سەبارەت بە لادانی سوڵتانیش هەمان شێوازی گرتبۆبەر، بەڵام بەسەرنجدان لە هەستی ئایینیی خەڵک، دەیزانی کەوا هەر هەڵەیەک کە لەو بارەیەوە بیکات، یەکسانە بە خۆکوژیی سیاسی؛ بۆیە بە شارەزایی و لێزانیەکی زۆرەوە دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ژەهراوی لە دژی کارو کردەوە سیاسییەکانی سوڵتان و دارو دەستەکەی و بە *«دەستەمۆی بێگانەکان و خائین»* بە *بەرژەوەندیی نیشتمانی»* بەخەڵکی ناساندن.

هەر کە هەستی خەڵک وورووژاو خەڵک لە سوڵتان ودارو دەستەکەی بەقین داچوون، مستەفا کەمال، ژیرانە دەستی کرد بە داکۆکیکردن لە پلەوپایەی ئایینیی سوڵتان و گوتی نابێ ئایین و سیاسەت تێکەڵی یەکدی بکرێن.

سوڵتان، خەلیفەی موسڵمانانەو لەو ڕووەو جێی ڕێزو ستایشی خەڵکە، کەواتا بۆچی سەڵتەنەت، کە پلەیەکی سیاسییە پوچەڵ نەکەینەوەو، خەلافەت کە پلەیەکی ئایینییە نەپارێزین؟ ئەم پێشنیازە بەو مانایە بوو کە بەرەبابی عوسمانی وەک ڕێبەری ئایینی خەڵک بمێننەوە، بەڵام سیاسەتیان لە چەنگ دەربهێندرێ و بدرێتە سیاسەتمەداران.

کاتێک کە ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی لە ئەنقەرە لەو بارەیەوە دەستی بە دانوستان کرد، مستەفا کەمال هەستی کرد کە ژمارەیەک لە نوێنەران حەز ناکەن دەنگ بەو پێشنیازەی بدەن کە لە ڕوانگەی ئەوانەوە لێدانێکی کوشندە لە شان و شکۆی مێژوویی تورکیا دەدات. بۆیە ژمارەیەک لە برادەرەکانی کە لە هەمانکاتدا چەکداریش بوون لە خۆکۆکردەوەو، پێشنیازی ئەوەی کرد ککە ئەم باسە بەشێوەیەکی ئاشکرا بخرێتە بەر دەنگدانەوەو دەست بەرز بکرێتەوە، ئەمەش بووەهۆی ئەوەی کە دەنگی نارەزایەتی ئەو نوێنەرانە کپ بێت کە داوای ئەوەیان دەکرد دەنگدانەکە بەنهێنی بێت.

لەکاتێکدا کە برادەرەکانی دەمانچەکانی خۆیان هەڵکێشابوو، مستەفا کەماڵ گوتی: *«من دڵنیام لەوەی کە ئەنجومەن بە زۆرینەی دەنگ ئەم پێشنیازە پەسند دەکات، بۆیە تەنها دەست بەرزکردنەوە بەسە.»*

چەند نوێنەرێک دەستیان بەرزکردەوەو، سەرۆکی ئەنجومەن ڕایگەیاند: *«بەزۆرینەی دەنگ پەسندکرا.»* نوێنەرانی توڕەو هەڵچوو، چووبوونە سەر کورسیەکانیان و نارەزایەتیان دەردەبڕی و دەیانقیژاند و هەندێکیشیان تفیان بەسەروچاوی یەکتری داکردو پێک هەڵپرژان.

سەرۆکی ئەنجومەن لە کاتێکدا کەچاوی لەنێو چاوی مستەفا کەمال بڕیبوو، ڕایگەیاند: «*ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانیی تورکیا، بەزۆرینەی دەنگ پوچەڵ کردنەوەی سەڵتەنەت ڕادەگەیەنێت.*»

هات و هاوار قیژەقیژی نارازییانەی نوێنەران، چەندە دەقیقیەکی دیکەشی خایاندو دوای ئەوەسوڵتانەکانی عوسمانی کە ٧ سەدەبوو حوکمیان بەسەر ئەوە وڵاتەدا دەکرد، چوو نێو پەڕەکانی مێژووەوە.

چەند هەفتە دواتر، کۆڵۆنێل ڕەفعەت چووە قوستەنتەنییەو جڵەوی کاروباری ئەوێی گرتە دەست و ، تێکڕای دەسەڵات و تواناکانی لە سوڵتان وەحیدەدین ستاندەوەو لە کۆشکی یڵدزدا بە تەنیای هێشتەوە. بەڵام سوڵتان سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بمێنێتەوەو بەرگری بکات تا هەندێ پڕوپاگەندەی سەبارەت بەوەی کە لەلایەن هێزە نیشتمانییەکانەوە دادگایی بکرێ، بەرگوێ کەوت. لەو کاتەدا سوڵتان جگە لە سەرۆکی ئۆرکێستراى کۆشکەکەی کە لە هەمانکاتدا خەزووریشی بوو، متمانەی بەکەسی دیکە نەبوو. بۆیە زۆر بەنهێنی ئەو کابرایەی ناردەلای ژەنراڵ هرینگتۆن کە ئەودەم خەریکی خۆئامادەکردن بۆ چۆڵکردنی خاکی تورکیا بوو لە هێزەکانی ئینگلیز. نێردراوەکەی سوڵتان بە ترس و لەرزەوە، بەدەم پیامەکەی سوڵتانی بەهرینگتۆن گەیاند کە تێیدا داوای یارمەتی و پشتیوانیی لە دەوڵەتی بەریتانیا کردبوو، بەڵام هرینگتۆن نەیدەویست بەوە تاوانار بکرێ کە لە خۆیەوە یارمەتی سوڵتانی داوەولە تورکیا ڕزگاری کردووە، بۆیە لە وەڵامدا گوتی: « *دەبێ سوڵتان بەشێوەی نوسراو ئەم داوایەی بخاتەڕوو.*» سوڵتانیش نامەیەکی نووسی و کاتێ هرینگتۆن نامەی سوڵتانی پێ گەیشت، پلانێکی بۆ ڕزگارکردنی سوڵتان دارشت.

دوو ڕۆژ دواتر، کەمێک بەرلەوەی خۆر هەڵبێت، ئەمبۆلانسێک لەبەرامبەر دەرگای پشتەوەی کۆشکی یڵدز وەستا. سوڵتان و منداڵە بچوکەکەی و یەکێ لە خواجەسەراکان بە چەند باوڵێکەوە، لەژێر بارانێکی بەخوڕدا لە کۆشکی یڵدز هاتنەدەرو پەرستارێکی پیاوی ئینگلیزی یارمەتی دان تا سواری ئەمبۆلانسەکە بوون.

لەکەنار دەریا، قایەغێک چاوەڕێ بوو تا سوڵتان و هاوڕییەکانی بگەیەنێتە کەشتی جەنگیی مالایا. دەریا سالارە ئینگلیزەکە پێشوازییەکی شایستەی لە سوڵتان کرد، بەڵام کاتێ سوڵتان زانی یەکێ لە باوڵەکانی ون بووە، دەستی بەهات و هاوارو نەڕاندن بەسەر خواجەسەراکەیدا کرد. سەرئەنجام باوڵەی سوڵتان کە لە قایەغەکەدا بەجێ مابوو، درایەوە دەست سوڵتان و سوڵتان ئیسراحەتی کرد.

یەک سەعات دوای ئەوە، لەبەرەبەیانی ڕۆژی ١٧ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢، کەشتی جەنگیی بەریتانیا، ئاوەکانی بسفۆری جێ هێشت و دوا سوڵتانی عوسمانیی گەیاندە شاری سان ڕیمۆی ئیتالیاو سوڵتان بە گومناوی لەو شارەدا نیشتەجێ بوو و عەبدولمەجیدی ئامۆزای، کە یەکێ لە کوڕەکانی سوڵتان عەبدولعەزیز بوو، لەلایەن حکومەتی نوێوە بە خەلیفەی موسڵمانان و ئەمیرەلموئمینین دیاریکرا.

دوا داواکاریی سوڵتان له هرینگتۆن ئه‌وه‌بوو که له کاتیکی گونجاودا وا بکات (٥) هاوسه‌ره‌که‌ی بگه‌نه لای، به‌ڵام باسی کچی باخه‌وانه‌که‌ی نه‌کرد.

هرینگتۆن توانی ئه‌م داوایه‌ی سوڵتان بێنێته‌جێ و دوای چه‌ند ڕۆژێک یه‌کێ له خواجه سه‌راکان گه‌ڕایه‌وه قوسته‌نته‌نیه و ئه‌و (٥) ئافره‌ته‌ی له‌گه‌ڵ خۆیدا برده ئیتالیا. ئه‌مجاره‌یان ئیدی به‌نهێنی نه‌بوو و هاوسه‌ره‌کانی سوڵتان به ئاشکرا له قوسته‌نته‌نیه‌وه به‌ره‌و ئیتالیا به‌ڕێ که‌وتن و ئه‌مه‌ش بووه هۆی ئه‌وه‌ی که ته‌لگرافێکی سه‌یر بگاته باڵیۆزخانه‌ی به‌ریتانیا له قوسته‌نته‌نیه. یه‌کێ له به‌ڕێوه‌به‌رانی نمایش (پیشاندان)ی نیویۆرک له ته‌لگرافێکدا نووسیبووی: *«سێرکی هیپۆردووم-ی نیۆریۆک، حه‌ز ده‌کا هاوسه‌رانی سوڵتانی پێشوو دامه‌زرێنێ. تکامان وایه به‌و که‌سه‌ی که ده‌توانێ ئه‌و ئافره‌تانه‌مان بۆ بنێرێ ڕابگه‌یه‌نن که په‌یوه‌ندیمان پێوه بکات.»*

* * *

هه‌رچه‌نده ئێستا ده‌سه‌ڵات که‌وتبۆ به‌رده‌ستی مسته‌فا که‌مال، به‌ڵام سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش زه‌ینی به بابه‌تێکی دیکه‌وه خه‌ریک بوو. ئه‌و ئیتر له‌فکرییه‌ی ئامۆزای بێزاربوو و سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی که مسته‌فا که‌مال تووشی ئاگری عه‌شقی له‌تیفه ببوو، فکرییه‌ش تووشی نه‌خۆشی سیل ببوو. بۆیه کاتێک به‌مه‌به‌ستی چاره‌سه‌ر فکرییه‌ی نارده ئه‌ڵمانیا، ته‌نها له‌به‌رئه‌وه‌نه‌بوو که ده‌یویست چاره‌سه‌ری بکات، بگره ده‌یویست به‌و شێوه‌یه له‌خۆی دووری بخاته‌وه. مسته‌فا که‌مال نه‌خۆشی خۆی پێ ته‌حه‌مول نه‌ده‌کرا ئینجا نۆره‌ی فکرییه بوو. هه‌رچه‌نده فکرییه له ڕابردوودا به‌خۆیه‌وه خه‌ریکی کردبوو، به‌ڵام ئێستا ئیدی کاتی ئه‌وه‌هاتبوو کۆتایی به‌م باسه بێنێ. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا، هه‌ر فکرییه‌ی نارده ئه‌ڵمانیا، هه‌ستی به‌وه‌کرد که جێگه‌که‌ی پێویستی به‌یه‌کێک هه‌یه که گه‌رمی کات.

هه‌ندێ جار له‌شاره‌وه ئافره‌تیان بۆ ده‌هێناو به پێی گوته‌ی کۆلۆنێل عارف که هێشتا براده‌ری خۆشه‌ویستی مسته‌فا که‌مال بوو، له‌و شه‌وانه‌دا مسته‌فا که‌مال بێ ئه‌ندازه مه‌شروبی ده‌خوارده‌وه‌و سه‌ر ئه‌نجامی ئافره‌ته‌کانیشی به‌شه‌ق و پێلاقه له ژووره‌که‌ی وه‌ده‌رده‌نان.

بێگومان دو شت مسته‌فاکه‌مالیان ناڕه‌حه‌ت ده‌کرد؛ یه‌کیان بیره‌وه‌ریی فکرییه بوو که ڕه‌نگبێ تاکه ئافره‌تێک بوو که له قووڵایی دڵیه‌وه خۆشی ده‌ویست و ئه‌وه‌ی دیکه‌شیان بیره‌وه‌ری ئافره‌تێک بوو که خۆی به ده‌ستییه‌وه نه‌دابوو.

هه‌ر ئه‌وه‌بووه هۆی ئه‌وه‌ی که شه‌وێکیان له پڕێکا به سایه‌قه‌که‌ی گوت خۆی بۆ سه‌فه‌رێکی درێژ ئاماده بکات و سه‌عاتێک دوای ئه‌وه له تاریکی شه‌ودا به‌ره‌و ئه‌زمیر که‌وته‌ڕێ.

هه‌ر که گه‌یشته ئه‌زمیر، یه‌کسه‌ر به‌ره‌و گرده‌کانی بورنوا که‌وته‌ڕێ و، به‌نێو باخه سه‌ر سه‌وزه‌کاندا تێپه‌ڕی و گه‌یشته ماڵی له‌تیفه.

مسته‌فا که‌مال له ده‌رگای دا، به‌ڵام له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌تیفه له‌قاتی سه‌ره‌وه نووستبوو، گوێی له ده‌نگی ده‌رگانه‌بوو، بۆیه مسته‌فا که‌مال به‌شانی ده‌رگاکه‌ی شکاندو به

خێرایی خۆی گەیاندە قاتی سەرێ و بەبێ ئەوەی سڵاو بکات؛ وەک ئەوەی درێژە بە گفتوگۆ ناتەواوەکەی شەوی ئاگرکەوتنەوەکەی ئەزمیر بدات، گوتی: «*زۆرباشـە، ڕازیمە، مارەت دەکەم و، دەتکەم بە هاوسەری خۆم، بەڵام هەر ئێستاو بەبێ هەراو هۆیاو میوانداری و شتی لەو بابەتە...*». بەڵام ئەو شەوە نەدەکراو، مستەفا کەمال ڤێللاکەی باوکی لەتیفەی جێ هێشت. بەڵام بەیانی زوو گەڕایەوەو دەستی لەتیفەی گرت و سواری ئۆتۆمبێلی کردو لە ڕێگادا تووشی مەلایەک بوو. هەر لەوێ لەسەر ڕێگا مەلا لێکی مارەکردن و بەم پێیە لەتیفە و مستەفا کەمال بوونە هاوسەری یەکتری.

ژن و مێردی نوێ، مانگی هەنگوینی خۆیان لە گوندەکانی تورکیادا بردە سەر، بەڵام مستەفا کەمال لای کەس نەیدرکاند کە ژنی هێناوە تا ئەو کاتەی ڕۆژێکیان لەکاتی نمایشی سەربازیدا، لەتیفە وەکو یەکێ لە بەردەستەکانی مستەفا کەمال، شان بە شانی مستەفا کەمال وەستا و ئەو کاتەبوو کە ئەفسەرەکانی زانییان ئەو ئافرەتەلاوە، هاوسەری ڕێبەری تورکیای نوێیە.

هەواڵی ئەم ژن هێنانەی مستەفا کەمال بەڕێکەوت لە مونیخ بەر گوێی فکرییە کەوت. جالییەی تورکەکانی دانیشتووی ئەڵمانیا کە ئاگایان لە پەیوەندی نێوان فکرییەو مستەفا کەمال بوو، سەرەڕای ئەو نەخۆشییە سەختەی کە فکرییە لێی بوو، میوانداریيەکی شاهانەیان لێ دەکردو ئەویش دەیگوت بڕیارە دوای چاک بوونەوە لەگەڵ مستەفا کەمالدا بین بە ژن و مێرد.

کاتێ یەکێ لە برادەرەکانی هەواڵی ژن هێنانی مستەفا کەمالی بە فکرییە ڕاگەیاند، لە حەژمەتان ڕەنگی لەبەردانەماو وەک بووکەشووشە بەسەر جێگەکەیدا بەربۆوە، بەڵام برادەرەکەی پێی نەگوتبوو کە لەتیفە دەستبەجێ دوای هاتنی بۆ ماڵی مستەفا کەمال، فەڕشەکەی فکرییەی فڕێ داوەو ، پەردەکانی دڕاندوون و شێوەو ڕووخساری نێو ماڵ و تەنانەت باخەکەشی گۆڕیوە.

* * *

یەکێ لە سەرسووڕهێنەرترین لایەنەکانی ژیانی سیاسیی مستەفا کەمال ئەوەبوو کە وەک هیتلەر لە ساڵانی دواتردا، چین و توێژەکانی خەڵک دەیانپەرست، بەڵام ڕۆشنفکران بڕوایان پێی نەبوو. ڕەنگبێ مستەفا کەمالیش وەک پیاوە مێژوویيەکانی دیکە، جارجارە تووشی «*نەخۆشی گەورەیی*» دەبوو و پێیوابوو مومکین نییە کەسێکی دیکە بتوانێ لە تورکیا ڕۆڵی ئەو ببینێ. وردە وردە وا باوەڕی بەم مەسەلەیە پەیدا کرد تا گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە بۆگەیشتن بە ئامانجەکانی دەتوانی هەموو ئامرازێک بەکاربێنێ و، بە کورتیەکەی هەموو شتێک لە پێناو سەرکەوتن د ا بوو بە درووشمی.

کاتێ خەڵکی تورکیا مستەفا کەمال و دیکتاتۆرە هاوچەرخەکەی مۆسۆلینی یان خستە تای یەک تەرازووەوە، مستەفا کەمال تووڕەبوو و گوتی: «*بە هیچ شێوەیەک ڕاست نییە من و ئەو پیاوە لە خۆباییە لە تەنیشت یەک دابنێن و بەیەکچاو لێمان بڕوانن. ئەو کەمتیارە چەکمە پۆشە دەتوانێ بەبێ هیچ دوودڵییەک وەحشییەکانی*

*حەبەشە لەنێوبەرێت، بەڵام من لە پێناو گەلەکەی خۆمدا، پتر لە هەموو شتێک بۆ وەحشییەکانی خۆمان جەنگاوم.»*

مستەفا کەمال لەیەک ڕووەوە جیاوازییەکی سەرەکیی لەگەڵ مۆسۆلینی و دواتر لەگەڵ هیتلەریشدا، هەبوو و ئەویش ئەوەبوو کە بەردەوام دووپاتی ئەوەی دەکردەوە کە تورکیا نیازی داگیرکردنی خاکی کەسی نییەو ئەوەشی بەکردەوە سەلماند. هەر کە شەڕی نێوان تورکیاو یۆنان کۆتایی پێ هات، دەست بەجێ لەگەڵ یۆنانییەکاندا ئاشت بۆوەو هەردوولا دەستیان کرد بە گۆڕینەوە یەخسیرەکان. مستەفا کەمال وازی لە هزری تورکچیەتی، عوسمانیچیەتی و ئیسلامچیەتی هێنابوو و، تەنها و تەنها دەیویست تورکیا شوێنی شایستەی خۆی لەنێو گەلانی پێشکەوتوودا بەدەست بێنێ.

دەمێک بوو گەیشتبۆ ئەو باوەڕەی کە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، دەبێ تورکیا ببێ بە کۆماری. چەندین هەفتەی بەردەوام ئەم بیروباوەڕەی لە نێوبیرادەرو لایەنگرانیدا کە ئێستا سەرو شکڵیان گۆڕابوو، بڵاوکردەوەو گفتوگۆی لەسەر کرد. مستەفا کەمال زۆر جەختی لەسەر مۆدێرنیزم دەکردو پێی وابوو کە دەبێ تورکیا هەنگاو بۆ بەمۆدێرن بوون بهاوێ و، ئەمەش وایکرد کە نەیارەکانی بێدەنگ بن و دژایەتی بۆچوونەکانی نەکەن. کاتێ یەکێ لە پیاوانی ئایینی لە مستەفا کەمالی پرسی: «مۆدێرن» چیە؟

مستەفا کەمال لە وەڵامدا گوتی: واتا مرۆڤ بوون.

بیروبۆچوونەکانی خۆی لە ڕێگەی دیمانەیەک لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی ئۆتریشیەوە گەیاندە بەرگوێی دنیای دەرەوەو بەڵگەی ئەوەشی هێنایەوە کە ئێستاکە تەنها بە ناو نەبێ، ئەگینا لە هەموو ڕوویەکەوە تورکیا خاوەنی ڕژێمێکی کۆمارییە و لەو بارەیەشەوە ئەمەریکای بەنموونەی وڵاتێکی کۆماری هێنایەوە کە تێیدا هەموو تاکەکان بەشێوەیەکی یەکسان سوود لە ئیمکاناتی ژیان وەردەگرن و بەچاوی مرۆڤ سەیر دەکرێن.

وەکو هەموو سیاسەتمەدارێکی کارامەو ژیر، سەرەتا چوارچێوەو بنەماکانی بیروباوەڕەکانی خۆی لە وتارێکی کورتدا، بۆ ئەندامانی حزبەکەی شی کردەوە. لە ڕاستیدا لایەنگرەکانی چاوەڕێی ئەوەبوون کە مستەفا کەمال لەوە پتر قسەیان بۆ بکات، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە ددانە تاقمەکانی نێو دەمی نوێ بوون، نەیتوانی لە چەند ڕستیەک زیاتر قسە بکات و لە بری ئەو وەزیری داد بە دوورودرێژی قسەی کردو ژیرانە بەڵگەی ئەوەی هێنایەوەیە کە دەستوری نوێ هیچ شتێکی نوێی تێدا نییەو مەبەستی تەنها ڕوونکردنەوەو جێگیرکردنی ئەو یاسایانەیە کە هەنە.

کاتێ ڕەزامەندیی ئەندامانی حزبی وەرگرت، ئیتر ڕازی کردنی پەرلەمان کارێکی سەخت نەبوو و بە ئاکامی سروشتیی لە قەڵەم دەدرا. پەرلەمان بە زۆرینەی دەنگ دامەزراندنی کۆماری تورکیای پەسندکردو مستەفا کەمالیشی بەسەرۆکی ئەو کۆمارە هەڵبژارد. ئەڵبەتە لەگەڵ ئەو «*بەزۆرینەی دەنگ*»ەشدا، نزیکەی (١٠٠) نوێنەر، یان کاغەزی سپییان خستبۆ سندووقی دەنگدانەوە، یان ئەوەتا بەشداریی

دانیشتنەکەی پەرلەمانیان نەکردبوو. کاتێ کە نرکەی (١٠١)تۆپ، لە دایکبوونی تورکیای نوێیان لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣دا ڕادەگەیاند، مانای وابوو لەمەودوا مستەفا کەمال بەهێزترین و دەسەڵاتدارترین کەسی تورکیایە.

ئێستا، دەیتوانی سەرۆک وەزیران و وەزیرەکانی خۆی هەڵبژێرێت وەک فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان سەرکردایەتی دەزگای سەربازیی وڵات بکات. بەو پێیە مستەفا کەمال کۆنترۆڵی ڕەهای گەل، دەوڵەت و سوپای بەدەستەوە گرت.

* * *

هێشتا گرفتێکی دیکەش مابوو و ئەویش مەسەلەی خەلافەت بوو. خەونەکانی مستەفا کەمال بۆ بنیادنانی تورکیای مۆدێرن تاڕادەیەکی زۆر دژی بیروباوەڕە ئایینییە دێرینەکانی خەڵکی تورکیا بوون و جیاوازییەکی تەواویان لەگەڵ یەکتریدا هەبوو. مستەفا کەمال باوەڕی بە ئایین نەبوو و جارێکیشیان بە گۆڵۆنێل عارفی گوتبوو: «*ئایین وەک لێفەیەکی ئەستوور وایە کە بەسەر خەڵکی تورکیادا دراوەو خەواندونی و نایەڵێ ڕابنەوەو پێش بکەون.*» بەم پێیە لە چالاکییە دژە ئایینییەکانی خۆیدا، ڕووی تیژی شمشێرەکەی لە عەبدولمەجید کرد کە کابرایەکی تەمەن پەنجا ساڵان بوو و هیچ جۆرە ئیدعایەکی سیاسی نەبوو.

ئەگەر چی عەبدولمەجید چیدی نازناوی سوڵتان بەدواوە نەبوو، بەڵام کەیفی بە شان و شکۆو گەورەیی دەهات. کاتێ لە ڕۆژانی هەینی بۆ بەشداریکردن لە مەراسیمی نوێژی هەینیدا، خەڵکی قوستەنتەنیە لەسەر ڕێگای ڕۆیشتنی ئەودا دەوەستان و هەلهەلەیان بۆ دەکێشا، چێژی لەم کارەیان دەبرد. بەڵام مەوکیبە پڕشکۆکەی دژایەتییەکی تەواوی لەگەڵ ژیانی هەژارانەو پڕ لە مەینەتیی خەڵکی تورکیای دواجەنگدا هەبوو. لەیەکێ لە ڕۆژەکانی هەینیدا، عەبدولمەجید مەندیلەکەی سوڵتان محەمەدی فاتیحی لەسەرناو بۆ جارێکی دیکە شمشێرە بەنێو بانگەکەی سوڵتان سەلیمی سێیەمی لە پشتی بەست. ڕۆژێکیشیان سواری قایەغی سەڵتەنەتی بوو کە چواردە سەوڵ لێدەر لێیان دەخوڕی و ئاڵای خەلیفەش بەسەر قایەغەکەدا دەشەکایەوەو بەم حاڵە شاهانەیەی بە بسفۆڕدا سووڕایەوە. ئەمە دوا دڵۆپ بوو کە ڕژایە سەر جامی سەبری مستەفا کەمال. مستەفا کەمال کە لە ئەنقەروە بە وردی چاودێری هەڵسوکەوتی خەلیفەی دەکرد، بەم کارەی خەلیفە لە ڕادەبەدەر تووڕەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دوانمایشەی خەلیفە هاوکات بوو لەگەڵ ئەوەیدا کە خەلیفە داوای زیادکردنی بودجەی خۆی کردبوو. مستەفا کەمال ئەم داوایەی بە توندی ڕەت کردبۆوەو، لە وەڵامدا پێی گوتبوو: «*چاوەڕوانیی ئێوە لە خەڵکی تورکیا بۆ پاراستن و بەهێزکردنی ئەو شتەی کە هی سەردەمی کۆنە، بەڕای من جۆرە گوستاخییەکە بەرامبەر بە خەڵک.*»

نەیارانی سیاسیی مستەفا کەمال کە لە هەمانکاتدا دژی دامەزراندن و بەرپایی کۆمار بوون، لەوەی کە ناکۆکی کەوتبۆ نێوان خەلیفەو مستەفا کەمالەوە، لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوون. ئەگەر بۆ جارێکی دیکە بەخت یارمەتی مستەفا کەمالی نەدابایە، تەنانەت خۆشی لە خەباتەکەی خۆی دوودڵ دەبوو. بەختی ئەمجارەی

لەوەدابوو کە ئاغاجانی مەحەلاتی نامەیەکی نووسیبوو و تێیدا نارەزایەتی خۆی لەهەمبەر ئەو سوکایەتیانە دەربریبوو کە بە خەلیفە دەکرێن. مستەفا کەمال دەستبەجێ سوودی لەم دەرفەتە وەرگرت و هەلەکەی لەکیس نەدا. نامەکەی ئاغاجان بەرلەوەی کە بگاتە دەستی مستەفا کەمال، لە رۆژنامەکاندا بلاوکرابۆوە. مستەفا کەمال لە وەلامدا گوتی رەنگبێ ئاغاجان کەسایەتییەکی موسلمان و گرنگ بێت، بەلام لەبەریتانیا دەژییەت، جلی ئینگلیزی دەپۆشێ، ئەسپی ئینگلیزی بەخێو دەکات، لەگەل کاربەدەستانی ئینگلیزدا هەلدەستێ و دادەنیشێ و لەراستیدا سیخوڕو پیاوی ئینگلیزەکانە.

ئەم وەلامەی مستەفا کەمال بەشێوەیەکی فراوان لە نێو ئەندامانی پەرلەمان و خەلکدا دەنگی دایەوەو، هەمووان بەدل و گیان هاودەنگی خۆیان بۆ مستەفا کەمال دەربڕی. مستەفا کەمال بەلێزانی و کارامەیی و بە تێکەل کردنی راست و هەلەو گەورەکردنی بابەتەکە، شەرێکی گەورەی راگەیاندنی لەدژی لایەنگرانی خەلافەت بەرپا کردو لە هەمانکاتیشدا هۆشداریی ئەوەی بە ئەندامانی ئەنجومەن دا کە ئەمانە بەم کارانەیان دەیانەوێ کۆمارە ساواکە لە نێو بەرن و سولتانی پێشوو بگەرێننەوە سەر دەسەلات.

چیوای نەبرد کە ئاغاجان لەنێو خەلکی تورکیادا بوو بە رەمزی خەراپەو زەبوونیی سیاسەتی ئینگلیز کە مەبەستی پارچەپارچەکردنی خاکی تورکیایەو، هۆشدارییەکەی مستەفا کەمال بووە هۆی ئەوەی کە خەلکی تورکیا هەست بەوە بکەن کە سیاسەتی هێزە نیشتمانییەکان لە مەترسی دایەو پێویستە پشتیوانیان لێ بکەن. بەلام هێشتا کەسانێک هەبوون کە لایەنگری خەلیفە بوون.

مستەفا کەمال هەموو جۆرە هاتوچۆیەکی زیادو نمایشیی خەلیفەی یاساغ کردو بودجەکەشی کردە نیوەو سزای لە سێدارەدانی بۆ هەموو ئەو کەسانەدانا کە هەول بۆ گێرانەوەی سەلتەنەت بدەن. ئیدی ڕووداوەکانی دوای ئەمە بەریان پێ نەدەگیردرا. لە ٣ی ئازاری سالی ١٩٢٤دا، مستەفا کەمال بەرنووسی بڕیارێکی دایە پەرلەمان کە تێیدا باس لە هەلوەشاندنەوەی خەلافەت دەکراو خەلافەت بە «*گرییەک کە لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە ماوەتەوەو دەبێ نۆژداریی بۆ بکرێت*» نێوبرا. بەرنووسی نێوبراو بەبێ ئەوەی گفتوگۆی لەسەر بکرێت، لەلایەن پەرلەمانەوە پەسند کراو دەستبەجێ عەبدولمەجیدیان لە ولات وەدەرناو، ڕەوانەی سویسرایان کرد. لەوێش بۆ دواجار سوکایەتی پێ کرا؛ چونکە راسپێردراوانی سنوریی سویسرا لەبەر زۆریی هاوسەرەکانی، ڕێگەی چوونە نێو سویسرایان پێ نەدەدا. مانگێ دوای ئەمە، هەموو دادگا شەرعییەکانی نێو تورکیا هەلوەشێندرانەوەو زمانی تورکی بوو بەزمانی ڕەسمی ولات و ئەنقەرەش کرابە پایتەختی کۆماری نوێ. لە کاتێکدا کە مستەفا کەمال بەم بۆنەیەوە لە چانکایا میواندارییەتی بەرپاکردبوو، یەکێ لە کۆنترین هاوسەنگەرانی کە لە ڕووداوەکانی سالۆنیکدا شان بەشانی جەنگابوو و نێوی تۆفیق ڕەشتۆ بوو، لە پڕێکا خۆی بە هۆلی میوانداریەکەدا کردو بەحەماسەتەوە دیکتاتۆری نویی تورکیای بەسێیانە پیرۆزەکەی مەسیحییەکان

چواند. مستەفا کەمال بە پێکەنینەوە پێی گوت: «*مەبەستت باوک و کوڕو ڕۆحی پیرۆزە؟ کەواتا ئاگات لێ بێ ئەم نهێنیە بەکەس نەڵێی!*.»

گومانی تێدانییە کە ئەو گەرم وگوڕی و جیدیەتە سەرسوڕهێنەری کە مستەفا کەمال لە کارکردندا لەخۆی نیشانی دەدا، سەرچاوەی لە ناکامیی لە ژیانی خێزانی و نێوخۆییدا بوو. ئەو ئێستاکە سەرەڕای سەرکەوتنە سەربازی، سیاسی و کۆمەلایەتییەکانی، پیاوێکی کاملی ورگنەی تەنیا بوو؛ چونکە دوای یەک مانگ بەسەر هاوسەریەتیی لەگەڵ لەتفیەدا، لەتیفە هەستی کرد کە مستەفا کەمال خیانەتی لێدەکا و پەیوەندی لەگەڵ ئافرەتی دیکەدا هەیە. لەتیفە کە ئافرەتێکی لەڕادەبەدەر ژیربوو و لەئەورووپا خوێندبووی، زوو تێگەیشت کە مستەفا کەمال تەنها بەمەبەستی چێژ لێوەرگرتن کردوویە بە هاوسەری خۆی و هاوسەرییەتیەکەشی لەو ڕوانگەیەوە بووە کە بۆ چێژ لێ وەرگرتنی هیچ ڕێگەیەکی دیکەی شک نەبردووەو لە ناچاری پەنای بردۆتە بە ئەو شێوازەو ئێستاش مستەفا کەمال ئەوی لەبەرچاو کەوتووە. یەکێ لەو کەسانەی کە لە مستەفا کەمالەوە نزیک بوو دەڵێ: «*لەتیفە شارەزایی لە کاروباری سیاسیشدا هەبوو و لەزۆر بواردا بەری بە زێدەڕۆییەکانی مێردەکەی دەگرت.*»

مستەفا کەمال، هیچ ئافرەتێکی بەو تایبەتمەندییانەوە پێ تەحەمول نەدەکرا، بەلام لەتیفە دەیویست ڕۆڵی هاوسەرێک ببینێ کە هەوڵی دەدا مێردە هەڵەکەرەکەی بگەڕێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست و ئاگاداری هەموو نهێنییەکانی ببێت و، وانیشان بدات کە کاریگەریەتی بەسەر بڕیارەکانی مێردەکەیەوە هەیە. کاتێ لەتیفە بە ئینگلیزییەکی پاراو بە وراد پریس-ی پەیامنێری ڕۆژنامەی دەیلی میلی گوت: «*دەتوانی ئەوەی من دەیلێم بەڕای مێردەکەمی لە قەڵەم بدەی*»، مستەفا کەمال لەڕادەبەدەر تووڕەبوو.

کاتێ ناخۆشییەکیان دەبوو، لەتیفەش وەک مستەفا کەمال هەڵدەچوو و تانەو تەشەری دەوەشاند. دەمەقاڵیی نێوانیان بەڕادەیەک پەرەی سەندو زیادی کرد تا وایلێهات مستەفا کەمال بە باشی زانی لێک جیابنەوە؛ بۆیە بەدەستی خۆی تەلاقنامەکەیی نووسی و ئیمزای کردو بەیاننامەیەکی کورتیشی نارده پەرلەمان و ڕۆژنامەکان و ئینجا بە لەتیفەشی گوت ماڵەکەی بەجێ بێڵێ.

چیوای پێ نەچوو کە مستەفا کەمال لەگەڵ هاوسەری چەند کەسێک لە سەرانی وڵاتدا پەیوەندی پەیدا کرد. لەنێو ئەو تاقمەدا پاشایەک هەبوو کە هاوسەرەکەی پەیوەندی ئەویندارییی لەگەڵ مستەفا کەمالدا هەبوو و ڕۆژێکیان بە مستەفا کەمالی گوت: «*هەرچەندە کە خەڵک سەبارەت بە هاوسەرەکەم و جەنابتان قسە دەکەن، بەلام من دڵنیام لەوەی کە ئەوانە هەمووی پڕوپاگەندەن.*» مستەفا کەمال بەسەریدا قیژاندو گوتی: «*من باشت دەناسم، تۆ پێشتر لە دژی من پیلانت دەگێڕا. بەڵێ من پەیوەندیم لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بەرقەرار کردووە بەس بۆ ئەوەی تۆڵەت لێ بکەمەوە.*»

لەو کاتەدا، فکرییە هێشتا بەدەست نەخۆشییەکەیەوە دەیناڵاندو لە نەخۆشخانەبوو، بەلام هەر کە هەواڵی جیابوونەوەی لەتیفە و مستەفا کەمالی بیست

بەبێ ئەوەی بە کەس بڵێ، دەستبەجێ گەڕایەوە تورکیاو هەر کە گەیشتە ئەنقەرە بە پەلە خۆی گەیاندە چانکایا.

شەو تەواوێکی لێ ڕۆیشتبوو کە فکرییە لە حاڵەتێکی نیمچە بێهۆش و لەوپەڕی بێ هێزیدا و لەکاتێکدا کە خۆی پێ لەسەر پێ دانەدەگیردرا، گەیشتە شوێنی دانیشتنی مستەفا کەمال.

بێگومان ئەو شەوە دیکتاتۆر لە ماڵەوەبوو؛ چونکە بەردەستەکەی دەرگای کردەوە. دواتر بەردەستەکە گێڕایەوە: *«کاتێ فکرییەم دیت، پەشۆکا بوو. داوای کرد مستەفا کەمال ببینێ، بەڵام ڕێگەم پێ نەدا؛ چونکە سەروشکڵی ئاسایی نەدەهاتە پێش چاو و لێی ترسام و گوتم نەوەکا نیازێکی خەراپی هەبێ. بۆیە بەئەرکی خۆم زانی کە ڕێگەی نەدەم بێتە ژوورەوە.»*

نازانین ئاخۆ بەردەستەکە بە مستەفا کەمالی ڕاگەیاندبوو کە فکرییە هاتووەو دەیەوێ بیبینێ یان نا؟ تەنها ئەوەندە دەزانین کە ڕۆژی دوایی پاسەوانەکان تەرمی بێ گیانی فکرییەیان دۆزییەوە کە گوللەیەکی لەسەر دڵی خۆی دابوو و خۆی کوشتبوو.

لەو ڕۆژە بەدواوە، وردە وردە کەسایەتیی مستەفا کەمال گۆڕا. عەلی فەتحی یەکێ لە هاوسەنگەرە کۆنەکانی دەڵێ: *« لاوازو کەم دوێ و کۆشەگیرببوو. نیگایە قوڵ و کاریگەرەکەی ئیتر کاریگەریی لە کەس نەدەکردو سارد دەهاتە پێش چاو. واپێ دەچوو کە ئیدی کەیفی بەهیچ شتێک و هیچ کەسێک نەیەت.»*

کاتێ کە دوای ماوەیەکی زۆ ناچاربوو لەبەردەم خەڵکدا ئامادەبێ، بەتەواوەتی گۆڕابوو. زەردەخەنە هەمیشەییەکەی کە سەرنجی لادێیەکانی پێ ڕادەکێشاو زیرەکییە سیاسییەکەیی دەشاردەوە، نەمابوو و جێی خۆی دابوو بە توونتیژی و خوێن ساردی.

بەحاڵەتێکی جیدی و بێ ڕەحمانە لە بەرامبەر خەڵکدا دەردەکەوت.تەنانەت برادەرە کۆنەکانی لێی دوور دەکەوتنەوەو خۆیان لێ بەدوور دەگرت، لەوانە عارفی ئازا کە شان بە شانی ئەو لە گالیپۆلی و دواتر لە ئانادۆڵدا جەنگابوو. دوای ئەو هەموو ساڵەی کە عارف وەکو هاوخەبات و هاوسەنگەرو نزیکترین برادەری دەژمێردرا، چارەنووسێکی شومی وەکو چارەنووسی فکرییە چاوەڕێی دەکرد.

* * *

ئەگەر چی تورکیای نوێ لە گەرمەی گۆڕانکاریەکاندا بووە وڵاتێکی سەربەخۆ، بەڵام بە قۆناغێکی سەختدا تێدەپەڕی و خەڵکەکەی برسی بوون. خۆراک دەست نەدەکەوت و پارەش کەم ببۆوەو ئەرمەنی و یۆنانییە کان کە زۆربەی کارە سوودبەخشەکانیان لە دەستدابوو، یان کوژرابوون یان ئەوەتا دەرکرابوون و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی تورکەکان بەرەو ڕووی قەیرانێکی سەختی ئابووری ببنەوە.

باجەکان زیای کردو خەرمانەکانیش بەهۆی بانگکرانی وەرزێرە لادێیەکان بۆ خزمەتی سەربازی ، لە نێوچوون. خەڵک بەگشتی لەشەڕ بێزار و ماندووبوون و نارەزایەتیان دەردەبڕی، بەڵام پێ دەچوو مستەفا کەمال ئاگای لە ڕاستییەکان نەبێ

تا ئەو ڕۆژەی کە کوردەکانی دانیشتووی باشووری ڕۆژهەلاّت و نزیک سنوری ئێران، بەدرووشمی «*بمرێ دیکتاتۆر*» و «*بژی سولّتان*» لەدژی دەسەلاّتەکەی مستەفا کەمال ڕاپەڕین و، ئەو دەمە بوو کە مستەفا کەمال بەخۆهاتەوە. وەک چۆن سولّتانەکانی پێشوو بە دلّڕەق و بێ بەزەییانە یۆنانی و ئەرمەنی و بولّغاریاییەکانیان قەتلّوعام دەکرد، ئاواش مستەفا کەمال بەهەمان شێوە هەلّیکوتایە سەر کوردەکان و قەتلّوعامی کردن و، ئینجا دادوەرێکی جێی متمانەی خۆی بەنێوی بەلەدعەلی نارده ناوچەکە تا دادگای تایبەتیی سەربەخۆیی بۆ کوردەکان ساز بدات و ناوچەکە هێور بکاتەوە.

بەهەزاران کەس کەوتنە زیندانەوە، ئەشکەنجەدران و لە سێدارەدران و لوتکەی ئەم توندوتیژییەش لە سێدارەدانی ١٦ سەرکردەی کورد بوو لە مەیدانی گەورەی شاری دیاربەکر.

داوێنی ئەو خوێنڕێژی و دڕندایەتییە بەڕادەیەک فراوان بوو کە تەنانەت نزیکترین هاوڕێکانی مستەفا کەمال خۆیان پێ ڕانەگیراو دەنگیان هەلّبڕی و لە دژی وەستان.

کۆلّۆنێل عارف-یش لەزومرەی ئەو سیاسەتمەدارە ناڕازییانە بوو کە دەست لەکار کێشانەوەی خۆیان لە نوێنەرایەتی پەرلەمان ڕاگەیاندو پارتێکی ئۆپۆزسیۆنیان بەنێوی «*پێشرەوی گەل*» دامەزراند. مستەفا کەمال دانی بەخۆ داگرت و چاوەڕێی دەرفەتێکی لەباری کرد بۆ ئەوەی تۆلّە لەو کەسانە بکاتەوە کە لە دژی وەستابوون و ڕوویان لێ وەرگێڕابوو. ئەم دەرفەتە لەبەهاری سالّی ١٩٢٦دا، هاتە پێش و ئەویش ئەو کاتەبوو کەکابرایەک بەنێوی ضیاء خورشید ئیدعای ئەوەی کرد کە نیازی کوشتنی مستەفا کەمالی هەبووە. دیار نییە ئاخۆ عارف تا چ ئەندازەیەک پەیوەندی بەم پیلانەوە هەبووە، بەلاّم دەرکەوت کە جارێکیان خورشید چووەتە مالّی عارف.

خورشید لە ١٤ی حوزەیران، واتا دوو ڕۆژ بەر لەسەردانە ڕەسمییەکەی مستەفا کەمال بۆ ئەزمیر، هاتە ئەو شارەو لەیەکێ لەو هوتێلانەی کە کەوتبۆ سەر سەر ڕێگای مستەفا کەمال، ژوورێکی بەکرێ گرت و چەند بۆمب و نارنجۆکێکی لەژێر تەختە خەوی هوتێلەکەدا حەشاردا، بەلاّم شەوی بەر لە ئەنجامدانی پەلامارەکە، یەکێ لە هاودەستەکانی خورشید خەبەری لێدا. لەنیوەشەوداو لەکاتێکدا کە خورشید لە سەرخۆشیان تەخت لێی نووستبوو، پۆلیس بەسەری داداو، بۆمب و نارنجۆکەکانیان دۆزییەوەو خورشیدیشیان دەستگیر کرد.

ئەم ڕووداوە بووەمایەی نارەحەتی خەلّک، بەلاّم نارەحەتی گشتی کاتێ پەرەی سەند کە پۆلیس دەستی دایە دەستگیرکردنی سیاسەتمەدارە ئۆپۆزیسیۆنەکان کە کۆلّۆنێل عارفیشیان لە نێودابوو.

دادگایەکی نمایشی وەکو دادگایەکەی میدحەت پاشا لە سینەما ئەلحەمرا پێک هێندرا کە تێیدا تاوانباران بەبێ پارێزەر ئامادەبوون و بەلەدعەلیش بەبێ سێ و دوو و بەبێ جیاوازی تەواوی سیاسەتمەدارە دەستگیرکراوەکانی بەسێدارە حوکمدا.

لە دانیشتنەکانی ئەم دادگایە نمایشییەدا، عارف لەکاتێکدا کەلەپچەی لەدەست بوو، بەزەردەخەنەیەکی ساردو بەدلّنیاییی لەوەی کە بێتاوانە، لە ڕیزی دووەم

دانیشتبوو و گوێی بۆ قسه‌کانی به‌له‌د عه‌لی ڕاداشتبوو که له‌و ساته‌دا باشترین هاوڕێیانی دێرینی مسته‌فا که‌مالی به‌سێداره حوکم ده‌دا. مسته‌فا که‌مال به‌ده‌ستی خۆی بڕیاری له سێداره‌دانی ئه‌و تاقمه‌ی ئیمزا کردو کاتێ گه‌یشته سه‌ر ناوی عارف ته‌نها کارێک که کردی ئه‌وه‌بوو که جگه‌ره نیوه سووتاوه‌که‌ی خۆی له نێو په‌نجه‌کانیدا فیچانده‌وه‌، دوایی ئاخێکی هه‌ڵکێشاو جگه‌ره‌یه‌کی نوێی داگیرساند.

ژماره‌یه‌ک له‌و حوکم دراوانه‌یان ده‌ستبه‌جێ له سێداره‌داو ئه‌وانی دیکه له‌بارودۆخێکی سامناکدا کوژران؛ چونکه هه‌ر ئه‌و شه‌وه‌ی که هاوڕێ دێرینه‌کانی مسته‌فا که‌مال و ئه‌وانه‌ی که له بنیادنانی تورکیا نوێدا یارمه‌تییان دابوو، له سێداره ده‌دران، مسته‌فا که‌مال میوانداریه‌کی گه‌وره‌ی بۆ دیپلۆماته بیانییه‌کان سازدابوو. تاقمێک جلی ره‌سمیی شه‌وانه (فراک)ی ده‌ستکردی له‌نده‌نی پۆشیبوو و زۆر به که‌یف بوو. ئه‌و شه‌وه تا دره‌نگ به میوانداری له میوانه‌کانییه‌وه خه‌ریک بوو.

هه‌ر له‌و کاته‌دا که مسته‌فا که‌مال خه‌ریکی ئه‌و به‌زمه‌بوو، شه‌ش کیلۆمه‌تر له‌ولاترو له‌مه‌یدانی گه‌وره‌ی ئه‌نقه‌ره، به‌به‌رچاوی خه‌ڵکه‌وه (١١) سێداره‌یان داکوتاو، له‌کاتێکدا که حوکمدراوه‌کان ڕووپۆشی سپییان پۆشیبوو و ده‌سته‌کانیان له دواوه‌ڕا به‌سترابۆوه‌، په‌تی سێداره‌یان خرایه مل. هاوکات له‌گه‌ڵ ئه‌و ساتانه‌یدا که مسته‌فا که‌مال له‌گه‌ڵ میوانه‌کاندا ده‌یخوارده‌وه‌و سه‌مای ده‌کرد، ڕێگه به‌هه‌ریه‌ک له حوکمدراوه‌کان درا وه‌ک دوا قسه چه‌ند وشه‌یه‌ک بڵێن، یه‌کێ دوعای کرد، ئه‌وی دیکه‌یان چه‌ند به‌یته شیعرێکی خوێندو یه‌کێکی دیکه‌یان هوتافی کێشاو...هتد. ئینجا هه‌ر هه‌موویان به په‌ته‌وه‌کردن و خنکاندیانن و، به‌له‌د عه‌لیش به‌په‌له به‌ره‌و شوێنی میوانداریه‌که که‌وته‌ڕێ تا به مسته‌فا که‌مال ڕابگه‌یه‌نێ که هه‌موو دوژمنه‌کانی له‌نێو چوونه. کاتێ دوا میوان میوانداریه‌که‌ی به‌جێ هێشت، مسته‌فا که‌مال له‌گه‌ڵ چه‌ند براده‌رێکی تا به‌ره‌به‌یان پۆکه‌ری کرد. هه‌ندێ جار له جێی خۆی هه‌ڵده‌ستاو له په‌نجه‌ره‌وه له ده‌ره‌وه‌ی ده‌ڕوانی. ڕه‌نگی ده‌موچاوی خۆڵه‌مێشی و چاوه‌شینه‌کانی زیندوویه‌تیان تێدا نه‌مابوو، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ماندوویه‌تی پێوه دیارنه‌بوو و جله‌کانی بێ گنج و لۆچ و خاوێن مابوونه‌وه.

له‌کاتێکدا که گزنگی خۆر له گرده زه‌رده‌کانی ده‌وروبه‌ری ئه‌نقه‌ره‌ی ده‌دا و مژده‌ی ڕۆژێکی گه‌رمی ده‌به‌خشی، مسته‌فا که‌مال چووه ژووری نووستنی، به‌ڵام به‌ر له‌وه بانگی به‌رده‌سته‌که‌ی کردو فرمانی پێدا له‌مه‌و دوا به هه‌موو ئه‌و که‌سانه‌ی که سه‌ردانی ده‌که‌ن ڕابگه‌یه‌ندرێت که به هیچ شێوه‌یه‌ک لای ئه‌و نێوی کۆڵۆنێل عارف نه‌هێنن.

* * *

مسته‌فا که‌مال دوای له نێوبردنی دوایین دوژمنه‌کانی، به‌هێزو توانایه‌کی که‌م وێنه‌وه بڕیاریدا ڕووخساری تورکیا بگۆڕێت.

سه‌ره‌ڕای ئه‌و ڕاپه‌ڕین و نائارامییانه‌ی که له ناوچه جیاجیاکانی تورکیا له ئارادابوون، بڕیاریدا له‌سه‌رنانی فینه یاساغ بکرێت و، ئه‌م شته‌ش له‌نێو کۆمه‌ڵگای ئیسلامیی تورکیا به‌قه‌ده‌ر نوێژو ڕۆژ و بایه‌خی هه‌بوو. مسته‌فا که‌مال به‌بێئه‌وه‌ی

گوێ بەو نارەزایەتییانە بدات، کڵاوێکی حەسیری پەنەمای لەسەرناو بەسەرانسەری تورکیادا سووڕایەوە. لە قسەکردنێکی لەشاری کاستامۆنیا گوتی: «هەندێ کەس دژی ئەوەنە کە لە جیاتی فینە، کڵاو لەسەر بنێن کە ئەمە کارێکی دەبەنگانەیە. بۆچی دەبێ ئێمە هێندە دژی کڵاو بین، بەڵام کەیفمان بە فینە بێت لەهەمان کاتدا تایبەتە بە یۆنانییەکان و یادگاری سەردەمی بیزانسە؟ ئەو جلانەی کە ئێوە دەیانپۆشن و تەنانەت شەڵوارە فشەکانتانیش یادگاری سەردەمی بیزانسە کە سوڵتانەکانی عوسمانی، واتا ئەو کەسانەی کە لاوەکانی ئێمەیان بەخۆڕایی بە کوشت دەدا، پاراستوویانە. دەزانن ئەو جلانە لە بنەڕەتدا هی چ کەسانێک بوونە؟ ئەم جلانە هی قەشە بیزانسی و یۆنانییەکان و هی حاخامە یەهودییەکان بوونە. لەسەردەمی پێشوو تەنها زانایانی ئایینی مەندیلیان لەسەردەنا کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا نیشانەی زانست و زیرەکیان بوو، بەڵام دوای ماوەیەک بۆ فریودانی خەڵک هەرچی ڕاست بۆوە مەندیلێکی لەسەر نا.

بۆ گەلێکی زیندوو و شارستانی، مایەی شەرمەزارییە ئەگەر بیەوێ پەنا بۆ مردووەکانی بەرێت و داوای یارمەتییان لێبکات.»

لەو ڕۆژە بەدواوە پیرەمێردەکان دەسماڵێکیان لەسەریان دەبەست و دواتر کڵاویان لەسەردەنا، بەڵام پۆلیس دەسماڵەکانی دڕاندن. وەرزێرەکانی ئەنادۆڵ کە لە ژیانیاندا هەرگیز کڵاویان لەسەر نەنابوو، ئەغلەب کڵاوی ڕوسییان لەسەر دەنا. لە ئەزمیر، لادێیەک عەمباری کڵاو فرۆشییەکی ئافرەتانی دۆزییەوە کە پڕبوو لە کڵاوی ئافرەتان و هی ئافرەتێکی یۆنانی بوو کە ڕای کردبوو. عەمبارەکە تەژیی کڵاوی ڕەنگاوڕەنگی ئافرەتان بوو کە کابرا بە لادێیەکانی دەوروبەری دەفرۆشت.

پیاوەکان کڵاوە هاوینیە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئافرەتانیان لەسەر دەناو بەو کڵاوانە هاتوچۆی بازاڕیان دەکردو لە کێڵگەکانیشیاندا کاریان دەکرد!

هەر جارەی مستەفا کەمال چاوی بە فینە بەسەرێک کەوتبایە، بەڕق دادەچوو، تەنانەت جارێکیان کە باڵیۆزی میسر بە فینەیەکی سوورەوە لە ئەنقەرە بەشداریی لە میوانداریيەکی دیپلۆماتیکدا کردبوو، مستەفا کەمال بە تووڕەییەوە لێی چۆ پێشەوەو پێی گوت: «بە پاشاکەتان بڵێن من کەیفم بە کڵاوەکەتان نایەت.»

دوای ئەوە دەستی دایە لادانی عەبای ئافرەتان. لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەری لە شاری ئێنبوڵ گوتی: «من زۆر لە خوشکانم بینیووە هەر کە پیاوێک لێیانەوە نزیک بۆوە، خێرا ڕووی خۆیان دادەپۆشن. ئاشکرایە کە ئەم کارە لەو هەواکەرمەی هاویندا نارەحەتیان دەکات. بۆچی ئێمەی پیاو هێندە خۆویست بین و بهێڵین خوشکەکانمان لەو بارودۆخەدا بژین؟ باشتر وایە بێڵین ڕووی خۆیان نیشانی دنیا بدەن و بواری ئەوەیان پێبدەین سەفەر بکەن و چاویان بە شوێنە جیاجیاکان بکەوێ. نابێ لە هیچ بترسێین. هیچ گەلێک بەبێ هاوکاری و بەشداریی ئافرەتەکانی ناتوانێ پێش بکەوێ. ئایا ئافرەت و کچانی دنیای پێشکەوتوو ئاواو بەم شێوەیە جل دەپۆشن و هەڵسوکەوت دەکەن؟ ئاشکرایە نەخێر...»

بەڵام لادانی عەبا لەسەر ئافرەتان بەرەوڕووی کۆمەڵی گیروگرفت دەبۆوە،

بەتایبەت لە لادێیەکان کە ئەگەر کچێک بە پێی یاسا جولابایەوەو بەبێ عەباچووبایە دەرەوە، لەکاتی گەڕانەوەیدا دایک و باوکی چینێکی باشیان دەکوتا. سەرئەنجام مستەفا کەمال وای بە باشی زانی جارێ هەوڵەکانی بەشێوەیەکی چڕوپڕ لە شارەکاندا بخاتەگەڕو لادێیەکانی هێشتەوە بۆ ئەوەی وردە وردە ئەم گۆڕانکارییانە قەبوڵ بکەن.

رێبەری تورکیای نوێ، دوای هەڵوەشاندنەوەی حەرەمسەراکان و پوچەڵکردنەوەی فرەژنی، داهێنانێکی دیکەشی ئەنجامداو ئەویش دامەزراندنی قوتابخانەی تێکەڵاو بوو لە قوستەنتەنییە. هەروەها مۆسیقای کلاسیکی رۆژئاوای هێنایە نێو تورکیا، بەڵام چاکسازییەکانی دیکەی گەلێ لەو شتانەی کە باسکران قوڵترو پڕ بەهاتربوون. یاسای مەدەنی نوێی بۆ وڵات دانا کە لەبەر گیراوەی یاسای مەدەنیی سویسرابوو، رۆژمێری رۆژئاوایی قەبوڵ کردو رۆژی یەکشەمەی بە رۆژی پێشووی گشتی راگەیاند. بەر لەوە رۆژی هەینی رۆژی پشووی موسڵمانان، شەموان رۆژی پشووی یەهودییەکان و یەکشەموانیش رۆژی پشووی مەسیحیەکان بوو و، بەم شێوەیە جاران لە هەفتەیەکدا سێ رۆژ پشووی گشتی هەبوو. سەلاموعەلێکی بەزمانی عەرەبی یاساغ کردو لە جیاتی ئەمە بڕیاریدا خەڵک لەکاتی دیتنی یەکتریدا تەوقە بکەن. رۆژمێری کۆچیی مانگی کە تێیدا هەر سەدەیەک ۹۷ ساڵە، پوچەڵ کرایەوەو رۆژمێری زایینی جێی گرتەوە، کاتی تورکیای لەگەڵ گرینویچدا گونجاند و سیستەمی پێوانەی مەتریی هێنایەکایەوە.

گرنگترین تازەگەری مستەفا کەمال، داهێنانی ئەلفوبێی نوێی بۆ تورکەکان بوو. لەکاتێکدا کە بە تەباشیرو تەختەڕەشی بەدواوە بوو، بەسەرانسەری تورکیادا گەڕاو خەڵکی لەگەڵ ئەلفوبێی دا ئاشنا کرد. مامۆستایانی زانکۆ لە تورکیا لەماوەی (٦) هەفتەدا ئەلفوبێی لاتینی زمانی تورکیایان نووسیبۆوەو، مستەفا کەمال یەکەم کەس بوو کە فێری ببوو.

مستەفا کەمال ماندووبوونی پێوە دیارنەبوو و کۆڵنەدەرانە هەوڵی دەدا. فرمانی بە قوتابخانە بیانییەکان دا ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایانی تورک کە هەرچەندە ئاستیان لە خوارێ بێت و زانیارییەکانیان کرچ و کاڵ بێت، دابمەزرێنن و چیدیکەش رێگەی نەدا قوتابخانەی بیانی نوێ دابمەزرێندرێن. کارکردنی بیانییەکانی لە زۆر بواردا یاساغ کرد، سواڵکردنی بە کارێکی نایاسایی راگەیاندو گەمەکردن بە شێتەکانی بە تاوان لە قەڵەمدا. وردە وردە نێوی شارەکانی تورکیاشی گۆڕی، ئەسمیرنای کرد بە ئەزمیرو ئەنقەرەشی کردە ئانکاراو، تەنانەت نێوی قوستەنتەنیەشی گۆڕی. ئەو شارە مەزنەی کە یۆنانی و رۆمییەکان بە بیزانتیوم، عەرەبەکان بە *«دەروازەی کامەرانی»* و ئەسکەندەناڤییەکان بە *«شاژنی شارەکانی جیهان»* نێویان دەبرد، کرا بە ئەستەمبوڵ کە تەحریف کراوی تورکیی ئەو رستەبوو کە یۆنانیەکان لەسەر تابلۆ کۆنەکانی رێنوێنی رێبوارانی دا دەیاننووسی و بەمانای *«بەرەو شار»* بوو.

* * *

بەدرێژایی ئەو ساڵانە، هەردوو دوژمنی دێرین، واتا تورکیا و ڕووسیا، هاوتەریب و پێ بە پێی یەکتری گۆڕانیان بەسەردا هاتبوو. شۆڕشی ڕوسیا لە ساڵی ١٩٠٥ و شۆڕشی تورکە لاوەکان لە ١٩٠٨ هەردووکیان لە ویستێکی قوڵەوە سەرچاوەیان گرتبوو ئەویش بەرپایی دیموکراسی بوو لە دوو ئیمپراتۆرییەتی نیمچە ئاسیایی و نیمچە ئەورووپایی کە بەهۆی کاریگەری شۆڕشی پیشەسازی شێوە ڕووخساریان گۆڕابوو.

هەردوو وڵات لە شەڕی یەک بە دوای یەکدا تێکشکابوون و بەرەو ڕووی سەعاتی چارەنووسیان ببوونەوە. کۆمەڵێ خاڵی هاوبەشی دیکە لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا بەدی دەکرا؛ هەردووکیان ئایینیان لە سیاسەت جیاکردبۆوەو هاوکات لەگەڵ ئەوەیدا کە قوستەنتەنییە ببوو بە ئەستەمبوڵ و ئانکارا بە پایتەخت ڕاگەیەندرابوو، لە ڕوسیاش سەنپترسبۆرگ، ببووە پترۆگرادو دواتر لینینگرادو، پایتەختیش دەگوێزرایەوە بۆ مۆسکۆ. ئەم پایتەخت گۆڕینانە لەهەردوو وڵاتدا بەمانای ئەوەبوو کە دەیانەوێ پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ڕابردووی پڕ لە کارەسات و نوشوستیدا بپچڕن و سەردەمێکی نوێ دەست پێ بکەن.

بەڵام لەهەمانکاتدا جیاوازییەکی گەورە لەنێوان ئەو دوو وڵاتەشدا هەبوو. ڕوسیاش بەدەست مەسایلی ئایدۆلۆژیکیەوە دەیناڵاندو ئەوەش وایکردبوو کە لە زۆر بواردا هەوڵی بۆلشۆڤیکەکان بۆ چاکسازییە نێوخۆییەکان تووشی نوشوستی و شکست بێت، بەڵام بە پێچەوانەوە کاروکردەوەکانی مستەفا کەمال لە خۆماڵیکردنی بانکەکان و گەیاندنی وزەی کارەبا بە گوندەکان، هەرگیز بەرەوڕووی ئەم جۆرە ئاستەنگانە نەبۆوەو، لەو جێیەیڕا کە بنەمای بیروباوەڕەکانی مستەفا کەمال لەسەر دامەزراندنی تورکیایەکی مۆدێرن لەسەر شێوەی ڕۆژئاوا بنیادنرابوو، دەیتوانی هەموو جۆرە ئاستەنگێک لەسەر ڕێگا هەڵگرێت و ئەو چاکسازی و ڕیفۆرمانەی کە مەبەستی بوون لە ڕێی پەرلەمانەوەو لەکاتی خۆیاندا ئەنجامیان بدات.

* * *

پوچەڵکردنەوەی ئەو نازناوانەی کە بە درێژایی چەندین سەدە وەک بەشێک لە مێژووی عوسمانییان لێهاتبوو، بەیەکێ لە دوایین چاکسازییەکانی مستەفا کەمال لە قەڵەم دەدرا. نازناوەکانی پاشا، بەگ، ئەفەندی و..هتد، کە لە زمانی بیانییەوە هاتبوونە نێو زمانی تورکییەوە، پوچەڵ کرانەوەو بە پێی یاسا خەڵک ناچارکرا شۆرەتێک بۆخۆی هەڵبژێری و دەبوایە شۆرەتەکەشی تورکی بێت. تا ساڵی ١٩٣٤ خەڵک بەلکاندنی پیشە، یان شوێنی لە دایک بوونی بەنێوی خۆیەوە، بەنێو بانگ بوو. بۆنموونە ئەگەر باخەوانێک نێوی عەلی بایە و خەڵکی ئەنقەرەش بوایە، یان پێی دەگوترا عەلی بۆستانجی، یان بە عەلی ئەنقەرەیی نێویان دەهێنا. مستەفا کەمال تەنانەت نێوی خۆیشی کە ڕەگ و ڕیشەی عەرەبیی هەبوو، گۆڕی و خۆشبەختانە توانی وشەیەکی تورکی پڕمانای بۆ بدۆزرێتەوە. ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی تورکیا، لە دانیشتنێکی پڕجۆش و خرۆشدا نازناوی «ئەتاتورک»ی بە مستەفا کەمال بەخشی و لەو ڕۆژە بە دواوە مستەفا کەمال بوو بە کمال ئەتاتورک کە ئەتاتورکەکە

بەمانای باوکی تورکەکان بوو.

کەسایەتی کەمال ئەتاتورکیش گۆڕانی بەسەرداهاتبوو و لە ڕادەبەدەر خۆپەرست بببوو.لەساڵی ۱۹۲۱، زۆر بە شانازییەوە گوتبووی لە ماڵی دنیا هیچی نییە، بەڵام ئێستا دەست نووساو پارەپەرست ببوو و، ئیرەیی بە هەموو شتێک دەبرد. کێڵگە بچوکەکەی کە بەشێوەیەکی سرووشتی لەدەشتەکانی چانکایا درووست ببوو، ئێستا ببوو بە گەورەترین کێڵگەی بەخێوکردنی ئاژەڵ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. حەزی لەوەبوو وەکو ئاغایەک هەڵسوکەوت بکات و دەستی لە هەموو کارێک وەردەدا.

جارێکیان کە لەگەڵ کەم ئاویدا بەرەوڕوو بۆوە، ناردی بەدوای ئەندازیاری ئاودێری دا و، فرمانی پێدا عەمبارێکی نوێ دروست بکات. لەو کاتەدا، یەکێ لە برادەرەکانی پێشنیازی ئەوەی پێ کرد کە بۆچی لەجیاتی ئەو عەمباراوە گۆلێکی لە شێوەی گۆلەکەی ژنێف لە چانکایا درووست ناکات. ئەتاتورک پێشنیازی برادەرەکەی پەسند کرد، بەڵام فرمانی دا پانتایی گۆڵەکە بەقەدەر دەریای مەڕمەڕە بێت.

ڕۆژ بەڕۆژ پتر مەشرووبی دەخواردەوە، قوماری دەکردو لەگەڵ ئافرەتانداکاتی بەسەر دەبرد. ئەگەرچی ئەم کارانەی لە کۆڕوکۆمەڵە جیاجیاکانی تورکیادا دەگێڕدرایەوەو دەکەوتە سەرزاری خەڵک، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کارانەی کەمترین زیانێکیان لە ئابڕو ناوبانگی نەدەداو خەڵک چاوپۆشییان لەکارەکانی دەکرد. تا ئەوەی کە جارێکی دیکە کۆنە نەخۆشییەکەی واتا ئەو نەخۆشییەی لە سۆفیا تووشی ببوو، لێی هەڵدایەوە. مستەفا کەمال هەرگیز بە باشی ئەم نەخۆشییەی چارەسەر نەکرد و ئێستا وا زیانی بە جەرگی گەیاندبوو. بەپێچەوانەی قسەی دکتۆرەکان کە پێیان گوتبوو مەشرووب نەخواتەوە، ڕۆژ بەڕۆژ بۆ کەمکردنەوەی ئازارەکانی پتر پەنای دەبردە بەر مەشرووب. لە ساڵی ۱۹۳۸، بە ئاشکرا دیاربوو کە پێکهاتەی لەشی هێندە بەهێز نییە کە بتوانێ بەرگەی ئەو نەخۆشییە کوشندەیە بگرێت؛ بۆیە پزیشکە تورکەکان بەبێ ئاگاداری ئەو، پرۆفیسۆر فیسینگر–ی فەرەنساییان هێنایە تورکیاو ئەویش دەستبەجێ نەخۆشییەکەی مستەفا کەمالی بە ئاوسانی جگەر دیاری کردو بەسەر ئەتاتورکدا قیژاندی: *«ئێوە ڕەنگبێ فەرماندەیەکی گەورەبن و لە زۆر جەنگدا سەرکەوتنتان بەدەست هێنابێت، بەڵام ئێستا من فەرماندەی تۆم و دەبێ فەرمانەکانم جێبەجێ بکەی.»*

ئەتاتورک سەری لەو شێوە دوانە ڕاشکاوانەی پرۆفیسۆرە فەرەنساییەکە سوڕما، بەڵام وا کاری تێکرد کە وازی لە خواردنەوە هێناو، پارێزەکانی قەبوڵ کردو ڕازی بوو لەسەر ئەوەی بۆماوەی سێ مانگ بحەسێتەوەو تەنها ڕۆژانە بۆماوەی نیو سەعات هەستێتەوەو بە کاروباری وڵات ڕابگات. فرمانیدا کورسییەکی حەسانەوەی تایبەتییان بۆ لە بەریتانیاوە هێنا کەتێیدا ڕادەکشاو بەخوێندنەوەی نامەو دەرکردنی بڕیارەکانەوە خەریک دەبوو، بەڵام دوای مانگێک بەدزییەوە لە جێگەکەی دەهاتە دەرو دوور لە چاوی بەردەستە وەفادارەکەی (ساڵح)، کە لە شەڕی گالیپۆلییەوە بەجێی نەهێشتبوو و لەگەڵیدا بوو، دەجولایەوەو ئەم جولانەوەیەش لە ڕادەبەدەر مەترسی بۆ

سەر ژیانی هەبوو.
هەندێ لە مێژوونووسانی تورک لەو باوەڕەدان کە ئەتاتورک لە دڵەوە حەزی لەوە نەبوو چاک بێتەوەو، وای پێ باش بوو لە لوتکەی دەسەڵات و شانازیدا جیهان بەجێ بێڵێ و هەمیشەش ئەو پەندە تورکییەی دووپات دەکردەوە: «*هەر کاتێ خانوو سەری گیرا، ئیزرائیل لە دەرگای ئەو خانووە دەدات.*» ئێستاکە، کۆماری تورکیا لە تەمەنی ١٥ساڵی دابوو و، سەیر ئەوەبوو کە دامەزرێنەرەکەی دوا ڕۆژەکانی تەمەنی خۆی لەسەر تەختە خەوێکی گەورەی قاتی دووەمی کۆشکی دۆڵمە باخچەدا بەسەردەبرد کە بە قەنەفەو کەلوپەلی دوا سوڵتانی عوسمانی ڕازێندرابۆوە.
مستەفا کەمال لە سەعات ٩,٠٥ی پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٨، لەو ژوورەیدا کە پەنجەرەکانی بەسەر ئاوەکانی بسفۆڕدا دەکرانەوە، لەتەمەنی ٥٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. هەر ئەو ڕۆژەو لەکاتێکدا کە خەڵک لەسەر شەقامەکانی قوستەنتەنییە دەگریان و لەخۆیان دەدا، ساڵح-ی وەفادار بە مستەفا کەمال، لەیەکێ لە ژوورەکانی کۆشکی دۆڵمە باخچەدا، گوللەیەکی لەسەر دڵی خۆیدا و خۆی کوشت.
بەدرێژایی ئەو ڕۆژو شەوی دواتر، بێدەنگیەکی کوشندە باڵی بەسەر شاردا کێشابوو. ئەو هەیکەل و وێنانەی ڕێبەری کۆچکردوو کە لە گۆشەو کەناری شارو لە جامخانەی هەموو دوکانێکدا بەرچاوی دەکەوتن، پەڕۆی ڕەشیان لێ ئاڵێندرا. سێ شەو و سێ ڕۆژ تەرمی ئەتاتورکیان لە کۆشکی دۆڵمەباخچەدا هێشتەوە بۆ ئەوەی خەڵک بیبینن. تابوتە عەبەنووسەکەی ئاڵای تورکیای پێ دادرابوو و، چوار ئەفسەر بە شمشێری هەڵکێشراوەوە ئێشکەیان لێدەگرت و بەسەدان هەزار ئافرەت و پیاو بەگریان و ڕۆڕۆوە بە تەنیشتیدا ڕادەبوورین. زۆربەیان کە پەیتا پەیتا وشەی «*ئاتا، ئاتا*»یان دووپات دەکردەوە، هەرگیز باوکی خۆیان بەچاوی خۆیان نەدیبوو.
بەڵام لەو جێگەیەیڕا کە لە قوستەنتەنییەدا هیچکەس ناتوانێ خۆی لە مێژووی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی کەسەردەمێک دەسەڵات و هێزەکەی دنیای دەلەرزاند بدزێتەوە، ئەو خەڵکە زۆرەی کە بۆ ڕێزلێنان لە تەرمی باوکی تورکیا پێیان دەنایە کۆشکەوە، ستایشی باخە سەرسەوزو تالارە پڕشکۆکانی کۆشکی سوڵتانەکانی عوسمانیان دەکرد. دیار نییە ئاخۆ دەبێ چەند کەسیان زانیبیان کە ئەو گوڵانەی کە لە باخچەکانی سەر ڕێگایان دەیانبینن، لە زەوییەکدا چێندراون کە (٥٠٠) ساڵ پێشتر بەهۆی ١٦ هەزار کۆیلەی مەسیحییەوە ئامادەکراوە وژێێندراوەتەوە.
تەرمی ڕێبەری تورکیا لە تالاری تەختی سەڵتەنەت ولەژێر میچێکی گومەزی دا، داندرابوو کە بەدەستی عەبدولەجیدی دەست بڵاوەوە، واتا هەمان ئەو کەسەی کە بە میعمارەکەی گوتبوو دەمەوێ کۆشکێکم بۆ دروست بکەی لە دنیادا نموونەی نەبێ، بنیادنرابوو. لەهەمان ئەو تالارەیدا کە شەربەتیان لە پەرداخی زێڕدا دەخواردەوەو دواتر عەبدولەجیدی بەدبەخت و ترسنۆک تێیدا پێشوازی لە ئیمپڕاتۆری ئەڵمانیا کردبوو، بەڵام لە ترسی ئەوەی ژەهر خوارد بکرێ، خۆی تەنها پڵاوێکی ساکاری لێندراوی چێشتخانە تایبەتیەکەی خۆی خواردبوو.

دوای سێ ڕۆژ تەرمی ئەتاتورکیان لە کۆشکی سوڵتانەکان بردە دەرو مەراسیمی ناشتنی ڕەسمییان بۆ ئەنجامدا. سەرانسەری شەقامەکانی قوستەنتەنییەو تەنانەت لق و پۆپی درەختەکان و منارەی مزگەوتەکانیش خەڵکیان پێوەبوو و ڕەش دەچوون. هەموان دەیانویست تەنانەت ئەگەر بۆیەکجاریش بێت، چاوێکیان بەتابوتی باوکی تورکیای نوێ بکەوێ. تابوتەکەیان لەسەر تۆپێک دانابوو و ئەفسەرانی سوپا لە تەنیشتیەوە دەڕۆیشتن. لە پشت ئەوانەوە ئەفسەرێک تەنها یەک نیشانی مستەفا کەمالی لەسەر بالیفێک دانابوو و بەدوای تابوتەکەدا دەڕۆیشت، ئەو نیشانەش هی شەڕەکانی سەربەخۆیی بوو.

لەکاتێکدا کە مەوکیبی بەخاک سپاردنی تەرمەکە هێدی هێدی ڕێگەی دەبڕی، لەبەرامبەر بینایەکی کورتی لەبەرد دروستکراودا تێپەڕی و ئەو شوێنەش ئارامگەی خەیرەدینی ڕیش سوور، ئەمیرولبەحری بەناوبانگ بوو کە لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانوونیدا دەریای ناوەڕاستی کرد بۆ بە دەریاچەیەکی تورکی. ئەویش وەک ئەتاتورک بێ بەزەیی و دڕندەو دڵڕەق بوو، بەڵام بەیەکێ لە گەورەترین کەسایەتییەکانی سەردەمی خۆی لەقەڵەم دەدرا کە ڕۆڵێکی بەرچاوی لەبنیادنانی ئیمپراتۆرییەتدا هەبوو.

مەوکیبەکە گەیشتە سەر ئەو پردەی کە لەسەر کەنداوی داردانێل دروست کرابوو، لێرەدا مەوکیبەکە بۆماوەیەکی کورت ڕاوەستاو لەوماوەیەدا تەرمی ئەتاتورکیان لەسەرووی زەوییەکی شێوە سێگۆشە دانا کە سەرای کۆنە سوڵتانەکانی پێک دەهێناو دنیایەک کتێبی مێژووییان لەبارەوە نووسیوە. ئێرە هەمان ئەو شوێنە بوو کە ڕوکسلانە، سوڵتان سلێمانی ناچارکرد مارەی بکات و پیلانی لە دژی کوڕە خۆشەویستەکەی سوڵتان سلێمان گێڕاو بە کوشتی دا، ئێرە شوێنێک بوو کە محەمەدی سێیەم نۆزدە برای خۆی تێدا خنکاندو مورادی چوارەم لەماوەی یەکساڵدا (٢٥) هەزار کەس لە هاوولاتیانی خۆی تێدا لەسێدارەداو هەندێکیانیشی بەدەستی خۆی کوشت. ئەگەر یەکێ لەوانەی کە بەدوای تەرمەکەی مستەفا کەمالەوە بوو بە وردی لەو شوێنەی بڕوانیبایە کە پێشتر حەرەمسەرای سوڵتانی لێ بوو، دەیتوانی پەنجەرەکانی ئەو ژوورەی قاتی سەرەوە ببینێ کە ئیبراهیم (٢٢) ساڵی تەمەنی خۆی تێدا بەسەربردبوو.

ئەتاتورک وەسیەتی کردبوو لە ئاشکرا خۆشەویستەکەیدا بینێژن، بۆیە بڕیاریاندا سەرەتا بە کەشتی تەرمەکەی ببنە بەندەری ئیزمیت کە کەوتبۆ سەرکەناری ڕۆژهەلاتی دەریای مەرمەڕەوە. تەرمی مستەفا کەمال سواری کەشتییەکی جەنگی تورکی کراو دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە گەیەندرایە ئیزمیت و لەوێشەوە سواری شەمەندەفەری تایبەتی سەرۆک کۆمار کراو بەرەو دەشت و دۆڵەکانی ئەنادۆڵ کەوتەڕێ. ئێرە بەلانکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەژمێردرا کە تێیدا مورادی چوارەم لەماوەی ١١٠ ڕۆژدا پێیدا تێپەڕی بوو و گەیشتبۆ بەغداو، لەوێ لە شەڕێکی دەستەویەخەدا بەدەستی خۆی ئازاترین ئەفسەری سوپای ئێرانی کوشتبوو و (٦٠) هەزار کەس لە دانیشتوانی بەغداشی قەتلوعامی کردبوو. هەر لەو شوێنەدا کە

ئێستا لەوپەڕی بێدەنگیدا، تەرمی ئەتاتورک گوزەری دەکرد، ئەتاتورک یۆنانییەکانی لەشەڕی چارەنووسسازی ساکاریادا بەچۆک داهێنابوو و، دواتر لە تەنیشت لوتکە پڕ لە بەفرەکانی کێوەکانی ئۆلۆمپەوە کە چەندین سەدە سەهۆڵی پێویستی سوڵتانەکانی دابین دەکرد، سەربازەکانی خۆی ڕووەو قوستەنتەنییە ڕێبەرایەتی کردبوو، هەر لێرەوە بوو کە ئەتاتورک هێزەکانی خۆی بردە داردانێل و ملی پێ لەبەرملی هێزە داگیرکەرەکانی ئینگلیز نان و، بەبێ خوێنڕێژی لە چاناک کالێ‌ی وەدەر نان.

لۆرد کین ڕاس کەیەکێ لە باشترین ژیاننامەنووسانی ئەتاتورکە، نووسیویەتی: *«لەو شەوەدا، بەهەزارن کەس لە لادێ نشینەکانی ئەنادۆڵ، گوندەکانی خۆیان بەجێ هێشتبوو و لەولاو ئەولای هێڵی شەمەندەفەر کۆببوونەوەو چاوەڕێی ئەو شەمەندەفەرەبوون کە «باوکیان»ی تێدابوو، ئەوان شاپلیتەکانی خۆیان ڕادەوەشاندو بەشە نەوتە کەمەکەی خۆیان دەڕشتە سەرزەوی و ئاگریان تێ بەردەدا تا بەڵکو بتوانن بە باشی شەمەندەفەری هەڵگری ئەتاتورک کە بە بەرامبەریاندا تێپەڕ دەبێ، باشتر ببینن.»*

شەمەندەفەری نێوبراو بەرەو شارێک دەچوو کە تێیدا ئەتاتورک ئەویندای لەگەڵ فکرییەی مەلولدا کردبوو و ئەو ئافرەتە بەدبەختە لەوێ بە شێوەیەکی مەینەتبار مردبوو. دواتر لەتیفەی هێنابوو و وەک دوو هاوسەری خۆشبەخت تێیدا نیشتەجێ ببوون و دوای ماوەیەک ئەویشی لەوێ تەلاق دابوو. شارێک کە مستەفا کەمال هاوکات لە گەڵ لە سێدارەدانی (١١) کەس لە هاوڕێیە دێرینەکانی، میواندارییەکی پڕشکۆی تێدابەرپاکردبوو و بەڕابواردنەوە خەریک ببوو.

شەمەندەفەری سەرۆکایەتی، تەرمی ئەتاتورکی دەبردە گوندێکی نێو کێوەکانی ئەنادۆڵ کە خۆی کردبوویە پایتەختی ئەو تورکیا نوێیەی کە دایمەزراندبوو. ئەو دەستی بەسەر ئیمپراتۆرییەتێک داگرت کە بە ئازایەتی و نەبەردی درووست ببوو و بەهۆی گەندەڵییەوە لەبەریەک هەڵوەشابۆوەو بەقەولی کین ڕاس: *«لەماوەی ١٥ ساڵدا لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە گەیاندبوویە ئاستانەی دنیای نوێ و تەنانەت ئەولاتریشی.»*

* * *

## کۆتایی خەونەکە

ئێستاکە، هەموو شتێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە. شاری پڕ لە جەنجاڵ و هەراو هۆریای ئەستەمبوڵ بە دوویردی هەڵواسراوەوە کەبەسەر کەنداوی داردانێلدا لێدراون، هێندە نیگەرانی ئاییندەیە کە دەرفەتی ئەوەی نییە بیر لە ڕابردوو بکاتەوە. لە ڕوانگەی دەوڵەتە مۆدێرن و بە ڕووخسار ڕۆژئاواییەکەی تورکیا، مێژووی ئەو وڵاتە بە ئەتاتورک دەست پێ دەکات و لە ڕوانگەی خەڵکی سەر شەقام و نێو کۆڵانەکانیش، دەرباری پڕشکۆی سوڵتانەکان هی سەردەمی ڕابردوون.

لە ڕۆژانی گەرم و خۆرەتاویی هاویندا، ماڵۆستاکان پۆ پۆل قوتابیە چەنەبازەکانی خۆیان بۆ دیتنی حەوشەویانی ساختومانە پەڕاگەندەکانی کۆشکی سوڵتان دێنن کە ئێستاکە بووەتە مۆزەخانەی «تۆپکاپی».

ئەوانیش وەکو هاوکارانیان لە وڵاتانی دیکە کە منداڵەکان بۆ گەشتی زانستی و سەردانی مۆزەخانەکان دەبەن، ماندوو دیارن و بە دڵنیاییشەوە منداڵەکان ئەم گەشتە وەک وانەیەکی پڕەکتیکیی مێژوو لەقەڵەم نادەن و بگرە بەلای ئەوانەوە ئەو ڕۆژە ڕۆژێک بووە کە توانیویانە لە قوتابخانەو ئامادەبوون لەسەر پۆل ڕزگاریان بێ.

هێشتا نێوی قوستەنتەنیە بەگوێی دانیشتوانی ئەستەمبوڵ ناشنایەو نامۆنییە، بەڵام لە کاتێکدا کە ئۆتۆمبێلەکانیان بەهۆڕنی نەپساوە و برێکە بەردەوامەکانیان لە گۆشەیەکی نزیک مزگەوتی ئەیاسۆفیا، یان لە تەنیشت عەمباراوی هەزار ستون ڕادەگرن، هێندە بەهاتوچۆی هاووڵاتیان قەرەباڵغیی بازارەکەوە خەریکن کە دەرفەتی ئەوەیان نییە بە وردی سەرنجی دەوروبەری خۆیان بدەن.

ڕەنگبێ ئەو گەڕیدانەی کە بە کۆمەڵ دەکەونە دوای ڕێبەرە زمانزانەکانیان و بە کۆریدۆرە تاریک و ژورە ڕووناک و ڕوو لە هەتاوەکانی حەرەمسەرای سوڵتانەکاندا تێپەڕدەبن، بۆ وەرگرتن و تێگەیشتن لە مێژوو ئامادەگیەکی باشتریان هەبێ. ئەوان بە کتێبی ڕێبەر و هاوێنە فۆتۆگرافییەکانیان، گەشتێک بەنێو مەملەکاتی پڕشکۆی ڕابردوودا دەکەن کە لە دنیای نوێماندا هەموو شتێکی لەنێوچووە.

لەو گۆڕەپانەیدا کە کاتی خۆی بیزانسییەکان پێشبڕکێی تاودانی ئەسپیان تێدا سازدەداو سوڵتان موراد بە کەوانەکەی خۆی تێرێکی لەو گۆشەیەوە بۆ ئەو گۆشەی هاوێشت، کۆمەڵی تەختی بەردین دەبیندرێن کە بەدەگمەن خەڵک لەسەریان دادەنیشێ؛ چونکە گۆڕەپانی نێوبراو ڕەونەقی ڕابردووی نەماوەو کاول بووە. لەگۆشەیەکیدا تاقمە منداڵێکی سەر بزێو تۆپێن دەکەن. پیرەژنێک لەسەر تەختێکی بەردین دانیشتووەو بەدەستێکی دان دەداتە کۆترەکان ودەستەکەی دیکەشی لەسەر لەچەکەکەی سەریەتی تا ئەگەر لە پڕێکا وێنەگرێک لێی نزیک بۆوەو ویستی وێنەی بگرێ، ڕووی خۆی لێ بگرێتەوە.

لەژێر هەتاوی سووتێنەری هاویندا، هەندێ جار مارمێلکەکان سەریان لە کەلێنی ئەو بەردانەی کە لەسەردەمی قوستەنتەنییەوە ماون دەردێنن و، بەنیگایەکی ماتی وەک نیگای مردووەکان، چاوەڕێی ڕاوکردنی گیانلەبەرێکی بچوک دەکەن و هەر کەڕاویشیان کرد، دەستبەجێ بە قەڵشتەکانی حەسارە درزاوییەکەی شاردا ڕۆدەچنەوە.

جاری وایە زۆر زەحمەتە مرۆڤ لەبەر سێبەری مزگەوتە جوان و پڕشکۆکانی ئەستەمبوڵ دانیشێت و بیر لەوە بکاتەوە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم شارە دڵی ئیمپراتۆرییەتێکی بەهێز بووە کە دنیای ڕۆژئاوا لەبەری لەرزیووە. ڕەنگبێ سەرەڕای چەندین سەدە گەورەیی، سەرکەوتن، ستەمکاری، پیلانی ئافرەتانی حەرەمسەراو بەدبەختی و بێ بەشیی ملیۆنەها کەس لە دانیشتوانیشی، لەخەو خەیاڵ پتر هیچی دیکە نەبووە.

**کۆتایی**

## پەراوێزەکان

١- ئەگەرچی کۆمیتەی ئیتیحاد و تەرەقی لە هەندێ بواردا ڕێگەی دەدا کە تورکە پیرەکانیش لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا پۆستیان هەبێ، بەڵام لە کۆی گشتیدا دەسەڵاتی ڕاستەقینە لە دەست تورکە لاوەکان دابوو.

٢-بەڵگەنامە ڕەسمیەکانی دەوڵەتی ئەڵمانیا. تەلگرافی وانگنهایم بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا، ژمارە:٤٠٤ ڕێکەوتی ٢ ی ئابی ساڵی ١٩١٤.

٣-تەلعەت لە یەکێ لە دیدارەکانی لە گەڵ باڵوێزی ئەمەریکا،ناوەرۆکی یەکێ لەو تەلگرافانەی بۆ باڵوێزی ئەمەریکا خوێندبۆوە کە لە واشنتۆنەوە بۆ باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە قوستەنتەنیە نێردرابوو و هێشتا نەگەیشبۆ دەستی مۆرگنتاو و ئینجا بە خۆشحاڵییەوە درێژەی پێدابوو و گوتبووی:« حەتمەن ئەو تەلگرافەتان بەدەست دەگات؛ چونکە من فرمانم داوە دوای ئەوەی تەلگرافەکانی ئێوەم خوێندەوە، پێش هەموان هی ئێوە بگەیێننە دەستتان.»

٤-ئەنوەر دوای ماوەیەک چووە ڕوسیا و لە ساڵی ١٩٢٢ لە کاتێکدا کە لەدژی سوپای سوور سەرکردایەتی تاقمێکی دژ بە شۆڕشی دەکرد، لە تورکستان کوژرا. تەلعەت لە ساڵی ١٩٢١ لە بەرلین بە دەستی ئەرمەنییەکان کوژرا و جەمالیش چووە ئەفغانستان و لەوێ بە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی سوپای ئەو وڵاتەوە خەریک بوو، بەڵام ئەویش لە ساڵی ١٩٢٢ لە تەفلیس تیرۆر کرا.

٥-وەحیدەدین چوارەمین کوڕی سوڵتان عەبدولەجید بوو کە دوای موراد، عەبدولحەمید و ڕەشاد کرا بە سوڵتانی عوسمانی.

٦- لە ساڵی ١٩٢١ دا، ئەو ئەفسەرانەیان لە گەڵ ئەو نوێنەرانەدا گۆڕییەوە کە پێشتر هاوپەیمانان بەرەو دوورگەی ماڵتا دووریان خستبوونەوە.

# Books consulted

Abbott, G. F., *Turkey, Greece and the Great Powers* (London: Robert Scott, 1917).
Ahmad, Feroz, *The Young Turks* (Oxford University Press, 1969).
Alderson, A. D., *The Structure of the Ottoman Dynasty* (Oxford University Press, 1956).
Anderson, M. S., *The Eastern Question 1774-1923* (London: Macmillan, 1966).
Armstrong, Harold, *Turkey in Travail* (London: John Lane, 1925).
Armstrong, H. C., *Grey Wolf (Mustapha Kemal)* (London: Arthur Barker, 1932).
Barker, Capt. B. Granville, *The Passing of the Turkish Empire in Europe* (London: Seeley Service, 1913).
Barker, Thomas M., *Double Eagle and Crescent* (New York University, 1967).
Benjamin, S. G., *The Turk and the Greek* (New York, 1867).
Benson, E. F., *Crescent and Iron Cross* (London, 1918).
Bierstadt, E. H., *The Great Betrayal* (London: Hutchinson, 1924).
Blanch, Lesley, *The Wilder Shores of Love* (London: John Murray, 1954).
Brandier, M., *The History of the Imperial Estate of the Grand Seigneur* (London, 1635).
Busbecq, Ogier Ghiselin de, *Turkish Letters* (Oxford University Press, 1927).
Cassels, Lavender, *The Struggle for the Ottoman Empire* (London: John Murray, 1966).
Castle, Wilfrid T. F., *Grand Turk* (London: Hutchinson, 1943).
Cavavelas, J., *The Siege of Vienna* (Cambridge University Press, 1925).
Chishull, Rev. Edmund, *Travels in Turkey and Back to England* (London, 1747).
Coeck, Peter, *The Turkes in MDXXXIII*, ed. Sir William Maxwell (privately printed, 1874).
Coles, Paul, *The Ottoman Impact on Europe* (London: Thames & Hudson, 1968).
'Consul's Daughter and Wife, A', *The People of Turkey*, 2 vols (London: John Murray, 1878).
Covel, Dr John, *Early Voyages and Travels in the Levant* (Cambridge: Hakluyt Society, 1893).
Cowles, Virginia, *The Russian Dagger* (London: Collins, 1969).
Creasy, Sir Edward, *History of the Ottoman Turks*, 2 vols (London, 1878).
Cuddon, J. A., *The Owl's Watchsong* (London: Barrie & Rockliffe, 1960).
Davey, R., *The Sultan and His Subjects* (London, 1897).
Davis, Fanny, *The Palace of Topkapi* (New York: Charles Scribner's Sons, 1970).
Davis, W. S., *A Short History of the Near East* (London: Macmillan, 1923).
Davison, Roderic H., *Reform in the Ottoman Empire* (Princeton University Press, 1953).
Devereux, Robert, *The First Ottoman Constitutional Period* (Baltimore: Johns

Hopkins University Press, 1963).
Djemal Pasha, *Memories of a Turkish Statesman 1913–1919* (London: Hutchinson, 1922).
Donaldson, H. E., *Ibrahim Pasha* (New York: privately printed for a Columbia University thesis, 1911).
Edmonds, C. J., *Kurds, Turks and Arabs* (Oxford University Press, 1957).
Efendi, Evliya, *Narrative of Travels in Europe, Asia and Africa in the Seventeenth Century*, 3 vols (London: Oriental Translation Fund, 1834, 1846, 1850).
Elliot, Sir Charles, *Turkey in Europe* (London: Edward Arnold, 1900).
Elliott, Frances, *Diary of an Idle Woman in Constantinople* (London: John Murray, 1893).
Ellison, Grace, *Turkey Today* (London: Hutchinson, 1928).
Emin, Ahmed, *Turkey in the World War* (New Haven, Conn.: Yale University Press, 1958).
Eton, W., *A Survey of the Turkish Empire* (London, 1801).
Eversley, Lord, and Chirol, *The Turkish Empire from 1288–1914–1922* (London: T. Fisher Unwin, 1922).
Farley, J. L., *Modern Turkey* (London, 1872).
Finlay, George, *History of Greece* (Oxford University Press, 1877).
Flachat, *Observations sur le Commerce et sur les arts d'une Partie de l'Europe, de l'Asie, de l'Afrique et même des Indes Orientales* (Lyon, 1766).
Freeman, Edward A., *The Ottoman Power in Europe* (London, 1877).
Froembgen, Hans, *Kemal Ataturk* (London: Jarrolds, 1937).
*The Fugger News Letters*, 2 vols (London: John Lane, 1924, 1926).
Furneaux, Rupert, *The Siege of Plevna* (London: Anthony Blond, 1958).
Garnett, Lucy M., *Turkey of the Ottomans* (London: Putnam, 1911).
Gibbons, H. A., *The Foundation of the Ottoman Empire* (Oxford University Press, 1916).
Graves, Philip P., *Briton and Turk* (London: Hutchinson, 1941).
Grosvenor, E. A., *Constantinople*, 2 vols (London, 1895).
Hammer, Joseph von, *History of the Ottoman Empire* (Paris, 1841).
Harington, Gen. Sir Charles, *Tim Harington Looks Back* (London: John Murray, 1940).
Harvey, A. J., *Turkish Harems* (London, 1871).
Haslip, Joan, *The Sultan: the Life of Abdul Hamid* (London: Cassell, 1958).
Hemingway, Ernest, *The Fifth Column* (London: Jonathan Cape, 1939).
Hepworth, Rev. George, *Through Armenia on Horseback* (London, 1898).
Herbert, W. V., *The Defence of Plevna* (London, 1895).
Housepian, Marjorie, *The Smyrna Affair* (New York: Harcourt Brace Jovanovich, 1966).
Hubbard, G. E., *The Day of the Crescent* (Cambridge University Press, 1920).
Hutton, W. H., *Constantinople* (London: Dent, 1900).
Jarman, T. L., *Turkey* (Bristol: Arrowsmith, 1935).
Jones, D., *A Compleat History of the Turks*, 3 vols (London, 1701).
Keitovoulos, *The History of Mehmed the Conqueror* (Princeton University Press, 1954).
Kemal, Ismail Bey, *Memoirs* (London: Constable, 1920).
Kinross, Lord, *Ataturk, the Rebirth of a Nation* (London: Weidenfeld & Nicolson, 1964).
Knolles, Richard, *The History of the Turkish Empire 1679–99* (London, 1700).

[illegible], *The March of the Barbarians* (London: Robert Hale, 1941).
— [illegible] (London: Robert Hale, 195[illegible]).
[illegible], *Turkey* (London, 18[illegible]).
— [illegible] *de Redcliffe* (London, 1890).
[illegible], *Turkey, Its History and Progress from the Journals of Sir James* [illegible]
[illegible] *of Modern Turkey* (Oxford University Press, 1961).
[illegible] (London: Ernest Benn, 1955).
[illegible], *Everyday Life in Ottoman Turkey* (London: Batsford, 1971).
Luke, Sir Harry, *The Making of Modern Turkey* (London: Macmillan, 1936).
— *The Old Turkey and the New* (London: Geoffrey Bles, 1955).
Lusignan, Princess Anne de, *The Twelve Years Reign of Abdul Hamid II* (London, 1889).
Lybyer, A. H., *Government of the Ottoman Empire in the Time of Suleiman the Magnificent* (Cambridge, Mass.: Harvard University Press, 1913).
McCoan, J. Carlile, *Our New Protectorate: Turkey in Asia*, 2 vols (London, 1879).
Ma.Farlane, Charles, *Turkey and Its Destiny*, 2 vols (1850).
Mango, Andrew, *Turkey* (London: Thames & Hudson, 1968).
Maxwell, Sir Robert, *Life and Letters of the 4th Earl of Clarendon* (London: Edward Arnold, 1913).
Mayes, Stanley, *An Organ for the Sultan* (London: Putnam, 1956).
Melling, A. I., *Voyage Pittoresque de Constantinople* (Paris, 1819).
Mennies, Sutherland, *Turkey Old and New*, 2 vols (London, 1880).
Merriman, R. B., *Suleiman the Magnificent* (Cambridge, Mass.: Harvard University Press, 1944).
Mikusch, D. von, *Mustapha Kemal between Europe and Asia* (London: Heinemann, 1931).
Miller, Barnette, *Beyond the Sublime Porte* (Newhaven, Conn.: Yale University Press, 1931).
— *The Palace School of Muhammed the Conqueror* (Cambridge, Mass.: Harvard University Press, 1941).
Miller, William, *The Ottoman Empire and Its Successors 1801–1927* (Cambridge University Press, 1927).
Montagu, Lady Mary Wortley, *Complete Letters* (Oxford University Press, 1965).
— *Letters during Travels* (London, 1789).
Moorehead, A., *Gallipoli* (London: Hamish Hamilton, 1957).
Morgenthau, Henry, *Secrets of the Bosporus* (London: Hutchinson, 1918).
Mourad, Bey, *Le Palais de Yildizg et le Sublime Porte* (Paris, 1897).
Muller, Herbert J., *The Loom of History* (London: Museum Press, 1959).
Mundy, Peter, *The Travels of Peter Mundy in Europe and Asia 1608–1667* (Cambridge: Hakluyt Society, 1907).
Nicolson, Harold, *Lord Carnock: a Study in the Old Diplomacy* (London: Constable, 1930).
Oecondmos, Dr Lysimachos, *The Martyrdom of Smyrna and Eastern Christendom* (London: Allen & Unwin, 1922).
Orga, Irfan and Margarete, *Ataturk* (London: Michael Joseph, 1962).
Osman Bey, *La Turquie sous Abdul Aziz* (Paris, 1868).
Pallis, Alexander, *In the Days of the Janissaries* (London: Hutchinson, 1951).
Pardoe, Miss, *The City of the Sultan*, 2 vols (London, 1837).
Pears, Sir Edwin, *Life of Abdul Hamid* (London: Constable, 1917).

Penzer, N. M., *The Harem* (London: Spring Books, 1966).
Porter, Sir James, *Turkey, Its History and Progress*, 2 vols (London, 1854).
Postel, Guillaume, *De la République Turke* (Poitiers, 1560).
Ramsaur, E. E., *The Young Turks* (Princeton University Press, 1957).
Ramsay, Sir William, *Impressions of Turkey* (London, 1897).
--- *The Revolution in Constantinople and Turkey* (London: Hodder & Stoughton, 1919).
Ranke, Leopold, *The Ottoman and Spanish Empires in the Sixteenth and Seventeenth Centuries* (London, 1843).
Reis, Sidi Ali, *The Travels and Adventures of Admiral Reis* (London, 1899).
Remak, Joachim, *Sarajevo* (London: Weidenfeld & Nicolson, 1959).
Remaleddin Bey, D. J., *Sultan Murad V* (London, 1895).
Rosendale, Rev. H. G., *Queen Elizabeth and the Levant Company* (Oxford University Press, 1904).
Rycaut, Sir Paul, *History of the Turkes to 1699* (London, 1700).
Sanders, Liman von, *Five Years in Turkey* (Annapolis: U.S. Naval Institute, 1928).
Shah, Ikbal Ali, *Kemal – Maker of Modern Turkey* (London: Herbert Joseph, 1934).
Sherley, Sir Thomas, *Discours of the Turkes* (London: Royal Historical Society, 1936).
Smith, Albert, *A Month in Constantinople* (London: David Bogue, 1851).
Stoye, John, *The Siege of Vienna* (London: Collins, 1954).
Sykes, Sir Mark, *The Caliphs' Last Heritage* (London: Macmillan, 1915).
Thornton, Thomas, *The Present State of Turkey*, 2 vols (London, 1809).
Tott, Baron de, *Mémoires* (London, 1786).
Trumpener, Ulrich, *Germany and the Ottoman Empire* (Princeton University Press, 1968).
Tugay, E. F., *Three Centuries* (Oxford University Press, 1967).
Upham, Edward, *History of the Ottoman Empire till 1828*, 2 vols (Edinburgh, 1829).
Walder, David, *The Chanak Affair* (London: Hutchinson, 1969).
Weber, Frank G., *Eagles on the Crescent* (Ithaca, N.Y.: Cornell University Press, 1970).
White, Col. Charles, *Three Years in Constantinople*, 3 vols (London, 1845).
Withers, Robert, *Edited Version of Grand Seigneur's Seraglio* (London, 1650).
Wittek, Paul, *The Rise of the Ottoman Empire* (London: Royal Asiatic Society, 1938).
Wittlin, Alma, *Abdul Hamid, Shadow of God* (London: John Lane, 1940).
Wortham, H. E., *Mustafa Kemal* (London: Holme Press, 1930).
Young, George, *Constantinople* (London: Methuen, 1926).

Bon, Ottaviano, *A Description of the Grand Seigneur's Seraglio* (Venice: Library of St Mark, 1625).
Bramey, Thomas, M.P., *The Eastern Question* (London, 1877).
Brown, Joseph, Q.C., *The Idolatry, Superstition and Corruption of the Christians of Turkey* (London, 1877).
Chishull, Rev. Edmund, *Antiquitates Adriaticae* (London, 1728).
Constantinople reports 1730; Constantinople reports 1736 (Public Record Office 97/26 and 97/28).
Cooper, Joseph, *Turkey and Egypt* (*Consular Reports on the Slave Trade*) (London, 1876).
Dispatches from Envoys in Constantinople, Vienna, St Petersburg and Paris (Public Record Office 97/25–31; 80/54-8; 78/207-21).
— 'The Armenian Question', speech, 1898.
— *The Bulgarian Horrors* (London, 1876).
Gladstone, W. E., M.P., 'The Eastern Question', speech, 1877.
— *Lessons in Massacre, Conduct of Turkish Government in Bulgaria* (London, 1877).
*Greek Atrocities in Turkey* (Constantinople: Ministry of Interior, 1921).
Hierosolimitano, Domenic, 'Relations della gran citta di Constantinopii' (MSS. Room, British Museum).
Lara, Chrysaphides and Rene, 'The Last Sultan of Turkey', *Nineteenth Century and After*, June 1909.
*Parliamentary Papers in the Eastern Question* (London: H.M.S.O., 1854).
Reports received from H.M. Ambassador and Consuls relating to the Christians in Turkey. Presented to House of Commons, 1867 (Public Record Office).
Richard, Henry, M.P., *Evidences of Turkish Misrule* (London: Eastern Question Association, 1877).
Taylor, Sedley, *The Conduct of H.M. Ministers on the Eastern Question* (London: Liberal Central Association, 1877).
Vambery, Armenius, 'The Future of Constitutional Turkey', *Nineteenth Century and After*, March 1909.
— 'Personal Recollections of Abdul Hamid and His Court', *Nineteenth Century and After*, June 1909.
'Vindex Veritatis', *That Unconscionable Turk* (London, 1877).

وێنەیەکی روکسلانە کە لەلایەن نیگارکێشێکی رۆژئاواییەوە کێشراوەتەوە

مەوکیبی سوڵتان سلێمانی قانونی کە سەربازانی یەنیچەری لەگەڵدا دەبیندرێن

خەیرەدینی ریش سوور «بارباڕۆسا» کە بە کاپودان پاشا بەنێو بانگ بوو

دیمەنی کوشتنی مستەفای کوڕی سلێمانی قانوونی کە لەلایەن نیگارکێشێکی رۆژئاواییەوە کێشراوەتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا بەم شێوەیە نەبووە و، نێوبراو بە پەت خنکێندرا

سەرۆک وەزیران لە ساڵی ١٧٨٨ لە تاوڵەکەی خۆیدا پێشوازی لە باڵیۆزی بەریتانیا دەکات

چەنەلێدان لەسەر نرخی کچان لە بازاڕی کۆیلەفرۆشیی قوستەنتەنییە

سوڵتان عەبدولحەمیدی یەکەم

عەبدولحەمیدی یەکەم لەکاتی چوونی بۆ نوێژی هەینی

سوڵتان مەحمودی دووەم

کۆشکی دۆڵمەباخچە

کەنیزەکە چەرکەسییەکان کە جوانتین ئافرەتانی حەرەمسەرا بوون و ، سەردەمیک
لە کێڵگەی کۆیلەکاندا پەروەردە دەکران

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم«مەلعون» دوا سوڵتانی
دیکتاتۆری عوسمانی لەکاتی پیریدا

کەمال ئاتاتورک و خاتو لەتیفەی هاوسەری

کەلیسای سەنت صوفی کە لە سەردەمی عوسمانییەکان کرا بە مزگەوتی ئەیاصۆفیا

ئەو تەختە بە مرواری نەخشێندراوەی کە نادرشا لە هیند بە دەستکەوت هێنابووی
و، پێشکەشی کرد بە سوڵتانی عوسمانی

دیمەنێکی شاری قوستەنتەنییە کە لەبەشی پێشەوەدا، مزگەوتی سوڵتان ئەحمەد بە شەش منارەوە، گۆڕەپانی ئەسپ تاودان، مزگەوتی ئەیاصۆفیا و لە دوورتریش و لەو شوێنەی کە گەرووی بسفۆڕ و دەریای مەڕمەڕە یەکدەگرنەوە، کۆشکی تۆپقاپی دەبیندرێن

دیمەنێک لە مزگەوتی سولتان سلێمان کە کەوتۆتە تەنیشت کەنداوی داردانێل

دوابەدوای گۆڕینی ئەلفوبێ و بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی، ئەتاتورک بۆخۆی
کارمەندانی دەوڵەت لە بەکارهێنانی ئەم ئەلفوبێیە نوێیەدا تاقی دەکاتەوە

# کتێبە چاپکراوەکانی دەزگا

١- جوگرافیای کوردستان
٢- نەژادی کورد
٣- باڵە سیاسییەکان لە ئێران
٤- کرۆنۆلۆژیای مەسەلەی مووسڵ
٥- اربیل ٨٨ هەولێر ٩٩
٦- جمعیە خویبون
٧- امارە بابان
٨- امارە بوتان
٩- امارە بادینان
١٠-جیهانگیری
١١- حقوق الانسان والمجتمع المدنی بین النظریە والتطبیق
١٢- الفدرالیە وامکانیە تطبیقها فی العراق
١٣- تەقریرستان
١٤- شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا
١٥- کردستان - فی القرن الثامن الهجری
١٦- فەرهەنگی لێک حاڵی بوون
١٧- ئینسکلۆپیدیای ئابووری
١٨- ئەودیوی مەرگ
١٩- فریدریک نیتشە
٢٠- چەند بابەتێکی رێزمان و زمان